تصوير ابو عبد الرحمن الكردي

کانت دمارانس

جەنگی چوارەمی جیهانی

# جەنگی چوارەمی جیهانی

جاسوسی و دیپلۆماسیەت لەسەردەمی تیرۆریزمدا

وەرگێڕانی

دلاوەر عەبدوڵڵا

منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

# جەنگی چوارەمی جیهانی

## جاسوسیو دیپلۆماسیەت لەسەردەمی تیرۆریزمدا

## {کانت دمارانش}

سەرۆکی پێشووی دەزگای جاسوسی فەرەنسا

وەرگێڕانی

دلاوەر عەبدوڵا

سلێمانی ٢٠٠٤

زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
کتێبی سەردەم ژمارە (٢٦٣)

سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی

# جەنگی چوارەمی جیهانی

بابەت: لیکۆڵینەوە
نووسینی: کانت دمارانش
وەرگێڕانی: دلاوەر عەبدوڵلا
بەڕێوەبەری هونەری: شیروان تۆفیق
تیراژ:٨٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ١٦٨ ی ٢٠٠٤

مافی لە چاپدانەوەی ئەم کتێبە بۆ دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم پارێزراوە

## پێشکەشە :

بەوکەسانەی لەناو سەنگەرە ساردو سڕەکانی شەهیدبووندا بەخواستی خۆیان و دوور لەچاوەڕوانی پاداشتی ڕۆژی سەرکەوتن جەستەیان کردەسوپەری بەرگریکردن لەنیشتمان و ڕۆحیان بووە مژدەهێنەری ئازادی نەتەوەیی.

بەوانەی وەك بوومە لێڵ لە نهێنی و تاریکیدا بۆپاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی دەجولێن و وەك سەربازی گومناو سەردەنێنەوە.

# دەسپێك

بەبڕوای نوسەرانی ئەم کتێبە، کەلەلایەن(سهیلا کیانتاش)ەوەبۆسەرزمانی فارسی وەرگێڕاوە،هەنگاوی یەکەمی سەدەی بیست ویەك بەجەنگێکی جیهانی شاراوەوبەردەوام دەسپێدەکات. ئەوهێزانەی لەململانێدادەبن لەدوونیوەگۆی زەوی (باکور- باشور) پێك دێن. واتەهێزی ولآتانی پێشکەوتووی خۆرئاواو هێزەنەیارەکانیان لەئسولیەکان لەولآتانی جیهانی سێ. ئەم شەڕە، کەلەوێنەیەکی توندوتیژوخوێناوی وبێبەزەیانەی تیرۆریزمی جیهانی (باشور) دژبە(باکور)داخۆی بەرجەستەدەکات، ناودەنێت (جەنگی چوارەمی جیهان).
لەگەڵ ئەوەشی کەسیماکانی ئەم تیرۆریزمی جیهانیەشرۆڤەدەکات و، بەنمونەوبەڵگەوەتیۆرەکانی لەمەڕقەلاچۆکردنی دەخاتەڕوو، جیهانیش لەوەئاگاداردەکاتەوەکەدەبێت لەناوسیستمی جیهانیی نوێدا هاوکاروهاودەنگ بن. دەبێت ولآتانی پێشکەوتووی وەك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو بەریتانیاو فەڕەنسا لەخۆرئاواو ئەورووپا دانوێنەری ڕاستەقینەی پاراستنی ئەوسیستمەو هاوپەیمانەکانیان بن لەبەشی (باشور). سەرەڕای ئەوەش لەوەشاندنی گورزی کوشندەوگوچکبڕانەی خێرا هیچ دوودڵییەك نەنوێنن، چونکەتیرۆریزمی جیهانی لەوە دەرچووە کە بەهاویشتنی بۆمبێکی دەستی یان تیرۆرکردنی کەسایەتیەك داسەکنێت، بەڵکوکاری گەورەی وەك ژەهرکردنە ناو ئاوی خواردنەوە یان دانانی بۆمبێکی ئەتۆمی لەناو شارێکی گەورەدا ئەنجام دەدات، کە بیروڕاکانی نووسەرلەسەرەتای دەیەی یەکەمی سەدەی بیست ویەك وپاش ڕووداوی یازدەی سێپتامبەری تاقاندنەوەی دووتاوەری بازرگانی شاری نیۆرك وکوشتنی هەزاران کەس بەڕاست گەڕاون. هەروەها هەمان ڕووداو سەلمێنەری پێشبینیەکی دی نووسەرە، کەئاگاداری ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکادەکاتەوە لەوەی تیرۆریزمی جیهانی وقاچاخچێتی مادەسڕکەرەکان بەرەوسنورەکانی دەکشێن.

ئەم کتێبەوەك بابەتی جاسوسیی ودیپلۆماسیەت لەناوەڕۆکە بەدەگمەنەکانن کەکتێبخانەی کوردی ئێمە پێویستیان پێیەتی . جگەلەوەش بۆسەردەمی ئێستای ئێمە، کەوەك میللەتێکی چەوساوەو ژێردەستە بەدرێژایی مێژوو، هەروەها پاش ڕاپەڕینی بەهاری (١٩٩١)و ئازادکردنی دوولەسێی خاکی

کوردستانی لکێندراو بەعێراقی عەرەبییەوە، هەلی هەنگاوێکی مێژوویی بۆڕەخساوە. بەهۆی نەمانی جەنگی سارد (کە بە جەنگی سێیەمی جیهان ناوزەد کراوە) و داپلۆسنی ئەودیکتاتۆرانەی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی وەك چەك بەکاردەهێنن، دەبێت لەودیدوبۆچوونە خۆرئاواییانەی خۆیان بەپارێزەری بەهاومۆڕاڵە جیهانیەکان دەزانن تێبگەین، چونکە هەروەك نووسەری ئەم کتێبەجەختی لەسەردەکاتەوە(تاکە ڕێگای سەرکەوتن ، ناسینە)، بۆیە بۆئێمەش زۆرگرنگە دۆست و دوژمن وهاوپەیمانەکانمان باش بناسین.

ئەوەی دی کەماوەوپێویستەسەبارەت بەم کتێبە بوترێت ئەوەیەکەزۆرسوپاسی مامۆستاوهاوڕێی بەڕێزم کاك(محمد کەریم)دەکەم، کەکۆمەکی زۆری پێکردم لەڕووی هەڵبژاردنی کتێبەکەو پێداچوونەوەی بەشی یەکەمیدا.

خاڵێکی دی ئەم بوارەئەمەیەکەجگەلەپێشەکیەکەی هیچ پەراوێزێکی دی وەرگێڕی فارسییەکەی(سهیلا کیانتاش)م وەرنەگێڕاوەتەسەرکوردی، چونکەجگەلەوەی کۆمەکی بەڕوونکردنەوەی بابەتەکانی ناوکتێبەکەنەکردووە، لەڕوانگەیەکی سیاسیانەی رووتی ناوخۆی وڵاتەکەشیەوە نووسیوویەتی، کەلەوبڕوایەدام تەنها بۆڕەخساندنی بواری چاپکردنی بوویێت، یان دەزگایەکی سانسۆر ئەو پەراوێزانەی بۆزیادکردبێت. هەروەها لەبارەی ناوی نوسەری کتێبەکەوە پشتم بەناونیشانە ئنگلیزییەکەی بەستوە، چونکە لەفارسیەکەدا ناوی نوسەرەکە گۆڕانێکی تێدابوو. لەڕاستیدا لەسەر بەرگی فارسییەکەی ناوی نوسەر بە(کانت دومارانش) تۆمار کراوە، بەڵام لەناونیشانە ئینگلیزیەکەدا بە (مارانش ئەلکساندەر دوکام—Marenches,Alexander de,Comt)هاتوە،بۆیە منیش لەسەر بەرگەکەی وەك ئینگلیزیەکەی نوسیومەتەوە، بەڵام لەناوەڕۆکی نوسینەکاندا وەك وەرگێڕانە فارسییەکە دامناوەتەوە.

بەهەرحاڵ هیوادارم توانیبێتم کەلێنێکی بچوك لەناوبۆشایی گەورەی ڕۆشنبیری کوردی و وەرگێڕان وجۆری بابەتی کتێبەکە پربکەمەوە، کەدڵنیاشم هەوڵەکەم بێکەموکوڕی نابێت، بۆیەلەسەرەتاوەداوای لێبوردن دەکەم.

دلاوەر

31/ئاب/2002

## پێشەكی وەرگێڕی فارسی

ئەم كتێبە كەبەشێوەی پاشكۆ لەڕۆژنامەی ئیتلاعاتیشدا پەخشكراوە، یادەوەرییەكانی (كانت دومارانش)ی سەرۆكی پێشووی دەزگای جاسوسی فەڕەنسایە، كەبۆ ماوەیەكی درێژ لەم دەزگایەدا وەك ڕاوێژكارو پیاوانی پشت پەردەی وەك (چارل دیگۆل، هێنری كیسنجەر، ڕونالد ڕیگان، ژیسكار دستن) و.. كاری كردووە. پێشبینیە وردەكانی (كانت دومارانش) سەبارەت بەهێرشی سۆڤیەت بۆسەر ئەفغانستان، بەڵگەی بەتوانایی ئەون لەبواری پرۆفیشنالی سیخوڕیو ڕاڤەكاری هەلومەرجی سیاسی.

لەم پەڕتووكەدا، (كانت دومارانش) لەگەڵ وێنە كێشانی ژیانی پیشەیی خۆی لەجەنگی دووەمی جیهانییەوە تا ئەم دەمە، پەیامێكی نائومێدانەش سەبارەت بەهەلومەرجی جیهانبینی خۆرئاوا بۆ سەرۆكەكانی ئەو وڵاتانە دەنێرێت. دومارانش، لەگەڵ ڕۆژنامەوانو سەرۆكی بڵاوكراوەی نیۆرك تا یمزو توێژەرەوەی پرسە دەرەكیەكان لەم نووسراوەدا، لەوباوەڕەدان كە خۆرئاوا بەدرێژایی سەدەی بیستەم، سێ جەنگی جیهانی تێپەڕاندووە– جەنگە جیهانیەكانی یەكەمو دووەمو جەنگی سارد– و ئێستاش گیرۆدەی وێرانكارترین جەنگ بووە. (دومارانش)و (ئەندلمن)، جەنگی چوارەمی جیهان بەڕووبەڕوو بوونەوەی نێوان باكور لەگەڵ باشوور دادەنێن. ئەوان، باشوور بەمیللەتانێك دادەنێن كەپەیوەستییەكی توندوتۆڵ بەڕابوردووەوە گرێیداونو لەجەنگدان دژ بەباكوری پیشەسازی. دومارانشو ئەندلمن لەئاستێكی خۆرئاوایی، یان بەواتای باكوری پیشەسازییەوە خاوەن تێڕوانینێكی تەواو عادلانەوە، هەوڵدەدەن ڕاستەوخۆ باشوور بەتیرۆریستو بەرهەمهێنەری ماددەی سڕكەر بناسێننو بەم فێڵانە، شەڕی زۆردارانەی باكور دژ بەباشوور، بەشەڕێكی ڕەوای لەقەڵەم بدەنو لەم ڕووەوە هەموو هەنگاوێك بەڕەوا دابنێن. نووسەرانی ئەم كتێبە لەسەر ئەوباوەڕەن كەكاری سیخوڕی، كاریگەرترین چەكی جەنگی چوارەمی جیهانییە، كەتیایدا هەموو خۆرئاوا بەواتای باكوری پیشەسازی، دژ بەوهێزانەی كەبەبڕوای ئەوان لەڕێگای

ستراتیژە ئاساییەکانەوە توانای هێرش کردنە سەریان لەئارادانییە، بەشداری ئەوشەڕە بکەن. کایە پەردەپۆش کراوەکانی ڕێکخراوە جاسوسییەکانی خۆرئاوا لەئالۆگۆڕەکانی جیهاندا- لەناویاندا ئەفغانستان- لەبابەتە سەرنجڕاکێشەکانی ئەم نووسراوەیە.
بەشێکی تری ئەم کتێبە تایبەتە بەوسەردەمەی (ئیمام خومەینی) لەپاریس بوەو، فڕوفێڵەکانی دەزگا جاسوسیەکانی خۆرئاوا لەڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ شۆڕشی ئیسلامیدا.
ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە بۆخوێنەران گرنگە کە وەرگێڕانی ئەم کتێبە مانای پشتگیری کردنی بیرو بۆچوونەکانی نووسەرەکانی نەبوەو نییە؛ بەڵکو بۆ ئێمەی موسڵمان کە لەوڵاتێکی ئیسلامییەوە بەجۆرێکی ڕاستەوخۆ دەرگیری شەڕێکی قورسی خۆرئاواو باکوری پیشەسازین، پێویستە کەدیدی ئەوان بەرامبەر بەباشوورو فێڵو تەڵەکانی کەدژمان بەکار دەهێنرێت، هەرچی زووترە ئاشنا ببین، تابتوانین لەجەنگی ڕانەگەیەندراوی باکووری دژ بەباشووردا سوودی لێوەرگرین.
بەواتایەکی تر، ئامانج لەوەرگێڕانی ئەم کتێبە تەواو ئاشنا تربوونی خوێنەرانە بەبۆچوونی سیاسەتمەدارانی خۆرئاوا سەبارەت بەئالۆگۆڕەکانی ئایندەی جیهان، کەئەمەش خۆی دەتوانێت کۆمەکی خەڵکی وڵاتانی باشوور بێت لەبەرامبەر سیاسەتی زلهێزەکانی جیهاندا.

* * *

(کانت دومارانش) لەپۆستی سەرۆکایەتی ڕێکخراوی جاسوسی فەڕەنسا دابەدرێژایی خولەکانی سەرۆکایەتی کۆماری (پمپیدۆ)و (ژیسکاردستن)دا کاری کردووە.
(دەیڤید ئای ئەندلمن)یش ماوەی بیست ساڵ ڕۆژنامەوانو یەکێك لەسەرۆکەکانی بڵاوکراوەی نیویۆرك تایمز بووەو، وەك هەواڵنێری فەڕەنسا بۆ تۆڕی (C.B.S) کاری کردووە. لەنێو نوسینەکانی تریدا، کارەکانی لەبڵاوکراوەکانی (ئەتلانتیك، هارپەر، نیوگایلیك، فارین ئەفرز)دا شایانی بینینن.(ئەندلمن) کتێبێکی تریشی بەناوی (ئاشتیخوازان) بەچاپ گەیاندووە.

## بەرایی کاری نهێنی

من لەگەڵ (ڕونالد ریگان)، بەماوەیەك پاش هەڵبژاردنی بۆسەرکۆماری و تەنانەت پێش بەدەستەوەگرتنی جڵەوی کاروبار، لەکۆتایی ساڵی(١٩٨٠) لە کالیفۆرنیا- لەوشوێنەی تیایدا خۆی بۆوەرگرتنی پۆستی سەرکۆماری ئامادەدەکرد- یەکترمان بینی. لەبەرئەوەی تەنها ئەمریکیەکان دەتوانن زیادەڕۆیی بکەن، چەندین دۆستو ڕاوێژکار بەسەرکۆماری هەڵبژێردراویان وتبوو کەئەگەر تاکەکەسێکی ئەوروپایی پێویست بکات بیبینیت پێش ئەوەی دەستەڵات بەدەستەوە بگریت تەنها (کانت دومارانش)ە. من لەوسەردەمەدا بەکۆتایی زیاتر لەدەساڵی خزمەتکردن لەپۆستی سەرۆکایەتی دەزگای جاسوسی فەرەنسا دەگەیشتم، کە بەبەراوورد لەگەڵ هەموو سەرۆکەکانی تری ئەودەزگایەی فەرەنسا درێژترین خولی سەرۆکایەتی بوو لەمێژووی ئەو وڵاتەدا. سەرەڕای ئەوەش، ئەودەمە جیهان چارەنووسی خۆی هەڵدەسەنگاندو، ئەوکەسانەشی کەئەو چارەنووسەیان دەسازاند لەئەرکێکی گراندابوون، منیش لەئەوپەڕی سەرقاڵی هزری ژیانمدا بووم.

سەرکۆماری هەڵبژێردراو چەند نیگەرانییەکی سەرەکیو هەنووکەیی هەبوو: هزری ئاوێزانی دوو ڕووداوی قەیراناوی بوو، کەبەماوەی مانگێك زیاتر لەئاهەنگی دەستپێکردنی خولی سەرۆکایەتی سایەیان خستبوو. یەکەم، ئازادکردنی بارمتە ئەمریکیەکان لەئێران و، دووەم هێرشی سۆڤیەت بۆ سەرئەفغانستان بوو. ئەو تەنها نوقمی نیگەرانی سەرەکی خۆی لەبارەی بارمتەگیراوە بێچارەسەرو گرانەکەبوو. ئنجا سەرهەڵدانی ئەو مەترسییەی لەلایەن ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتیەوە هاتبوە ئاراوە. هەرچەندە ئەم بابەتانە تەنها پێشبینی کاڵی بەدواییەکدا هاتنی ڕووداوەکان بوو کەتائەودەمە لەئارادابوون، بەڵام ئێستانە ئەوو نەڕاوێژکارەکانی هیچ دوودڵییەکیان

دەربارەی نەمابوو. (ڕیگان)و کەسانێکی کەلەلایەن خودی ئەوەوە وەك ڕاوێژکارانی سەرەکی ئەمنی قەومی هەڵبژێرابوون، لەوشوێنەداو لەمەیدانەکانی دواین جەنگی سێیەمی جیهانیدا -یان بەمانایەکی تر هەمان جەنگی سارد- ڕۆڵیان هەبوو. ئەوانە نازناوی(سەربازانی سارد)یان لێنرابوو. لەزۆر ناوەندی ویلایەتەیەکگرتووەکانو دەرەوەشیدا ئەم نازناوەیان پێدەبڕاو دووپاتدەکرایەوە. بەلاّم ئەوجەنگە ساردەی کەئەوان لەمەیدانەکەیدا شەڕیان دەکرد، وەکو تێوەگلانی هەمووجیهان لەجەنگی دووەمی جیهانی- کەمن تیایدا بۆ یەکەمین جار پیشەی جەنگ، جاسوسی و دیبلۆماسیەت فێربووم- هەموو پرسی گۆشەو کەنارەکانی جیهانی لەخۆدەگرت؛ یان وەك جەنگی یەکەمی جیهانی کەتیایدا یاریدەدەرەکەی جەنەڕاڵ(پرشینگ)کەباوکی من بوو، ناوبانگی پەیداکرد. لەوجێگایەدا،سەرکۆماری هەڵبژێردراو هەوڵی دەدا دەربارەی لایەنگرانو نەیارەکانی خۆیو ئەوجۆرە دەرگیرییانەی کەلەدونیادا سەرقالّی ململانێی کردبوون، باشترین ئەزموونێکی کەلەتواناداا بێت بەدەستبهێنێت. تەنانەت بیری لەوجەنگە جیهانیەی دوایی نەکردبۆوە، کەلەدواساڵەکانی سەرۆکایەتیەکەیدا یەکپارچە سێبەری خستبوو (جەنگی باکور- باشور، یان جەنگی چوارەمی جیهانی.)لەوانەیە لەداهاتوودا ئەوەبسەلمێت کە ئەو جەنگانە کاولکاریترین جۆری جەنگن.

چاوپێکەوتنەکەمان لەلۆس ئەنجلس، لەخانووە گەورەکەی (ئالّفرد بلۆمینگ دیل)، کەیەکێك بوو لەکۆنترینو نزیکترین هاوڕێکانی (ڕیگان)،بەئەنجام گەیاند. بەهەرحاڵ، خانەخوێکەمان بەشداری نەکردین، ئێمە لەسەرکورسی ڕەحەتو فراوان لەژوورێکی گەورەدا دانیشتین. تەنها منو سەرکۆماری هەڵبژێردراو بووینو بۆماوەیەك- کەلەماوەی زیاتر لەسێ سەعاتی گفتوگۆکان درێژەی کێشا-گفتوگۆمان کرد. هاوڕێی دێرینم (ئارنۆڵد) کەبۆڕێکخستنی یەکەمین دیدارم لەگەڵ (ڕیگان) زۆر هاوکاری کردبوو، لەوێبوو. کاتێ ئێمە بەیەکتری ناسێنراین، سەرکۆماری هەڵبژێردراو بەزەردەخەنەیەکەوە دەستی گوشیم. بەڕێز (ڕیگان) پێی وتم: (ئای..کەسێك

لێرەیە کەپێشبینی کرد ڕووسەکان لەڕۆژو سەعاتی گونجاودا دەچنە ئەفغانستانەوە.)

(ئارنۆڵد) کاتێك لە (دیسەمبەری ١٩٧٩)و لەسەروبەندی هێرشی ڕوسیا بۆسەر ئەفغانستان بەپاریسدارەتدەبوو، سەرپەرشتیاری پەیامنێرانی دەرەوەی گۆڤاری(نیوزویك)بوو. کارەکانی ڕاپۆرتە هەواڵێکی تەواوکردبوو پێش ئەوەی بچێتەسەر هەواڵێکی تر، سەردانی منی کرد. بەهەمان شێوەی کەمنیش سەردانم دەکرد. پاش ئەوەی نانی نیوەڕۆمان خوارد، تەنها بۆ کات بەسەربردن پرسیاری لێمکرد کەپێموایە دەبێ ئەو پاش ئێرە بۆکوێ بچێت؟ من وتم: (پێموایە ئەفغانستان سەرنجراکێش بێت.) ئێمە زانیاری وردوتەواومان لەبەردەستدابوو کەئەگەری ئەوەهەیە ڕوسیا هەلومەرجی وڵاتی ئەفغانستان بوروژێنێ.

(ئارنۆڵد) بەبێئەوەی من ئاگاداربکاتەوە بۆ هوتێلەکەی لە (لان کاستەر) دروست لەدەرەوەی (شانزەلیزە) گەڕایەوە. جانتاکەی داخستبوو، بەمەبەستی کابولْ کەوتبووەڕێ. پاش سێ ڕۆژ لەکاتێکی درەنگ وەختی شەودا، بەشەکەتی پاش سەفەرێکی تاقەت پڕوکێن بەدەوری نیوەی دنیادا، گەیشتبووەجێ. بەیانی ڕۆژی دوایی بەدەنگی نیشتنەوەی فڕۆکەکانی سوپای سووری سۆڤیەت لەفڕۆکەخانەی کابولْ لەخەو ڕاببوو. ئەو تاکەڕۆژنامەنووسی نێودەوڵەتی بوو کەگەواهی دەستدرێژی ڕاستەوخۆی سۆڤیەت بوو، ئەوەش بوە هۆی ئەوەی هەرگیز هۆیەکانی ئەودەستدرێژییە فەرامۆش نەکەم.

*          *          *

پاش ئەنجامدانی یەکتر ناسینەکەمان، سەیرنەبوو کەتەوەری یەکەمی گفتوگۆکانمان سەرەتا بەلای ئەفغانستاندا بسوڕێت. هەر لەسەرەتاوە ئاشکرابوو کەسەرکۆمار کاتێك بەبیری قولْو تیژەوە چووەسەر مەسەلەکە هیچ زانیارییەکی ڕیشەیی دەربارەی نەیارەکانیو هیچ تێزێکی دروستیشی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەیان نەبوو. من لەگەلْ خۆمدا لەپاریسەوە هەشت نەخشەی

گەورەی جیهانم هێنابوو، کەهەموویانم لەسەرمێزی ژووری دانیشتنەکە بڵاوکردبۆوە. ئێمە پاش سێ سەعات دوای ئەوە بەرەو گەشتێك بەدەوری جیهاندا کێشکراین. دەربارەی بەهێزیو لاوازی دوو بلۆکی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا، باکورو باشور گفتوگۆمان کرد. من ئەوەم بەیادهێنایەوە کە بۆ دروستکردنی کارخانەی چەکی زلهێزێك هەشت مادەی میتالی ستراتیژی پێویستە، کەئەمریکیەکان لەناو سنوورەکانی خۆیاندا تەنها چواردانەیان هەیە، لەکاتێکداڕوسەکان هەرهەشتیان لەبەردەستدایە. ئێمە کەمێك سەبارەت بە فشارەکانی سەرکۆمەڵگاو مەزهەب، سیاسەتەکانو دەسەڵات گفتوگۆمان کرد. لەکۆتایی دانیشتنەکەدا، سەرکۆمارپرسی؛ئایا دەتوانێت نەخشەکانی من بردبووم لەلای خۆی بهێڵێتەوە؟ منیش ڕازی بووم.

دانیشتنەکەی کالیفۆرنیا، یەکەم دانیشتنی کۆمەڵی بوو کەمن لەماوەی ساڵەکانی سەرۆکایەتی ئەودا لەگەڵی ئەنجامم دا. بەڵام نەمرترینیان چاوپێکەوتنی دووەممان بوو، کەهەرپاش ماوەیەك لەئەستۆگرتنی جڵەوی کاروباری وڵات لەلایەن ئەوەوە بەئەنجام گەیەنرا. ئەوکاتەی کەئێمە لەئۆفیسی (ئوراڵ) یەکترمان بینی بابەتی ئەفغانستان بووبووە گەورەترین سەرقاڵیە هزرییەکانی سەردەم.

من پاش کەمێك یەکترناسینی سەرەتاییو قسەی خۆش، دەستم بەقسەکرد: (بەڕێزسەرکۆمار، بۆڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەمجۆرە جەنگە چەندین ڕێگا هەیە، لەنێوان ڕێگا لەژمارە نەهاتووەکاندا یەکێکیان عاقڵانەیە. لەبەرئەوەی ئێمە ناتوانین ملیۆنێك سەرباز ڕەوانەی ئەفغانستان بکەین، لەحاڵەتێکدا کەمومکین بێت دەسبکەین بەوەی من بەچالاکی (مۆسکیتۆ) ناوی دەبەم.)

—ئەو پرسی بۆچی (مۆسکیتۆ)؟

—چونکە مێشوولەیەکی مەلاریا ناتوانێت ورچێك بکوژێت، بەڵام دەتوانێت ئەوەندە ئازاری بدات نەتوانێت بخەوێت، نەتوانێت هیچ بخواتو بەهۆی گیزەگیزەوە گێژببێت. هەتا ئێستا کەس نەیدیوە ورچێك مێشوولەیەکی

مەلاریا بکوژێت، بۆیە مێشوولەی مەلاریا دەتوانێت دوژمنێکی مەترسیدار بێت. ئێستا ئەوەی کەمن دەمەوێت بیلێم ئەمەیە کەئێمە دەتوانین لەو شێوە وێناکردن و نواندنە سوود وەرگرین‌و لەوانەیە بتوانین لەئەفغانستان کارێک ئەنجام بدەین.)

ئەو خێرا گەڕایەوەو وتی: (باشە ئەو کارەعاقڵانەیەی کەدەشێت ئەنجام بدرێت چییە؟)

لەوکاتەدا ئێمە پێویستمان بەهیچ کام لەونەخشانە نەبوو کەلەگفتوگۆی یەکەمجارماندا لەکالیفۆرنیا لەگەڵ خۆم بردبووم، ئێمە سەبارەت بەزەمینە فکریەکانی خەبات گفتوگۆمان دەکرد. من درێژەم پێدا: (کارمەندەکانم لێکۆڵینەوەیەکیان دەربارەی هێزەکانی دوژمنەکانمان ئامادەکردووە. ڕوسەکان بنکەیەکی سەربازییان لەخاڵێکی نامۆدێرن‌و تەختانیدا هەیە. بەپێی ئەمە پێویستە ئێمە بەجۆرێکی ڕێکخراو هێرش بکەینە سەریان. بۆنمونە، من لەپاریس گروپێك دەناسم کەخەڵکی گەنجن و بەهەر هۆیەکەوە بێت باری داراییان لاوازە. ئەوانە بەدەستنووس‌و بەپێی قاڵبی (سیریلیك- جۆرێك قاڵبە بەزمانی سلاڤی) ئنجیلی ڕوسی چاپدەکەن. ئەوانە هونەرمەندی بچوکن، ئەوانە بەپێی پێوانەکانی جەنگێکی بچوك دەزانن سەرقاڵی چین. ئەوانە لەنێو سەربازەکانی سوپای سووری کە لەئەفغانستان جێگیرن، بازاڕێکی ڕەشی بچوك بۆئنجیل پەیدا دەکەن. تێبینی بکەبە پێوانەی گەورە، لەوێدا چ شەپۆلێکی گەورەو بلند لەنێوسوپای سۆڤیەتیدا دەجولێت. پێویستە ئێمە ئنجیلی ڕوسی بۆسوپای سۆڤیەتی جێگیر لەئەفغانستان بنێرین. پێویستە بازاڕەکانی کابوڵ پڕبکەین. سەرباری ئەوە، سەربازەکانیش لەلای خۆیانەوە بەقاچاغ دەیبەنەوە بۆ نیشتمانەکەیان. تۆ ناتوانیت بەهۆی تانك‌و فڕۆکەوە دژبە بڕوای گەل بجەنگیت. لەم کارە هۆشمەندانەیەدا شتێکی کەمن ناوم ناوە ( بلیمەتی چالاك) پێویستە تۆ بەرامبەر بەهەرباوەڕێك بەباوەڕێکی تر بجەنگیت، قسە بەرامبەر بەقسەو هەندێجاریش درۆ بەرامبەر بەدرۆ. لێگەڕێ فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی لەگەڵ فڕۆکەکاندا بجەنگن؛

هێزەکانی پیادە لەگەڵ تاکەکانی سوپای زەمینیو هەروەها هێزی دەریایی کەشتی بەکەشتی بجەنگن.) درێژەم پێدا: (ئێمە بڕوامان بەجاسوسی هەیە. بۆیە پێویستە سوود لەهزر وەربگرین.)

سەرکۆمار دەخەنیەوەو پێیدادەگرت ئەم بابەتە چاپ بکەم. منیش بەردەوامبووم: (دووەمین بەشی پێشنیازەکەشم سادەیە. ئێمە گروپێك لاوی ڕۆژنامەنووسمان لەپاریس هەیە، کەهەمان دەقی کۆپیکراوی ڕۆژنامەی سوپای سۆڤیەتی، واتە (کراسنایازودا) واتە (ئەستێرەی سوور) بڵاودەکەنەوە. واتە هەمان ڕوژنامە، بەهەمان فۆرمو شێوازی تایپکراوەوە؛ بەلام تەواو شێوێنراو و تێکدەرانە. ئەو ڕۆژنامەیە هەمان پانتایی (ئەستێرەی سووری) هەیە، بەلام ئەونییە. وتارەکانی باس لەسوپای سوور، نشوستیەکانیان لەئەفغانستانو هەر شوێنێکی دی لەجیهاندا دەکات. پێویستە ئەم ڕۆژنامەیە بگۆڕێت بە(ئاکسیزسالی) یان (ڕۆژی تۆکیۆ) لەجەنگی ئەفغانستان. پێویستە ئێمە چاپی بکەینو لەناوسەربازە ڕوسەکاندا بلاوی بکەینەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، تۆ دەتوانیت لەگەڵ بردنە ناوەوەی ئەم ئنجیلو ڕۆژنامانە بەقاچاغ بەنرخی لەسەدا سێ هەزار لەبەهای چاپکردنی بیفرۆشیت. بەمپێیە، ئەم کارە دەستکەوتی مادیشی دەبێت. کۆمەك بەتێکدانی ڕێکخستنو ڕێسا ئەخلاقیەکانی سوپای سۆڤیەت دەکات.

لەوکاتەدا سەرکۆمار پێدەکەنیو شەیدای باسەکە ببوو، من وتم: (بەڕێز سەرکۆمار، فاکتەری سێیەم لەوانەیە لەهەموویان ترسناکتر بێت. لەڕاستیدا ئێوەچی لەوهەموو ماددە بێهۆشکەرە دەکەن کە لەلایەن کۆمیتەکانی بەرگری ئاسایش، پاسەوانی کەنارەکان، (FBI)و خزمەتگوزارەکانی گومرگەوە دەستی بەسەردا دەگیرێت؟)

سەرۆك کۆمار وەلامی دایەوە: (باش نازانم، وابزانم ئەوانە لەناودەبرێن)

من وتم: (کارێکی هەڵەیە،پێویستە ئێمە ئەومادانە بەخۆڕایی بڵاوبکەینەوە)

ئەو بەدەنگێکی لەسەرخۆ وتی: (ئاه..خوای من..ئۆف...)

چونکە بینیم سەراسیمەبوو، درێژەم پێدا: (لەڕاستیدا ئەمە هەمان کارە کەدانیشتوانی ڤیێتنامی سەروو لەگەڵ سەربازە خۆبەخشەکانی ئێوە لەڤیێتنام کردیان. ئەوان ئەم کارەیان بەپێی بەرنامەیەك بەجێگەیاندبوو. ئەگەرئەم هەنگاوە سەربگرێت ئێوە دەوڵەتی سۆڤیەتی لەکاردەخەن. لەبەرامبەر دەستکێشانەوەی سەربازەکان لەجەنگو گەڕانەوەیان بۆڕوسیا، بۆ بەرگریکردن لەودارمانە ئەخلاقیو ڕۆحییە فشارێکی زۆر دەکەوێتە سەرڕوسیا.) ئنجا وتم: (ئەمەیە شیکردنەوەی چالاکی مێشولەی مەلاریا.)

ئەمە تێزێکی زیرەکانەیەو شتێکە کەبۆ ئەنجامدان پێشنیاز کراوە. شەڕێك بەبێئەوەی تەنانەت لەڕووی تووڕەیشەوە تاکە گوللەیەکی تێدا بتەقێنرێت. ماوەیەك بۆ بینینی کاریگەری قسەکانم بێدەنگ بوومو پاشان درێژەم پێدا: (لەسەرو ئەوانە شەوە، هەموو چالاکیەکە دەتوانرێت بەبڕی یەك ملیۆن دۆلار زیاترنا، بەچەند کەسێکی وەفادار سازبکرێت. تەنهایەك ملیۆن دۆلار. چونکە گەرزیاتربێت پێشنیازەکە کاریگەری نابێت. ئێستا ئەوەی کەپێویستە لەم چالاکیەدا ئەنجامی بدەیت، دەیزانیت. ناچاریت مێشکێکت هەبێت کەڕەنگە بکەوێتە بەر نەفرەتی خودا، وەك ئەوەی چۆن لیمۆیەك بیخەیتە ژێر فشارەوە.

ئەو وتی: (کارێکی سەختە، تائێستا کەس شتێکی لەم بابەتەی پێنەوتووم.) دەستی بۆ تەلەفونی ئاسایش درێژکردو زەنگی بۆ (ولیام کەیسی) لەسەنتەری ئاژانسی جاسوسی (CIA) لێدا.

(کەیسی) لەوکاتەدا بەرپرسیارێتی سەنتەری دەزگای لەئەستۆبوو، بەڵام ئەو زیاتر لەبەڕێوە بەرێك بەرپرسیارێتی هەبوو. هاوڕێیەکی نزیك بووکە(ریگان) بەتەواوی پشتی پێدەبەست. لەکاتی بابەتە هەستیارو ئاڵۆزەکان وپڕۆژە مەترسیدارەکانی کەهەڵچوونو داچوونی گەورەیان تێدابوو ڕاوێژی پێدەکرد.

(ڕیگان) سەبارەت بەوەی ئێمە باسمان لێوەکرد بوو ڕوونکردنەوەیەکی کورتی بە (کەیسی) داو پێیوت کەناچارە چاوی پێی بکەوێت. پاش دووڕۆژ

سەردانی (کەیسی)م کردو نەخشەکانی (چالاکی مێشولەی مەلاریا)م بۆ دووپاتکردەوە. ئەو عاشقی ببوو. لەسەرکورسیەکەی هەستابوو لەهەوادا باڵەکانی کردبۆوەو وتی: (ورچێك، مرۆڤێك )

من وتم: (ڕێگابدە ئەم کارە مەیسەربکەین)، درێژەم پێدا (بێلْ، دەربارەی ئەم داواکارییە لێمببورەو بەجنێوێکی پیسەوە وتم: (بزانە گەر ئەم کارە سەربگرێت بەباشی تەمێدەبن، تۆ بۆ بەئەنجامگەیاندنی کارێکی وا پێنج هەزارکەس دەخەیتە بەرکار، لە کاتێکدا تەنها پێنج کەس پێویستە.)

بۆماوەی دەقیقەیەك بێدەنگ بوو، پاشان بەئارامی پرسی (ئەلیکس، دەتوانیت تۆ ئەم کارەئەنجام بدەیت؟)

من وتم (بەڵێ، بەڵام نابێت هیچ ئەمریکیەك بەشداربێت، ئەو ئەمریکیانە دەتوانن لەدووری میلێکەوە بڕوانن. سەرەڕای ئەوەش، بەپێی بیروڕای (CIA) چەند گرفتێکم لەگەڵیاندا هەیە. ئەوان ناتوانن مەسەلەیەك بەشاراوەیی بهێڵنەوە. لەماوەی کارکردنی یازدە ساڵیم لەناوڕێکخرای جاسوسی فەڕەنسادا، تۆ شەشەمین سەرۆکی (CIA)یت کە لەگەڵیدا سەروکارم هەبێت.

درێژەم پێدا (زۆربەی کاتەکان سەرۆکی لۆکاڵی (CIA) لەپاریس بەمن دەڵێت: بەیارمەتیت ڕستەکەت تەواومەکە، تەنها ئەو شتەی کەمن دەیزانمو بڕیارە تۆ دەربارەی زانیاریم بدەیتیْ باسیبکە، ئیتر هیچیتر گرنتی ئەوەی نییە بەنهێنی بمێنێتەوە.)

(کەیسی) کەبریکارو خاوەن پیشەیەکی سیاسی بوو، چونکە لەجەنگی دووەمی جیهانیدا لەخزمەتکردن لەئۆفیسی خزمەتگوزاری تایبەتدا هیچ ئەزموونێکی جاسوسیانەی سەرەکی نەبوو، بەئاشکرا تووشی شۆك بوو، وتی(ئەی چ خەوشێکی تێدایە؟)

من وەڵامم دایەوە: (سەیرکە، لەسەدا هەشتا یان نەوەدی ئەو چالاکیانەی ئێوە بەنهێنی ئەنجامی دەدەن بەئاشکرائە نجامی بدەن ولەسەدا دەکەیدی کە بەئاشکرا ئەنجامی دەدەن بابەڕاستی نهێنی بێت.) بەڵام چالاکی (مۆسکیتۆ) جیاوازبوو. ئەگەرئەوە لەکۆنگرێسدا بخرایەتە ژێر پرسیارەوە،

لەڕونکردنەوەو وڵامدانەوەدا تووشی دەردەسەری جدی دەبوو. بۆیە (کەیسی) نائومێدانە ویستی بیخاتە بواری پراکتیکەوە.
پاشان پرسی: (ئەی چۆن ئەنجامی بدەین؟)
من دووبارەم کردەوە: (پێویستە هیچ ئەمریکیەك لەچالاکیەکەدا نەبێت؛ چونکە ئێوە ناتوانن نهێنی پارێزبن. ئێمە پێویستمان بەپاکستانیەکانە.)
یەکسەر بەفڕۆکە بەرەو پاکستان کەوتمەڕێ، چونکە (بێل کەیسی) تەلەفونی لەگەڵ پاکستانیەکان کردبوو، دانیشتنێکم لەگەڵیان ڕێکخست. پێیانوت: (بابەتەکە زۆر ئاسانە، هەموو ئەوشتانەی کەمن لەئێوەم دەوێت ئەوەیە کەکاتێك ئێمە لەفلانە ڕۆژو سەعات وفیسارە شوێن بووین دەست بەچاوتانەوە بگرن.)
ئێمە نەماندەویست ئەوان تووشی گرفتو ڕووبەڕووبوونەوە بکەین. ئەوان ڕازی بوونو منیش بۆ ماوەیەکی زۆرکورت گەڕامەوە بۆلای (کەیسی) لەواشنتن. دەستم بەقسەکردو وتم: (بێل، ئێمە پێویستمان بەکەمێك پارەهەیە.)
ئەو وتی: (ئێ، ئێمە پارەیەکی زۆرمان هەیە، چۆن بۆدەرەوە بۆت ڕەوانە بکەم؟)
(تاکە ڕێگا ئەوەیە کەئێمە پارەکە بدەینە پاکستانیەکانو ئەوان خۆیان لەڕووی مادییەوە چالاکی (مۆسکیتۆ) بەڕێوە ببەن.)
سەرئەنجام ئامادەبووین. کارگوزارانی ڕاپەڕاندنی خودی پاکستانیو هەندێ جەنگاوەرانی ئازادیخوازی ئەفغانیمان ناسی. ئەوانە لەڕێگای قاچاخچێتی مادده بێهۆشکەرەکان یان پشتگیری سیاسییەوە پلە بەپلە بووبوونە بەرپرسو خاوەن دەستەڵاتی وڵات. لەپاریس، قۆناغی پراکتیکی بۆچالاکیەکە لەگەراجێکی بێسەروبەرە ڕێکخرا، کەبارەگای فەرماندەییەکی نهێنی بوو، تەنها چاوەڕێی سەرمایە بوو. پاش ئەوە، پێشتریش ڕۆژنامەنووسان بەیارمەتی چەندکەسانێك لەلێکۆڵیارانی دەزگای جاسوسی ئێمە لەحاڵەتی لێکۆڵینەوەی بارودۆخی ئەفغانستاندابوون، تائامادەکاری بۆکاریگەرترین پوچەڵکردنەوەی سیاسی لەڕۆژنامەدا سازبکەن. سەرئەنجام،

هەموو شتێك لەجێگای خۆیدا دانرا. لەگەڵ ئەوەشدا من لەزیادبوونی ژمارەیەکی بەرچاوی ئەو ئەمریکیانەی لەچالاکیەکە ئاگادار دەبوون نیگەران دەبووم. بۆگفتوگۆو دوایین ئاگادارکردنەوەو بۆسەردانی (کەیسی) چووم بۆ واشنتن . پێموت: (ئێمە هەموومان ئامادەین، بەڵام من مەرجێکی ترم هەیە.)

ئەو بەسەرنجەوە پرسی : دەبێت ئەو مەرجەچیبێت؟

—ئایا دەتوانیت گرنتی ئەوەم بدەیتێ کە لەکۆتایی کارەکەدا وێنەی من لەیەکەم لاپەڕەی (واشنتن پۆست) یان (نیۆرك تایمز) لەچاپ نادرێت؟

—ئەو بەشێوەیەکی لێبڕاوانە وتی: نەخێر، ناتوانم لەم بارەیە وەگرنتی ئەوەت بدەمێ.

—کەواتە، بێڵ.. ئەوکارە فەرامۆش بکە، من ئەوکارە ئەنجام نادەم.

ئەمە کۆتایی چالاکی (مۆسکیتۆ)بوو. ئەوەی چەند لەسەر زەمینی ئەمریکای ژێر فەرمانڕەوایەتی (ڕۆناڵدڕیگان) بەرەو جەنگی چوارەمی جیهانیی نوێ دەبۆوە، ڕون‌و ئاشکرابوو. هەرگیز جۆرە پانتاییەکی کەئێمە ئامادەی ڕۆشتن بووین بۆی—لەواقیعیشدا بۆی ڕۆشتین— فروانتر لەئارادانییە.

بەبڕوای من، لەبەرئەوەی دەزگاکانی جاسوسی ڕۆژئاوا بەهۆی دابڕانیان بەدرێژایی جەنگی سێیەمی جیهانی‌و خۆپاراستنیان لە دووبارەکردنەوەی چالاکی، ئیفلیج دەبن، ئیتر ئێمە ناتوانین ڕێگرێکی واقیعی بین لەبەردەم خۆئامادەکارییەکانی شەڕی جەنگی چوارەمی جیهانی‌و لەوێدا تووشی شکست دەبین. مەدەنیەتی خۆرئاوا—بەهەمان شێوەی کەدەیبینین— لەڕاستیدا ئابلۆقە دەدرێت.لەماوەی یازدە ساڵی نائاسایدا، من لەهەموو شوێنێك‌و بەتایبەتی لەهەموو کارێکی نهێنیدا، دەستەڵاتی گەورەم بەکار هێناوە.ئەم دەستەڵاتە مردن‌و ژیان نەبووە؛ گەرچی کاتی وا دەهاتە پێش کەمن بڕوای تەواوم بەباوەڕەکانم هەبووەو لەم حاڵەتەشدا لەتەنگانەکانی ژیان‌و مردندا خەباتم کردووەو لەلایەکی دییەوە، لەتوانای تێکدەرانەی ئەتۆمی فڕۆکەکانی نیشمانیشدا نەبووە کەژمارەیەك لەڕابەرە نەتەوەییەکان کەم‌و زۆربە جۆرێکی شاراوە لەخولە کورتەکانیاندا بەکاربهێنن.

من لەکارکردندا توانستی جاسوسیم پێباشترە- توانستی زانینی هەموو شتێك کە لەمەیدانی سەرنجڕاکێشترین بابەتی جیهاندا دەتوانین پێیبگەین، توانستێکی کەبەهۆیەوە بتوانین تێبگەین چۆن ڕووداوەکان بۆ ئیمتیازاتی وڵاتەکانمان‌و هاوپەیمانەکانمان دەگۆڕێن- ئەوانەی لەم مەیدانەدا بوون، لەڕاستیدا هەست دەکەن کەدەستەڵات دەتوانێت چەند بێترس بێت. ئێمەی- ڕابەرانی بەهێزترین دەزگای جاسوسی دنیا- یانەیەکی هەڵبژێردراوو بچوکین‌و لەبەرئەوەی پەیوەستی دۆستانەو شەرافەتمەندانەی دوولایەنەمان بەستووە، کاتێ کارتی ناسنامەکانیشمان بەلاوە دەنێین، دووبارە هەرئەم دەستەڵاتە کۆتایی نایەت. بۆنمونە، ڕێدەکەوێت کەئەندامێکی یانە لەژانێکی دوورو درێژدا بۆ تێگەیشتن لەڕووداوەکان تینووی زانین دەبێت؛ یەکێکیش بەناچاری مانای خۆشحاڵێ لەزانینەوە تێدەگات.

بەپێچەوانەوە، ئێمە دەتوانین سوود لەڕاوێژکاری ئەوکەسانە ببینین کەخاوەنی ئەم توانستەن، واتە(عەقل)ن: عەقڵێکی کەلەناو قەیران‌و ڕووبەڕوو بوونەوە لەژمارە نەهاتووەکاندا لەپێناوی چەسپاندنی ئاسایش‌و باشترکردنی هەلومەرجی جیهانی ئازاددا بەدەستهێنراوە. بەمپێیە، توانستی عەقڵ لەزۆربەی کاتەکانی ژیانمدا بۆ شتێکی تری لەجۆری پەیمانێکی بەهێز- کەبتوانێت جۆرێکی بێدەنگی بێت- گۆڕاوە. بێدەنگییەك بەقوڵی‌و گرنگی سوێندێکی بەخوێن، کەسەرۆك خێڵێك سوێندی پێخواردبێت. جاسوسی‌و توانایەکی کەهاوکارەکانم پراکتیکی دەکەن بۆ پارێزگاریکردن لەخشڵەکانی دەستەڵاتمان لەگەڵ بەرزترین میزانەیەی نهێنی تێکەڵەو ژیان‌و چارەنووسی میللەتانیش بارمتەی ئەوجۆرە توانستەن.

لەئێستادا بەڵگەم بۆشکاندنی بێدەنگی سادەیە. من دەمەوێت هەموو ئەو شتانەی کەپێشتر لەکاتەکانی ژیانمدا لەگەڵ خۆم وبەتەنها وتوومە، بەچاپی بگەیەنم. بەندە لەو بڕوایەدایە کەلەجەنگدایین. ئەم مەبەستە لەوانەیە لەڕووی تازەکردنەوەی پەیوەندییە پێشبینی نەکراوەکانی نێوان خۆرهەڵات‌و خۆرئاوا، دیموکراسیەتی تازەبنیادنراو لەهەندێ وڵاتانی ئەورووپای

خۆرهەڵاتیو ئاشکرایی روانگەی بێمەترسی ئیمپراتۆریەتی ڕوسیای پێشوو سەبارەت بەومەسەلانەی ناویان هات، هەندێك سەیر بێتە بەردیدە. بەڵام دوژمنەکەمان لەسێ چارەکی سەدەی ڕابووردوودا، جێگای خۆی لەگەڵ دووژمنانێکی نوێ گۆڕیوە . دوژمنانێکی زۆرخەتەرناکتر، کەئەگەر ئێمە بمانەوێت ڕووبەڕوویان ببینەوە، دەبێت بیانناسین. جەنگی چوارەمی جیهانی بۆ دیمکراسیەتی خۆرئاوا، بۆ دیمکراسیەتە نوێیەکانی خۆرهەڵاتو تەنانەت بۆخودی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتیش، ماوەیەکە دەستی پێکردووەو دوژمنەکانمانو ئەوانەشی سوود لەبوونی ئەو دوژمنانە دەبینن یان کۆنترۆڵیان دەکەن، هەموویان لەنێوماندان یان لەدەوروبەرمانن. ئەگەر ئەوانە لەهەوڵدانیاندا بۆ سەرکەوتن بەسەرماندا سەرکەوتووبن، یەکەمین قوربانیەکانیان لەوانەیە ئەو ئیسلامیە میانڕەوانەبن کەئێستا دۆستو هاوپەیمانی ئێمەن. ئەم دوژمنانەخاوەنی هەرئەندازەیەکی هەستی مەزهەبی بن، کەسانێکن کەبونیادەکانی دیمۆکراسیەتی ئێمە لاوازدەکەن. ئەوانە وەك خێو لەجیهانی سێیەم کەبێبەشە لە دەستکەوتی کۆمەڵایەتیو فەرهەنگی، مناجات دەکەنو دژ بەشارستانیەتی ئێمە چەکداریان دەکەن.

قاچاخچیانی مادەسڕکەرەکان کەهێواش هێواش دزەیان کردۆتە شارەکانمانەوەو لەژێر ڕوپۆشی بەرهەمهێنانی بەزۆری دەرمان، بەهەموو جیهاندا هەلدێنو ئەوشتەی کەوێرانکەرە بەکەسانێکی کەزۆر گەنجو بیگوناهن یان ئەوەندەگێلن کەنازانن لەسەرلێواری لەناودانی ئایندەیانن و، بەدڵنیاییەوە ستونی پێنجەمی کۆمەڵگاکەمانن، دەفرۆشن.

جیهانی ئەمڕۆ لەگەڵ جیهانێکی کەمن پێشتر ژیانم تیایدا گوزەراندووە، هەندێك جیاوازە. قاڵبی کەسایەتیەکان ئاڵوگۆڕی بەسەرداهاتووە.لەم جیهانە نوێیەدا پێویستە ئێمە فێری جۆرێکی نوێی شەڕ لەجۆرەکانی جەنگ ببین؛ جەنگێك کەچالاکیەکانی وەکو (مۆسکیتۆ) بنەمای شەڕە. ئەمە جەنگێکە کەتیایدا، جاسوسیو توانای داهێنان زیاد لەهەموو شتێك گرنگی هەیە. جەنگێك کەتیایدا دڵنیابوونی پێش هەڕەشەکردن گرنگەو لەوجەنگەدا،

مانەوەمان بەندە بە بەکارهێنانی خێراو زرنگانەی توانای سەربازی تایبەت، کەلەلایەن وڵاتە پێشکەوتووەکانەوە بەکاردەهێنرێت.

ئێمە لەساتێکی قەیراناوی مێژوودا دەژین، ساتێکی کەپەیمانەکان شکاون و بەرەو کێشمەکێشەکانی جەنگی چوارەمی جیهانیی وجەنگی باکورو باشور دەڕوات.

لەوکاتەدا کەئێمە پێویستمان بەکۆنترۆڵکردنی بنەڕەتیترین چەمکەکانی جاسوسیی و بەرگریکردن هەیە، هەموو پێداویستیە سەرەتایەکانی جەنگی سێیەمی جیهانیی یان جەنگی سارد، هزرو ستراتیژی ڕێنمایی کردووە. لەواقیعدا ئێمە دەستپێشخەریمان لەکارێکدا کردووە کەلەوانەیە وێرانکەرترین جەنگی ناو جەنگە تۆمارکراوەکان بێت. جەنگێك کەتەنانەت دوورتر لەپەیمانی خۆلادان لە جەنگی ئەتۆمی کەلەجەنگی سێیەمی جیهانیدا پیادەکرا، هەمان پێشبینی کۆتایی شارستانی -بەلایەنی کەمەوە شارستانی خۆرئاوایی- ئەنجامەکەی بێت. هەمیشە لەمیانەی ئەو جەنگانەی کەچەکە ئەتۆمی، کیمیایی، میکرۆبیەکانی تێدا بەکارهاتووە، ئەگەری نابوتبوونی ژیانی مرۆڤایەتی و تەنانەت سەرەتایترین شێوەکانی لەئارادا بووە. جەنگی چوارەمی جیهانیی دەتوانێت شەڕێکی هێندە تۆقێنەرانە بێت کەوردەکاری تاکتیکی و بەکارهێنانی چەکە ترسناکەکانی، هەرگیز پێشتر لەکێشمەکێشەکاندا بەدینەکرابێت. زیاتر چەکەکانی ئەم شەڕە لەهەمان جۆرەکانی پێشوترییەوە داکەوتوون و، ئاڵوگۆڕی زۆریان بەسەردا هاتووە، بەڵام لەژێر کۆنترۆڵ و چاوەدێری کەسانێکدایە کەفرمانی بەڕێوەبردنیان لەدەستدایەو پەیوەست نین بەهیچ کام لەشارستانیەکانی کە ئێمە شارەزایانین و تێیدەگەین.

لەجەنگە جیهانیەکانی یەکەم و دووەمدا، دوژمنانی سەرەکی ئێمەی ئەوروپایی، لەنێوان خۆماندا بوون. ئەوروپیەکانی وەك هیتلەرو مۆسۆلینی کەڕەنگە ئامانجەکانیان شتێکی دەروونی بووبێت، بەڵام پێکهاتەی بیریان لەڕیشەدا خۆرئاوایی و باکوری بووە. ئەندێشەکانیان و دوژمنایەتییان

بیرکردنەوە بوو لەدەستەڵاتو بەدەستهێنانی قەڵەمڕەوی زۆرتر بووە.
جەنگی سێیەمی جیهانیی یان هەمان جەنگی سارد، گێرمەو کێشەی نێوان خۆرهەڵاتو خۆرئاوابوو. ئەم شەڕە، شەڕی نێوان سیستمە سیاسیە نەیارەکان بوو؛ کەلەیەك ئۆردوگادا، ئازادی لەئارادا بوووە لەوی دیدا کۆیلایەتی ئەخلاقی، جەستەیی‌و هزری. نەیارەکانمان وەك کاردینالی نوێی مەزهەبی‌و بەبێ خودا خۆیان دەنواند، وەك ئەو چوارچێوەیەی کەکۆمۆنیزم بۆخۆی دایڕشتبوو. سەرانی هەردوو باڵەکە، هەروەك جێنیشینەکانی پێش خۆیان، لەڕووی فکرییەوە پیاوان‌و ژنانی باکوری‌و تەنانەت ئەوروپایی بوون. ئامانجەکانم لەدرێژایی زیاتری خولەکانی بەرەنگاربوونەوەم ناسینی دوژمنان‌و باشترین شێوەی ڕووبەڕوو بوونەوەیان لەجەنگی سێیەمی جیهاندا بوو.
لەوانەیەلەم دیدەوە هەموو هەوڵەکانم لەشەڕی دوژمنەکەی سەرەوە- ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی- تەنها بەهای زیندە بەچاڵکردنی لەزبڵدانی مێژوودا هەبێت. زاراوەی(ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەت)ی وەهمووئەوگەورەییانەی بەدوایدا دەخوێندرێت، حەقیقەتێکە کەمومکینە ڕۆژێك تەنها یادەوەری بێت. بەڵام پیشەی جاسوسی- کەمەبەستی ناسینی قوڵی دوژمنە- لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ دوژمنانی نوێ لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا (واتە جەنگی باکور- باشور) بەئەندازەی ڕووبەڕوو بوونەوەکان لەگەڵ لایەنە نەیارەکانی جەنگی سێیەمی جیهانیی (واتە جەنگی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا) مایەی ژیان دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ناسینی دۆستو هاوپەیمانەکانمان بەئەندازەی ناسینی دووژمنەکانمان سوود بەخشە. بەتایبەتی کاتێك کەدۆستێکمان یان بەلایەنی کەمەوە لایەنگرێکی ڕاستەقینەمان کەتا ئەم دواییانە دوژمنێکی سەرسەختمان بووبێت: وەك ئەڵمانیا یان ژاپۆن لەپاش جەنگی دووەمی جیهانی. ئەگەر ئێمە ئەم وانانە لەمێژووەوە فێربووبین، لەکاتی بزاوتن لەمەیدانی وێرانکەرترین جەنگی چوارەمی جیهانی، بۆگۆڕینی ئەوشتەی ڕۆژێك ئیمپراتۆریەتی توندوتۆڵی ڕوسیا بوو لەنێوان تۆڕی دۆستان‌و هاوپەیمانەکانماندا شانبەشانمان هەنگاوی دەنا، ڕێگایەکی ئاسانتر

دەبڕین. لێگەڕێ ئومێدەواربین کەئەمە خەونێك نییە. بەدرێژایی ئەوسالانەی کەلەدەزگای جاسوسی فەڕەنسادا لێکۆڵینەوەی فراوانم ئەنجامداوەو، هەندێ لەلێکۆڵینەوەو زانیارییەکانم پەیوەستبوون بەجیهانی ئەورووپای خۆرهەلاتەوە، بەپێی دەستەلاتەکانم خۆم گریمانەم سەبارەت بەو دۆستە نوێیانە ئامادەکردووە. سەرەتا ڕوونبوو کەئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی دواین ڕژێمێکی بەتەواوی ڕاستڕەوە- لەجۆری دواسیستمی ئیستعماری بەشێوە کۆنەکەی کەپێویستبوو ئەورووپیەکان بەتەواوی بیناسن، بەلام نەیانناسی. سۆڤیەت ئیمپراتۆریەتێکی کۆنینەی ناو چەمکی کلاسیك بوو، کەلەهەوڵی ئەوەدابوو سەدوسی یان ژمارەیەکی زیاتری میللەتان‌و خێڵی جیاواز لەژێر فەرمانڕەوایەتی خێڵی باشتری روسی، کەلەڕیشەی ئەورووپیە سپی پێست وبێمەزهەب‌و لەخزمەت کۆمۆنیزمدابوون، کۆبکاتەوە. پێش هەڵوەشاندنەوەی یەکجارەکی سۆڤیەت، دەتوانرا بەئاسانی زەن بکرێت کەئەم ئیمپراتۆریەتە- کەبەشێکە لەکیشوەرێکی فراوان لەزەریای ئارامەوە بۆ چیاکانی ئورالٚ- تەنها لەلایەن ئەورووپیەکانەوە، ئەو ئەورووپیانەی کەزیاتر لەیەك سەدەیە تیایدا دەژین، بەڕێوە دەبرێت. لەوبەری زنجیرە چیاکانی ئۆرالەوە، ناوچەکانی ئاسیایی ڕوسیای سۆڤیەتییەکە تازەریای ئارام درێژبۆتەوە. پانترین تاکەسەرزەوی لەجیهاندایە کەڕێگربووە لەبەردەم فراوانخوازی ولاتانی زەبەلاحی وەك ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکاو کەنەدا. تائەم دواییانەش، ڕوسەکان بەهەستی ئیرەیی‌و لەڕاستیشدا بە بەبێ هیچ دوودڵییەك بەلام بەپشتگیرییەوە هەوڵیان دەدا بۆ خەوی دەستبەسەراگرتنی جیهان کەئێمە تیایدا پێشدەستیمان کرد. خەونەکەی ئەوان خەونێك بوو کەلەلایەن لینین‌و بەهۆی بڕواکانیەوە سەریهەڵداو لەنێوان سیاسەتەکانی جیهاندا خاوەنی هیچ ڕیشەیەکی توندوتۆڵ نەبوو. سیاسەتێکی کەپێویستە میللەتێك بەزەبری هێز فروانی سەرزەمینەکەی یان سەرهەڵدانەکان بۆ جوودابوونەوەو پارچەپارچەبوون بەتەواوی بپارێزێت.

لینین دەڵێت : (ئاژاوە، مامانی مێژووە)

لەڕاستیدا ئەمە بەشێکی ئەوهێزەیە کەئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی گەیاندە کۆتایی خۆی، دوای ئەوە جەنگی سێیەمی جیهانیشی گەیاندە کۆتایی. لێرەوە کەسیستمی سۆڤیەتی لەهەڵوەشاندایە، تەنانەت ئەگەر وەك زلهێزێکیش بمێنێتەوە، بەپێی ئەمە، کەمتر دەبێتە جێگای هەڕەشە بۆ دوژمنە کۆنەکانی. دەوڵەتە کۆمۆنیستیەکانی ئەوروپای خۆرهەلآت یەکەمین دەوڵەت بوون کەلەو ئیمپراتۆریەتە جیابوونەوە. پاش ئەوەچی بوو؟ خودی یەکێتی سۆڤیەت هەڵوەشا.

دەبێ ئەوەش لەیاد بێت کەهەر یەك لەو میللەتە نەتەوە یان زمان جیاوازانە، پاشی خوێنڕێژییەکی ترسناك پێکەوە گرێدرابوون.

گریمانەی دووەم لەلێکۆڵینەوە دەربارەی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی زانینی ئەم بابەتەیە کە ڕوسەکان لەماوەی چەندین دەیەدا سەرکەوتوو بوون، چونکە پشتیان بەواقیعی ڕەووتی ژیان بەستبوو کەنەك تەنها بۆ ئەوان لەباربوو، بەڵکو لەمڕۆدا بۆ ئێمە، نوێیەکان، تەنانەت سەرسەخترین دوژمنەکانیشمان ڕاستە.

ئەوە حەقیقەتە کەداگیرکردنی خاکەکان و دەستبەسەراگرتنی قوتی خەڵکی ئیتر پێویست نییە، بەڵکو زاڵ بوون بەسەر مێشك و ڕۆحدا پێویستە؛ بەمجۆرەو بەپێی ئەمە، خاکەکان خۆبەخۆ دەبنە سەربەئێمە. ئێمە لەخۆرئاوا پێویستە لەوەمەیدانە فکریەدا ڕۆڵ بگێڕین. بۆماوەیەکی درێژ ئێمە هەمووەمان خاوەن ئابڕوبووین. من خۆشم بەهۆی ئادابی مارکیەکەوە (کوئینزبری) جێگای ڕێزلێنان بووم. بەلآم ئەگەر تۆ بەجوتێك دەستکێشەوە بچیتە مەیدانێکی بازی کۆڵەمشتەوەو لەبەرامبەر تا کەسێك بوەستێت کەچەکێکی شاراوەی هەلگرتبێت، کارت تەواوە. لەوانەیە بۆماوەی دەسانیەیەك وەك قارەمان و بەرجەستە دەربکەویت، بەلآم تەنها ڕابووردووە کەتا کەناونیشانی قارەمانیت پێدەبەخشێت. پێویستە دژ بەنەیارەکان لەگۆشەیەکی زۆر دوورەوە، دەست بەچالاکی بکەین. ئەمڕۆ، لەزۆربەی بەرەکان و دژ بەزۆر لەنەیارانمان لەمەیدانی (جەنگێکی مزریدا) سەرقاڵی زۆرانبازین.

پێش ئەوەی بتوانین بیانبەزێنین یان بیانهێنینە ڕیزی خۆمانەوە، پێویستە بیانناسین. بۆ نمونـە، ولیام کەیسـی، ئـەو پـەندەی لـەچالاکی(مۆسکیتۆ)ی وەرگرت، فەرامۆشی نەکرد. ئەو کاریگەری خستنەسەر هزرو دڵـی نـەیارەکان نەك تەنها هێرش بۆسەر ئامێرەکانی بەرگری‌و فیزیکیان درك پێکردبوو. بەڵام گەر کەیسی سەرسەخت وانەی بەوجۆرەش فـێربوویێت، بەدەگمـەن ولەساڵە سەرکەوتووە کەمەکاندا دەیتوانی بەکاری بـهێنێت. مـن خانەنشین کرام کـە (جـۆرج بـوش) بـەدرێژایی مـاوەی پۆسـتی بەڕێوەبەرایـەتی (CIA)ی لەوکۆتاییانەداپـەی بەرەهـەندەکانی ئـەم مەسـەلەیەبرد. بـەڵام هـەتا (مستەرجۆرج بوش)یش لـەناو خـولی مـەیدانی ڕاپـەڕاندندا نـەیتوانی ڕوشـی (CIA) بگۆڕێت. ئاشکرایە کەهەوڵیدا بۆ دۆزینەوەی ئامڕازە کاریگەرییـەکانی جاسوسی کەتوند بەسترابو وبەبیرۆکراسیەتەوە پرسوڕا بەمن بکات، بیرۆکەی بەبەهای هەبوو. بەڵام لەودەمەوەی ئەو بیرۆکانە بەدەسـتهێنرا تـا ئەوکاتـەی خرایە جێبەجێکردنـەوە چـەندین سـاڵ درێـژەی کێشـا. ئێمـەی ئـەوروپی‌و ئـەمریکی کـە لەپـەراوێزی کـەنارەکانی ئـەتلانتیکداین، بـیر لەیاسـایترین مەرجەکانی جەنگ‌و ئاشتی، بەرژەوەندی‌و دیبلۆماسیەت دەکەینەوە. ئێسـتا واپێویستە لەگەڵ ڕابـەرانی سۆڤیەتی‌و کرملـین یـان لەگـەڵ تیرۆریستەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ڕووبەڕوو ببینەوە کەساڵەهای ساڵە مێشکیان بەجۆرێك بیرکردنـەوە پڕکـراوە کەدروسـتکراوی دەسـتی خۆیانـە. لەوانەیـە ئەمـە گەورەترین شکستی ئێمەبێت. پرۆفیشناڵترین جاسـوس کەسێکە کـەبتوانێت خـۆی بخزێنێتـە نـاو جێگـای دووژمنەکانیـەوە، تێبگـات کەئـەوان چـۆن بیردەکەنەوە، چـۆن هەست بـەواقیع دەکـەن‌و لـەچ ڕێگایەکـەوە دەوروژێـن. سـێیەمین گریمانـەم کەلـەماوەی چـەندین سـاڵی خوێندنـەوەی بونیادنـەرانی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی بەدەستم هێنـاوە، ئەمەیـە کەگـەورەترین هێزیـان- کەلەگەڵ هەندێ لەڕژێمەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا دەبنە هاوبەش‌و هەندێ جار بۆ ڕێکخستنیان بـەوجۆرە هاوکارییـان دەکـەن- لەوێدایـە کەئـەوان وەك ئێمـە مامەڵـە لەگـەڵ کـات ناکـەن. ئەوانـە (سـاعەت وکـات) ناناسـن‌و هێـل‌و

سنووردارییەتیان نییە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا هۆکاری دارمانی ئابوورییەکەیانە. گەشەسەندی ئابووری خۆی لەخۆیدا خێراییەکی شێتانەو پێداویستی تایبەتی خۆی هەیە.

بەڵام لەڕوانگەی مێژووییەوە، تێبینیکردنی (کات) زۆرگرنگە. ئێمە لەخۆرئاوا چوارچێوەکانی (کات) مان هەیە کەزۆر لەژێرفشاردا لەیەکترنزیك دەبنەوە. بۆنمونە، بۆماوەی هەفتەو مانگ بەرنامەڕێژیو کاردەکەین نەك بۆماوەی دەیەکان. بەمپێیە، ئەمەش خاڵێکی تری لاوازییە کەپێویستە چاوی پیا بخشێنینەوە.

من لەبەڕێوەبەرایەتی دەزگای جاسوسی فەرەنسادا، لەناومەیدانە جیاوازەکانی جەنگدا، ڕۆڵمان دەگێڕا. لەیەکێك لەوانەدا، لەگۆشەجیاوازەکانی ژووردا و لەبەردەم دیوارەپانەکانی کەنەخشە فراوانەکانی جیهانی پیادا هەڵواسرابوو- گروپە سەرەکیەکانی هێزەسەربازیەکانی ئیمپراتۆریە تەجیاوازەکانی بەئاڵای ڕەنگاوڕەنگ لەسەری دیاری کرابوو- ڕیز دەبووینو ڕۆڵی وڵاتە جیاوازەکانمان دەگێڕا. لەزۆربەی کاتەکاندا، یەکێك لەدوو لایەنە کەڕۆڵی نەیارەکانی روسی دەگێڕا، لەهەنگاوەکانی دواییدا، بەتێبینی کردنی سروشتو ماهیەتی ڕووداوەکان، ڕۆڵەکانمان دابەشدەکرد. تیمێك ڕۆڵی وڵاتانی خۆرهەلاتی ناوەڕاست - ئێران یان عێراقو سوریەو لیبیا- ی پەسند دەکرد.

ئەم کارە جۆرێك لەگێڕانی ڕۆڵ بوو؛ بەڵام بەداخەوە بەدەگمەن واهەڵدەکەوت ڕووداوی مانگو ساڵەکانی دوایی لەوێدا پێشبینی بکرێت. دیارەئێمە پەیمان بەدارمانی بێچەندوچوونی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی بردبوو. سەرەڕای ئەوەش، لە پێشتریشدا، پێشبینی هەڵچوونی کورەیەکی گەورەی ئاگرمان لەخۆرهەلانی ناوەڕاست دەکرد. ڕاڤەکاریەکانمان تاڕادەیەكو بەهەمان پێوەر لەدەرەوەی سنوری (کات)بوو. وامان زەندەکرد کە لەوانەبێت ئەم تەقینەوەو ئاگرە گەورەیە لەسەرەتای سەدەی داهاتوو لەئایندەیەکی دووردا ڕووبدات؛ ئالێرەدایە کەبەهای هاوسەنگی لەگەڵ بەهای

ئارایشتکاری ستراتیژەکانی پەیوەست بەڕووداوو قەیرانە ڕاستەقینەکان- کەلەزەیندا بەرجەستەبووە- نایەنەوە یەك.
لەژوورە جەنگییەکانی هەموو دەزگا جاسوسیەکان لە (لانگلییەوە) لە (ڤێرجینیا) بگرەتامەیدانی (دزرژنیسکی) لەمۆسکۆ، لەوشێوە ڕاڤەکاریانە لەئارادایە کەبەتەواوی لەپێشبینی کردنی ڕووداوەکان بەوجۆرەی کەلەواقیعدا ڕوودەدەن، ناکام بوون. ئێمە لەنێوان ڕووداوێکدابووین کەبۆ نوکی ڕمی جەنگی چوارەمی جیهانی دەگۆڕاو، ئەودەمە هەستمان بەم شتەنەدەکرد. کێشمەکێشێکی کەئێمە پێوەی سەرقاڵ بووین لەڕاستیدا شتێکی ترە. ئەم شەڕە، لەناهەموارترین هەلومەرجدا، شەڕی وڵاتانی باشوورە دژ بەباکوور؛ وڵاتانی هەژارو ڕێکنەخراو، دژ بەوڵاتانی دەوڵەمەندو ڕێکخراو.
بەمزوانە ژمارەی دانیشتوانی وڵاتانی باشور دەگاتە چوار ملیار کەس، کەتەنها یەك ملیاریان لەئەفریقادا دەژین. ئەم دانیشتوانە بەرامبەر بەیەك ملیارد کەسی تەواوی وڵاتانی باکور دەوەستێتەوە. هاوپەیمانی نوێو دوژمنانی نوێمان لەم جەنگی چوارەمی جیهانیەدا چ کەسانێك دەبن؟ بۆسیستمی جاسوسیو ڕاڤەکارییەکانمان درێژترین هەنگاو کامەیە؟ لەئایندەدا، دوورە قاڵبە کەسایەتیەکان لەگێروگازو ڕووداوێکی لاوەکیدا بوونی هەبێت؛ ئەمەش خولگەی سەرەکی مەسەلەکەیە.
دوژمنەکانمان بەپێی توانای خۆگۆڕینی بەردەوامیان، درێژە بەژیانیان دەدەن. ئەوانە لەو شوێنانەی کەگرفتاویە یان نەگونجاوە پێشبینی خەیاڵی دەکێشنو لەخەڵکانی خراپ چیرۆکی باش دەهۆننەوە. هەموو هەوڵدانمان بۆناسینی ئەوانە لەشوێنێکدایە کەسنووری نێوان باکورو باشور کێشراوە. ئەمەش بۆئەوەی بەلایەنی کەمەوە تێبگەین، لەنێوان ئەو وڵاتانەی کەئێمە بەباشور ناوزەدیان دەکەین کام ڕیز لەساتێکی ڕاستەقینەدا بیر لەساتی دوایی دەکاتەوە. هاوپەیمانە کۆنەکانمان، (ناتۆ)، واتەئە ڕوروپای خۆرئاواو کەنەداو هەروەها وڵاتانی تر لەجیهانی فراواندا وەك هێزی گەورەی ئابوری

ژاپۆن لەئارادان. بەڵام لەتەنیشتمانەوەو لەم جەنگی چوارەمی جیهانیەدا، هاوپەیمانانی نوێش دێنەئاراوە کەتازەبەتازە دەستمان بەناسینیان کردووە.

هیوادارم یەکەمینیان ڕوسیابێت؛ دیارە بەبێ کۆلۆنەکانی. ستراتیژی سیاسیمان پێویستە هاوکاری ئازادکردنی ئۆکرانیاو بەدوای ئەویشدا سەربەخۆیی ولاتانی حەوزی بالتیك بێت. بۆئەوەی لەلای سنورەکانی خۆرهەلاتی ئەوروپاوە لەجیاتی ولاتێکی پانوپۆڕی سێسەد ملیون کەسی تەنها ولاتێکی دووسەد ملێون کەسیمان هەبێت.

ئەم ڕوسیا لاوازە، گەرچی بەهیچ جۆرێك دەستەڵات لەدەست نادات، دەتوانێت هاوپەیمانێکی گرنگ بێت. لەماوەی سالانی دوورو درێژی ژیانی جاسوسیمدا، هەموو هەولم بۆناسینی دوژمنەکەمان،ڕوسیا خستەگەڕ. لەیەکەم گفتوگۆم لەگەڵ سەرۆك (ڕیگان)، پێموت: کەساڵەها ئامانجی سەرەکیمان ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی بووە؛ تەنها بۆ ئەوەی کەئەو خالە لاوازانەی دەبنە هۆی لەبەریەکهەلوەشانی بناسین. ئێمە لەسالانی سەربەخۆیی ئابووریدا، بەشێوەیەکی کاریگەرانە ڕێگربووین لەبەردەم جیهانی سێیەمدا. لەهەمان کاتدا بۆ بەدەستهێنانی زانستێکی کە بۆ سەرکەوتن لەجەنگی سێیەمی جیهانیدا پێویستمان پێی بوو، بڕێکی زۆری زانستو هونەرمان کۆدەکردەوەو هەلماندەگرت.

بەندە بەتەواوی لەسەرئەوباوەڕەیە کە بۆ خۆسازدان بۆ بەرگریکردن دژ بەوهێزە نوێیانەی لەبەرامبەرماندا ڕیزیان بەستووە، ئێمە بەتەنیا نابین؛چونکە هێشتا کەمێك سۆز لەنێوان بەهێزترینو سیاسیترینو سوپایترین بەشەکانی ولاتانێکی کەڕۆژێك لەڕۆژان بە یەکێتی سۆڤیەت ناودەبراو هەروەها لەجیهانی باشوریشدا بەرامبەرمان ماوە. ئێران کەلەلایەن مەزهەبی ئیسلامی شیعیەوە ڕابەرایەتی دەکرێت، بەتەواوی دەکەوێتە نزیك زیانبارترین سنورەکانی خوارووی سۆڤیەت. بۆیە ساڵەهایە کرملین هەستی بەم مەترسیيە کردووەو هەولی داوە لەدەستەلاتدارانی ئێران نزیك ببێتەوە.

زانیارییە فراوانەکانمان ئاماژە بەوە دەدەن کەئەوان سەرکەوتنی بەرچاویان بەدەستهێناوە. کرملین لەپێش ئێمەوە لەڕۆحانیەکانی ئێران دەترسێت.

بەپێی ئەمە، هەنگاوی ڕوسەکان هەرچەند بەزەحمەت دەرئەنجامو سەرکەوتنی بەدەستهێناوە بەتەواوی هەوڵدان بووە بۆ ڕاکێشان وڕێکخستنی نزمترین توێژەکانی ناوئێران. ڕابەرانی مەزهەبی شیعە بۆ موسڵمان نشینەکانی خوارووی سۆڤیەت (جاران)-کەگونجاوترین ناوچەکانی ئەو وڵاتەشن- لەشێوەی سەنتەری ڕاگەیاندنی سیاسیو لەکۆتاییداوەك بوومەلەرزەیەکی هەمیشەیی ماونەتەوە. سۆڤیەت ڕایگەیاندووە کەیەکەمین شۆڕشی چەکدارانەی ڕاستەقینە دژ بەحکومەتی ناوەند لەیەکێك لەهەمان ئەو ناوچانەدا- کۆماری ئازەربایجانو ئۆزبەکستان- دەستی پێکردوەو، ئەو ئاژاوەیە بەرهەمی دەمارگیری مەزهەبیو مەحرومبوون بووە. چ ڕابەرانی سۆڤیەتیو چ ڕابەرانی کۆمارەکانی ڕوسیا لەئێمە باشتر دەمارگیری مەزهەبیان ناسیبوو. لە دەرئەنجامدا دەوڵەتی کۆمۆنیستی لەسەربنەمایەکی ئایدیولۆژی بەڕووکەش ئسولگەرایی بیناکرا. کۆمۆنیستەکانی سۆڤیەت لەهەر بڕوایەکی بونیادگەرایانە کەجیاواز بووبێت لەئایدیۆلۆژیەتی خۆیان تۆقیوون.

ئەوان دەستەڵاتیان ناسیبوو، بەڵام لەمەیلەکانی ئیمپریالیستی ترسیان هەبوو. لینین زۆرجار دەیوت: (باشترە بەئاڵایەکی سپییەوە بچیتەناو قەڵاکەوە وەك لەوەی لەدەرەوە بێتو ئاڵایەکی سورت بەدەستەوە بێت). ئەو لەزۆربەی جێگرەوەکانی خۆی باشتر، دیارە تاڕادەیەکیش لەزۆربەی هاوپلەکانیشی لەخۆرهەڵات، بەهای ناسینی نەیارو هاوپەیمانەکانی خۆیو هەروەها بەهای کێشکردنیان بەرەو بەرژەوەندییەکانی خوی دەرك پێکردبوو. زۆرینەی دەوڵەتە ئیسلامیە ئسولیە ڕاستەقینەکان لەگەڵ زۆربەی ئەودەوڵەتانەی کەلایەنگیریان دەکەنو بەپێی خواستەکانیان دەجولێنەوە، هاوئامانجنو لەسەرو ئەوەشەوە، بیرکردنەوەیەکی دێرینەیان هەیە کەبۆ ساڵەکانی ڕابوردوو دەگەڕێتەوە. ئەگەر ئەمانە وەك دوژمنانێکی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم هەلبسەنگێنین، ناتوانین لەخوێندنەوەی ئەوانەدا

سەركەوتن بەدەستبهێنین. پێویستە ئێمە خۆمان بخەینە جێگای ئەورووپییەكانی سەدەكانی یازدەو دوازدە. بەوشێوەیە وابزانم ئەگەری ئەوەهەیە ئەوشتەی لەخۆرهەلاتی ناوەڕاست ڕوودەدات باشتر دەرك پێبكەین. هەلبەتە نابێت ولاتە بچوكەكان، سەربەخۆو تازە پیاكەوتووەكانی كەڕۆژانێك بەشێكی یەكێتی سۆڤیەت بوون، فەرامۆش كرێن. لەم ڕۆژەدا خودی زاراوەی (یەكێتی)، ناوێكی بێناوەڕۆكە. هەرسەرزەمین و ڕێسایەكی كەئەم زاراوەیە لەیەكەم ڕۆژەكانی فەرمانڕەوایەتی لینین و ستالینەوە بیگرە تا جێنشینەكان لەخرۆشۆڤ و برجنیڤ و، جێنشینەكانی ئەمانیش، لەخۆیگرتبوو،لەلایەن (KGB)و (سوپای سوور)ەوە بەهێز دەكرا؛ بەهەمان شێوەی ئێستا كەلەلایەن پارتی كۆمۆنیستی لاوازەوە پشتیوانی لێدەكرێت. لەبەریەكترازاندنی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی، دواین قۆناغی ڕەوتێك بوو كەدەتوانرێت بە (پوكانەوەی كۆلۆنیالیزمی) ناوبرێت. بەهەمان شێوەی فەڕەنساو ئینگلستان ، بەلجیكاو هۆلەندا، ژاپۆن و تەنانەت ئەمەریكا كە لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا، كۆلۆنیەكانی خۆیان لەدەستدا.

ئێستا ئەم شەپۆلی پوكانەوەی ئیستعمارییە گەیشتۆتە ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی. سەرەتا كۆلۆنیەكانی لەئەورووپای خۆرهەلات، واتە پۆلەندا، نەمسا، چیكۆسلۆڤاكیا ،ڕۆمانیاو تەنانەتە جێگای بڕواترین كۆلۆنیەكان، ئەلمانیای خۆرهەلاتی و بولگاریا جیابوونەوە؛ ئێستا كۆلۆنیەكانی ناوخودی سۆڤیەت لەناوەوە، وەك كۆمارەكانی حەوزی بالتیك و كۆمارە ئاسیاییەكان دابەشبوون، كەدوور بینیەكانی (كرملین) بۆ ئایندەیان شتێكی كتوپڕی و جێگای باوەڕنەبوو. دروست وەك ئەوە بوو كە لەپڕێكدا كالیفۆرنیا بڕیاربدات ببێتە ولاتێكی سەربەخۆ.

ئێستا ئێمە ماوینەتەوەو ئابوری ولاتانی ئەروپای خۆرهەلاتی بەنیازی یارمەتی دارایی فراوانەوە، پۆلۆنیا، ڕۆمانیا، بولگاریاو تا ڕادەیەكی كەمتر نەمساو چیكۆسلۆڤاكیا، ئەوپەڕی فشار دەخنە سەر سەرچاوەكانمان و

پێویسته ئێمه کۆمەکیان بکەین. بەتایبەتی ئەگەر ئەوچەمکی کۆمۆنیستیەی پێشتر بەقوڵی باوەڕیان پێی هێنابوو بەلاوەیان نابێت.
ئەو شتەی کەئێمە لێرەدا بەشێوەیکی بەرچاو پێشنیازی دەکەین‌و دەیخەینە بەرلێکۆڵینەوە، فۆرمی نوێی ئەورووپایە. گوتارە دەربارەی واقیعە نوێیەکانی دەستەڵات‌و هێزی بزوێنەری ئەورووپا کەبەقوڵی کاریگەری لەسەر کارو کردەوەی هێزەکان دادەنێت‌و، تواناو خواستی ئەم میللەتانەیە بۆ یەکگرتن لەڕووی بەرژەوەندی هاوبەشەوە. لەم سەدەیەی ئێستادا بۆ جاری سێیەمە، نەخشەی ئەورووپای سەنترالی دەکێشرێتەوە. لەماوەی ئەو ڕۆژانەی کەلەپال جەنەڕال دیگۆل‌و سەرکردەکانی تری هاوپەیمانەکان لەکۆتاییەکانی جەنگی دووەمی جیهانی وەك ئەفسەرێکی پەیوەندی بەسەرم دەبرد، لەنزیکەوە شایەتی دواین کێشانەوەی دووبارەی نەخشەکەبووم. بەڵام ئێستا بەهاوکێشەیەکی نوێی دەستەڵاتەوە دەچینە خولی دوای پەیمانی (یالتا)وە.
بۆ نمونەی ئەورووپای ئەمڕۆ بۆتە کەنارێکی نوێ بۆ ڕاوەستانی ئەڵمانیا. وڵاتێکی کەبۆماوەی نزیکەی نیوسەدە دابەشکرابوو. لەپڕێکدا دووبارە یەکدەگرێتەوە. یەك وڵات‌و حکومەت بەیەك زمان ، نەتەوەو فەرهەنگەوە کە لەناودڵی هەمان ڕەوشی ئەخلاقیدا لەدایکبووە. ئەوێ نیشتمانی هەشتا ملێون ئەڵمانیەو هێواش هێواش دەبێتە هێزێکی چڕی گەورە لەناو سەنتەری ئەروپادا. ئەگەر هەموو ئەڵمانزاکان‌و تەنانەت کەم‌وزۆر کەسانێکی کەهزری ئەڵمانیان هەیەو لەگۆشەو کەنارەکانی جیهاندا پەرشوبڵاون بخرێتە سەرئەم ژمارەیە دەگاتە نەوەد ملیۆن کەس.
لەهەر خولێکی یاری ئۆڵمپیکدا، کاتێ دەرئەنجامەکان دەگەیشتنە ئۆفیسەکەم، کردبوومە خو ژمارەی خەڵاتە ئاڵتونی، زیوی، بڕۆنزییەکانی لەلایەن هەردوو ئەڵمانیاوە بەدەستهێنرابوون، بژمێرم. ئاسایی بووئەوان ژمارەیەکی زیاتری خەڵات، واتە

لەویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکاو یەکێتی سۆڤیەتیش ببەنەوە. ئەمە ئاماژەیەکە: ئاماژەیەکی گەورەی دلاوەری ئەڵمانیەکانە.

ڕیزی باڵێکی تر لەجەنگی جیهانیی چوارەم، دڕندەترین هێزەکانی (باشور)ن. دڕندە بەمانای توندوتیژو ئاژاوە چی، چونکە هەتا لە کاتی نائومێدی ڕووتیشدا دووبارەبەدوای ئازادبوونەوەن. هەروەها بەمانای ئەمەش کەلەگەڵ کەموکوڕیەکانی میللەتەکانیشیاندا کەگیرۆدەی برسێتیو هەژاری بوون، هەڵدەستن بەکاری توندوتیژانە.

ئەوانە میللەتانێکن کە لەژێر سایەی سەرکردەی نەیاری ئێمەدا فەرمانڕەوایەتی دەکرێن. نەك ئەو وڵاتانە (باشور) کەدۆستو هاوپەیمانی ئێمەن یان باوەڕیان وایە سەقامگیریو بڕەوی توانا باشترین هۆکاری دابینکردنی بەختیارییە بۆ میللەتەکانیان، بەڵکو وڵاتانی لەوێنەی عێراق، ئێران و لیبیا، سەرانی ئەم وڵاتانە، میللەتەکانیان ئامادەکردووەو داهاتی نەوتەکانیان خستۆتە خزمەتی گەشەدان بەبەرنامەیەك کە لەبنەڕەتدا بۆ دژایەتی کردنی دوژمنەکانیان (باکور) بێت. لەم سەری هێڵەکەوە، نەژادێکی نوێی دەستەڵاتدار (باشور) بوونیان هەیە کەهەریەکەیان لەکاروانەکەی خۆیدا بەئەندازەی ئەوانەی پێشوو لەدەستەڵاتدارە دێرینەکانی (باکور) بەدەستەڵات دەبن. لەهەموو ئەو وڵاتانەی باشوردا، فشارەکانی- لەوێنەی فشاری دانیشتوانی، برسێتی، بڕوای مەزهەبی، دەمارگیری مێژوویو دوژمنایەتی- بوونی هەیە کەئێمە هەرگیز ئەوانەمان لەجەنگەکانی یەکەمو دووەمو سێیەمی جیهانیدا لەبەرامبەر دوژمنەکانمان ئەزموون نەکردووە. ئەم فشارانە، هێزێکی سەرەڕۆن کەدەتوانن کاریگەرییان بۆسەر توانای ئەو وڵاتانە هەبێت لەئامادەکردنی پێداویستی جەنگ دژبە (باکور). بەهەمان شێوەش کەناڕەزایی سیاسی ناوخۆیی لەنێوان ئەم وڵاتە دیمکراتیانەی خۆرئاوادا بەتوندی کاریگەری خراپی دەبێت لەسەرتوانستی ئێمە بۆ دابینکردنی پێداویستی دژ بەدوژمنەکانمان لەڕووبەڕووبوونەوە گەورەکانی ئایندەدا. ئەم هێزە سەرەڕۆیانە لەولاتە نوێیەکانی باشور، لەسەر پێناسەی

سەرەكی دەستەواژەی شەڕ كاریگەری دادەنێن. بەڵام لەمڕووەوە، بابەتەكە لەگۆڕینی زۆرداریك بەیەكێكی تر زیاترە. بێجگە لەم حاڵەتەش ئێمە لەجەنگی سێیەمی جیهانیدا لەساتەوەختێكی زەمەنییەوە تاساتێكی تری یەك خولی هاوبەندو بێوەستانمان هەبووە.

ئەمجارە هەمان دوژمن لەقالبێكی نوێدا فۆرمەلە دەبێت كەپەروەردەی دەستی جەنگی چوارەمی جیهانی زۆرو ێرانكارترو هۆی نائومێدی زیاترە. ئەمجارە دوژمنەكەمان مەزهەبە.

ئسوڵیەكان تا ئەو ڕۆژەی یەكێك لەئەندامانی نەیاریان زیندو بێت، هەست بەئارامی ناكەن. ئەم پرسە لەلوبنان واتە ئەو جێگایەی كەموسڵمانەكان لەگەڵ مەسیحیەكاندا لەڕووبەڕووبوونەوەدان، ڕاستە. ئسوڵیەكان لەوێشدا هەتا مەسیحیەك لەخاكەكەیاندا بێت، ئارام نابنەوەو پاش مەسیحیەكان نۆرەی جووەكان دێت. موسڵمانە ئسوڵیەكان دەیانەوێت لەگۆشەو ڕۆخی جیهاندا، جگە لە ئیسلام هەموو مەزهەبێكی تر ڕیشەكێش بكەن. ڕیشەی ئەم دەمارگیرییە، جەنگی ناوخۆیی لەلوبنان، جەنگی فەلەستین‌و ئیسرائیل‌و جەنگی كەنداوی فارسی لەودواییانەدا كە لەلایەن سەدام حوسەینەوە داڕێژار بوو. لەم كێشمەكێشانەدا موسڵمانەكان دژ بەمەسیحی‌و جووەكان دەجەنگن. لەسەروو ئەوەشەوە ڕیشەی پەرەسەندن‌و فراونبوونی ئەو دەمارگیرییان هلەمەیدانەكانی جەنگی چوارەمی جیهانیدا گەشە دەكات، باشور ئەمڕۆ جۆرێك سەركردەی نالۆژیكیانە پەروەردە دەكات، كە ئێمە لەڕابردوودا سەروكارمان لەگەڵیاندا نەبووە.(نكیتا خرۆچۆف) لەناوەڕاستی كۆبوونەوەی گشتی ڕێكخراوی نەتەوەكاندا پێڵاوەكەی خۆی داكەندو كێشای بەسەرمێزەكەداو هاواری كرد: (ئێمە ئێوە زیندە بەچاڵ دەكەین.)

گاڵتەجاڕییەكە لێرەدایە كەڕوسەكان بەبێ كۆمەكە زۆرەكانی خۆرئاوا، خۆیان زیندەبەچاڵ دەكرد؛ بەمپێیە، كارەكەی وەك شانۆگەرییەكی سەرشانۆبوو. خرۆچۆف‌و هەموو ئەوانەی پێش ئەویش‌و ئەوانەشی بوونە جێنشینی پەیڕەوی یاسایەكیان دەكرد ئێمە دەمانتوانی تێبگەین. ئەوانەش

یاسای ئەوروپایی یان (باکوری) بوون نەك ڕێساکانی (باشور). لەگەڵ ئەوەشدا، خستنە ڕووی هەمان ئەو یاسایانە بوون بەڵام نەك بەدرێژییان، دیارە لەسەر هەمان هێڵی بیرکردنەوە. سەرەڕای دوژمنە نوێیەکانمان، ئێمە لەبەرەی وڵاتانی باشور کەیەکلایەنە پێداویستیەکانی جەنگی چوارەمی جیهانی ئامادەو سازدەکات، کۆمەڵێك ڕێسای نوێش لەئارادایە کەهێنراونەتە ناومەیدانی جەنگەکەوە.

لەزۆرینەی سەرچاوەکانی ئەوڕێسایانەدا، ئێمە لەگەڵ دوا کەوتووترین گرفتی ژیان (ژیانی بەدەوی- دەوارنشینی) - واتە بەربەریەتو سەردەمی پێش دیمۆکراسیەت، کەیاسای تاکەمەفهومی ناسراوی جیهانی لە (دەولەت)بووە- ڕووبەڕوو دەبینەوە. لەوسەردەمەدا هیچ چەمکێکی ڕاست بەرامبەر هەڵەیان سنورداریيەکی واقیعیانە لەئاکار بوونی نەبووە. کاتێ بەپەلەو بێ میتۆد بەرەو سەدەی بیستو یەکەم هەنگاو دەنێین،هەموو گریمانە کۆنەکانی سەقامگیریو ئاسایش-واتە ئەو کاروانەی کەلەگەڵ ئەو گریمانانەدا یەکانگیرەو لەناویاندا جەنگ یان ئاشتیمان کردووە- ڕۆژبەڕۆژ بەسادەیی لەکەدار دەبێت.لەسەرانسەری مێژووی جەنگدا هەرگیز لەتوانادا نەبووە بەچەکی کۆن وەڵامی چەکی مۆدێرن بدرێتەوە. کاتێ کەتیرو کەوان وەك چەك داهێنرا، هێزە ئاگرینەکەی بازووی مرۆڤ دابینی دەکرد، پاشان کەسێکی ئیتالیایی بێناونیشان شتێکی داهێنا بەناوی (کەوانی پۆڵاین). ئەم چەکە، ئامرازێك بوو کەئیتر تەنها پەیوەست نەبووبەبازووی پاڵەوانەکانەوە. بەڵکوهۆکارێکی میکانیکی بوو. لەودەمەدا، لەنیوەی سەدەی پازدەیەم، لەوباوەڕەدابوون کەئەوجۆرە چەکە، دواین جۆری چەکە.

کاتێکیش بۆیەکەمجاربەرگ-پۆشێکی ئاسنی کون کرد،(کەوانی پۆڵاین)لەلایەن کەنیسەوە مەحروم و ئەوانەشی بەکاریاندەهێنابەکافرلەقەڵەم دەدران. شورای(لاتیرن)لەساڵی ١١٣٩،بەکارهێنانی ئەو چەکەی دژبەمەسیحیەکان قەدەغە کرد. بەمجۆرە، چارەیەك

نەبوو؛چونکەلەکۆتاییدائەوچەکەبرەوی پەیدادەکرد.ئەوچەکەی سەرەوەوەك پێشەنگێك لەجەنگە نوێکاندا بەکاردەهێنرا.
لەوەودوا، هەرگۆڕانکارییەك لەچەکسازیدا، کاریگەری کتوپڕو فروانی لەسەرئارامی سیستمیە جێگیرەکانی جیهان دادەنا.
تیرۆریزم، دواین جۆری ئەو چەکانەیە کە لەشەڕی باکور-باشور لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا بەکاردەهێنرێت. تیرۆریزم جێنشینی چەکی ئەتۆمییە کەدواین جۆری چەکی چەکسازی بوو لەجەنگی سێیەمی جیهانیدا، کەدەکراو دەتوانرا بەجۆرێکی نوێ بۆخولقاندنی ترس بەکاربهێنرێت. لەچل ساڵی ڕابووردوودا، ئاسایشی ئێمە گرێدراوی ئەگەرێك بوو کەئەمرۆ بەپێی چەمکە کۆنەکەی بۆناوی (دارمانی دوولایەنەی بێ چەندوچوون) گۆڕاوە. (دارمانی دوولایەنەی بێ چەندوچوون) بابەتێکی سادەو لەهەمان کاتدا بنەمای هاوسەنگی هەراسی ئەتۆمی بوو. ئەگەر یەکێك لەهەردوولایەن و بەهەر هۆیەکەوە بێت چەکە ئەتۆمیەکەی بهاویشتایە، لایەنی دووەم ئەوەندە چەکی ئەنبارکراوی هەیە کەتا پاش چەند تەقاندنێکی ناوخۆیی و ئامارژە، موشەکە ئەتۆمیەکانی خۆی بۆ لەناوبردنی دوژمنەکەی بهاوێژێت؛ یان هەتا دوژمنیش دەیتوانی لەهاویشتنی موشەکە ئەتۆمیەکانیدا ئەوەندە خێرا کاردانەوەی هەبێت کەهێشتا موشەکی لایەنەکەی بەرامبەری لەئاسماندا بێت.
تۆڵەسەندنەوە بەتەواوی لەدەستی سەرۆکەکاندابوو؛ ئەوکەسەی کەخاوەنی دەرفەتێکی ئاشکرابوو. ئەگەر ئەوان چەکەکانیان بتەقاندایە، ئەو دەستی دەنا بەدوگمەکەدا. بۆمۆڵەت وەرگرتن ناچارنەبوو بگەڕێتەوە بۆ لای کۆنگریس و کۆمیتەی چاودێری زانیاری. ئەو تەنها پەنجەی دەنا بەدووگمەدا. تەنها گرفتی (سانیەکان)ی هەبوو؛ واتە پێش چەند دەقیقەیەك بەر لەکەوتنە خوارەوەی موشەکەکان پێویست بوو دەستبەکاربێت.
ئەم سیستمە بێ بەزەییانە هقابیلی خۆلێلادان نەبوون. سەرەڕای ئەوە، چونکە دەرئەنجامی فراوانی هەبوو، هیچ یەکێك لەو دوو لایەنە حەزیان

بەئـەزمونکردنی ئامێرەکانیـــان نـــەبوو؛ بەوهۆیـــەوەی کەئـــەو سیســـتمە نێونەتەوەییانە بەکاردەهێنرا کەدەربارەی ڕێزدانان بۆ بەهای ڕیشەیی ژیانی تـاکی مرۆڤایـەتی هـاودیدبوون، لەسەروهەمووشیانەوە لەبەرئـــەوەی سـزای ترسناکی لەخۆگرتبوو، هەموو پابەندی بەکارنەهێنانی بوون.

ڕووبەڕووبوونەوەکانی جەنگی سێیەمی جیهانی،ڕووبەڕووبوونەوەو قەیرانی موشەکەکانی کوبـا زیاتریاری بۆکسێنێکی زۆر هێمنانـەبوو. لەڕاستیدا هیچ کەسێك لەوباوەڕەدانەبوو کەڕوسەکان بەهاویشتنی بۆمب، فاتیحە بـۆ جیـهان دابـدەن. لـە هەلومەرجـەکانی (دارمـــانی دوولایەنـــەی بێچـــەندوچوون)دا تـۆ نەتدەتوانی هاوار بۆ کۆمەك بکەیت، یان دەبوو دەسـت بەدوگمەکـەدا بنێیت یان نا.

ئـەمڕۆ، (دارمـــانی دولایەنـــەی بـێ چـــەندوچوون)ی ســـەردەمی ئـــەتۆمی پێویستە بـۆ چـــەمکێکی نوێـــی تـری دوای ســـەردەمی ئـــەتۆمی بگۆڕێـت. لـەواقیعدا، بڕیـاری تاکلایەنـەی ئۆفیسـی ڕاپـەڕاندنی (بـوش)لەسـیپتامبەری ١٩٩١ نیشـــانەی ئـــەوەبوو کەپلـــەدارە ڕەسمیـــەکان دەستنیشـــانیان کردبووکە(دارمانی دولایەنەی بێچەندوچوون) بەزبلدانی مێژوو سپێردراوە.

جێنیشینی (دارمـانی دولایەنـەی بێچـەندوچوون) لەسـەردەمی ئێمـەدا، لەوانەیـە بەسادەیی نـاوی (دارمـــانی بێچـــەندوچوون) لـــەخۆبگرێت. لـــەدڵی ئەوکەسانەی کەسوود لەچـەکی فـیزیکی‌و جاسوسـی تیرۆریزمانـە، بـەبێترس لەتۆڵەسەندنەوەی بەرامبەرەکەیان وەردەگرن—چونکە هـــەموویان ڕاستەوخۆ سەبارەت بەخواستەکانیان شکستیان هێنابوو— ئەبێ چ پریشك‌و تۆقاندنێکی تێدا کۆببێتەوە؟.

بەڕاسـتی ئەگـەر تیرۆریسـتەکان یـان پاڵەوانـــە نەتەوەییـــەکانیان چـــەکی ئەتۆمی، بایولۆژی یان کیمیایی بەکاربهێنن‌و شەڕێك بخولقێنن کەپێشتر تەنها لەشێوەی سایەیەکی جەنگدا بوونی هەبووبێت، چی ڕوودەدات؟بەپێی ئەمـە، هەلومەرجـــەکان واپێوسـت دەکـات کەسـتراتیژی نوێـــی بەدەســـتەڵات بەسـەرجەنگی چوارەمـی جیـهانیدا کـە (دارمـانی بێچـــەندوچوونی)یـە، وەك کریستاڵێکی ڕوون پێناسەو ئاشکرا بکەین.

ئەگەر تۆ لەسنوربەندییە میلیمەتریەکانی ڕێککەوتنی لەسەرە زیادەڕۆی بکەیت، بەدڵنیای و بێدوودڵی بەشێوەیەکی تەواو گشتی لەناودەچیت. ئەم سیستمە تاکوئێستا بەکارنەهێنراوە. بارودۆخی (دارمانی بێچەندوچوون) لەجیهانێکی چەکداری خاوەن یاسادا پێشتر چەندجارێك تاقیکراوەتەوە. هەتائێرەجگە لەچەندئاوارتەیەکی بچوك، لەهەر ئەزمونگەرییەکدا ڕووبەڕووی شکست بۆتەوە. سیستمی سەرەوە بۆ دڵنیا کردنەوە لەوەی کەدەبێتە هۆی لەناوبردنی ئەوکەسانەی کەوەك چەکێك سوود لەتیرۆریزم وەردەگرن، ناکام بووە.

گریمان کاتێك تیرۆریستەکان فڕۆکەی ژمارەی (١٠٣)ی پان ئەمەریکیان لەکاتی فڕیندا بەسەر (لۆکەربی) لەئوسکتلەندە تەقاندەوە، هیچ بۆمبارانێکی کۆشکی (عقید معمر قەزافی) لەتەرابولس بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە ئەنجام نەدرا. ئەم کاردانەوەیە بەفرمانی خەڵکیو هەستانی سیایەتی (دارمانی بێچەندوچوون) بووە.

لەهەندێ سەرچاوەدا، بیرۆکەی(دارمانی بێچەندوچوون) لەوردەکارییەکانی خۆیدا لەگەڵ پرسی ئاینی دەقاودەق لەگەڵ ئینجیلی پیرۆز ئاڵوگۆڕ دەکات؛ واتە سێسەدو شەست پلە بۆ چەمکی چاوێك بەچاوێك دەگەڕێتەوە.

زۆربەی ڕەوشەکانی ڕاپەڕاندن لەجەنگی چوارەمی جیهانی ئاماژەیە بۆ گەڕانەوە بۆ سەرەتایترین فۆرمەکانی مرۆڤایەتی .

زەینی ئسوڵییەك بەشێوەیەکی بەرچاو چەمکەکانی ستراتیژی سەدەی بیستو یەك ڕووندەکاتەوە. پێویستە ئێمە بۆ گەیشتن بە هاوسەنگیەکی نوێ لەدەستەڵات، یان هەراسو لەدەرئەنجامدا بەدەستهێنانی ئاشتیو دڵنیایی هەمیشەیی لەوەی کە(دارمانی بێچەندوچوون) بەسەر تیۆری(دارمانی دولایەنەی حەتمی) زاڵ بێت، بەتەواوی ئامادەی قبوڵکردنی ئەم ڕێسایانەبین. ئەوکێشمەکێشەی وەك جەنگی چوارەمی جیهانیی خۆی دەنوێنێت، هەرگیز ناتوانێت خاوەنی چالاکی زۆرو دووبارەبووەوە بێت. شەڕەکان دەتوانرێت بەبزاوتنی گەورەو فراوانی هێزی سوپاییەکان، وەك چالاکیەکانی (گەردەلولی

بیابان) دەستپێبکەن. بەڵام شەڕەکانی بێگومان لەلایەن گروپی بچوكو سەرسەختی تیرۆریستەکانەوە ئەنجام دەدرێت کەپێشتر لەوجێگایەدا بووەو بەوردی لەنێوان گروپە کۆچبەرەکانی وڵاتانی باشوردا کەپێشتر لەیەکێك لەپایتەختەکانی بەرەی باکور ژیاون، خۆیان حەشاردەدەن.

دەلیلی مەسەلەی جاسوسی ئەمەیە یەکەمین دەزگای جاسوسی جیهان لەم جەنگەدا بەرامبەر بەسێ جەنگی گەورەی تر کەپێش ئەمەو لەم سەدەیەدا ڕوویان داوە، ڕۆڵی زۆر هەستیارتر دەگێرێت.

ئەم دەزگا جاسوسیانە بەهاو نهێنی (چوونەناوەوەی پلەبەپلە)– کەچەكو کلیلی دەرگای جبەخانەی تیرۆریزمە–پێدەزانن. ئەوانە فێربوون چۆن بەکاری بهێنن‌و چۆن بەرامبەری بوەستنەوە؟ هاوپەیمانەکان لەزۆربەی خاڵەکانی ئەوروپا لە جەنگی جیهانیی دووەمدا، ئەمەیان بەکارهێنا. ئەم چەکە، بەردی بناغەی بزاوتی بەرگری بوو لەئەوروپای داگیرکراودا.لەکۆتایی شەڕەکان‌و سەردەمی کۆتایی یەکجارەکی جەنگی دووەمی جیهانی ، ستالین نفوزی پلەبەپلەی لەمەیدانێکی فروانتردا بەکارهێنابوو.

(عقید)ێك لەدەزگای(KGB) کەخۆی بەرەخنەگری خۆرئاوا دا دەنا جارێك پەردەی لەسەردانیشتنێکی کرملین لادا کە بەسەرۆکایەتی ستالین بەسترابوو. ستالین لەوێدا بڕیاری دابوو بەمۆڵەتدانی کۆچکردنی سێ ملیۆن کەسی جوولەکە یەکێتی سۆڤیەت خۆی لەشەڕیان بەدوور بگرێت، بەڵام فرمانیشی دابوو کەدەبێت لەناو ئەو سێ ملیۆنەدا بیست هەزار کارمەندی (KGB)یان لەناودابێت. ئەو پێیوتین کەئەم سیاسەتە لەوەودوا بەردەوام بووە.

ئەو تاکانە کاریگەرییان هەتا ئەمڕۆش لەچالاکی (ئیکسۆدس) کەدواین شەپۆلی کۆچباری جوولەکانە لەسۆڤیەتەوە بۆ ئیسرائیل هەیە.

بەڵام لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا ئەم تاکانەی لەجیاتی کارکردن وەك کارمەندێکی ڕووت کەکاری کۆکردنەوی زانیاری بێت، بۆئامێری تێکدان‌و شەڕدەگۆڕێن. لەپەراوێزی (باشور)دا، وڵاتانێك هەن کەبەرامبەر بەیەکتری وەك ئامڕازێکی جەنگیی سوپایی یان سیاسی زۆر کاریگەر تروحساب بۆکراوتر تیرۆربەکاردەهێنن. ئەمڕۆ ئاشکرایە کەهەندێ لەوڵاتانە پشتیوانی

ڕاستەقینەی ئەو جۆرەجەنگەن. سەرەڕای ئەوەش، لەهەریەکە لەووڵاتانەدا ڕێساو هێزێکی بەتوانا لەمێژوویانەوە سەریهەڵداوە کە لەولاّتانی تر زیاتر وایان لێدەکات تاوەك چەکێکی جەنگی دژ بەباکور ڕوو لەتیرۆریزم بکەن.

لەسەردەمی (خەلافەت)دا، کاتێك کەتورکیای گەورە لەسەنتەری ئەستانبوڵەوە فرمانڕەوایەتی زۆربەی زۆری موسڵمانی جیهانی دەکرد، گروپێك هەبوون بەناوی (حەشیشیم) کەپیاوکوژانی بەکرێگیراوو ئەندامی (فیرقەی ئیسماعیلیە) بوون؛ تایەفەیەکی سیاسی _ مەزهەبی کەکوشتنی دوژمنەکانیان بەفەرمانێکی ئاینی دەزانی‌و، خەڵکی ناوچەی سەروی عیراقی ئێستابوون‌و یەکەمین کەسانێك بوون کەتیرۆریان -گەرچی بەسەرەتاییترین فۆرم بووە—وەك چەکێك بەکارهێناوە. (مارکۆپۆلۆ) ئەفسانەکانی سەبارەت بەکەسانێکی لاو کەبۆکاری پیاوکوشتن‌و کرێگرتەیی هەڵدەبژێردران باسدەکات. دەڵێت حەشیشەیان دەدرایەو بۆقەلاّیەکی کوێستانی دووردەخرانەوە. لەوێدا خۆیان لەناوباخچەیەکی پڕلەنهێنیدا دەبینییەوە، کەبەدەشتی سەرنجڕاکێش دەورەدرابوو. پێیان دەووتن (ئەمە بەهەشتە). لەوێ مەلەکان دەیانخوێند. درەخت‌و گوڵی جوان، ئاوهەوای بۆندارو ژنانی قەشەنگی تێدابوو. ئەوانە بۆماوەیەك لەو بەهەشتەدا بەرەڵلادەکران تاتامی میوەکان بکەن‌و خۆشی لەلەزەت‌و چێیژببەن.

پاشان لەوێ دووریان دەخستنەوەو پێیان دەوتن: (ئێستا تۆ شێوەی بەهشتت بینی) بەهەریەکێکیان خەنجەرێك کەچەکی تایبەتی ماڵی خەلیفەبوو دەدراودە یانووت: (ئێوەپیاوکوژانی ڕۆژانەخۆرن‌و ناچارن لەڕێگای ئەرکەکانتاندا بمرن، ئەگەر مردیت ڕاستەوخۆ بۆ بەهەشت دەڕۆیت. تۆش پێشتر شێوەیەکی بەهەشتت دیوە.) دەوترێت؛ قوربانی تیرۆریستە بەوەفاکانیان کەلە قەلاّکانی سەرانسەری عیراق‌و ئێراندا بەجێماون، قوربانی لەژمارە نەهاتووی سەربازانی پلەبەرزو دەستەلاّتدارانی سەردەمی خەلافەت‌و هەندێکیشیان خۆیان خەلیفەبوون.

لەماوەی دووسەدەدا هەتاهێرشی مەغۆلەکان، بەکرێگیراوە پیاوکوژەکان دەستەلاّتێکی تۆقێنەربوون. لەگەڵ ئەوەشدا، تا ئەمڕۆش ئەو فیرقەیە وایڕادەگەیەنن کەئەوانەی پەیڕەویان دەکەن لەسەرانسەری سوریا، ئێران‌و

ئاسیای ناوەڕاست پەرشوبڵاو بوونەتەوەو میراتی ئەم ترسەبە پێچووپەنای تازەوە نفوز دەکاتە ناودەستەڵاتەوە. چەکی تیرۆریستەکانی ئەمڕۆ جۆرێکی ئاڵۆزترە لەخەنجەری بەکرێگیراوە پیاوکوژەکان کەزۆر ترسناکترو ئازاربەخشانەترە لەوەی پێش خۆی. لەکاتی جەنگی خاچپەرستەکاندا زۆرجار واهەڵدەکەوت کەدوژمنەکان پێش وادەی جەنگ لەسەرخوانی یەکتری نان بخۆن‌و دیدەنی یەکتریبکەن. لەیەکێك لەوجێگایانە،(سەلاحەدین)ی یەکێك لەگەورەسەرکردەی بەرەی موسڵمانەکان، پێشوازی لەچەند سەرکردەیەکی ئەوروپایی کرد. لەنێوانیاندا (ڕیچارد)ی پادشای ئینگلستان بوو، کەسێکی شێردڵی گەورەو بەهێزبوو بێبەزەییانە بەهەردوو دەست شمشێری دەوەشاند. پاشا وتی: (ئێمە بەمجۆرە شەڕ دەکەین). شمشێرەکەی دەرهێنا، کڵاوێکی ئاسنی لەسەر مێزەکەداناو بەهێزانە پیاکێشا چووە ناوکڵاوەکەوە. بەرەو (سەلاحەدین) گەڕایەوەو پێیوت: (بەیارمەتیت ئێستا بابزانین تۆچۆن ئەمەدەکەیت!.)

سەلاجەدین وەڵامی دایەوە: (هەریەکەمان شێوازی تایبەتی خۆی هەیە). دەستەسڕێکی ئاوریشمی دەرهێناو خستیە سەرڕووی تیژی شمشێرێك. دەسەسڕەکە بووە دووکەرت.خەندەیەکی جوانی کردو وتی: (ئەمەش شێوەیەکی تری جەنگە).

شەڕە جۆراوجۆرەکانی کە لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا ڕوودەدەن، لەلایەن میللەتانێکەوە دادەهێنرێت کەهزری خەلیفەو ئیمپراتۆریەتی (عوسمانی)یان بەمیرات بۆماوەتەوە؛ ئێمە لەجەنگی خاچپەرستانی نوێدا بەجۆرێکی کارامە بەشداری دەکەین.

باکور نزیکەی هەزارساڵ بەر لەئێستا لەجەنگی خاچپەرستاندا شکستی هێنا. ئێستا نابێت‌و ناتوانین لەجەنگێکی کە لە پێشماندایە، ناکام بین. جەنگەکانی خاچپەرستەکانی ڕابووردوو، بزاوتێکی خۆرئاوایی بووە بەمەبەستی فەتحکردن. جەنگەکانی خاچپەرستانی ئایندە، چالاکین لەڕووی بەرگریکردنەوە. بەهیچ شێوەیەك نابێت ئەوە فەرامۆشبکەین کە جەنگەکانی خاچپەرستانی نوێ – کەئێمەناومان ناوەجەنگی چوارەمی جیهانی– لەوانەیە

لەشوێنێکی دوور لەڕۆخەکانمان ڕوو بدات. بەهەمان شێوەی ئەوانەی ڕابووردوومان کەبۆئەو دوورە دەستیەدوای سەرکەوتن کەوتبوون. لەوسەردەمەدا، لەوانەیە ئەم جەنگە وەك شاشەیەکی سینەمایی کراوە، مەیدانێکی نزیك دیاربێت. دەبێت ئێمە ئامادەبین تا لەدووریان لەنزیك گیانمان فیدابکەین.

نەیارەکان کەهەموویان لەدەورمانن، بەتاسەوە قوربانی بەژیانیان دەدەن‌و ئامادەن لەپێناوی بڕواکانیاندا بمرن، بەڵام ئێمە نا. بڕواکانی ئێمە بەتەواوی لەسەر (بەختیاری مادی) وەستاوە.

هەندێ لەڕژێمەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ئەم خاڵی لاوازییەمان تێگەیشتوون. بۆیە پەنادەبەنە بەر وتەی پارێزەرانە، بەرتیل دان بەڕێگران بۆ کوشتارکردن بەرامبەر بەپارە. ئەوان بەدوای خاڵی لاوازی ئێمەوە بوون‌و پەیدایان کردووەو لەڕێگای خۆیانەوە وەك ڕوسەکان سەرسەختن ، کەمتر بواری ناسینیان دەبێت. ئەو ڕوسانەی کەبۆ ماوەی چەندین دەیەی دوایی کردوبومانن بەدوژمنی خۆمان. پێویستە ئێمە ڕێگای ناسینی ئەوانە بدۆزینەوە. زۆرئاشکراشە کەئەمە یەکێکە لەڕۆڵەسەرەکیەکانی کاری جاسوسی ئەمڕۆمانە.

ئێمە لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست چووینەتە قۆناغێکی ڕەتکردنەوەی گەورەوە کەڕێچکەی ڕزگاربوون لێی (موعجیزە)یە. ئێستا کاتی ئەوەیە کەلەگەڵ ئامادەکردنی دۆستەکانمان فشاربخەینە سەردوژمنەکانمان؛ فشارێکی کەلێی تێدەگەن فشارە بۆسەر هەلومەرجەکانیان. دواین ئامانجی کاری جاسوسی ئێمە، ئامادەکردنی وێنایەکی بێلایەنانەیە دەربارەی جیهان تاسەرانی وڵاتەکانمان بتوانن بەهۆی ئەوەو بەعەقڵ‌و وزانین کاربکەن. ئەم خواستە، دیدی هەمیشەیی من بووە.

بەداخەوە، کەزۆربەی سەرانی ئەم سەردەمەی ئەمریکا سەبارەت بەم باوەڕە لەگەڵمدا نین. سیستمی ئەمریکا زۆرجیاوازترە لەسیستمی ئەوروپا. ئەمەریکیەکان چەمکی (بەرژەوەندی دەوڵەتی) کەدەبێت لەجیهانی جاسوسیدا تەنها وەك هۆکارێك لەکاتی هەستیارترین چالاکیدا سوودی لێوەربگیرێت، نادیدەدەگرن. ئەوان لەوباوەڕەدان کەئەم شتە لەسیاسەتی

ئەمریکادا جیگایەکی نییە. بەڵام یەکێك لەقوڵترین باوەڕەکانی من ئەوەیە کەدەبێت ئەوە وەك بەهانەیەك بەکاربهێنرێت؛ بەبێئەوەی ئەمە لەبەردەم نارەزاییەکانی خەڵکی یان نێونەتەوەیی، تاوانبارکردنی بەرامبەری لێبکەوێتەوە یان وەك تۆڵەسەندنەوە خۆی بنوێنێت.

من جارێك بەسەرۆك (ریگان)م گوت کەتا چ رادەیەك باوەڕم بە (بەرژەوەندی دەوڵەتی) هەیەو لەوباروەڕەدام دەکرێت بەگرنگتر لەهەر یاسایەکی تری ئەخلاقی دابنرێت. ئەمە ئەو شتەیە کەئێمەی ئەوروپی چەندین سەدەیە هەستمان پێکردووە.

بەڵام هەرگیز پێویست بەبوونی (بەرژەوەندی دەوڵەتی)، لەزۆرانبازی لەگەڵ بێبەزەیترین دوژمنان ناکات، واتە هەندێك لەو دەوڵەتانەی کەلایەنگری توندوتیژین لەباشور، چونکە ئەو دەوڵەتانە بەبێ هیچ دوودڵیەکی ئەخلاقی کەئێمە لەسەردەمی دامەزراندنی مەدەنیەتدا بۆکۆنترۆڵکردنی رەفتارەکانمان بەکارماندەهێنا،دەجووڵێن‌و پێویستە کەئامادەبین پەردەی ئەدەب بەلاوە بنێین‌و بەشێوازی خۆیان لەگەڵیاندا بجەنگین.

ئەم کارەبەمانایەك لەماناکان هەوڵدانێکە بۆ نوسینەوەی مێژووی کۆمەڵگاکەمان یان بەلایەنی کەمەوە ڕوونکردنەوەی ئەو گۆشانەی کەدوودڵی شاراوەو گرفتی لێڵیان تێدایە. بەپێناسینێکی کەدروست هێزەکانی سێ جەنگی جیهانی لەم سەدەیەدا بەرهەمهێناوە، ئێمە بەحاڵەتێکی نیوە کوێرو نیوە کەڕییەوە دەچینە ناو جەنگی چوارەمی جیهانییەوە.

من وەك کۆنترین سەرانی دەزگای جاسوسی خۆرئاوایی، فێری ئەوەبووم کەدووجۆر مێژوو هەیە: یەکێکیان ئەو مێژووەی کەدەیبینین‌و دەیبیستن کەمێژووی ڕەسمیەو ئەوی دییان مێژووی نهێنی یان ڕووداوێکە کەلەپشت پەردەکانەوە، لەتاریکی‌و لە ناودڵی شەودا ڕوودەدەن. کاتێك کەسێك ڕوانگەیەکی ڕاستی بۆ جیهان هەبێت، دیدەکانیشی قابیلی دەرککردنەو دەبێتە خودی ئەو. بەندە وەك ئەکتەرێك‌و مامۆستایەك لەیەکەم‌و دووەم جەنگی جیهانیدا هەوڵمدا جۆرێك زانین لەگەڵ هەردووك لایەنە مێژووییەکە بخەمە سەرکارەکانم، ئەگەر بمانەوێت توانای ڕۆڵی دەستڕۆیشتوو فراوانمان

بەسەر هێزە زیانبەخشەکاندا هەبێت، کە بنەڕەتیترین بەهاو سەرەکیترین بونیادەکانمان لاوازدەکەن، ئەم دەرککردنە پێویستە.

لەسەرو ئەوانەشەوە، ئێمە خواستاری بەهایەکی حسابین، ئەگەر پەیامێکی شاراوەلەم کتێبەدا هەبێت، ئەمەیە کە بەدرێژایی سێ جەنگی جیهانی ئارامیەك لەکایەدا بووە کەسەرکەوتنمانی مسۆگەرکردووە.

ئەم ئارامیە، هەمان هەڵسەنگاندنی وردی ماهیەتی دوژمنەکانمانە. هیچ کام لەدوژمنەکانمان لەماوەی سێ جەنگی گەورەی ڕابوردوودا، بێبەهاترین لەوێنەی بابەتەکانی هەڵسەنگاندنی بێلایەنانەی پێگەیان لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا.

لەهەریەکێك لەولایەنانە، نەك هەرخواستەیە بەڵکو پێویستە کەئەزمونە لەتوپەتو لەژمارە نەهاتوو پەرشوبڵاوەکانی پەیوەستە بەزانیارییەوە وەك (پێگەی گەورە) کۆبکەینەوەو لەسەرئاستی تێزی مانادار ڕێکیان بخەین؛ ئەو دیدانەی کەئێمە جورئەتی خستنە ڕوویمان هەبوروەو لەچەند لاپەڕەی ئەم کتێبەدا ئاشکرامانکردووە، دیدێکی تایبەتە بەنەخۆشیە ئەخلاقیە گشتیەکان، کەزۆرجاران لەسەر زمانی خاچێکی گەورەوە تا پسپۆڕێك باسکراوە.نابێت بەکەم بگیرێت.

بەشی دووەم:

## کەسێکی نهێنی

من سەربەخێزانێکی دێرینم کەیەکەمین جەنگی جیهانی زۆرگران لەسەرمان کەوت. لەیەکەمین جەنگی جیهانیدا، باوکم بەخەستی بریندار‌بوو. لەساڵی ١٩١٨دا(هنری) برای کوژرا. لەساڵی١٩٤٥دا مامم لە(راونس برۆك)ی کامپی سەنتەراڵی نازییەکاندا زایەبوو.

لەخوێنی ئەم خێزانەدا هونەری جەنگو جاسوسی بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی ڕیشەی داکوتاوە. لە پشتی باوکمەوە، ڕەچەڵەکمان بۆ(فرانش کونتە)ی ساڵی ١٤٥٢ و سەردەمی (پیەمونت) لەسەدەی سیازدە دەگەڕێتەوە. ئێمە لەکاتی(دۆکەکانی بورگوندی) کەخێزانێکی نەمساوی بوونو لەهەمان کاتیشدا کە لویسی شازدەیەم بەسەر(فرانش کونتە)دا سەرکەوت، لەخزمەتی خودی فەڕەنسادا بووین.

دایکم لەڕیشەی (هوگونوی)ی فەڕەنسایی بووە. کەسوکارەکەی، پاش ئەوەی لویسی شازدەیەم هەڵوەشاندنەوەی فرمانەکانی(نانتس)ی لە(فونتن بلو) لەساڵی ١٦٨٥ئیمزاکردو بەوجۆرە دوایی بەتەواوی مافەکانی پرۆتستانەکان و(هۆگونوەکان) لەفەڕەنسادا هێنا، ئەوشوێنە کۆنەی کەچەندساڵێك لەوەوبەر بەرەونەمان دەچوو، بەمەبەستی چوون بۆ(سانتۆ دومینگۆ) –کەپاشان ناونراهیسپانیولا– ئەوێیان بەجێهێشت. پاشان لەسەردەمی شۆڕشی کۆیلەکان لەسالی ١٧٩٤ولەژێرسایەی حکومەتی (توسان–لوورتور)، کەسوکارەکەی دووبارە بەرەو ویلایەتەیەکگرتووەکان کۆچیان کرد. ئەوان بەکەشتییەکی بارهەڵگر کەبەڕێکەوت بۆ بارهەڵگرتن لەبەندەری(پورت–ئا–پرنس)لەنگەری خستبوو ورازی بوو لەگەڵ خۆیان هەڵیانگرێت، بۆئەوێ کۆچیانکردبوو. من نامەی باپیرە گەورەکانمانم بینیوە کەبۆ ئامۆزاکانیان لەدەڤەری(پریگور) لەفەڕەنسا ناردوویانە. لەنامەکانیاندا باس لەوشەڕانە دەکەن کە لەپێناوی مانەوەدا لەڕشتەیەکی خوارووی ناوچەیەك کەپاشان بەنیویۆرك سیتیو ئێستا بە(واڵ ستریت) ناودەبرێت،

ئەنجامیان داوە. شەڕێکی کە بەئەندازەی نەبەردەکانی من لەماوەی دووسەدەی دوای ئەوەو لەکاتی جەنگە گەورەکانی ئەورووپای سەدەی بیستدا مووی لەشی مرۆڤ ڕاست دەکاتەوە. شەوێکیان دووبارە یەکێك لەو نامانەم دەخوێندەوە. ئەوان وتبوویان کە(سوور پێستەکان بەتیری ئاگراوییەوە لەسەردیوارە بەرزەکانەوە هێرشیان بۆ دەهێناین‌و تیرەکان لەدیواری خانووە دارینەکانمان کەگری گرتبوو هەڵدەچەقین. ئێمە بەدرێژایی شەو، دەست بەدەست سەتڵی ئاومان دەگەیاندە یەکتری، چونکە لەپشت خۆمانەوە جێگای چەند پەناهەندەیەکمان دابوو بەهاوکاری‌و یارمەتی (لۆرد)و سەتڵە ئاوەکان لەکۆتاییدا کارەکەمان جۆربوو. ئەمڕۆبەیانی کاتێ ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم سوپاسی یەزدان دەکەم کەسەلامەتین.)

دەتوانرێت بووترێت کەئەمە یەکەمین ئەزموونی جەنگێکی هەرەس هێنەرانەی- گەرچی لەفۆرمێکی سەرەتاییانەدا بووە- خێزانەکەم بووە. زۆر ڕوونە کەئێمە پێشتر فێربووین چۆن لەم جۆرەجیهانەدا بژین.

دایکم لەنیویۆرك لەدایك بووە. لەهاوینی ١٩١٧و لەسەرەتای تێوەگلانی ئەمریکا لەیەکەمین جەنگی جیهانی بۆ دیدەنی فەڕەنسا هاتۆتە ئێرە. زۆر پەیوەست بەوڵاتی باوباپیرانیەوە بووە. سەرەڕای گەڕانەوەی لەفەڕەنساوە بۆ ئەمریکا هەستێکی ڕۆمانسیانەی هەبووە. لەڕاستیدا لەسەر مەزهەبی کاسۆلیك بووە. خانەخوێیەکەی لەفەڕەنسا (مارکیزدوسالیذیاك-فنلن) لەخێزانێکی گەورەی فەڕەنسایی بوو. کاتێك ئەم گەیشتبووە فەڕەنسا، جەنەراڵ (بلك جك پرشینگ)بارەگای فەرماندەیی خۆی لەخۆرهەڵاتی فەڕەنسا کەدەکەوتە (شاتودوسیتی) دانابوو-ئەو جێگایەی کەسەردەمانێك (ولتر)ی تێدا ژیاوەو بەڕێکەوتیش ماڵی باپیری خانە خوێیەکەی دایکیشم لەوشوێنەبووە.

لەپشووی کۆتایی هەفتەیەکدا، جەنەراڵ پرشینگ بەڕاوێژکردن لەگەڵ خانمە پێشوازکارەکەی خۆیدا، چەند میوانێکی لەکۆمەڵی کۆچبەرە فەڕەنسیەکانی نیشتەجێی ئەمریکا بۆنانخواردنی ئێوارە بانگهێشت کردبوو.

دایکی منیش کەلەودەمەدا بێوەژنێکی جوان و قەشەنگ بوو لەنێوان ئەو بانگکراوانەدا بوو. تەنها جارێك شووی کردبووبە(والاس موناهان) کەبازرگانێکی گەورەی ئەمریکایی بوو.

جەنەڕاڵ (پرشنگ) هاوەڵی کۆلۆنێل (جۆرج مارشال) بوو، فەرماندەی گاردی چوارەم یان ئیدارەی کەسایەتی (پرسنڵی) بوو، ئەفسەری پەیوەندیدارەکەی (جۆرج پتن) بوو. (پرشنگ) لەکاتی هێنانی هێز بۆ ڕێگرتن لەبێبەشکردنی(پانچوویلا) لەمافە کۆمەڵایەتیەکانی لەساڵی(١٩١٦) دا (پتن) ی بینیبوو. چونکە لەیەکەم گەیشتنی سوپای ئەمریکا بۆ ئەوروپا یەك لەشکری سوارەهەبوو–واتە هەمان ئەویەکەیەی کە (جۆرج واشنتن) تیایدا خزمەتی دەکرد–لەو بارەیەشەوە (پتن)یش سوارەی نیزامی بوو، بۆیە بەدەستی جەنەڕاڵ پرشنگ سپێردرا. لەومیانەشدا ئەم لەشکرە وەك لەشکرێکی پێشوازیش کاری دەکرد. (پتن) دەرچووی ئەکادیمیای (سامور) ی سەربازی فەرەنسابوو. دایك و باوکم لەو ئێوارە میواندارییەدا بەیەکتر ئاشنابوون. لەوێدا یاریدەدەرو ئەفسەری پەیوەندی جەنەڕاڵ (پرشینگ) کەکەسێکی فەرەنسی بوو، لەگەڵ فەرماندە پلە بەرزەکان لەوێبوو. کاتێك یازدە ساڵان بووم باوکم مردو ئازارێکی بەسوێی لەژیانمدا بەجێهێشت. پیاوێکی سەرنجڕاکێش، قۆز، باڵابەرزو بەهێز، دلێر، بەئەدەب و فروتنی (متواچع) بوو.

کاتێك مێردمنداڵ بووە، قوتابی (هنری) باوکی (چارل دیگۆڵ) بووە کەسەرۆکی بەشی لێکۆڵینەوەی ئامادەیی لەشەقامی (ڤژیرا) ی پاریس بووە. دوای چەند ساڵ باوکم (چارڵ دیگۆڵ)ی لە (ئاراس) دیوە. لەوسەردەمەدا ئەوان ئەفسەرو پەیوەندی هاوڕێیانەیان هەبووەو لەیەکەی٢٣ی پیادەی سەربازی (ئاراس) بەفەرماندەیی مارشاڵ (پتن) خزمەتیان کردووە.

باوکم لە(دینان)، لەسەرسنوری بەلجیکا، بەسەختی بریندارببووەو یەکێك لەیەکەمین میدالیای (لژیون دونور)ی یەکەمین جەنگی جیهانی پێخەلات کراوە.

ئەوو (دیگۆڵ) لەشەڕی (بری ئوباك)ی ساڵی (١٩١٦) سەردانی یەکتریان کردووە. لەوێدا باوکم دووبارە بریندارببوەو (دیگۆڵ) زیندانی کراوە. پاش ئەوە ئیتر باوکم بۆکاری چالاکانە گونجاونەبووە. پەیوەندی کردوە بەدەستەی ژێر فەرماندەیی جەنەڕاڵ (پرشینگ) کەلێپرسراوێتی هێزە سەربازییەکانی ئەمریکای لەسەرسنووری فەڕەنسا لەئەستۆبووە.لەنێوان ئەو خۆبەخشانەی کەئەو پەروەردەی دەکردن (جۆرج مارشال)ی گەنج ، جۆرج پتن، عمر برادلی، داگلاس ئارتوری تێدابوو. پاش سێ ساڵ، ئەم کوڕانەی (پرشینگ) لەفەرماندەیی هێزی هاوپەیمانەکان لەدووەمین جەنگی جیهانیدا بوونە لێپرسراو؛ من وەك کوڕی هاوڕێی سەربازییان زۆربەی جار لەوپەیوەندییە سوودمەند بووم.

دیارە زانینی ئەو شتانە بەدڵنیاییەوە هونەرەکەی فەرەنسێك بوود لەو گروپە پایەبەرزەدا، بە کوڕی کەسێك دەگەن ، کەخەڵکی زۆر بەتواناى پەروەردە کردووە.

کاتێك منداڵ بووم بەسێ زمان دەئاخاوتم، ئەمەش بەهۆی دایکو باوکی فەڕەنسایی، مامۆستای تایبەتی ئەڵمانیو دایەنە ئیرلەندیو ئنگلیزیەکانەوە مەیسەربوو. ئێمە خێزانێکی دیارو بەرچاوبووین. یەکێك لەیادەوەریەکانی قۆناغی منداڵیم دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێك کەدایەنەکەم بەمیهرەبانییەوە بەگوێمدا دەیچرپاند (دایکت بۆماچکردنو شەوشادکردنت هاتووە.)

خانمێك کەگەردانەیەکی سێڕیز مرواری لەگەردندا بوو بۆ پاککردنەوەی ژوورەکان دەهاتە ئێرە. بەسەرمدا دەچەمایەوەو دەیگوت: (بەنیازی دیدار). دایك بۆخواردنی نانی ئێوارە دەڕۆشت. دەرگا دادەخراو دەنگی ئاژوتنو دوورکەوتنەوەی ئۆتۆمبیل دەهات.

من سەرەتا لە (لیەڕوش) کەقوتابخانەیەکی ناسراوە لەنۆرماندی، دەمخوێند. پاشان چەند ساڵ لە(سویس)و لە (نری بورگ) وانەم خوێندووە. هەڵبەتە کەسێکی زیرەك نیم. هەموو ئەوشتانەی کەخێزانەکەم دەیانخواست

ئەوەبوو کەمنداڵەکانیان وریابن‌و بزانن چۆن هەستەکانی خودی خۆیان دەردەبڕن. هەروەها بتوانن باش ئەسپ سواری بکەن. (ئیتل)ی پورم واتەخانمی بەڕێز (هنری دان) لەناو کۆمەڵەی کۆچبەرانی ئەمەریکایی لەفەڕەنسا، کەسایەتیەکی دیاری هەبوولەگەڵ دایکم، لەشارێکی بچوکدا، دراوسێی یەکتری بوون.

لەوڕۆژانەدا، پەیوەندیەکانی خێزانی دایکم ببوە هۆی ئەوەی ببینە یەکێك لەخێزانەگرنگەکان‌و لەگەڵ کۆمەڵی کۆچبەرەکان هاوکاریمان هەبێت، بەوهۆیەوە میوانی زۆرمان هەبوو. ئەوانە کەسانێك بوون کەمن لەوانەوە فێری ڕەوشتی دیپلۆماتیك‌و جاسوسی، ستراتیژی سەربازیی‌و سیاسەت بووم. هەموو هونەرە باڵاکانی، ڕێچکە جیاوازەکانی پەیوەندییە نەتەوەییەکان لەگەڵ یەکتری‌و لەگەڵ مێژووەکان‌و ڕێساکانی تایبەت بەخودی خۆیان، دادەبڕێت. ئەم ڕێچکانە بەجۆرێکی ڕێکوپێك بارەکان دەگۆڕن.

یەکێك لەوکەسانەی کەزۆر سەردانی دەکردین گەنجێك بوو بەناوی (ڕۆبرت مۆرفی) کە لەوکاتەدا بەڕێوەبەری سێیەمی کۆنسڵی ئەمریکا بوو. ئێمەهەموومان پەرۆشی ئەوبووین‌و ئەویش زۆر پەیوەست بوو بەئێمەوە. بۆیە هەرکاتێك میوانداری لەماڵی پورە (ئیتل)، کە لەشارۆچکەیەکی بچوك بوو، سازدەکرا، هەمیشە شالیاری ئەمریکی (ویلیام بۆلیت) کەدۆستی نزیکی مامە (هنری) و پورە(ئیتل) بوو، بانگهێشت دەکراو (مۆرفی)شی لەگەڵ خۆی دەهێنا. پاشان لەهەموو هەنگاوێکی جەنگیی هاوپەیمانەکاندا لەدووەمین جەنگی جیهانیدا بەکەسایەتیەکی زۆر گرنگ لەقەڵەم دەدراو پەیکی پەیوەنداری کەسێتی‌و نهێنی‌و دیپلۆماتی سەرۆك ڕۆزفلت لەئەورویا بوو. بەڕێکەوت لەژیانی منیشدا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو.

ڕوونکردنەوەی ئەم پەیوەندییە خێزانیانە کەکاریگەریان لەیەکەم ساڵەکانی پەیوەندییەکانمدا لەگەڵ کەسانێکی کەمێژووی سەردەمەکەمانیان دەنەخشان، گرنگە، بەڵکو بەوهۆیەوەیە لەدیاریکردنی ڕێچکەی داهاتووی ژیانمدا ڕۆڵی سەرەکی‌و خاوەن گرنگییەکی تایبەت بوون.

(مارشاڵ فوش) منی دەهاویشتە سەرکۆشی.
(مارشاڵ پێتن) دەفتەری ناونووسکردنی ژنخوازی لەئاهەنگی بوكو زاوایەتی دایكو باوکمدا ئیمزا کرد.
یەکێك لەکۆنترین یادەوەرییەکانم تایبەت بە(جەنەڕاڵ پرشینگ) دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەمەی کەجارێکیان بۆ فراوین کردنی کۆتایی هەفتە بۆ یەکەمجار هاتبووە ماڵمان. خانووەکەمان لەدووری هەشتا کیلۆ مەتر لەپاریسەوە بوو ئەویش بەئۆتۆمبیلێك کەبۆنی مسکی لێدەهات گەیشت. ئێمە سوارئۆتۆمبیلەکەی ئەو بووینو بۆ گوندەکانی (نۆرماندی) کەگۆڕی سەربازانی گومناوی لێبوو چووینو لەبەرامبەر گۆڕی باوکم وەستاین. لەڕێگای گەڕانەوەدا سەبارەت بەباوکم تاریفێکی دوورو درێژی کرد؛ لەوەی کەچەند ئەفسەرێکی باشو شایستەبوەو لەیەکەمین جەنگی جیهانیدا چەند کۆمەکی ئەمریکیەکانی کردووە. من هەرگیز سێیەمی سپتامبەری ١٩٣٩ لەیاد ناکەم، مێژوویەك کە بۆهەمیشە لەهزرمدا هەڵکەندراوە.
کاتێك ڕاگەیاندنی جەنگ وەکو هەورەبروسکەو هەورەگرمە بەجیهاندا بڵاوبۆوە من لەقوتابخانەیەك لە (فری بورگ)ی سویس سەرقاڵی کۆکردنەوەی هەندێك پارە بووم. بەبێ دواکەوتن بۆ فەرەنساو خزمەتکردن لەڕیزی سوپادا گەڕامەوە. یەکەم ئەزمونمان لەتاکتیکی جەنگیدا ناسراو بە (هێرشی بروسك ئاسا) یان (جەنگی گڕاوی) هێرشێکی گشتی بەیەکە ماتۆڕسوارە تیژڕەوەکان بوو، کەکارێکی سەرنجڕاکێش بوو. پاش ئەوە هەستان بەپایەماڵکردنی هێزە بەرگرییەکانی ژێر فەرماندەییان. هێرشی ناوبراو سەلماندی کەتەنها تاکتیکێکە بتوانرێت لەدووەمین جەنگی جیهانیدا بەکاربهێنرێت کەلەسێ شەڕی تری گەورەی ئەم سەدەیەی جیاکردۆتەوە. بەرامبەر بەپێشڕەوییە ئاگرینەکانی سوپای ئەڵمانی، هێزەکانی فەرەنسا لەماوەی کەمتر لەیەك مانگدا تێکشکان. بەڵام لەڕاستیدا هێڵی (ماجینۆ) کەسوپەرێکی سەرسوڕهێنەربوو هەرگیز تێکنەشکا. ئەم هێڵە بریتی بوو لەقایمکارییەکی کۆنو قورس کەبەدرێژایی بەرەکانی باکوری فەرەنسا کێشرابوو تا ببێتە

بەربەست لەبەردەم هێرشی دەوڵەتانی نەیارو هێرشبەرو نەدەتوانرا تێکشکاندنیان پێشبینی بکرێت. بەڵام بەهۆی بوونی هێرش بەرانی زۆر خێراو ئامادەکراوە، ئەو بەربەستە گەورەیە بەسانایی ئاسانی بەلاوەنرا.

ئەڵمانیەکان، لەدوورەوە بەکەشتی وەك دەستە خوشکێکی بێزراو فەرەنسا یان کوتابوو، بەهۆی دادوەری خراپی سەربازیانەو لاوازی یان حەزنەکردن بەناسینی دوژمن و قبوڵکردنی واقیعە ستراتیژییە نوێیەکان، فەرەنسایان بەجێهێشت. سوپەرە ناوبراوەکان پاشماوەی خولی شەڕەکانی پێشوو بوون. ئەم سەنگەری شەڕانە بەوهۆیەوەی کەدەگەڕانەوە بۆ یەکەم جەنگی جیهانی، لەڕووی چەکدارکردن و تاکتیکی بەکارهێنانەوە لەدووەم جەنگی جیهانیدا وەلانرابوون و بێ کارهێنان مابوونەوە.

فەرماندەیی باڵای فەرەنسا بەهۆی ئامادەگییەکی لاواز، بێتوانا، نەبوونی رێکخستن و بەکورتی دەزگایەك کە بەهۆی زەمینەسازی سیاسییەوە تووشی ئیفلیجی بوو بوو، نەیتوانی فەرەنسا لەگەڵ واقیعە سەربازییە نوێیەکاندا رووبەڕوو بکاتەوە. ئەوان لەگەڵ زەین کوێریان کەسەرچاوەکەی دیدی مێژوویان بوو، ئەوەشی نەیاندەتوانی دەرك بە (عەقڵی یاسایی) خولی ئایندەبکەن، یەکەمین ئاگادارکردنەوەکانی دەزگا سیخوڕێکەیان دەربارەی تاکتیکە نوێیەکانی هێرشەکانی چیکوسلۆڤاکیاو پۆلۆنیادا بەکارهێنرابوو نادیدەگرتبوو.

ئەم وڵاتانە زەبری خێرایان بەئەوروپای سەنترالی و خۆرهەڵاتی گەیاند کەکەنارەکانی دەستەڵاتی لەئەورووپای خۆرئاوا پێش هەڵگیرساندنی شەڕ جێگیر کردبوو. لەگەڵ ئیفلیج بوونی هێزەکان کەدەرئەنجامی نادیدەگرتنی واقیعە نوییەکان بوو، سوپای فەرەنسا رووبەڕووی فشاری سەخت و گەورەتری یەکە باڵادەست و چالاك و سەرسوڕهێنەرەکانی ئەڵمانیەکان بۆوە کە لەپشتی پەردەوە گەشەیان دەکرد. هێرشی ئاسمانی ئەڵمانیا بۆ سەرفەرەنسا کە لەماوەیەکی کورتدا ڕوویدا، یەکەمین ڕووبەڕوو بوونەوەی من لەگەڵ پیشەی جاسوسی سوپایی و بەرنامە رێژی ناوخۆییدا بوو. لەوکاتانەدا

خۆم گەواهی ئەو ڕێگایانەبووم کە بەوگارییانەی ئەسپ ڕایدەکێشانو ئاوارەیان هەڵگرتبوو تەنرابوونو لەلایەن پێشەنگێکی لاوی سوپای فەڕەنساوە لەشوێنێکدا کەبەزەحمەت دەیانتوانی تیایدا بحەوێنەوە بەرەلای دەکردن. ئەو گەنجەی کەتفەنگەکەی سەرەوخوار گرتبوو بەپەرێشانحاڵییەوە لەلای خواری جادەکەوە ڕێیدەکردو لەحاڵەتێکی ترساویدابوو، زۆر بێئەدەبانە لەسەرجێگا لەگەڵ پاسەوانێکی سوپای خۆماندا بەشەڕهات.

گاردی پۆشتەی ئەڵمانیا بەکۆتی درێژی خاکیو بەسواری ماتۆڕەوە کەزۆربەیان لەتەنیشتەوە کابینەی سەرنشینێکی تریشی هەبوو، ئامادەو زۆرچالاک بوون، بەدوای ئەودا دەگەڕان.

لەئەنجامدا من ڕێگاکەم بەرەولای ماڵی خێزانەکەم لە (نۆرماندی) گۆڕی. لەوێ هەموو باسوخواستێکی هاوڕێو دراوسێکانم سەبارەت بەجەنەڕاڵ (دیگۆڵ) دەربارەی خواستەکانی بۆ بەرگریکردن بوو. جەنەڕاڵی لاوی فەڕەنسایی، پشتگیری خێراو نامەردانەی مارشاڵ (پێتن)ی بۆ ئیمزاکردنی وەستاندنی شەڕ، ڕەتکردبۆوە.

ئەو لەجیاتی ئەوە بەفڕۆکە چووبوو بۆ لەندەن. لەوێ لە(١٨/حوزەیران/١٩٤٠) بڕیای بەناوبانگی خۆی کەبریتی بوو لەبانگهێشت کردنی سوپا بۆ بەرهەڵستیکردن دەرکرد. لەڕاستیشدا من ئیمزای خزمەتکردنم تەنها بۆکاتی جەنگ کردبوو، بەلام بەگوێبیستی وتاری (دیگۆڵ) گەیشتمە ئەو بڕوایەی کەبەبوونی هێزی داگیرکاری ئەڵمانیا بەهیچ شێوەیەك جەنگی منیش کۆتایی نەهاتووە. لەبەرئەوەی هەتا جەنگ بەردەوامی هەبێت ، من سووربووم لەسەربەشداری کردن. ئەمەش بەسادەیی درێژەی هەمان بەردەوامی جەنگ بوو.

هەلێکم بۆ ڕەخسا لەگەڵ کەشتییەکی پۆلۆنی، کەدەچوو بۆ بەریتانیا بچمە ئەوێ. ئەو شوێنەی کەلەوانەبوو لەگەڵ جەنەڕاڵ (دیگۆل) زۆربەی بەرپرسانی ولاتەکەم یەکبگرینەوە. بەلام پێش ئەوەی بیر لەدووبارە

دەستپێکردنەوەی جەنگو توانای ڕۆشتن بکەمەوە ناچاربووم کاروبارە شەخسیەکانم ڕێکوپێك بکەم.

کێڵگەکانم لە (نۆرماندی) بەهۆی هێرشی ئەڵمانیەکانەوە بەجۆرێك وێران بووبوو وەك ئەوەی هەرگیز کشتوکاڵی تیانەکرابێت.

کرێکاری کێڵگەکانی منو هاوسێکانم بەناچاری سواری گارییەکان بوونو پەرشوبڵاو بوون. ئەوانە جگە لەڕۆشتن هیچ جێگایەکی دییان نەبوو. هەرچەندە خانووەکەم بەهۆی هێرشی سوپای دوژمنەوە تاڵان کرابوو، بەڵام زۆرترینی ئاژەڵەکانم مابوون. ئەڵمانیەکان ئەوەیان لەلائاشکرابوو کە لەیەکەم ساڵی داگیرکردنەکەیاندا پێویستیان پێیان نابێت. لەوێدا نەتەلەفون هەبوو نەکارەبا. زیاتر لەیەك هەزار جریب (بەرامبەر بەدەهەزار مەتر چوارگۆشە) زەوی کشتوکاڵی بۆ پەروەردەکردنی پوشو باشترین گاوگۆتاڵ بۆ گۆشتو زاوزێ هەبوو. بەگشتی سەدوبیست سەر گاوگۆتاڵم هەبوو، چونکە ئەوانە یەکەم ئامانجی سوپای داگیرکاری ئەڵمانیا بوون، تووشی زۆر دەردی سەریان دەکردم.

فەڕەنسا بووە دووبەش؛ نیوەی بەشی باکوری کەشوێنی لەدایکبوونی من بوو، داگیرکراو ڕاستەوخۆ تابارەگای دەوڵەتیو سەنتەری ڕاپەڕاندنی سوپایی ئەڵمانیا لەپاریس درێژ بووبۆوە. ئیتر کەسێك لەئارادا نەبوو بڵێت هێشتا فەڕەنسایە. لەگەڵ ئەوەشدا، نیوەی باشوور بەڕووکەش لەناو قەڵەمڕەوی فەڕەنسادا بوو کەتابارەگای دەوڵەتیی فەڕەنسا لە (ڤیش) درێژ دەبۆوە. بەڵام هەموو ئەم بەشکردنانە چاوو ڕاوبوون. دەوڵەتی (ڤیش)ی بەئاشکرا دەسکەلای داگیرکارانی ئەڵمانیا بوو، تەنها خاوەنی جیاوازییەك بوو. ڕێگای دابوو بەئەمەریکیەکان لەناو واقیعو قەڵەمڕەوی ئەڵمانیادا کۆنسوڵیەکی هەبێت کەئەوەش بووە سەنتەرێکی جاسوسی دژ بەنازییەکانو بیروباوەڕەکانیانو یاریدەدەری بەبزاوتی بەرگریخوازی فەڕەنسا.

منو سەدەها کەس لەهاوکارانم تائەوپەڕی لەم دەرگا بچکۆلەیەی لەجیهانی ئازاد مابۆوە سوودمان وەرگرت. من هیچ ڕقێکم بەرامبەر بەخەڵکی ئەڵمان نەبوو، بەڵام هیچ بڕوایەکیشم بەو بانگەوازەیان کە بەبێ خواستمان هاتبوونە وڵاتەکەمانەوە نەبوو. بەدرێژایی مانەوەم لە (نۆرماندی)، لەوکاتەوەی لەساڵی (١٩٤٠)وە کە لەسەرخاکی داگیرکراو کاری نهێنیو ژێرزەمینم لەگەڵ بزاوتی بەرگریخواز دەستپێکرد، هەوڵمدا وەك پەندخوازێك، توندوتیژ ڕەفتار بکەم. ئەم فۆرمی ڕەفتارە لەوەودوا تا ئەمڕۆ وەك یاسایەکی چەسپاو لەکاری جاسوسیداو لەپشتی هێڵەکانی دوژمنەوە بەکاردێت. بەڵام ڕێساگەلێکن کەزۆرجار تەنها دەتوانرێت لەڕێگای سەرچڵێترین ڕێچکەکانی ئەزموونگەرایو هەڵەوە فێرببین. بەپێی ئەمە خۆم لەکڕینی هەموو شتێك لەبازاڕی ڕەش لادەدا. هەرچەندیش یەك یان دوو ڕێگام بۆ بەدەستهێنانی تایەی پاسکیل (کەبەدەگمەن دەستدەکەوت)و پێڵاوی زستانە پەیدا کردبوو. من هیچ تێکەڵاوییەکی کەسایەتی یان کۆمەڵایەتیم لەگەڵ ئەڵمانیەکان نەبوو، بەڵام چونکە ئەڵمانی قسەم دەکرد، خۆ بەخۆ لەناوخاکی داگیرکراودا بووبوومە دەمڕاستی گوندە بچوکەکەمان. هەندێ کات کەئەوان بۆسەردانی ڕەسمی دەهاتن، کرد بوومە خوپێیان بڵێم: (من داواتان لێناکەم دانیشن، چونکە گەر ئێوەش لەجێگای من بن، باوەڕناکەم داوای وا لەمن بکەن.)

خانووەکەم هەر لەسەرەتاوە دەستی بەسەردا گیرابوو. بۆ خانوویەکی بچوکتر کەدیواری پانی هەبوو گوێزابوومەوە. لە بەیانییەکی ڕۆژی یەك شەممەدا دەنگی ستۆپی تایەی لاستیك لەدەرەوەی خانووەکە دەهاتە بەرگوێ خانەخوێیەکەم بەشڵە ژاوییەوە بەقادرمەکاندا سەرکەوتو وتی: (ئەڵمانیەکان لێرەن).

من بەدرێژایی دوێنێ شەو لەگەڵ هاوڕێکەم، (جۆرج–دی) کەجووبوو، سەرقاڵی پاککردنەوەی دەبۆو چەکەکانی کەبۆ بزاوتی بەرگریخوازانمان دانابوو، بووینو هەمیشە لەشوێنی تایبەت بەپەتاتە لەژووری ژێرهێلانە کۆنی

کۆترەکان، دەمانشاردنەوە. لەبەرئەوەی وامانـدەزانی تـا ئێـوارەی ڕۆژی داهاتوو ئەوکارە تـەواو دەکـەین، چەکـەکانمان لـەژووری نووستنەکەی مـن لەنهۆمی یەکەمی ئەو خانووە بچوکە لەسەریەك هەڵچنی و بەجێمان هێشتبوو. ئەفسەرەکەی سوپای ئەڵمان کاغەزێکی لولکراوی پیشـاندامو بەڕەقییەکـەوە وتی: (بەپێی زانیاری ناو ئەم نامە بێناوە، تۆ لێرە چەکت حەشارداوە.)

ساتێکی ترسناك بوو.

درێژەی دایە: (ئەزانی چی ڕوودەدات ئەگەر ئێمە ئەو چەکانە بدۆزینـەوە؟ لەسێدارە دەدرێیت؟

وەڵامم دایەوە: (سەدجار بەدلنیاییەوە گەرئێمەش لەجێگای ئێوە بووینایە هەمان شتمان دەکرد.)

بەبێ ئەوەی کەمترین داوای ڕوخسەت یان پێشنیاز لەئاوازی دەنگیدا بێت، وتی: (ئێستا بەیارمەتی خۆت، ئێمە هەموو شوێنێك دەپشکنین).

لەوساتەدا دەمتوانی لەسێدارەدانی خۆم بهێنمـە بـەرچاو. وێنـاکردنێك کـە بەهیچ شێوەیەك مایەی خۆشحاڵی نەبوو؛ بەتایبەتی لەتەمەنی بیست ساڵیدا. ئەو دەمە فێر بووم کەلەرزین و ڕەنگ بزرکاندن یـان هـەوڵدان بۆشاردنەوەی هەرجۆرە هەڵچوونێك چەند دژوارە. ئەمە وزەیەك بـوو کـە لەکارەکـەمدا وەك ئەفسەرێکی جاسوسی لەزۆربـەی کاتـەکاندا مایـەی سـوودو کاریگـەری بـووە بۆم.

ئەوان بەدرێژایی ڕۆژ (ڤێلا) کـەیان پشـکنی و ڕووبـاری نزیـك خانووەکـەش باش گەڕان.

ئـەوڕۆژە بـەخۆمم دەوت: لەوانەیـە دووبـارە بگەڕێنـەوەو هـەموو ماڵەکـەم ژێرەوژوور بکەنەوە. تەنانەت بیرم بۆ ئەو شوێنانەش دەچوو چەکی تێدابێت، کەمن هەرگیز چەکم تێدا حەشارنەدابوو. پاشان چیم بـەخۆم دەوت؟ ئەمـەی کە: (ئەم ئامێری جەنگە ناتوانێت هیچ لەگەڵ من بکات).

هەڵبەتە لەڤێلاکەدا هیچیان چنگ نەکەوت، شەکەت لەگەڕانی بێسەمەری خۆیانو، لەگەڵ پاڕانەوەی پەڕەموچە ئاسای ئەوانی تر، تەنانەت زەحمەتی پشکنینی خانووە بچوکەکەی منیان نەکێشا. ئیتر هەرگیز نەگەڕانەوە.

لەسەرئەوەشەوەو خۆشبەختانە ئەوانە ئەفسەری سوپای بەرگری ئەڵمانو لەپلەی ئاسایی داگیرکاریو سوپاییدا بوون. ئەوان ڕەفتاریان دروست بوو. ئەگەر کەسێك تووشی (گشتاپۆ)، پۆلیسی نهێنی تۆقێنەرو بێزراو ببوایە، شتێکی تردەبوو. بەدرێژایی جەنگ، بەدەگمەن لەلایەن هێزی داگیرکارەوە غافلگیرکراوم. ئەوان بەوجۆرە هەڵسوکەوتیان دەکرد کەچاوەڕوان دەکرا لەسەرزەمینێکی نامۆودوژمندا ڕەفتاربکەنو، سوودیان لەو جیگایانە دەبینی کەلەلایەن هاونیشتمانیەکانمەوە بۆیان ئامادەدەکرا. کەرەتێك کە هێشتا ماوەیەکی زۆر بەسەرپەیوەندیە کانمدا لەگەڵ ئەفسەرانی ئەڵمانی تێنەپەڕی بوو، کرێکارێکی بەتەمەن لەگوندەکەی من بەهۆی هەڵەیەکی بچوکەوە زیندانی کرا، بۆ گرتنەکەی سەردانی فەرماندەیی لۆکاڵی (محلی)م کرد. ئەوکەسەی لەوکاتەدا لەوێبوو ئەفسەرێکی پیری سوارەی سوپایی بوو، کەئێمە لەسەرەتادا سەبارەت بەئەسپ و، پاشان دەربارەی شوێنەکەی کەبەئاشکرا حەزی پێی نەبوو، گفتوگۆمان کرد. دادوبێدادی بوو لەوەی کە: (بەهۆی بەتەمەنمەوە ڕەوانەی ڕوسیایان نەکردم، لێرەش کارێکی پیسو نەفرەتیم هەیەو، لەهەمووشی خراپتر سەیرکە ئەم هەموو نامە بێناوانەی هاوولاتیەکانت بەمەبەستی تاوانبارکردنی دۆستو دراوسێکانیان بۆم دەنێرن !). لەچاوێکی مێزەکەدا کەپڕبوو لەکاغەزو شتومەك بەستەیەك نامەی سەددانەیی بەستراوی دەرهێنا بەرقەوە وتی: (نامەی بێناوونیشان. سەبارەت بەمەدەڵێیت چی؟) منێکی کە بەدەگمەن لەوجۆرە شوێنانەدا تووشی سەرسوڕمان دەبووم، تێگەیشتم کەلەپێشتریشدا خودی خۆشم یەکێك بووم لەقوربانیانی ئەونامانە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی منی دوچاری سەرسووڕمان دەکرد دووڕووی هاونیشتمانیەکانم بوو.

لەکاتی گەڕانەوەم بۆ فەڕەنسا لەدوای کۆتایی جەنگ بۆم دەرکەوت کە لەوسەردەمەدا لەسەداچل‌و دووی هەموو دانیشتوانی وڵات کاریان بۆ براوتی بەرگریخوازان دەکرد. وادەردەکەوت لە(نۆرماندی)، ئەوکەسانەی کەقارەمانی ئیرلەندی براوتی بەرگریخوازان بوون، کاتێ گەیشتبوونە ئەو بڕوایەی کەلەوانەیە هاوپەیمانەکان سەرکەوتن بەدەستبهێنن، بەپەرۆشەوە لەهەوڵی کارکردندا بوون وەك سەرچاوە لەڕیزەکانی (گشتاپۆ)دا تاجەنگ بەکۆتایی دواقۆناغەکانی بگات. لەگەڵ ئەمەشدا، کاتێ من لەبیری سامانەکانی خۆمدا بووم‌و لەگەڵ سەرانی ئەڵمانیەکان گفتوگۆم دەکرد، لەدوورەوە تەماشای (شاتو)م دەکردو چاوەڕوانی فرسەتێك بووم تا بەتەواوی ڕۆڵی خۆم لەجەنگدابگێڕم. ئەوەی من لەدەستم دەهات لەوگۆشە بچوکەی فەڕەنساوە بۆبزاوتی بەرگری بەئەنجامی بگەیەنم، ئەنجامم دا. من بەهاوکاری هاوڕێکانی ترم لەناوچەی داگیرکراودا، نەخشەیەکی سادە، لە دامەزراوە سەربازییەکانی دوژمنم ئامادەکردو بۆهێزی هاوپەیمانەکان لەقونسولگاکان یان ئۆفیسەکانی تری کە لەنزیك کەنارەکانی دەوڵەتی (ڤیشی) دەستنێژە بوون، ناردم. لەسەرو ئەوانەشەوە، ژن‌و مێردێکی ئەمەریکاییم لەئاستی بەرزی دیبلۆماسیدا دەناسی ، بۆ نمونە ئەدمیراڵ (ویلیام لی) کەپاشان بووە سەرۆکی کارمەندانی کۆشکی سپی لەسەردەمی سەرکۆمار ڕوزفلت، وڕۆژنامەنووسانی وەك (ڕالف فۆرت) کەچەندین ساڵ بەرپرسی بڵاوکراوەی (پرس) بوو لەمەدریدو هەروەها وەك ڕاوێژکاری (ئارنست هەمنگوایی) لەهەموو قۆناغەکانی بازی گادا لەڕۆمانی (زەنگەکان بۆکێ لێدەدرێن؟) ڕۆڵی کارمەندی گێڕاوە. من بەکۆمەکی ئەوانە چەندسەفەرێکی سەرسوڕهێنەرم لەنێوان سەنتەری چالاکی خۆم‌و (ڤیشی)دا ڕێکخست. من گەواهی دروستکردنی فڕۆکەی ئەڵمانی لەنۆرماندی بووم کەوێنەیانم گرتوو ئەو بەڵگەنامانەم بۆ کۆنسوڵی ئەمەریکا لە(ڤیشی)و (ڕالف)، کەڕۆژنامەنووسی ئەمریکایی نیشتەجێی (ڤیشی) بوو، برد. ئەم کارە پێشەکیەکی باش بوو بۆ کاری جاسوسیم، چونکە دەبوو ئەو بەڵگەنامانە لەناوهەوای ناهەموارو ڕەشەباو ڕۆشتن بەپیادە لەسنوور بپەڕێنرێنەوە کە لەژێر چاودێری ورد دابوون؛ واتە لەخاکی داگیرکراوە تا

(ڤيشی). ئەو جێگایەی کەتیایدا هێزی هاوپەیمانان بتوانن لەکۆنسڵی خۆیانەوە نامەبەرەکان وەربگرن‌و لەڕێگای دەریاوە ڕەوانەیان بکەن. لەجووڵەی ناوبێدەنگی‌و ئارامی شەوداو بەدرێژایی جادەی گوندەکان کاتێ گروپی بەرگریخوازان جێگاکانیان دەگۆڕییەوەو نامەیان ئاڵوگۆڕ دەکرد، من فێری وانەی بەبەهای پێکەوە گرێدانی کاری ڕێکخستنی جەنگی‌و چالاکی‌و پیشەی هەواڵگری بووم. لەوسەردەمەدا تۆڕێکم دروستکرد کەتا کاتی بڕیاری هەڵاتنم لەڕێگای چیاکانی (پیرنە)وە، درێژەی بەکارەکانی خۆی دا. لەماوەی هەمان سەردەمدا بوو تێگەیشتم کەکاری جاسوسی‌و هەواڵگری لەهەزاران پارچەو سەرەداو دروست بووە؛ بەتەواوی وەك پارچەکانی یاری (خلسکێنە).

کارە جاسوسیەکانی بزاوتی بەرگری لەبنەڕتدا بریتی بوو لەکۆکردنەوەی ڕۆژانەی زانیاری دەربارەی چالاکیەکانی سوپای ئەڵمان کەئەگەر لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە هێرش دەستی پێبکردایە، بۆ وێرانکردنی جێگای هێزی نازییەکان زۆرگرنگ بوو. لەهەمان کاتدا، ئەو جۆرە زانیارییانەش بۆبزاوتی بەرگریخوازەکان زۆر پێویست بوو کەدەیتوانی بەئەنجامدانی کاری تێکدەرانە بەهەمیشەیی شوێنی هێزی داگیرکەران نائارام بکات.

سەرەڕای ئەوەش، زانیارییەکی شێوازی بیرکردنەوە بوو کەدەیتوانی هاوسەنگی یەکێتی هێزەکانی داگیرکار بدات بەیەکداو ئەو سەرچاوانەشی کەبۆ بەرگریکردنی تەواوی خۆیان‌و دەستەڵاتیان بەسەرخەڵکی فەرەنسادا پێویستیان پێیبوو، لەناو ببات. بەپێی ئەمە، لەم هەلومەرجەدا، ئەگەری باوەڕنەبوون بەهەموو تاکێکی فەرەنسایی هەڵدەکشاو مەیلی هاوڕێیان‌و یەکگرتوان بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ هاونیشتمانیەکانم کەمتر دەبۆوە.

بەکورتی، فێربووم کەجاسوسی‌و چالاکی کەبەرهەمێکی ئەو جۆرە زانیارییانەن، وەك شەڕێکی ڕووبەڕوو دەتوانێت ڕۆڵی سەرەکی هەبێت لەسەرکەوتندا.

لەکۆتاییدا کاتێك بوومەبیستو یەك ساڵ، بڕیارمدا فەڕەنسا بەجێبهێڵمو تاگەیشتن بەئامانجی (فەڕەنسایەکی ئازاد) یان (یەکێتیەکی یەکگرتووانە) بەردەوام بم لەسەر چالاکی سەربازیانە لەژیانمدا.

تۆڕی هەواڵگرییەکەی من لەناوخاکی داگیرکراودا بەباشی بونیادنراو بوو، کارەکانی خۆی ڕادەپەڕاندو لە (ڤیشی) ئامێری کاریگەرو گونجاوی بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی لەگەڵ هاوپەیمانەکان لەبەردەستدابوو. بەهاوکاری هەمان تۆڕ پەڕینەوەم لەچیاکانی (پیرنە) بەلای ئیسپانیادا ڕێکخستو ماڵ بەماڵ بەکێڵگەکاندا تێپەڕین تا گەیشتینە باکوری ئەفریقای ئەمڕۆ. وەك کەسێکی ئەمەریکایی بەڵام هاووڵاتیەك بەبەرگی جیاوازەوەو بەبێ ناسنامەو بەشێوەیەکی نایاسایی، پاش مانەوە بۆ ماوەیەکی کورت لەزیندانی ئیسپانیادا، مۆڵەتی چوونەناو تەنگەی (چیای تارق)م پێدرا. چونکە بەکەسێکی ئەمەریکایی دانرابووم، ئەوان لەدەرکردنی حوکمەکەمدا بەزمانی ئنگلیزی گرفتێکیان نەبوو. یەکەمین دیمەنی کەلەوێدا بینیم، ئەفسەرێکی سەربەدەریایی شانشینی بوو کە بەبەرگێکی ڕەسمیو سەربازییەوە لەسەرسەنگەرە کاتیەکانی درێژایی هێڵی سنور پاسەوانی دەکرد. بۆ ئێمە ئەو نوێنەری هەموو ئەوشتانە بوو کەئێمە لەپێناویدا خەباتمان دەکرد.؛ واتە دونیایەکی سەراسەر ئازاد. پاش سەفەرێکی کورتی ناو دەریای ناوەڕاست، سەرئەنجام گەیشتمە جەزایر، ئەو شوێنەی کەتیایدا پەیوەندیم کردبە لەشکری دووەمی سوپای جەزایریەکانەوە. ئەو لەشکرە هەڵۆیەی لەپێناوی فەڕەنسای ئازادا لەباکوری ئەفریقادا دەجەنگی. ئەوانە سەربازانی پیشەیی خاوەن دیسپلینێکی ئاسنین بوونو منیش لەوێدا دەستم کرد بەفێربوونی پیشەی سوپایی کەپاشان زۆر بەکەڵکم هات. ئێمە لەهێڵی سنوری (ئور–ریف)ی ناوچەی (تیلمسان)ی جەزایر جێگیربووین. ئێمە جەنگاوەرانێك بووین کەلاوچاکانی فەڕەنسیو هەڵخەڵەتێنەرەکانی (هۆلێود) لەیەك جێگادابووین؛ هەڵخەڵەتێنەرانی وەك درەوشانەوەی خۆر، ڕەنگەڕوونەکان، ئەسپو ژنانی قەشەنگی کەتایبەت بەهۆلێودە.

ئەمە شێوەو پێکهاتەی لەشکرێکی دەرەکی بوو. بەڵام زووزانیم کە ئێمە لەجەنگدا هەرگیز بەشێوە کلاسیکیەکە شەڕمان نەدەکرد. زۆرسادەیە، لەدووری نزیکەی هەزارمیل لەبنکەی (سوپای)ی، هیچ هەنگاوێك دژ بەئەڵمانیەکان نەدەنرا. بیە پاش چەندمانگێك ویستم بگوێزرێمەوە بۆ جەزایر. جەزایریە فەڕەنسیەکان واتە ئەو کەسانەی ئەمڕۆ ناومان ناون (pieds noirs—کۆچبەرانی جەزایری فەڕەنسا)، لەژێر فەرمانداری جەنەڕاڵ (جوین)دا بۆشەڕ ئامادە دەکران. ئەوانە زۆربەیان سەربە (جوین) بوون. لەڕاستیدا (جوین) تەنها کەسێك بوو کەمن لەوکاتەدا بیستبێتم لەگەڵ ڕابەری گەورەی میللەتی فەڕەنسادا بەڕاناوی خۆمانەی (تۆ) گفتوگۆی دەکرد. لەڕاستیدا لەپاش ئازادکردنی پاریس بوو کەکاتێك هاوپەیمانەکان لەژووری جەنگیدا بڕیاریاندا سەرکردایەتی جەنگی ئەوروپا لەکۆشکی (تریانون)ەوە بۆ (ڤرسای) بەرن، من (دیگۆڵ)م ناسی. (جوین)و من لەیەکەمین شەپۆلی هێزەکانی فەڕەنسابووین بۆ ئازادکردن بەخێرایی چووینە ناوپایتەختەوە.

مەبەستی ئێمە هوتێلی (کنتینانتال) بوو لەناوخاکی فەڕەنسادا کە بەدرێژایی خولی داگیرکاری بۆ خزمەتکردنی فەرماندە نازییەکان بەبێگار گیرابوو.

پاش ڕۆزفلت کەتا کەکەسێکی گرنگو کاریگەربوو بۆ تێکشکاندنی ئامێری جەنگی نازییەکان، پێمان ڕاگەیەندرا کە بۆ پێشوازی جەنەڕاڵ (جۆرج مارشال) ئامادەبین، ئێمە بەپەلەو زەحمەت لەو هوتێلەدا شوێنمان دەستکەوت.(مارشال) کەسێك بوو کەبەڕاستی فەرماندەیی چالاکیەکانی هاوپەیمانەکانی دەکرد.

(ئایزەنهاوەر) لەم ڕووداوەدا ڕۆڵی نەبوو، کاتێك بوونی مارشاڵ تائەو ئەندازەیە بۆ ڕوفلت گرنگی پەیداکرد، سەرکۆمار مۆڵەتی چوونە ئەوروپاو سەرقاڵبوون بەکاری شەخسی خۆیەوەی پێنەدا. بەپێی ئەمە، مارشاڵ یەکەیەکی سەنتەری فەرماندەیی باڵای پێکهێناو (ئایزنهاوەر) کەکەسێکی بەدیسپلینو گوێڕایەڵی دەستووربوو، تیایدا بەشداربوو. لەڕاستیدا تەنها

شتێکی کەمارشالٚ پێویستی بوو کەسێکی هاوەلٚ بوو کەبگونجێت لەگەلٚ کەسایەتی مارشالٚ.

(ئایك) ئەو ئەرکەی بەرێکوپێکی بەئەنجام گەیاند. هەڵبەتە کارێکی قورس بوو هەرچەندە درێژەشی نەبوو، بەلاّم لەبەرپرسیارێتی دوایی سووکتر نەبوو.

ئێمە هەموومان دەمانزانی کەگۆشەی دەستەلاّت بەستراوە بە (مارشال)وە. لەوکاتەدا کەبڕیار بوو مارشالٚ بێتە پاریس لەدواین ساتەکاندا بوو کەسێك بیریکەوتەوەو پرسی دەزانێت بەفەڕەنسی قسەبکات؟

وەلاّمی ئەو بەمجۆرە بوو: (زۆرباش نا، پێویستتان بەوەرگێڕێك دەبێت.)

دیارە لەوڕۆژەدا ئێمە وەرگێڕی ڕەسمیمان نەبوو. بەلاّم بەسادەیی کەسێکمان فێرکرد. ساتێکی زۆرگرنگ بوو، لەوێداو بەخێرایی کەسێك دەستبەکاربێت. سی سالٚ پێش ئەمە، یەکێك لەفەرماندەکانی ژێردەستی جەنەڕالٚ (جۆرج پرشنگ) لەیەکەمین جەنگی جیهانیدا، باوکی من بووە؛ کەئەفسەرە لاوە ئەمەریکیەکانی وەك مارشالٚ و(جۆرج پتن) ،(عمربرادلی)، (داگلاس مك ئارتور)ی فێرکردووە. کەببوونە هاوڕێی نزیکی خێزانی. من خۆبەخۆ ئەوەم دەربڕی کەمارشالٚ دەناسم ووتم: (خۆشحالٚ دەبم گەربتوانم کۆمەکێك بکەم) . (جوین)، کەدووەمین جاربوو لەماوەی یەکتر ناسینماندا پێکەوەبین گەڕایەدواوەو هاواری کرد: (دەبوو پێشتر ئەم بابەتەت باسکردایە).

وەلاّمم دایەوە: (تۆلەمنت نەپرسی، بەڕێز !)

تاڕادەیەك هەرپاش ئەم گفتوگۆیە، دەنگی ئاژێری مەترسیداری کاروانی ماتۆرم بەرگوێ کەوت. مارشالٚ گەیشتو چووە ژووری هوتێلەکەوە، کەبەئۆفیسی (جوین) دادەنرا. ئەو ڕاستەوخۆ منی ناسییەوەو وتی (ئەلکساندەر!)، گەڕایەوە بۆلای (جوین)و بۆیڕوون کردەوە کە لەوکاتەوەی من تەنها مێرد منداڵێك بووم، ئەم و(پرشنگ) منیان ناسیوە. دەستم کرد بەوەرگێڕانی قسەکانیان. لەکۆتایی گفتوگۆکاندا، کەمارشالٚ وتی: (لێرە بەدواوە سەنتەری فەرماندەیی بالاّی هێزە نیزامیەکانی هاوپەیمانەکان لەگەلٚ

ئۆفیسی ئەفسەری پەیوەندیداری فەڕەنسا دەبنە دیوار بەدیوار. ئایا ئەوە بیرێکی باش نییە کەتۆ ئەفسەرێکی پەیوەندیدارت هەبێت هاوەڵی شەخسی (ئایزنهاوەر) بکات؟ چونکە بەوجۆرە دەتوانیت ڕاستەوخۆ لەگەڵیدا پەیوەندی ببەستیت.

(جوین) وتی: (ئێمە جەنەراڵێك پەیدادەکەین.)

کاتێك (جوین) سەراسیمە بوو من لەوزیاتر تووشی سەرسوڕمان بووبووم، ئەو وەڵامی دایەوە: (باشە بۆچی سوود لەم ئەلکساندەرە وەرنەگرین؟ خاوەنی تێڕوانینی تایبەتی خۆیەتی سەبارەت بەجیهان. کوڕی گرنگترین هاوڕێیەو کەسێکە کەمن بەدڵنیاییەوە دەتوانم باوەڕی پێبکەم.) (جوین) لەسەر شێوازی فەڕەنسی شانەکانی هەڵتەکاند. دیاربوو هەرچەندە ئەمکارەی بەگران نەدەزانی، بەڵام پەسندکردنی کەسێك لەخوارپلەی جەنەراڵەوە بۆ گێڕانی ڕۆڵێکی هەستیار بەدژوار دەبینی. لەزانکۆکانی فەڕەنسادا بابەتەکانی وەك چوونە تەمەن، پلەو تەنانەت لەدایکبوون لەپرسی پەروەردەیی گرنگترە.

بەڵام جەنەراڵە ئاست بەرزەکانی هاوپەیمانەکان بڕیاری کاتیان دابوو. درێژەی پێدا: (من لێرەوە ڕاستەوخۆ بۆلای ئایزنهاوەر لە (ڤێرسای) دەڕۆم، (ئەلکساندەر) لەگەڵ خۆم دەبەمو بە (ئاریك)ی دەناسێنم.) یەکەمجارم بوو کەنازناوی ئایزنهاوەر ببیستم. دیارە دواین جاریش نەبوو. ئێمە ڕاستەوخۆ هۆتێلی (کنتینانتال)مان بەجێهێشتو بەئۆتۆنۆبیلەکەی تایبەت بەجەنەراڵ بەرەو هۆتێل کۆشکی (تریانون) لە (ڤێرسای) کەوتینەڕێ. ئایزنهاوەر بڕیاری دابوو ئیدارەی سەنتەری فەرماندەیی زۆردوور لەپاریس دابمەزرێنێت تا لەژاوەژاوی پایتەختی فەڕەنسا بەدووربێتو گەواهی دیمەنەکانی بێت. بەگشتی حەزی بەئازادبوونی ئەورووپابوو، نەك تەنهائازادی فەڕەنسا. هوتێلەکە، کەخانووی زستانەی پاشاکانی فەڕەنسابوو، لەناوپارکێکدابوو کەهێند دوور نەبوو لەکۆشکی (ڤێرسا)وە.

بەشێك لەژووری جەنگی ئایزەنهاوەر وەك ژووری چاوەڕوانی دانرابوو. لەوێدابوو کە، (ئایزنهاوەر) ، (چەرچڵ) ، (پتن)، (برادلی)، (جوین)،(فیلد مارشاڵ مونتگمری)،هەموو فەرماندەیی هاوپەیمانەکان بەهاوکاری لەژێر چەتری فەرماندەیی ناسراوبە (فەرماندەیی باڵای هێزە نێردراوەکانی هاوپەیمانەکان) ستراتیژو تاکتیکی جەنگیان لەدژی ئەڵمانیای نازی دادەڕشت.

لەم ژوورەدا نوکتەیەکی ڕەخنەگرانە بەدیوارەکەدا هەڵواسرابوو. دەیەهاساڵ دوای ئەوە، دوابەدوای ڕووخانی شای ئێران و ماوەیەك پاش مردنی بەهۆی نەخۆشی سەرەتانەوە، کوڕەکەشی کەهەوڵی دەدا بەیادەوەرییەکانی باوکیدا بچێتەوە هاتبوە کۆشکی (تریانون)و لەهەمان ژووری کەئایزنهاوەر ڕۆژێ لەڕۆژان بۆ ئازادکردنی ئەوروپا لەوێدابوو، بەلوتبەرزی دەربارەوە کەبەخۆی ڕەوادەبینی، لەسەرکورسییەکی پشتبەرزی شایانە لەگۆشەیەکدا دادەنیشت و پێشوازی لەمیوانەکانی دەکرد. ئەوانە کەسانی پلە جیاوازی هەوادارەکانی بوون. ئەم ژوورەی ئێستا لەگەڵ ژوورەکەی (ئایزنهاوەر)، (دیگۆڵ)، (چەرچل) جیاوازییان لەناشیرینیو پەژارەو غەمدا هەبوو. خودی ژووری جەنگ لەگەڵ ئۆفیسی فەرماندە باڵاکانی هاوپەیمانەکان نێوانیان ئەوەندە نەبوو. لێرەوە تەنها یەك ڕێگای چوونەدەرەوە هەبوو ئەویش بەناو ژوورەکەدا تێدەپەڕی. هەموو پەنجەرەکانی دی بەوردی تەختەڕێژکرابوون، تا ئەوڕادەیەی کە لەوسەردەمەدا ئارامترین سەنتەری فەرماندەیی جیهان، ئامادەکرابوو. دیوارێك بەنەخشەی گەورەی ئۆپەراسیۆنەکانی تایبەت بەئەوروپاو ئۆقیانووسی ئارام داپۆشرابوو. لەڕووی دیوارێکی تر، ئامازەی ئۆپەراسیۆنی هێزە یەدەگیەکان، کە ئەو ئامانجانەی لەخۆگرتبوو لەپاشاندا هێرشی دەکرێتەسەر، هەڵواسرابوو، ئامازەکانی تر، شوێنی کاروانە گەورەکانی ئەتلانتیك، ڕێکەوتی هاتنیان و گەڕانەوەیان و ئەو هەنگاوانەی کەلەحاڵەتی جێبەجێکردندا بوون، پیشان دەدا.

ئەگەر کەسێك بیتوانیایە وێنەیەکی ئەو ژوورە بگرێت، دەیتوانی جڵەوی جەنگی لەدەستدابێت. سەبارەت بەئاسایش زۆر لێبڕاوانە توندوتیژی دەنوێنرا. ژوورەکە بەشێوەیەکی بەردەوام بۆ ئامێری مایکرۆفۆن دەپشکنرا. دوو ئەفسەر بۆ ماوەی چەندین سەعات بەردەوام لەشوێنی خۆیان دەمانەوە. پاشان وەك پۆلیسی سەربازی چەند ڕۆژێك جێگۆڕکێیان پێدەکرا تا هیچ ڕێگایەکی دزە کردن نەمێنێتەوە.

من تاکەکەسێکی فەڕەنسایی بووم، جگە لە (دیگۆڵ)و (جوین)، کەهاتوچۆی هەمیشەیی ئەوژوورەم دەکرد. ئێستاش وێنەی پارچە کاغەزێکی ناسكو سەوز ڕەنگم لەگۆشەیەکدا هەڵگرتووە. ئێستاش ڕووداوێکی سەرنجراکێشم لەیادە. ڕۆژێکیان جەنەڕاڵ (ڕیدمن) کەنمایندەی هێزەچەکدارەکانی بەریتانیابوو، ڕێگای پێنەدرا دوابەدوای فەرماندەکانی هاوپەیمانەکانەوە بچێتە ژووری جەنگەوەو ناچاربوو لەمەمەڕەکانی دەرەوەدا پیاسەبکات. من کەتەنها نێرراوێکی ئاسایی بووم، لەگەڵ جەنەڕاڵە پایەبەرزەکاندا بەخێرایی بەبەردەمی ئەودا تێدەپەڕیمو دەچوومە ژوورەوە. بەیانی ئەوڕۆژەی بۆیەکەمجار منو مارشاڵ گەیشتینە ئەوێ، ماوەی نیوسەعات بوو لەناو چیمەنەکەدا چاوەڕوانی گەیشتنی مارشاڵ بووین. خێرا لەهاتنمان ئاگادارکرایەوە، بەپەلە بۆ ئۆفیسی (ئاریك) چووینو من لەبەردەرگای ژوورەکەدا وەستام. مارشاڵ گەڕایەوەو منی کردەژوورەوە.

دەستی کرد بەناساندنی من: (ئایك، ئەمە ئەلکساندەرە. نێرەری (جوین)ە، هەمان (جوین)ی هاوڕێمان. سەربازێکی باشە، وەك پەیوەندی نێوان تۆو (جوین) کاردەکات. دەمەوێت هەمان ئەو بڕوایەی پێببەخشیت کەجەنەڕاڵ (پرشینگ) بەباوکی بەخشیبوو.)

(ئایك) پێکەنیو بابەتەکە تەواوبوو. کاری سەرەکی من لەکاتی کۆبوونەوە ئاستبەرزەکانی کۆشکی (تریانون) بەئەنجام دەگەیەنرا. من تێڕوانینەکانی جەنەڕاڵ (دیگۆڵ)م بۆ فەرماندەکانی هاوپەیمانەکان لەفەڕەنسییەوە بۆ ئنگلیزی وەردەگێڕا. ئەو فەرماندانەی کەگفتوگۆ ئاساییەکانیشیان بەئنگلیزی

بوو، بەپێچەوانەشەوە، بیروڕاکانیانم بەتایبەتی هی ئایزنهاوەر لەئنگلیزییەوە بۆ فەرەنسی دەگۆڕی. هەموویان کەمو زۆر لەیەك کاتدا قسەیان دەکرد. بۆیە وەرگێڕانی وشەبەوشەیان کارێکی سەخت بوو.

ئەوان زۆرجار ڕاستەوخۆ قسەیان لەگەڵ کەسی بەرامبەری خاوەن گفتوگۆکە نەدەکردو ئەمەش ئاڵۆزتربوو. زۆرجاران سەرنجم دەدایە کورتەی داواکارییەکانو هەڵبژاردنی خاڵە گرنگەکان. (دیگۆڵ) بەمنی دەگوت: (مارانش) بابەتەکە بۆ جەنەراڵ شیبکەرەوە. ئەمە ئەو شتەیەمن دەمەوێت.. ئەوە کارێکی وردوسەخت بوو. بەپێی ئەوە، لەوکاتەدا بەدەگمەن ئەوەمدەزانی، ئەوکارەش بووە باشترین فۆرمی فێرکاری گونجاوی ژیان لەبەرزترین ئاستی جاسوسیمدا.

وەرگێڕان کارێك بوو کەدەبوو لەهەموو حاڵەتەکاندا واتایەك لەجیاوازییە بچوکەکانی سیاسەتەکانی جیهان زۆر بەوردبینییەوە لەگەڵ باشترین وردەکارییەکانی ڕەفتاری مرۆڤایەتی ئاوێتە بکەیت. لەودەمانەدا کەهەستم بەوبەرپرسیارێتیە قورسەی کەکەوتبووە سەرشانم دەکرد، عارەقی سارد لەڕووم دەنیشت. پرسی جەنگو چارەنوسی هەزاران کەسی خەباتگێڕ لەحاڵەتی دیاریکردندابوو. هەندێجار داوام لێدەکردن ڕستەکانیان دووبارە بکەنەوە. لەحاڵەتی تێنەگەیشتندا نەمدەتوانی سەرەڕۆیی بکەم. ئەم کارە زۆر مەترسیداربوو. گرفتاویترین بەشی کار، گوێزانەوەی وردو جوانی قسەکانی ئایزنهاوەر بوو بۆ دیگۆڵ، کەهەرگیز لەودانیشتنانەدا ئارام نەبوو.(دیگۆڵ) لەبەرامبەر کەسانی دیدا هەمیشە تا ڕادەیەكو شكو لەخۆبایيو لوتبەرز بوو. ئەوەی کەمن دەرکم پێدەکردو دەترسام ئەمەریکیەکان لێی تێنەگەن ئەمەبوو کەسروشتێکی سادەی هەبوو. ئەو بەجۆرێکی تایبەت بەمنی دەگوت: (ئەگەر کەسێك بچوكو لاواز بێت، ناچارە هەمیشە بەتوانابێت).

ئەم هەڵوێستەی، بۆپارێزگاری کردن لەهەستی غروریو شانازی شەخسیو خۆهەڵکێشانی بەوڵاتەکەیەوە بوو کە بەهۆی نادیدەگرتنی ئەڵمانیا لەجەنگی

یەکەمی جیهانیدا ، تووشی نوشستی هاتبوو. لەبەرچاوی ئەمدا ئەوانی دی (ئەنگلۆساکسۆن)ی بوون. بەوهۆیەوە، هەموویان پێکەوە هاورێ بوون هەمیشە بەناوی بچوککراوەوە یەکتریان بانگ دەکرد. هەموویان جگە لە (چەرچل). هەموو هاورێکانی ئەویان بە (کاك) بانگ دەکرد.

بەمپێیە ئەو لەفەرماندەکانی دی زیاتر، سروشتیو ئاسایی بوو.(چەرچل) یونیفۆرمی هێزی ئاسمانی سەڵتەنەتی دەپۆشیو تەنها پێڵاوەکانی بوو کەنەزمی ئەم بەرگپۆشینەی تێکدەدا. حەوسەڵەی بەستنی قەیتانەکانی نەبوو لەجیاتی ئەوە تێکی ئالاندبوون. یەکەمین جار کەچاوم بە (چەرچڵ) کەوت، چووبوومە ژوورەکەی (ئاریك)ەوەو دیقەتم لەنەخشە هەڵواسراوەکانی سەردیوارەکان دابوو. من بێدەنگو بەرێزەوە لەگۆشەیەکی ژوورەکەدا وەستام. (چەرچڵ) لەسەرکورسییە خۆشەکەی هەستاو لەسەرئەژنۆ دانیشت تانزیکتر لەنەخشەکە بڕوانێت. دەستی کرد بەخزین لەسەرفەرشەکەو دوکەڵی ئاسایی جگەرەکەشی هەڵدەکشایەوە بۆرووی خۆی. لەدوایدا بەتەواوی سەرقاڵی کارەکەی بوو و ئاوڕی دایەوەو جگەرەکەی دایەدەست من کە بەرێزەوە دووبارە بۆمدەگێڕایەوە. هیچ کاتێك جگەرەی تاکۆتایی نەدەکێشا، تەنها دایدەگیرساندو چەند نەفەسێکی لێدەدا، گومانی تێدانییە چێژی لێوەردەگرتو ودەیزانی ئەم خووە بۆتە بەشێك لەتایبەتمەندی شەخسیو دەروونی خۆی.

پاش دانیشتنەکانی ژووری جەنگی زۆرجار بەئۆتۆمۆبیل دەگەڕامەوە بۆپاریسو هەموو ئەو شتانەی بیستبووم بۆ (جوین)م دەگێڕایەوە. لەبەرئەوەی نەمدەتوانی هیچ نووسراوێك لەوسەنتەرە ئارامە بهێنمە دەرێ، فێربووبووم کەگفتوگۆکان لەبەربکەم. دیارە ئەمەش یارمەتی باشتر بوونی یادەوەریمی دەدا. پاشان دەرکەوت لەژیانمدا ڕەوشێکی دیسپلینی بێمانابووە. ئەفسەرانی پرۆفیشناڵی سیخوڕی دەرغکار بە (جاسوسی گێل) ناودەبەن، چونکە زۆرجار شتەکانی لەبیر دەچێتەوە.

(جویـن) پـاش بیسـتنی هەواڵـەکان، مـنی لەگـەڵ خـۆی دەبـردو بـۆ ڕوونکردنـەوەی بابەتـەکانی کـەدەربارەیان بڕیـاری لەسـەر وەرگـیرابوو، چۆنیەتی لێکۆڵینەوەکان و بەڵگەکانی ئەو بڕیارانە، دەچووە لای (دیگۆڵ).

بەڵام زۆر جاران کە (دیگۆڵ) حەوسەڵەی ئەوجۆرە وردەکارییانەی نـەبوو، بەوتنی (باشە، مـارانش لەوبارەیـەوە هـەموو شتێکت پێدەڵێت)، (جویـن)ی لەکۆڵ خۆی دەکردەوە.

لەمیانەی ئەم لێکۆڵینەوانەدا لەنێوان ئەوکەسایەتیە گەورەو دیارانـە، یـان کەسـانێکی وەك مـن کـە لـەدەوری مـێزی کۆنفرانـس لەکۆشـکی (تریـانون) دانیشـتبوون، ڕووبەڕووبوونـەوەی ڕاستەقینە ڕوویـدەدا. سـاتی دژواربـوون و زۆربـەی جـار سـەبارەت بەوشـتانەی دەمبیسـتن بەنیگەرانییـەوە درێـژەم بەکارەکـەم دەدا. جارێکیـان لەبەرئـەوەی بـەریتانیا گوێـی نـەدابوو بەفـەرماندەیی بـاڵای جـەنگ، بـانگکرام. ئـەوان دەیانخواست لـەکاتێکدا کـە (فیلد مارشاڵ گرتفون ڕونداشـتت) بـۆ دوایـین هێرشـی بەرگرییـە گەورەکـەی لەزستانی١٩٤٤و شـەڕی (بـولج) خـۆی ئامـادەدەکرد بـۆ پارێزگـاریکردن لەبەرژەوەندییەکانی بەریتانیا بۆ (ئانت ورپ) بکشێتەوە.

(ئانت ورپ) لە بەلجیکا، بەندەرێك بوو، کەبـەریتانیا زۆرتریـنی هێزەکـانی لەکیشـوەرەکەداو زۆرتریـن هێزەکـانی تـری هاوپەیمانـەکان لەوڕێگایـەوە ئامادەدەکران.

بڕیـاربوو، (جویـن) ببێتـە گـەورەترین فـەرماندەی فەڕەنسـا لەجـەنگی دووەمـی جیـهانیدا، پـاش (دیگـۆڵ) پـەیوەنداری سـەرەکی لەگـەڵ ئەمەریکیـەکان و سـەنتەری فـەرماندەیی جەنەڕاڵـەکانی هاوپەیمانـەکان بـوو. لەدواییدا (دیگۆڵ) خۆی، پلەکەی بۆ (مارشاڵ) بەرز کردەوە.

کـاتێك (جویـن) پـەیوەندیکرد بـەهێزە ئازادیخوازەکـانی فەڕەنسـاوە لەسـەرووی ئـەفریقا، هاوپـەیمانانی دی،دەسـتیان بەدابـەزاندنی هێزەکـانی خۆیـان کردبـوو. ئوسـترالیەکان، نیـوز لەندیـەکان، کەنەدیـەکان و خـەڵکی ئەفریقای خواروو، لەهەموو بەشەکانی ئیمپراتۆریـەتی بـەریتانیاوە هـاتبوون؛

هەڵبەتە ئەمەریکیەکانیش.هەوڵدان بۆلەقاڵبدانی هەموئەم ڕەگەزە جیاوازنە لەهێزێکی یەکگرتووی سوپای کارێکی زۆر دژواربوو. ئەمکارەش خرایە ئەستۆی جەنەڕاڵ (جوین)و هاوتائنگلیزەکەی جەنەڕاڵ (سەرجان ئەندرسن) تا کار کە ڕاپەڕێنن. کاتێ سوپای یەکەمی ئنگلیز خۆی تووشی شەڕ لەگەڵ ڕۆمیەکان‌و لەوەش خراپتر لەگەڵ سپی پێستە ئەفریقیەکان کرد، لەلایەن مارشاڵێکی گەورەی ئەڵمانیەوە ناچاربە پاشەکشە بۆ بیابانەکانی ئەفریقای سەروو، هەڵبەتە لەژێر چاودێری ئنگلیزەکاندا کرا. ئە ودووکەسە لەوسەردەمەوە پێکەوە کاریان دەکرد. لەودەمەدا (جوین) فەرماندەی سوپای تونس بوو کەلەپاڵ هێزەئنگلیزییەکەی (ئەندرسن)دا دەجەنگین. (جوین) پێش هەموو شتێك شەڕکەرێك بوو نەك سەربازێکی سیاسی.

بەهەرحاڵ، هەر فەرماندەیەك ڕێزی فراوان لەوانی دی دەگرێت‌و پەیوەندیشیان لەدەرەوەی مەیدانی شەڕ بەخۆشی‌و ئەزمونە گشتیەکانیان دەپێورێت.

ئەم پەیوەندیانە بوون کە بەدرێژایی تەمەنم لەمیانەی کارەکانمدا لەگەڵ هاوکاروانە هاوپەیمانەکانماندا کاریگەری بێهاوتایان لەسەرم دانا. من دووبارە ئەوە دووپات دەکەمەوە کەناسین‌و گرنگیدانی تایبەتی بەهزرو هەستەکانی دۆستانمان‌و بەهەمان شێوەش دوژمنانمان کارێکی پێویستەو ئەو جۆە دەرکپێکردنەش مایەی ستایشکردنە. ئەوشتەیە کەجەنەڕاڵ (دیگۆڵ) لەگەرماو گەرمی شەڕی ئەورووپاو لەکاتی ئاشتی پاش شەڕیشدا هیچ کاتێك فەرامۆشی نەکرد.

بەتایبەتی وەك نمونە چیرۆکی نانخواردنێکی ئێوارەی شەوێکی جەژنی کریسمسی ساڵی ١٩٤٢ لەباکوری ئەفریقاتان بۆدەگێڕمەوە تا بزانن دوو هاوڕێی نزیك چۆن دەرك بەیەکتری دەکەن. (جوین)و (ئەندرسن) لەسەنتەری فەرماندەیی ئنگلیزی بەچەند ڕۆژێك پێش پشودان

پێکەوەنانی ئێوارەیان دەخوارد. (ئەندرسن) وتی: (واخەریکە کریسمس دێت وەرە باپێکەوە دیاری ئالوگۆڕبکەین، تۆ پێشنیازی چی دەکەیت؟)
(جوین) وەلامی دایەوە: (لەم بارەدا من وایدەبینم پێویستە دیاری بەسوود ئالوگۆڕ بکەین.)
جەنەڕاڵی ئنگلیزی بەڕەزامەندییەوە وتی: (بیرێکی باشە.)
لەڕۆژی جەژنی کریسمسدا، جەنەڕاڵ (ئەندرسن) دیارییەکەی خۆی کەبریتی بوو لەکاروانێکی بچوکی ئۆتۆمبیلی سوپایی، نارد. (جوین) ئۆتۆمبیلێکی سوپایی بەرامبەر بەخۆشەویستیەکەی بۆناردەوە. ئەم کارە دلخۆش و جوانە لەهەمان کاتدا کەبۆ ئامانجێکی دیاریکراوبوو، هەروەها لەهەمووشی زیاترکارێکی ڕێزدارانەش بوو کەڕێژەی توانستی هێزەکانی هەردوولاشیانی لەو ماوەزەمەنیەداو لەکاتی جەنگدا پیشاندەدا. یەکێك لەتایبەتمەندییە گەورەکانی (جوین)، هەستی درەوشاوەو جوان ڕەفتاریەکەی بوو، کە لەتاریکترین ڕۆژەکانی جەنگیشدا لێی جیانەدەبۆوە، ڕۆژێکیشیان پاش فراوینکردنی خواردنێکی ئنگلیزی، (جوین) خواردنێکی فەڕەنسایی بۆ (ئەندرسن) هێنا. لەڕۆژەکانی سەرەتای دووبارەگرتنەوەی ئەورووپا لەساڵی ١٩٤٤، کاتێك هێزی هاوپەیمانەکان دەستیان کرد بەسوود وەرگرتن لەخاکە کشتوکاڵیەکانی کەنارەکانی خۆیان لەباکوری ئیتالیاو بەرەوسەرووی ئەم نیمچە دوورگەیە لەپێشڕەویدابوون. من لەپۆستەکەی خۆم لەئەفریقا مابوومەوە. ڕۆژێکیان هاوڕێکانی (جوین) داوایان لێکردم نامەیەك بۆ (جوین) لە (ناپولی) بنێرم.
ئەوان دەربارەی ڕابووردووی خێزانەکەم و ئەوکارانەی لەناو بزاوتی بەرگری فەڕەنسادا کردبووم زانیارییان هەبوو، حەزیان دەکرد هاوەڵی فەرماندەی گەورەی فەڕەنسا کەئەودەمە چووبووە ئیتالیاوە سەرپەرشتی هێزەکانی فەڕەنسای لەپێشڕەوییان لەونیمچەدوورگەیەدا دەکرد، بکەم. لەناودەریای ناوەڕاستدا سەفەرێکی پڕمەترسیم گرتەبەرو لەئەنجامدا خۆم بەبارەگای فەرماندەیی هێزە نێردراوەکانی هاوپەیمانان لە (ناپولی) ناساند. کاتێ پێیان

وتم خودی جەنەڕاڵ دەیەوێت بمبینێت، سەراسیمەو خۆشحاڵ بووم. ئەمە بۆ ئەفسەرێکی پلەی بەرز نەبێت ڕووداوێکی گەورەبوو کە لەلایەن قارەمانی گەورەی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە قبوول بکرێت. من لەبارەگای فەرماندەییەکەی کەجۆرێك لەکامیونی ترێلەبوو لەبەشی سەرووی ناپۆلی دانرابوو، چاوم پێی کەوت. پیاوێکی جەسووربوو، لەبەرئەوەی لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا دەستی ڕاستی بەرکەوتبوو، بە ناچاری بەدەستی چەپ سەلامو ئەحوالپرسی دەکرد. یونیفۆرمێکی سادەی زستانەی پۆشیبوو. مستی دەدا بەڕووی مێزەکەداو دەیوت: (باشە تۆ کوڕی گەنج، لەجەزایرەوە هاتوویت؟ هەواڵی ئەوێ چییە؟) دەمزانی کەناوی خوازراوی (هانیپال)ەو لەوکاتەدا بیرم لەجەنگە نارێکوپێکەکانی کە (هانیپال) لەڕۆمای کۆن کردبوونی دەکردەوە. ڕۆژانی دوایش ئەمیش بەنۆبەی خۆی محەکی شەڕگەکانی ئیتالیاو وڵاتانی ئەفریقای سەروو (بەتایبەتی جەزایرو تونس) بووە.

لەوەڵامدا بەدوای سیمبولێکی وردو گونجاودا وێڵ بووم تابتوانێت هەموو فرووفێڵە نهێنیەکانی لەجۆری فەرەنسی کە لەپشتی پەردەوە دەچنران، ڕاستەوخۆ پێناسە بکات.

جەزایر، واتە ئەو وڵاتەی کەفەرەنسا هێزە داگیرکارەکانی ئەڵمانیایان تیادەرپەڕاندبوو و دەیانویست دەوڵەتی ئازادی فەرەنسای خۆیانی تێدا دابمەزرێنن. خۆشبەختانە(جوین) لەهیچ کام لەوقۆناغانەی سەرەوە ئامادەنەبوو، بەقورسی سەرقاڵی دووبارە ئازادکردنەی خوارووی ئەورووپا بوو. من دەستمکرد بەقسەکردن و گوتم: (بەڕێز، بەیەك وشەبڵێم، ئەم بابەتە وەك بابەتی (هانۆ)یە کەسناتۆرێکی گەورەی خەڵکی (کارتاج)ی‌بووە.)

(هانۆ) ئەشرافێکی خەڵکی (کارتاج– شارێکی کۆنی نزیك تونس بووەو ڕۆمانەکان وێرانیان کردووە)و ئاشتیخوازێك بووە کەلەبنەڕەتدا دژ بەهێرشی (هانیپال)بووە بۆ سەرئیمپراتۆریەتی ڕۆمای کۆن. (جوین) تریقایەوەو من خێرا تێگەیشتم کەهەردووکمان بیر لەیەك شت دەکەینەوە. لەوساتە بەدواوە،

(جوین) حەزی بەشێوازی کارەکانم دەکردو ژیانم بەتەواوی گۆڕا. لەپڕێکدا خۆم لەسەنتەری بەرەی ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپایی لەگەڵ دەوڵەتەکانی کەدەکەونە سەرهێڵی سەنتراڵی زەوی، دۆزییەوە.

بەو بۆنەیەوە کەمن شارەزا بووم لەتەکتیکە جەنگیەکانی وڵاتانی ئەفریقای سەروو، کەدەرئەنجامی گوزەراندنی بەشێکی ژیانم لەگەڵ سوپاکان‌و هێزی ئۆپەراسیۆنی کە لەکۆلۆنیاکانی فەڕەنسادا لەئەفریقای سەرروودا نیشتەجێ ببوون بەدەستهێنابوو، (جوین) منی بەئەفسەر لەیەکەیەکی هێزی لێدەری مەراکشی لەتەپەکانی (ئابروزی) دامەزراند. لەودەمەدا هەموو منیان فەرامۆش کرد. بەڵام هەنگاوە جەنگی‌و فیزیکیە گەورەکان لەڕووی گەشەکردنی کەسایەتیەوە، پێدەچوو لەهەموو خولەکانی ژیاندا بۆمن ئاشکرابووبن. لە (ئاپنین)و لەکۆتاییەکانی زستاندا پلەی سەرماو کەش‌و ئاووهەوا بۆ دەپلەکی فەهرەنهایتی‌و کەمتریش گەیشت. زۆربەی بریندارەکانمان لەناوی سەرمامردن. لەپێکدا دانانەکانی پاش ئەوە ڕوویاندا، ئێمە سێ لەسەرچواری سەربازەکانمان لەناوچوون. ئەفسەرەکان هەمیشە ناچاربوون وەك سەربازەکان ڕووبەڕووی خەڵکە ئەفریقیەکان ببنەوە.

لەکاتی شەڕدا، بەسەختی بریندار بووم‌و لەلایەن جەنەڕاڵ (مارك کلارك)ی فەرماندەی سوپای پێنجەمی ئەمەریکاوە، نیشانەی (ئەستێرەی برونز)م پێبەخشرا.

ئەو شەڕە بەشێك لەشەڕەکانی (کاسینۆ) بوو کەئەڵمانیەکان ناویان نابوو (ستالینگرادی خۆرئاوا). لەمیانەی قەیراناویترین قۆناغی شەڕ لەگەڵ ئیتالیا، ژنێکم بینی کەپاشان بووە هاوسەرم. هەلومەرجەکان بەو ڕادەیەی کەهەستیاربوون، پەژارە هێنەریش بوون. (لیلیان) ئەوکاتە حەڤدەساڵان بوو، پەرستارێکی ڕاهێنراوی خاچی سووربوو، کەهێشتا لەگەڵ دایك‌و باوکی لە(مراکیش) پێکەوە دەژیان. لەژێر چاوەدێری خانمێکی نائاسایی، واتە (کۆنتسە دلوار)دا کاریدەکرد. (خانم دلوار) یەکەیەکی نەشتەرگەری هەڵسوڕاوی پێکهێنابوو و سەرپەرشتی دەکرد. ئەو یەکێك لەبانگدەرانی

یەکەکانی (مش) لەجەنگەکانی دواییدا بوو کەبەتەنیا ورەی گشتیو پانتاییە دەروونیەکەی نەخۆشخانەی هێڵی یەکەمی بەرەی کۆنترۆڵ دەکرد، سەرپەرشتی ئەو یەکەیەی لەناو سامناکترین ناوچەی جەنگی لەشەڕەکانی ئیتالیا دەکرد.

(لیلیان) لەناوچادرداو لەنزیکی بەرەکەوە، ئەوشوێنەی کەبەقوڕوچڵپاو، خوێنو برینداراانی بێحاڵ دەورە درابوو، دەژیاو جوانیەکی جێیباوەڕنە بوونو زۆر نێچیرانەی هەبوو. لەکۆتای ئۆپەراسیونە جەنگیەکانی ئیتالیادا (جوین) خودی خۆی نیشانەیەکی (خاچی جەنگی) پێشکەش کرد. من زۆر گیرۆدەی (لیلیان) بووبووم. تاکەژن بوو کە لەوسەردەمەدا ڕازی نەدەبوو لەگەڵمدا بێتەدەرەوە. ئەوکارەشی منی تووشی شۆك دەکردو زیاتریش بۆلای خۆی کێشی دەکردم. بەهەرحاڵ لەدوای جەنگ سووربوونەکەی من گەیشتە ئەنجام. خۆشبەختانە بڕوای خۆی گۆڕیو پێشنیارەکەمی بۆ بوونەهاوسەری قبووڵکرد.

ئیتر لەوەدوا پێکەوە بووین. بەڵام لەوساتە وەختەی یەکەمدا کەیەکتریمان تێیداناسی، ئۆپەراسیونەکانی جەنگی ئیتالیا ماوەی زۆر نەدەدام بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستی (لیلیان). لەوێدا ڕشتەیەك شەڕو پێکدادان لەسەر نەزمێکی هێواش، بەئازارو قورس لە سەرانسەری وڵاتی پۆتین ئاسای وەك ئیتالیا ڕوویدەدا. هێزە نێردراوەکانی فەڕەنسا کەبۆچواربەشو نیو دابەشکرابوون، وەك سەرەنێزەی یەکەی سەنتەری سوپای پێنجەمی ویلایەتە یەککگرتووەکان، لەژێر فەرماندەیی جەنەڕاڵ (مارك کلارك) خزمەتیان دەکرد. لەلای باڵی ڕاستمانەوە سوپای هەشتەم بوو، کەپێشتر لەژێر فەرماندەیی مارشاڵ (فیلد لۆرد مونتگمری) دابوو، کە لەجەنگی بیابانی دژبە (ڕۆمل) سەرکەوتنی بەدەستهێنا. لەوسەردەمەدا هەردوو سوپاکە بەهاوبەشی لەژێر چاودێریو فەرماندەیی (لۆرد ئەلکساندەر) دابوون لەتونس، کەئەوان ئێستا باشترین سەربازانی بەریتانیان. سەرەڕای ئەوە، جەنگاوەرە کەنەدیو هۆلەندیەکانیش لەلایەن جەنەڕاڵ (تدی ئستواندرز)وە سەرپەرشتی دەکران.

بەمپێیە، ئێمە بەبێ کۆمەکی ئەمەریکییەکان نەماندەتوانی درێژە بەئۆپەراسیونە جەنگیەکانی خۆمان بدەین. بەریتانیای گەورە هەموو توانای خۆی لەدەستدابوو. ئێمە بۆ دابینکردنی تەواوی پێداویستی لۆجستیکی لەبابەت خۆراك، ئامادەکاری، چەك و تەقەمەنی، وابەستەی ویلایەتەیەکگرتووەکان بووین. تابتوانین خۆمان لەبەرامبەر ئیتالی و هاوکارانی ئەڵمانەکان لەهێڵی باشوری ئەوروپادا ڕاگرین. بەمهۆیەوە ناچاربووین بەدرێژایی ئەو خولە کاریگەری باش و سەرنجڕاکێش لەهزری ئەمەریکیەکان و نوێنەرەکانیاندا بەجێبهێڵین. وابەستەبوونێکی لەوجۆرەو تا ئەو ڕادەیە بەسبوو بۆئەوەی کەغروریمان برینداربکات.

ئەم پرسە بۆ ئێمە بزوێنەرێکی هەمیشەیی بوو، کە بەهەر جۆرێك گونجاوبێت بتوانین شوێنەواری شەرمی دوورودرێژی دەرئەنجامی نوشستیمان لەهێرشە ئاسمانیەکانی ئەڵمانیا لەساڵی ١٩٤٠ لەڕووبسڕێتەوە. ئەم کارە نەك تەنها بۆ مەبەستی ڕۆحی و ئەخلاقی هەنگاوێکی پێویست بوو، بەڵکو بۆ بەدەستهێنانی چەکی دوورهاوێژو بۆ خستنەبەرپشکی ئامرازەکانی دیبلۆماسیەتیش گرنگ بوو. لەکاتێکدا کەئێمە لەخولەکەی پاش کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیدا سەرقاڵی دروستکردنەوەی پێکهاتەیەکی ڕەواتر بووین لەکاتی جەنگی سێیەمی جیهان و لەکۆتاییدا جەنگی چوارەمی جیهانی، لەدوایین جەنگەکاندا (جەنگی چوارەمی جیهان)، فەرەنساو ئەوروپای یەکگرتوو لەوجۆرە پێکهاتەیەدا، تەنها هاوسەنگی و وەکیەکیان لەگەڵ ئەمەریکادا لەلاپەسندبوو. بەڵام لەوسەردەمەداو لەناوجەنگەکانی ئیتالیا لەساڵی ١٩٤٤ دا، ئەوجۆرە یەکسانیە لەزەمینەی دیبلۆماسیەت و لەبەرەکانی شەڕدا هێشتا بەدەستنەهاتبوون و ناچاربووین ملی بۆبدەین. ئەوکەسەی کەسەرکۆمار (ڕۆزفلت)ی بۆ ناساندنی لەئیتالیا هەڵیبژارد بوو، هەمان ئەوکەسە بڕیاربوو شوێنگەی ئێمەش بەباشترین و کاریگەرترین شێوە بۆ سەرکۆمارو خەڵکی ئەمریکا ڕوون بکاتەوە، کەیەکێك بوو لەدیبلۆماتە دیارەکانی جەنگی دووەمی جیهانی و، کەسێك بووبڕوای تەواوی سەرکۆماری

بۆ خۆی بەدەست هێنا بوو، سەردەمێکی باشیشی لەپاریس گوزەراندبوو. ناوی(ڕۆبرت مۆرفی)بوو.

ئەوهەمان ئەو (ڕۆبرت مۆرفی)یە بوو کەوەك سێیەمین نووسەری لاو لەکۆنسلگەی ئەمەریکا کاری دەکردو هەمان ئەو میوانە هەمیشە شەونشینەکانی پورە (ئاتیل) بوو کە لەسەردەمی لاوێتی مندا بەردەوام ئامادەیی هەبوو. لەگەرمەی جەنگەکانی ئیتالیادا، بەماوەیەك پاش یەکەمین (کەتا ئەو کاتە تاکە) چاوپێکەوتنی منو (جوین) بوو، مۆرفی دەعوەتنامەیەکی بۆ فەرماندەی فەرەنسیەکان نارد.

پاش باسکردنی سەرقاڵیو کاروبارەکانی، نوێنەری ئەمەریکا (مۆرفی) ڕایگەیاندکە: (لەنێوان سوپای هاتووی ئێوەدا یەکێك لەگەورەترین هاوڕێکانمتان لەگەڵدایە.)

(جوین) لەسەرشێوەی حاڵەتی فەرەنسیەکان سەراسیمە بوو وتی: (چی؟ لێرە؟ هاوڕێی نمایندەی شەخسی ڕۆزفلت؟) (ئەم کەسە گرنگە کێیە؟.)

مەبەستی سەرەکی ئەوەبوو ئەوکەسە گرنگەی کە (جوین) نەیدەتوانی بیدۆزێتەوە کێیە. مۆرفی بەدڵنیاییەوە وتی: (ئەوکەسە ئەلکساندەر دومارانشە.)

(جوین) بەسەرسوڕماوییەوە چاوی تێبڕیبوو بەسەراسیمەییەوە چاوی بەژوورەکەدا گێڕابوو تا لەپڕێکدا، یاریدەرەکەی جەنەڕاڵ بەتوندی کێشابووی بەناوچاوانی خۆیداو وتبووی: (ئاخر، بەڵێ، (مارانش)، گەورەم، ئەودەناسیت!)

(جوین) بەپەلە وەرگەڕابۆوەو وتبووی (هەرئێستا بیهێنن بۆ ئێرە.)

خوادەزانێت منیان لەکوێ دۆزییەوە، تەپوتۆزەکەیان لەسەروچاوم پاككردەوەو پێش ئەوەی سوارجێبەکەم بکەن یونفۆرمێکی نوێیان لەبەرکردم. جێبەکە بەپەلە بەرەو قەڵای کۆنی ئیتالیەکان کەدەکەوتە کەنار دەریاو بارەگای فەرماندەیی (جوین) بوو بۆ ئۆپەراسیۆنی پێشڕەویکردن بەرەو باکوری نیمچە دورگەی ئیتالیا، کەوتەڕێ. ئەوشوێنە لەپۆستی یەکەمی

فەرماندەییەکەی کە لەترێلەیەکدابوو لە (ناپۆلی) گەلێك دوورتر بوو. لەیادمە کەخۆشحاڵ بەڵام بەدوودڵییەوە لەسەرنوکی پەنجەی پێکانم چوومە سالۆنێکی ئەشکەوت ئاساوە؛ لەوێدا سۆپایەکی دار کە لەسەر شوێنێکی تایبەت بوو بەنێلەنێڵ دەسووتا. من بەئامادەگی تەواوی ئامادەباشییەوە، سلامم کرد. هیچ کەس نەبزووت. لەپڕێکدا (باب مۆرق) منی بینی، ئەوە یەکەمین چاوپێکەوتنی پاش دیدارە دووبارە بووەکانی ماڵەبچوکەکەی پورە (ئاتیل) بوو.

لەوکاتەدا لەسەر کورسیەکەی هەستاومنی گرتە باوەش‌و هاواری کرد: (چۆنی هاوڕێی لاوی من؟) منیش بەهەمان شێوەی ئاشنایەتی وەڵامم دایەوە: (زۆر خۆشحاڵم بەبینینەوەت!)

هەموو بەجارێك سەراسیمە بووبوون. ئاسای بوو بۆ نانخواردنی ئێوارە مامەوەو بەتەواوی وەك ئەفسەری پەیوەندی لەپشتی مێزەوە دانیشتم. پاشان(جوین) لەبەرئەوەی بەوم نەوتبوو کەسی نوێنەرو جێگا بڕوای ڕوزفلێت دەناسم، سەرزەنیشتی کردم. لەوەڵامدا وتم: (بەڵام، بەڕێز، جەنابتان لەمنتان نەپرسییوە.)

بەمجۆرە، عەسری ئەوڕۆژە خاڵی وەرچەرخانی ژیانم بوو. هەرساتێکی ئەمڕۆژە بەئەندازەی ئەونامەیە گرنگ بوو کە بۆیەکەمین جار منی لە(جوین) نزیك خستەوەو کشاندمیە ناوشەڕەکانی ئیتالیاوە. بەهەمان شێوەش بەئەندازەی سەفەرکرنەکەم بەناوچیاکانی پیرنەو ناونوسینم لەناوهێزی ئازادیخوازی فەڕەنسا کە لەسەرووی ئەفریقابوون، خاوەن گرنگی بوو. پاشنیوەڕۆی ئەوڕۆژە ڕۆژانێك بوو ئەو هەلەی پێبەخشیم کەڕەوشی هزری ستراتیژی جەنگی دووەمی جیهانی‌و هەموو جەنگەکانی جیهانی تر کەبەدوای ئەوداو لەم سەدەیەدا دێن، بەدەست بهێنم. لەکارکردنی، شوێنی باڵادا وەك چوونە قوتابخانەیەکی تایبەت بەکەسایەتیەکان بوو و مامۆستاکانی کەسانێك بوون کەسەرەتاکانی جیهانی ئێمەیان دیاریکردووەو لەجەنگیشدا لەگەڵ ئێمەدا دەجەنگان. پاش ئەو دوانیوەڕۆیە، جەنەڕاڵ (جوین) منی لەخۆی نزیکترخستەوە. ئێمە بەدەگمەن لەیەکتری جوودا دەبووینەوە. هەندێ کات

ڕۆڵی باوکێکی دەگێڕا؛ پیاوێکی ئازاو شەریف کەبنەماکانی جەنگو ئاشتی فێرکردم. دەیتوانی چەندی ڕووخۆش‌و قسە خۆش بوو ئەوەندەش ڕاستو جدی بێت. هەرگیز لەسنوری جدی بوون زیاتر تێنەدەپەڕی. چەندین ساڵ دوای ئەوە، ئەوە من بووم کەئەوپیاوەم لەتابوتەکەی هاویشت.

بەدرێژایی شەڕەکانی ئیتالیا، لەڕاستیدا ئەو ماوەیەی جەنگ کەمابوو، لەدەستەی کەسانی ژێر چاودێری (جوین) مامەوە. لەو ماوە درەنگوەختەی جەنگدابوو کە بۆ یەکەمینجار چاوم بە (دیگۆڵ) کەوت.

ئایزنهاوەر بۆ جەنگی (بولج) تاڕادەیەك هەستی بەپێداویستی بوونی هەموو هێزەکانی دەکرا کۆبکرێنەوە دەکرد. ئەو، ئەو ڕۆژانەی بەسەردەربردو هێزی هاوپەیمانەکانیش، هێڵی بەرەی دژ بەئەڵمانەکانیان- کەئیتر هەرگیز توانای بەرگری بەرامبەریان نەمابوو- دەپاراست. جەنراڵ (بیدل سمیت)، نێردراوی سەرەکی ئایزنهاوەرو دڵو ڕۆحی هەموو چالاکیەکانی ئایزنهاوەر بوو. لەگەڵ ئەوەی کەئەو لەبنەڕەتدا ستراتیژیستێکی سوپایی تەواوبوو، کاری سەرەکی پێکەوە گرێدانی کاری دوانەیی ئەمریکاو بەریتانیا بوو لەژێر چاودێری (ئایك)دا، بەتایبەتی جەنەڕاڵ (فیلد مارشاڵ مونتگمری) کەهیچی نەدەخواست جگە لەدڵنیا بوون لەپارێزگاریکردنی بەندەرەکای بەریتانیا لەبەرامبەر هێرشی نازیەکان.

(بیدل سمیت)کەزۆرترین کاتەکانی بەتەلەفونکردن لەنێوان هەموو لایەکداو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی هاوپەیمانەکان بەسەر دەبرد، لەڕاستیدا ناڕازی بوو لە لەخۆبایی‌و تاکڕەوی (مونتگمری). هەرچەندیشە هەستم دەکرد لەپێناوی ڕێزگرتنی (دیگۆڵ)دا، زۆر هەوڵیدەدا. (ئایك) بەچاوی خەڵکی نامۆ، ڕووکەش جیاوازو هەڵبەتە لەگروپی بچکۆلەی لاتینی لەفەڕەنسیەکانی دەڕوانی. نزیکترین هاورێکانی،ئەمریکیەکان‌و هەروەها هەندێك لەبەریتانیەکانیش بەهۆی کارە باشەکانیانەوە بوو. هەرگیز بەرامبەر بە فەڕەنسیەکان هاوڕێیەتی‌و نزیکبوونی پیشان نەدەدا. بەڵام گرفتی ئایزنهاوەر ئەوەبوو کەدەیویست ئەو هەلومەرجەی لەئارادابوو ڕایبگرێت. وەك یەکێك

لەدەستنێژەکانی مارشاڵ، هیچ کاتێك بەپێچەوانەی ستراتیژی بڕیار لێدراوەوە نەدەجولایەوە.

پاش ماوەیەك، ڕیشەی جیاوازییەکانی– نێوان فەڕەنسا لەلایەكو ئەمریکاو بەریتانیا لەلایەکیترەوە–ی ناوزووری جەنگم بۆدەرکەوت، کە بۆ پێش ئازادکردنی پاریسو، تەنانەت بۆ (٦/حوزەیران/١٩٤٤) کەهێزە ئاسمانیەکانی بەریتانیاو ئەمریکا لەباکوری فەڕەنسا دابەزین، دەگەڕایەوە. وا دەردەکەوت کە (دیگۆڵ) لەبەرئەو ڕووداوەی کە بەغافڵگیرکردنی گەورەی دادەنا– هێرش کردنە سەر مەراکیشو جەزایر لەنۆڤەمبەری١٩٤٢– هەرگیز لەڕوزفلتو چەرچل نەبوورابێت. بۆ هێزەکانی فەڕەنسا، لەوکاتانەدا کە (دیگۆڵ) پێشبینی دەکرد هێزی هاوپەیمانەکان پێویستە بۆ دووبارەگرتنەوەو ئازادکردنی فەڕەنسا کۆببنەوە.. لەهەر قۆناغێکی چالاکیدا،ئەو جۆرە ناڕازیبوون جیاوازی لەدیدەکاندا دەربارەی شتە پلەیەکەکان، دەبووە هۆی دروستبوونی نائومێدیو شەڕی تر. بۆنمونە لەساڵی ١٩٤٢دا، کاتێك کە هاوپەیمانەکان دەیانویست کەجەنەڕاڵ (هانری جیرو) بکەنە فەرماندەی هێزەکانی باکوری ئەفریقا، (باب مۆرف) هەموو تاکتیکەکانی کەدایڕشتبوو بۆ گونجاندنی (دیگۆڵ)و (جیرو) بەکارهێنا تا لەبەردەم وێنە گرەکاندا دەستبخەنە ناودەستی یەکتری. (دیگۆڵ) پێی باش بوو کە لەسەرووی قوچەکی ڕابەرییەوە ببینرێت. بەدرێژایی ئەو سەردەمە، کاتێ هاوپەیمانەکان دووبارە فەڕەنسایان گرتەوە، لەنێوان (دیگۆڵ)و ئایزەنهاوەردا پێکدادانێکی هەمیشەیی سەریهەڵدابوو. سەرەڕای ئەوە، من وەك نوێنەری هێزەکانی بەرگری فەڕەنسا هەمیشە پەیوەستبووم بە(جوین)ەوەو، پەیوەندیداری بەرزی هاوپەیمانەکان بووم. هەوڵەکانی فەڕەنسا بەهێزی بەرزی (جوین) داڕێژراو لەلایەن جەنەڕاڵ (جان ماری دوتاسینی)یەوە، کە فەڕەنسای لەشەڕی (سن تروپە) لە (ئالزاس) ڕزگارکرد، پراکتیك کراو لەکۆتاییدا (سن تروپە) بووە هۆی خۆ بەدەستەوەدانی سوپای ئەڵمانیا لەبەرلین. سەرەڕای ئەوەش، جەنەڕاڵ (فیلیپ لولکرك)یش بەڕێنمایکردنی هێزەکانی فەڕەنسا کۆمەکی بەهێڵەکانی نۆرماندی کردو ڕۆڵی گەورەی هەبوو

لەئازادکردنی پاریسدا. لەبەری ئەمریکاوە، دۆستو هاوڕێو دەستنێژی ئایزنهاوەر، جەنەڕاڵ (واڵتەربەدل سمیت)، ستراتیژەکانی ئەمریکای پیادە دەکرد. بەریتانیاش کاری بۆ خۆی دەکردو لەمیانەی دەرئەنجامی نواندنی توانای هێزەکانیدا، فەڕەنساو ئەمریکییەکانی گۆشەگیر دەکرد. کاتێ هێزەکانی فەڕەنسا لەپاریس چوونە دەرێو بۆ دووبارەگرتنەوەی دڵی فەڕەنسا بەرەوباشوور کەوتنە ڕێ، هەلی گەورە بۆ نواندنی توانا لەئارادا بوو. هێشتا ئەڵمانیەکان بەشێك بوون لەگرفتەکانمان. دڵسۆزانی کۆمۆنیستە فەڕەنسیەکان هەرجارەی لەڕوویەکەوە گرفتیان بۆ دروستدە کردین. ناوچە فروانەکانی باشووری (لوار)و خۆرئاوای (ڕون) لەدەرەوەی کۆنترۆڵی دەوڵەتی تازە دامەزراوی فەڕەنسا بوون.

(دیگۆڵ) دەترسا کەپارتیزانە بەهرەمەندەکان، کەهەمان ئەوکەسانەی ناو (بزوتنەوەی جەنگی نارێکوپێکی پارتیزانەکانی سەر بەکۆمۆنیستەکان) بوون، لەوناوچانەدا جڵەوی سەنتەری شۆڕشگێڕی فەڕەنسا بگرنەدەستو دەوڵەتێکی سەربەخۆ لەبەرامبەر ڕابەرایەتی سەنتراڵی پاریس دابمەزرێنن. دەوڵەتی (دیگۆڵ) شەش کەسی خاوەن پایەی ڕەسمی ڕەوانەی (لیمۆج) کرد کە هەریەك لەوانە یەکبەدوایەك دەستگیرکرانو لەلایەن (ئەنجومەنی لۆکاڵەوە) ڕەوانەی زیندان کران. دەستخستنە ناو کاروباری سیاسی بەجۆرێکی ئاڵۆزو بەمەبەستی سوپاییو، لەوەش زیاتر، هەستی ناسکی مرۆڤانە کەپێویستی بەلێکۆڵینەوەو تەندروستی هەبوو، لەئارادابوو. لەمبارەیەوە ئەو هونەرەی کەئێمە لەودەمە سەختەدا فێری بووین، لەبنەڕەتدا خۆی لەبەهادانان بۆ کاریگەریو کارتێکردنی بەرامبەریی ئاڵۆزی هێزەکانی مەزهەبو سیاسەت، کە لەیەکتری جیاوازبوونو، هەروەها لەبەهادانان بۆ خۆچەکدار کردن، دەبینیەوە. ئێستا ئەم زانیارییانەی کەفێری بووین لەبۆشاییەکانی جەنگی چوارەمی جیهانیدا بەرجەستەدەبن.بەهەرحاڵ (دیگۆڵ)و (ئایزنهاوەر) لەپرسی ئاشتیو رێککەوتنا، تەنانەت لەتێگەیشتنی خواستو ویستەکانی یەکتریشدا بەنەگونجاوی مانەوە.(دیگۆڵ) داوای لە (ئایزنهاوەر) کرد تا بەشێك یان

دووبەش لەولاتێکی، کەکۆمەك بە لەسەرپێوە ڕاوەستانی فەڕەنسا بەسیستمێکی نوێوەبکاتو دووبارە یاریدەی بدات تابتوانێت دەستی بەرسەر هێزەکانی (FTPP) دا ڕابگات، بۆ فەراهەم بکات. بەلام (ئایزنهاوەر) هیچ بەشێکی لەگرفتە سیاسیە ناوخۆیەکانو قەڵەمڕەوەکانی هاوپەیمانەکان پەسند نەکرد، ئەو مەرجانە کە لەهەلومەرجی ئەوسەردەمەی کەبەرایی کارکردن بوو بۆ دەستوەشاندن لەئەڵمانیا، بەتەواوی قابیلی دەرککردن بوو. بەلام ئەوشتەی کە بەتەواوی نادیدە دەگیرا، ئەو واقیعەی پاش جەنگ بوو کە لەپێشدا ڕیشەی داکوتابوو کەمکەمە سەری هەڵدەدا.

ئەو بەمجۆرە وەلامی خواستەکەی (دیگۆڵ)ی دایەوە: (لەتوانادا نییە، لەبابەتەکە مەچۆدەرەوە.. ئەم هێزانە لەژێر فەرماندەیی مندانو منیش مەبەستمەپارێزگارییان بکەم. من تەنها یەك دوژمنم هەیە؛ هێزەکانی ئەڵمانیایە. شەڕکردن لەگەڵ هێزە بەرگریکارەکانی ئەڵمانیا جەنگێکە تامردنو ناتوانم لەم فەرمانە سەرپێچی بکەم.)

گفتوگۆکردن لەگەڵیدا بێسوودبوو، حەقیقەت ئەمەبوو کە (ئایزنهاوەر) هیچ وێناکردنێکی ڕوونی سەبارەت بەجیاوازییە سیاسیەکانی جەنگ لەهەریەکە لەناوچەکانی ئەوروپا کەتیایاندا تووشی شەڕبووبوو، نەبوو. لەکاتی شەڕی(ئاردن)و لەیەکەمین ڕۆژدا، تەمێکی ترسناك لەئارادابوو کەبواری خۆحەشاردانی بۆئەڵمانیەکان دەڕەخساند، بەوپێیە ئێمە نەمانزانی کەئەوان تاڕادەیەك لەپێداویستیدا کەموکوڕییان هەیە. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی سەرەڕای زیادی ژمارەمان لەڕووی کەسەوە بەلام خەریك بوو بەتەواوی لەناوبچین. (ئایزنهاوەر) بڕیاریدا جمجوجۆڵێکی لەڕاستیدا سەرکێشیانە بکاتو هەموو هێزەکانی هاوپەیمانەکان لە(ئالزاس) بکێشێتەوەو بۆ یارمەتیدانی هێزی هاوپەیمانەکانی لە(ئاردن) جیگیربوون، بنێرێت. لەوساتەدا، (دیگۆڵ) نامەیەکی بۆ(ئایزنهاوەر) نووسی کەمن وەك گەلالەیەکی کۆتایی بۆمبرد. (دیگۆڵ) فەرمانی پێکردم: (پێویستە تۆ بەئایزنهاوەر بلێیت گەرکاری وابکەیتو هێزی هاوپەیمانەکان لەئالزاس بکێشیتەوە، مانای وایە بێحورمەتیت بەرامبەر بەهاوپەیمانەکان کردووە.) نامەکەم بردو کاتێك

(ئایزنهاوەر) لەخوێندنەوەی بۆوە، پەیامەکەم پێگووت. لەتوڕەبووندا تەقیەوەو وتی: (چۆن دەتوانیت بەمجۆرە لەگەڵ من بدوێیت؟)

هەندێ لەبەشە مێژوویەکانی ناوچەکەم بۆ ڕوونکردەوە. وتم کە ئالزاس بەشێکی ناوخۆیی ئەڵمانیابووە، پارێزگایەکە کەچەندە ئەڵمانیە ئەوەندەش ساکسۆنیە. ئەگەر ئەم پارێزگایە چۆڵ بکرێت، ئەڵمانیەکان دانیشتوانەکەی بەتاوانی هاوکاریکردنی هاوپەیمانەکان یان بەتاوانی خراپتر کۆکوژی دەکەن. (ئایزنهاوەر) نەیزانیبوو کەئەو دانیشتوانە چەند هەفتە لەوەوپێش بەچ شێوەیەك پێشوازییان لەهاوپەیمانەکان بەبۆنەی دووبارە گەڕانەوەی قارەمانەکانیان کردبوو، لەکاتێکدا چۆڵکردنی لەهێزی هاوپەیمانەکان دەکەونە بوارێکی سەختو پڕمەترسییەوە. لەوەش گرنگتر ئەو هەنگاوە دەبووە مایەی سەرکەوتنێکی گەورەی ئەخلاقیو ڕاگەیاندن بۆ (ڕایش)و، لەڕاستیدا دەیتوانی زۆربەی سەرکەوتنەکانی کە لەمانگەکانی دوایدا بەگران بەدەستهاتبوون هەڵگێڕێتەوە. بەڵام من دڵنیانە بووم کە (ئایزنهاوەر) باوەڕی کردبێت. لەبنەڕەتدا ئەو شەڕکەرێك بوو تا سیاسەتمەدارێك. لەوبڕوایەدا بووم کە(ئالزاس) کاتێك ڕزگای دەبێت کەچانسی هاوپەیمانان لەپڕێکدا لە (ئاردن) بگۆڕێت. زۆرجار هاتنەوەی ناخنی سیاسی (ئایزنهاوەر) لەئەستۆی (دیگۆڵ) دابوو. زرنگیەکەشی کەزۆر جاران (دیگۆڵ) لەناو کارەکانیدا پەیڕەوی دەکرد تەواکاری ئەو هێزە تێکدەرانەیەبوو نەیبوو. سەبارەت بەپارتیزانە شۆڕشگێڕەکانی سەربەسۆڤیەتی جاران کەبەشی باشوری سەنتەری فەڕەنسایان لەژێر چنگدابوو، (دیگۆڵ) بڕیاریدا ڕاستەوخۆ لەگەڵ (مۆریس تورە )مامەڵە بکات. (تورە) ڕابەری کۆمۆنیستەکانی فەڕەنسا بوو، کە لەسوپای فەڕەنسا جوودا ببۆوەو دەستی لەخزمەتکردن هەڵگرتبوو بەپێی فەرمانەکانی کۆمۆنیزمی نێونەتەیی ساڵی ١٩٣٩، ئەوکاتەی کەستالینو هیتلەر دەست لەناودەست کاریان دەکرد، لەفەڕەنساوە هەلات بۆ مۆسکۆ. دووساڵ دوای ئەوە لەمانگی (جون/١٩٤١)، لەپڕێکدا هیتلەر وەرگەڕایەوەو هێرشی کردەسەر ڕوسیا. بەلام لەکاتی هاتنەناوەوەی هێزەکانی ستالین بۆناو هاوپەیمانەکان (تورە) لەیەکێتی سۆڤیەت مابۆوە.لەدیسامبەری ١٩٤٤،

(دیگۆڵ) لەگەڵ (جویـن) بەمەبەستی گفتوگۆکردن لەگـەڵ سـتالین چـوو بۆ مۆسکۆ. بەدبەختانە من نەخۆش کەوتبووم و نەمتوانی لەگـەڵیان بچـم، بـەڵام (جوین) پاش گەڕانـەوەی هـەموو شتێکی لـەپاریس بۆ باسکردم. یەکـەمین تێبینی لەسەر ستالین ئەمەبوو کە، ڕابەری گـەورەی سۆڤیەتی کەسێك بـوو دیقـەتی کـەمبوو. بـەدرێژایی گفتوگۆکـان بەبێئـەوەی سـەربڵندبکات بـەهێڵی ناشـیرین و هەسـتی پەرێشـانەوە لەسـەرڕووی پارچـە کاغـەزەکان شـتی دەنووسـی، لـەکاتێکدا (دیگۆڵ) مەبەسـتی خـۆی لـەپێدانی ڤیزابـە (تـورە)و بەخشینی و مۆڵەتدان بەڕابەری کۆمۆنیستەکانی فەڕەنسـا بـۆ گەڕانـەوەی بـۆ وڵات شیدەکردەوە. هەڵبەتـە کـاتێك (سـتالین) هـەندێك لـەدوورخراوە یـان زیندانیـەکانی خـۆی لەدەرەوەگـەڕاندەوە، لەوبڕوایـەدا بـوو ئەوانـەیان کەنەشیاوبوون یان بەهۆی کاریگەرییەکانی دەرەوە خراپ ببوون و زۆربـەیانی ڕەوانەی زیندانە سیاسیەکان یان شوێنی خراپتر دەکرد. بەتـەوایش جێگـای پێشـبینی بووکـە هـەمان چـارەنووس چـاوەڕێی کۆمۆنیسـتە فەڕەنسـیەکانی سەربەئەویش بـوو، بـەمجۆرەی کـە لـە(تـورە)دا، ئـەم سـیمبولی کۆمۆنـیزمی فەڕەنسیەی کە ستاین دروستی کردبوو، بواری گەڕانەوەی دەبینی، خۆشحاڵ بوو، سەیری وەرگێڕەکەی کردبوو، کەتۆقیو دیـاربوو، وتبـووی: (لەجەنـەڕاڵ بپرسە کەی گوللەبارانی دەکەن.)

(تورە) لەڕاستیدا گەڕایەوە پاریس و (دیگـۆل) ڕاسـتەوخۆ کردیـە وەزیـری دەوڵـەت بۆکاروبـاری نـاوخۆ. ئـەم کـارە گلۆپـی سـەوزبوو کەدەرئـەنجامی گرانبـەهای لەگـەڵ خـۆی هێنـاو، (دیگـۆڵ) سـەبارەت بـەو دەرئەنجامانـە پێشـبینی پێشـتری هـەبوو؛ لەوانـەش کۆتـایی هێنـان بەخوێنڕێژی ئاشـوبێك کەلەوانـەبوو سـەختترین جـەنگی نـاوخۆیی لێبکەوێتـەوە. تـا ئەوکاتـەی (دیگـۆڵ)و (جویـن) لەڕوسـیاوە بـۆ پـاریس گەڕانـەوە، مـن تاڕادەیـەك هەستابوومەوەو دووبارە سەرقاڵی کارکردن ببوومـەوە. سـەرەڕای ئـەوەش، گرفتەکان بۆ هاوپەیمانەکان و بەهەمانشـێوە بـۆ فەڕەنسـاش چـەند بەرامبـەر ببـوون. سـوپای ئـەڵمانیا لەغەرغـەرەی مـەرگدا بـوو. کاتـێ هاوپەیمانـەکان

دەستیان کرد بەپێشڕەوی کردن بەرەو سەنتەری ئەوروپا، مەندەهۆشی ئەوترس‌و بیمەی ناو زیندانە سیاسیەکان دەبوون.

کاتێك کەڕوسەکان بۆ دەستبەسەراگرتنی پایتەختی ئەڵمانیا کەوتنە کێبەرکێ لەگەڵ ئەوانی دی، دانوستانێکی سەخت دەربارەی ئایندەی بەرلینی دابەشکراو لەتکراو لەئارادابوو.

زۆربەی بڕیارە تاکتیکیە گەورەکانی دواڕۆژەکانی جەنگ بەپەلەو لەنامۆترین هەلومەرجدا وەرگیران؛ بۆ نمونە دیاریکردنی کاتی پەڕینەوە لە(ڕاین). ئێمە ڕۆژێك پێش پەڕینەوەی هاوپەیمانەکان لە (ڕاین) لە ٢٢ مارت ١٩٤٥، لەڤیلاخەریکی نانخواردنی ئێوارەبووین جەنەڕاڵ (برادلی) لەسەر مێزەکەی ئێمە بوو، کەفەرماندەیی بەشێکی سوپای باکور، لەوانە هێزی ئەمریکیەکان‌و هێزەکانی بەریتانیای ژێر چاودێری (فیلد مارشاڵ مونتگمری)شی دەکرد. مارشاڵ (پاتن)ی بەهێزیش لەوێبوو، کە لەکاتی خۆنواندنیدا لەگەڵ (برادلی)، کە کەسێکی ئارام‌و باوەڕ بەخۆبوو دیاربوو لەگەڵ (مارشاڵ پاتن)ڕووبەڕوو بوونەوەیەك ڕوویدا.

(پاتن) زۆرترینی کاتی نانخواردنەکەی بەباسکردنی چیرۆکی جەنگی بەسەربرد، کەمن ئەو چیرۆکە تەواو نەبیستراوانەم بەزەحمەت وەردەگێڕا. ئەو دەیگوت: (ئەلکس، بەجەنەڕاڵ بڵێ ..) دەستی دەکرد بەگێڕانەوەی چیرۆکێکی پڕپێچ‌و پەناو لێڵ.

دوێنێ بەیانی جەنەڕاڵێکی ئەڵمانییان وەك دیل هێنا بۆ بارەگای فەرماندەییەکەم. ئەو حەرامزادەیە نازی بوو. کاتێك گەیشتە ناو ئۆفیسەکەی من پاژنەی پێکانی کێشا بەزەویداو هاواری کرد: (هایل هیتلەر!) ئەی عیسای مەسیح!، بەوهۆیەوە بەتوندی کێشام بەسەریداو وەك کەر کەوتەسەرزەوی. ڕوومکردە نێردراوەکەم‌و پێموت: (ئەم زۆڵە بەرە). بردیان بۆ کامپی زیندانیانی جەنگ. لەگەڵ وتنی ئەم چیرۆکە بەپێکەنینەوە ئەتریقایەوە.

لەکۆتایی نانخواردنەکەدا، خواردنەوەی شەراب دەستی پێکرد.(پاتن) هەستا، ڕوویکردە من‌و (جوین) گلاسەکەی بەرزکردەوە. بە(جوین)ی وت:

(بەرۆخسەتی تۆ جەنەڕاڵ، من حەزدەکەم گلاسەکەم بەیادی باوکی ئەلکساندەر بەرزبکەمەوە.)

(جوین) وەلامی دایەوە: (ئەوبوو تۆی فێری جەنگ کرد.)

(پاتن) وتی: (بەلێ)

(جوین) چاوی داگرت: (ئەی عیشق.)

(پاتن)بەدەنگی بەرز وتی: (ئۆو، نا، ئەوە پێشتر دەمزانی.)

(پاتن) دانیشتو (جوین) چووەسەر دیاریکردنی کاتی پەڕینەوە لە (ڕاین).

(جوین) بەتەوسەوە وتی: (ئایا ڕێگا دەدەیت خەلکی تر دەستکەوتەکان فەرهود بکەن؟)

(پاتن) لەسەرکورسیەکەی هەلساو وتی: (پشتبەخوا، نەخێر.) بەپەلە بەرەو تەلەفونەکە چوو فەرمانیدا کەبێوەستان سوپای سێیەم هێرش بکات. دوابەدوای ئەوە لەفەرەنسا سەردەمانێك کە بۆ جێگیربوونی سیستمی نوێ بەحسابەکۆنەکاندا دەچوونەوە، هەرگیز بەم ئەندازەیە ئەندامانی بزوتنەوەی بەرگری زۆر نەبوون. تا کۆتایی جەنگ، زۆرترینی ئەوانە مردو یان دوورخراوەبوون. برای ئەفسەرێکی ژێر فەرماندەیی من کارگەیەکی چاپکردنی سەرجلوبەرگی هەبوو. شەش مانگ دوای ئازادکردنی باشووری خۆرئاوای فەرەنسا، بڕی شەست هەزار داواکاری چاپکردنی دەستەواژەی (FF I) کەسیمبولی (هێزە ناوخۆ ییەکانی فەرەنسا)بوو ، قارەمانترین جەنگاوەرانی خەباتگێڕی بزوتنەوەی بەرگری فەرەنسابوو، پێگەیشتبوو. لەوکاتەدا، ئەو سیمبولە، ئاماژەی شانازیکردن بوو؛ چ بەدەستهاتوو بوایە یان نەهاتوو بوایە.

بەلام لەخولەکانی دوای ئازادیدا، لایەنی تاریکتری هەبوو. خولی دەستە تاوانبارکردن‌و دەستگیرکردنی زۆردارانە. تەنها لەماوەی چەند مانگێکدا، ئەوەی دەربارەی هاوولاتیەکانم حەزم دەکرد بیزانم، زانیم. حەقیقەتێکی تالی کە لەوبارەیەوە هەبوو ئەوەبوو ئیرەیی، عەیبی نەتەوەیی ئێمە بوو، لەوسەرمەدا، تا دواپلەی پەرەی سەندبوو. هەلبەتە لەساتە زۆر تاریکەکانی داگیرکردنیشدا، لەوکاتانەدا یارمەتیدان هەرهەبووە. ئەم شتە لەژیاندا

دیاردەیەکی ئاسایی بوو. پوری من (کۆنتسەدوگانە)، یەکێك بوو لەقوربانیانی ئەو (یارمەتیدانانە).

ئەو تۆڕێکی هەڵاتنی لەئۆردوگاکانی ئەڵمانیاوە بۆ ئیسپانیاو پاشان بەرەو ئازادبوون پێکهێنابوو. پاشان لەپڕێکدا لەلایەن فەڕەنساییەکانەوە تاوانبارکراو دەستگیرکرا، پێش دوورخستنەوەی بۆ(ڕاونسبروك)، لەلایەن باڵی چەپی گشتاپۆی فەڕەنساییەوە کەوتبووە بەر ئەشکەنجەو لەدوورخراوەیدا ئازایانە گیانی سپارد. هەڵبەتە کەسانێکی کەئەم ژنە ئازایەو چەندەها کەسانی تری فرۆشت، لەوانەیە لەکۆتایی جەنگی جیهانیدا دوچاری هەمان چارەنووس بووبن، هەروەها کەسانێك بوون کەچاوی تەماعیان دەبڕییە ژنانی دراوسێیان یان تایەی پاسکیلی کەسانی تریان ئەدزی‌و ئینکارییان لێدەکرد. ئێستا ئەو دەمەبوو کە ڕاستەوخۆ لادانە فراوان‌و تراژیدییەکان، چ واقعی‌و چ ئەوانەی ناواقعین، ئاشکرا بکرێن. من یەکێك بووم لەوکەسانەی کە لەساڵی ١٩٤٤دا باوەڕم وابوو، کەئاشتی نەتەوەیی زۆر لەلێکۆلینەوە لەرابووردوو گرنگترە. چونکە پێداویستی کۆتایی هێنان بەشەڕو هەراو هوریاکان‌و بەلاوەنانی کێشەکان پێداویستی تایبەتی بوون، تابتوانین خۆمان بۆجەنگی دواتر، یان جەنگی سێیەمی جیهان، کەدیاردەکانی لەپێشمانەوە ئاشکرابوو، ئامادەبکەین. شکستی گەورەو حەتمی فەڕەنسا، سەرنەگرتنی یەکێتی نێوان تیرەکانی (گول)بوو.

بەڵام لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٩٤٤دا، من تەنها دەمتوانی پێشنیازی چەند هەنگاوێك بکەم کەئەگەری ئەوەی هەبوو، گێڕانەوەی هەلومەرجی پێشوومان واتە حاڵەتی یەکێتی لەژیانی نەتەوەییماندا، ئاسانتر بکات. یەکێك لەپێشنیازەکان ئەوەبوو کەمن (گاستۆن پالوسکە)ی سەرۆکی کابینەی ناسراوی (دیگۆڵ)م بۆ کارێك دەستنیشان کردبوو، کەئەویش بەمجۆرەبوو: مارشاڵ (فیلپ پاتن)، ئەو پیاوەی کەبۆ بەرژەوەندی ئەڵمانیا ئابلۆقەی فەڕەنسای داو پاشان سەرۆکایەتی دەوڵەتی دەستنیژەو فەرمان هەڵسوڕێنەری لە(ڤیشی) گرتەئەستۆ، بەهۆی (پالوسکی)و بەڕووکەش وەك ڕێکەوت دەکرایە قوربانی. بەئاسانی دەمانتوانی بەهۆی چەند کەسێك

لەهێزەکانی ئاسایشمانەوە ئەورووداوە ڕێکبخەین و بڵاویشی بکەینەوە . ئەوکاتە فەڕەنسا باشتر لەشەڕو ململانێی ناوخۆی دەهاتە دەرەوە. ئەوکارە خوێ کردنە سەربرینێك بوو کەتا ئەمڕۆش درێژەی هەیەو بەدەگمەن سارێژ بۆتەوە. ئێمە ڕووداوی لەوجۆرەمان ڕێکخستبوو کە لەمانگەکانی پێش کۆتایی جەنگ جێبەجێکران. لەبەرئەوە من بیرۆکەکەم بە (پالوسکی) ڕاگەیاند.

(دیگۆل) لەوەڵامی پێشنیازەکەی مندا وتی: (زۆر درەنگ بووە.).(دیگۆل) بڕیاری دابوو دادگاییەکی ئاشکرا ڕێکبخات کەتیایدا، (پاتن) یەك وشەی لەدەم نەیەتە دەرەوە. ئەو دادگایکردنە بەحوکمی مەرگو یەك پلە کەمتر واتە زیندانی هەتاهەتایی کۆتایی پێهات.

ئەو پاش شەش ساڵ زیندانی مرد.

تا ئەودەمەی فەڕەنسا لەجەنگدابوو بەدوای ئەویشدا ترسوبیم دەستی پێکرد، لەدوای ئەوەوە منیش دوچاری هەراس ببووم، بەڵام سیاسەتەکانی جەنگیان لەپێش سیاسەتەکانی ئاشتییەوە داڕشتبوو.

## ئەرکێکی ناجۆر

لـــەکۆتایی جـــەنگی دووەمـــی جیـــهانیدا، هەریـــەك لەهاوپەیمانـــەکان سـەرەتاکانی خۆیـان هـەبوو. فەرەنسـا پێویسـتی بەشـانازیکردن بـــوو، کەسایەتی دەستڕۆیشتووی (دیگۆڵ) ڕیسوایی گشتی دادەپۆشـی. هێزەکانی بەریتانیا لەسـاڵی ١٩٤٥دا هەڵوەشـابوو. ئەمریکاییـەکان هیـچ میتۆدێکـی تایبەتیان نـەبوو، بەلایـەنی کەمـەوە لـەهیچ جێگایـەکی ئـەوروپادا، لەسـاڵی ١٩٤٥ دا تەنها یەك مەبەستیان هەبوو ئەویش دابینکردن وسـەپاندنی ئاشـتی بـوو بـەزووترین کـات کـە لـەتوانادا بێـت. هـاواری گشـتی خـەڵکی ئـــەمریکاو ئامانجی سەرەکی (ئایزنهاوەر)، کەسەرئەنجام وەك سەرکۆمار بـووە ڕابـەری ئەو میللەتە، ئەمەبوو: (سەربازەکان بگێڕنەوە بۆ نیشتمان !).

لەنێوان هاوپەیمانەکاندا، جگە لەچەند کەسێکی خـاوەن هـزری گۆشـەگیر کراو کەخاوەن وزەیەکی ستراتیژی بوون، زۆرکەم بیرلە دەستپێکردنی سێیەم جـەنگیی جیـهانی دەکرایـەوە. لەکەشـی پاشەکشـەکردن و گۆشـــەگیریدا، دیـارترین تایبەتمـەندی لـەدووربینی کەسـایەتی ئەمریکیـــەکاندا، کـاتێك تێگەیشتم کەلەساڵی ١٩٤٥ پێم نایە ناو ئەمریکاوە. مـن بـەهاوەڵی جەنـەڕاڵ (جوین) بۆ کارێك لەگەڵ جەنەڕاڵ (جۆرج. سی. مارشاڵ) دەربارەی ئایندەی سازشکاری ویلایەتە یەکگرتووەکان هـەمانبوو، چووین بـۆ پنتـاگۆن. لـەوێدا سێ کەسی گرنگی دیمان چاوپێکەوت؛ سەرکۆمار (ترومن)، (ئادمـیرال مـی)و دایکم.

ئەمە یەکەمین سەردانی من بـۆ گۆشـەیەکی دی ئـەتلانتیك نـەبوو، چونکـە لەزسـتانی ١٩٢٥ کـاتێك پێنـج سـاڵانە بـووم سـەفەرم بـۆ ئـەوێ کردبـوو، یادەوەری ئەوڕۆژە کۆنانـە، لـەپاشماوەی ژیـانمدا ڕەفتارەکانمیـان بەرامبـەر بەئەمـەریکاو ئەمریکیـەکان خسـتەژێر کاریگەرییـەوە. لەوسـەردەمانەدا تاکەڕێگای گەیشتنە ئەوێ لەڕێگای کەشتییەوەبوو. بەوپێیە یەکەمین وێنـای مـن بۆ ئەمـەریکاو بـەندەری نیـۆرك، ئـەو واگۆنانـەبوو کەلەبەلەمەکانـەوە

بارەکانیان دەگواستەوە. ئەوانە بەهێستر ڕادەکێشران و من پێشتر ئەسپ و گوێدرێژی ترم بینیبوو، بەڵام هەرگیز (هێستر)م نەدیبوو. ئەوانە ئاژەڵی نائاساین و وەك ئەسپ بەرز دیارن، بەڵام گوێکانی ڕەپن کە لەلای من زۆر سەنجڕاکێش بوون. دووەمین یادەوەریم لادانی لەوزەتێنەکانم بوو، کەلەنیۆرك ئەنجامدرا. مایەی سەرسوڕمان بوو کەپاش لادانی لەوزەتێن دەبێت بڕێکی زۆرساردەمەنی بخۆیت. دۆندرمەی ئەمریکایی باشترین ساردەمەنی جیهان بوو، من زۆر زۆر حەزم پێیبوو. دواین یادەوەریم سەبارەت بەنیشتەجێبوونمان لەواشنتۆن هاوەڵیکردنی کەسانێك بوو کەخانوویەکی باشی گوندیانەو باخێکیان هەبوو. باخەوانەکەی سەرەڕای کارەکەی پیشەی خەڵوز کردنە ناو زۆپاکەش بوو. کەسێکی ڕەشپێست و خەڵکی باشوور بوو. من لەسەر ڕانەکانی دادەنیشتم و لەو کاتانەی مژی لە پایپەکەی دەدا، چیرۆکی ڕۆژگارە دوورەکانی باشووری بۆ دەگێڕامەوە.

هەندێ لەچیرۆکەکان بەمجۆرە دەستی پێدەکرد (کاتێك من کۆیلەبووم.. ) پیرەمێردێکی زۆرباش بوو. لەگەڵ یادەوەرییەکانیدا تا دوورترین شوێن دەڕۆشتم. لەزستانی ١٩٤٠وە دایکم نەدیبوو؛ واتە لەکاتی هێرشی سوپای ئەڵمانیا بۆ سەر فەرەنسا هەڵهات. ئەو درێژایی ماوەی جەنگی لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەسەربردو لەوترسەی سایەی بەسەر وڵاتەکەیدا خستبوو دوور مابۆوە.

لەوساڵانەدا کەتێگەیشتم دایکم لەئازاری جەنگ بەدوورە، بەلایەنی کەمەوە بارێکی قورس لەسەرشانم لاچوو. لەواشنتن لەشوێنێکی سەرسوڕهێنەردا بەناوی (فیرفکس)لەهوتێلێکدا نیشتەجێبوو، کەتیایدا سویت (جناح)ێکی هەبوو، لەگەڵ(هانریت)ی کارەکەریدا دەژیا.

بەدرێژایی جەنگ بەسەختی سەرقاڵی کۆمەك ناردن و ڕەوانەکردنی بوخچەکان بۆ سەربازان بوو. ئەزموونێکی هێجگار وروژێنەرانەبوو کەپاش ئەو هەموو ساڵە دووبارە دایکم دەبینییەوە. لەڕاستیدا کاتێك منداڵ یان مێرد منداڵ بووم، ئەوم بەجێهێشتبوو. کاتێك دووبارە دەمبینییەوە ئەفسەرێك بووم کەدنیایەك ڕووداوی جەنگ لەپشتمەوە بوو، یاریدەدەری سوپایی

جەنەڕاڵ (جوین)، مارشاڵی ئایندەی فەرەنسابووم. گەشتی فرۆکە لەفەرەنساوە بۆ (ئسکتلاند)و پاشان بۆ (ئایسلاند) لەدوایدا بۆ (نیوفاندلاند)و لەئەنجامدا بۆ واشنتن‌و نیۆرك، سەفەرێکی دوورو درێژو سەخت بوو. له(نیوفاندلاند) تووشی تۆفانێکی بەفری بووین‌و نزیکەی چوار ڕۆژمان لەناو بنکەی هێزی ئاسمانی کەنەدا دا بەسەربرد تا زریانەکە نیشتەوە. بەدرێژایی ساڵانی جەنگ‌و خولەکانی دوای جەنگ، سەروکاری زۆرم لەگەڵ ئەمریکیەکاندا هەبووە.

بەڵام ئەو نزیکبوونەوانە لەڕاستیدا ئامادەگییەکی کەمی بۆ یەکەمین ڕووبەڕوو بوونەوەم لەگەڵ ئەمریکیەکان پێبەخشی بووم. بەتایبەتی لەکاتێکدا کەویلایەتە یەکگرتووەکان دەیویست بیرێك دەربارەی سیستمێکی کە بەهۆیەوە بەشداری فراوانترین جەنگەکانی جیهانی کردبوو، بەهزرێك بگۆرێت کەتیایدا (جەنگی سارد)ی تێدا بگونجێت. لەپاش هەموو ئەمانەشەوە، ئەمریکا ولاتێك بوو کە بۆشکست پێهێنانی دوژمنە مەترسیدارەکانی دیمکراسی، ڕابەری جیهانی لەئەستۆ گرتبوو. بەمپێیە، ئەو ڕابەرە یان ولاتە نەبوو کەئێستا بەهاوەڵی جەنەڕاڵ (جوین) لە یەکەمین چوونمان بۆ واشنتۆن دەمانبینی.

تا ئەودەمە، ئەمریکیەکان بەتەنها خاوەنی بۆمبی ئەتۆمی بوون کەپێگەیەکی ئاوارتەی پێدەبەخشین. ئەوان بەدرێژایی جەنگی جیهانی دووەم ئەوەیان بەئاشکرا ڕادەگەیاند کە بەسوود وەرگرتن لەم وزە نائاساییە فراوانی بەڕابەرایەتی ئابلۆوقەدراوی جیهان دەدەن. ئەم ڕابەرایەتی کردنە لەڕوانگەی ئەوانیدی لەجیهانی ئازاددا، دیاردەیەکی ئاشنا بوو، بەڵام خودی ئەمریکیەکان دەربارەی وردەکارییان نەبوو، بەدڵنیاییەوە گەربیانخواستایە، دوچاری نەخۆشی ئەمریکیا نەدەبوون کەیەك سەدەیان زیاتر درێژەی دەبوو؛ سەدەیەك کەباقی جیهان لە ئاشتی‌و ئارمیدا دەبوون. پەسەندکردنی ڕێسای گرنگی دابەشکردنی ئەڵمانیاو جێگیربوونی پایەگای ئەتۆمی لەنیوەی ئەوروپادا، ڕوسیای ناچار بەئامادەبوونی دیارو سنوردارکراو کرد لەئەورووپای

ڕۆژهەڵاتیدا؛ ئەم بارە ڕێسایەك بوو کەئەمریکیەکان لەهیچ هەلومەرجێکی ناهەمواری کە لەئەنجامی خۆسەپاندنی ڕوسیە بەسەر وڵاتە ئازادە ناسراوەکانی وەك چیکۆسلۆفاك دا (کەرێککەوتنەکانی یالتا دەربارەی دابەشکردنی ئەوروپا بەسەر دوونیوەی خۆرهەڵاتیو خۆرئاواییدا پەسەندی نەکرد) پاشگەز نەدەبوونەوە، یان بەلایەنی کەمەوە ئەگەری جەنگی سێیەمی جیهانی هێواش دەکردەوە. هەڵبەتە ئاڵوگۆڕی هاوسەنگی هێز بەسوودی خۆرئاوادا دەگەڕا. لەجیاتی ئەوە، ئەمریکیەکان بەلەدەستدانی دیدی مێژوویی کە لەزۆربەی کاتەکانی سەدەی بیستەمدا گرفتی بنەڕەتیان بووە، لەپرسی پشککگرتنی (کات)دا شکستیان خوارد. هەندێ لەگرفتەکان، ئەو چیرۆکانە بوون کەسەربازە لاوە ئەمریکیەکان لەکاتی گەڕانەوەیان لەدووبارە ئازادکردنەوەی ئەوروپا لەگەڵ خۆیان بۆ وڵاتیان دەبردەوە.هەرچەندە ئەوانە کیشوەرێکیان ئازاد کردبوو، بەڵام دووبارەش لەلایان شوێنێکی سەرسوڕهێنەرو عەجیب بوو (شوێنێکی کەپێش ئەوەی ئەوان بگەنە پلەی بڵندی میکانیزمە بوون، جێپێی لەپیشەسازیو پێشکەوتندا هەبووە.)

لەلایەکەوە سەرکەوتنەکانیان بەهۆی هەستی ناسکی ئاشکراو ئەم خەڵکانەی ئەمان ئازادیان کردبوون ، لەبەر یەك هەڵوەشابوو. چونکە ئەو خەڵکانە وەك منداڵی ئەمان بوون کەپێویستە چاودێریو پارێزگارییان لێبکرێت؛ لەلایەکی دییەوە بەچاوپۆشیکردن لەو بێبەزەییانەی لەکامپی زیندانیانی سیاسیدا ئەنجامدەدرا، ئەوان خۆیان ڕاستەوخۆ گەواهی کاری توندوتیژیانەی پاکتاوکردن لەسەر شێوەی بەربەڕیەت بوون. چیرۆکە ترسناکەکانی ناو ئەم کامپانە کەئەوان ئازادیان کردبوون هەروەها چیرۆکی ڕەفتاری فەڕەنسیە خائنەکان، چ ڕاستو چ خەیاڵی، کەمکەمە ڕووی ئەمریکیەکانی دەگرتەوە. ئەوانە چیرۆك گەلێك بوون جگە لەوەی کەهەندێ لەئەوروپیەکان دژ بەهەندێکیتر ئەنجامیان دابوو هەستێکی پانو فراوانی دەهێنایە ئاراوە، ئەو بیرەی بەرجەستە دەکرد کە لەوانەیە ئەمانە لەوکەسانە نەبن کەویلایەتە یەکگرتووەکان دەیخواست هەروەك

ڕۆڵەکانی خۆی سەرپەرشتیان بکاتو تائایندەیەکی نادیار بەرگرییان لێبکات.

هەرچەندە ڕوویەکی تری ئەم دراوە، ئەو هەستەبوو کە لەهۆکارێکی بچوکترەوە لەجۆری هێزی خەڵکی ئەمریکاوە سەرچاوەی دەگرت کەتەنها پاش یەك دەیەی دوایی هەموو ویلایەتە یەکگرتووەکانی گرتەوە. ئەو بڕوایانە بەوجۆرە بوو کەهەرچەندە جەنگی دژی نازییەکان کۆتایی پێهاتووەو سەرئەنجام ئەڵمانیەکان وزەبڕاو بوون، بەلاّم پێویستە بەبێوەستان جەنگ دژی دوژمنێکی بەئازارترو سامناکتر- واتە کۆمۆنیستەکانی ڕوسیای سۆڤیەتی- بکەین. جەنگێکی کە لەڕاستیدا دەتوانرا بەجەنگی سێیەمی جیهانی ناوببرێت. هەندێ لەئەمریکیە هوشیارەکان لێرە، ئەو شوێنەی کە (دیگۆڵ)،(جوین) وخودی من پێشوازی لێدەکراین، ئەو مەترسییەیان دەناسی.

لەواقیعدا، تەواو پێش کاتی بڕانەوەی جەنگ، (جوین)و من لەگەڵ سەرۆکی یەکەی سوپا (ئایك)، لەگەڵ جەنەڕاڵ (بدل سمیت)، لەکاتی چوونمان بۆسەنتەری فەرماندەیی هاوپەیمانەکان کەتائەو دەمە لە(ڕیمس) بوو، بەیەك گەیشتین. (بدل سمیت) زۆر لەخۆڕازیو غرور دیاربوو و(جوین) پرسیاری ئەوەی لێکرد: وا دەردەکەوت سەرکەوتن لەجەنگدا بۆ ئێمەیەو ڕێگا بەرەو بەرلین کراوەیە.

(بدل سمیت) لەخۆباییانە وتی، (بەدترین بەشی کارەکە هێشتا ماوە.)، زۆر لێزانانەش ڕەفتاری نەدەنواند. بەلاّم ماوەیەك پاش ئەوە، دوای کۆتایی جەنگ، (دیگۆڵ) فرمانی پێمکرد کەئەو هەوالاّنەی بەدەستمان گەیشتووە بۆ (ئایزنهاوەری) ڕوونبکەمەوە. هەواڵەکان لەسەرچاوەکانی حزبی کۆمۆنیستی فەڕەنسییەوە بوو دەربارەی ئەوەی کە لەناوچەی ڕوسیادا ڕوویدەدا. من وتم: (ملیۆنان کەس لەڕوسەکان لەناوچەکانی ئەمریکادا کۆببوو نەوەو بەرەو ئەو شوێنەی کەبڕیاربوو یەك بەیەك تیرۆر بکرێن لەڕوسیا، نێردرانەوە.)

(ئایك) قسەكانی بەمن بڕیو بەئاوازێكی بێپەروا كەدیاربوو تێكەڵ بەدەستەپاچەیی بوو، وتی: (دەزانم، بەلاّم دەربارەی ئەوە ئێمە ناتوانین هیچ بكەین. ئەمە بەشێكە لەرێككەوتنمان لەگەڵ هاوپەیمانەكانمان.)

بەمپێیە لەگەڵ ئاگاداربوونی (ئایك) لەهەڕەشەی نوێی سۆڤیەتیو ئەو بیرە ستراتیجی‌یەی هەیبوو، كەهەموو بیركردنەوەكانی لەدەوری ئەم كێبەركێ نیزامیە نوێیە كۆدەكردەوە، جێگای سەرسوڕمان نەبوو، بۆیە بەدرێژایی مانگەكان ئیتر بیرم لەدژایەتی بەرلینو ڕووسەكان نەدەكردەوە، بەڵكو دژایەتی كردنی بەرجەستەترین هزرو دژایەتی ئامادەكارییەكانی (ڕایش)ی سێیەم لەلام گرنگ بوو، كەزۆربەی زۆری گفتوگۆكانی پنتاگۆنیش لەدەوری هەمان بابەت دەسووڕایەوە.

لەوسەردەمەدا، لەناو سیستمی كۆمۆنیستیدا، ژمارەیەكی كەمی پسپۆڕی واقیعی بوونیان هەبوو كە زۆربەی شارەزاكانیش سەر بەنازییەكان بوونو ساڵەها سەرقاڵی جەنگ بوون دژی ڕووسەكان.هەموویان شێتانە هاواریان دەكرد تا بیانگێڕنەوە بۆلای گروپەكانی خۆیان. لەسەردەمی جەنگدا بەكارهێنانی نوێنەرو كەسانی تری كەدوژمنیان دەناسی، كارێكی زۆر ئاسایی بوو. بەوجۆرە، دەزگاكانی جاسوسی- ئاسایشی ئەمریكا، بەریتانیای گەورە، فەڕەنساو لەڕاستیدا دەزگا جاسوسیەكانی هەموو ئەوروپای خۆرئاوایی دەستیان دابوویە بەكارهێنانی نازیە كۆنەكانی (گشتاپۆ) یان مێزە چەكدارەكان؛ پیاوانی وەك (كلاوس باربی) كەقەسابی (لیون) بوو یان بەناوبانگترین پسپۆڕی دروستكردنی ڕۆكێت بوو.

لەنێوان نازییەكاندا پاشماوەی مرۆڤایەتی بوونی مابوو. سەرەڕای ئەوەش كەسانی نائاسایشیان لەنێواندابوو. پاش ماوەیەكی دوورو درێژ كاتێك من بوومە سەرۆكی دەزگای جاسوسی فەڕەنسا، یاریدەدەرێكم هەبوو كەنێردراوی جەنەڕاڵ (گرهارت ویسیل)ی فەرماندەی بەرەی ڕۆژهەلاّتی نازییەكان بوو. بووبووە نزیكترین كەسانی هاوەڵم. بەهەرحاڵ ئەندامی پارتی سۆشیالیستی میللی نەبوو. ئەو تەنها سەربازێكی بەپیشەبوو.

لەقوڵی سۆڤیەتەوە هەزاران نازی بەدناو هەبوون کە ڕاستەوخۆ لەلایەن پۆلیس و هێزە چەکدارەکانی بلۆکی خۆرهەڵاتیەوە دەستگیرکران. ئەم هێزە چەکدارانە بەدووی نازییەکانی تایبەتمەندی جیاوازی سەرکوتکارو جاسوسدا دەگەڕان. بەشێوەیەکی گشتی ئاڵوگۆڕکردن لەسیستمێکی تۆتالیتارییەوە بۆ یەکێکی تر کارێکی زۆرئاسایی بوو. وابپێدەچوو ڕووسەکان کەمتر دڵەڕاوکێیان بووبێت لەئەمریکیەکان کەهیچ باسیان لەسوودی لێکۆڵینەوە دوورو درێژەکانی سیاسەتەکانی جیهان نەدەکرد. هەرچۆنێك بێت تەنانەت ئەمریکیەکانیش حەزیان بەپیادەکردنی سیاسەتە کۆنەکانی ئەو ئەڵمانیانە بوو کەخاوەنی تایبەتمەندی ئاوارتەیی بوون، بەتایبەتی ئەوانەی کەزانستی هونەری و ناجێگرەوەیان هەبوو. ئەوانەش بەتایبەتی لەنێو کۆمەڵگای زانستی سوپایی بەرجەستەی ئەڵمانیاو لەدامەزراوەکانی لەوێنەی (پینەمود) لە کەنار ڕۆخی بالتیك دا هەبوون. ئەو شوێنەی کەزانا کیمیاگەری و فیزیاییەکانی ئەڵمانیەکان کاریان لەسەر ڕۆکێتەکانی لەجۆری (V1)و(V2) دەکرد.

بەمجۆرە، هەردووباڵ - هاوپەیمانەکان و هێزەکانی ڕووسیا- لەواقیعدا لەهەمان کات و لەهەفتەی کۆتایی جەنگدا هێرشیان کردە سەرئەم بنکەیە. ئەم هەماهەنگی دەستبەسەرا گرتنە، لەلایەك لەلایەن ئەمریکاوە بوو کە (ڤرنرون براون) (V1)ی داهێنابوو وەکاری لەسەر (V2) دەکردو پاشان یارمەتی ئەمریکیەکانیدا بۆ چوونە ناو گەردوون. لەلایەکی ترەوە، ژمارەیەکی بەرچاوی هاوەڵەکانی ڕێگای ڕووسیایان گرتە بەرو لەوێ بوونە یاریدەدەری ڕووسیا بۆئەوەی ببێتە یەکەم وڵات کەمانگی دەستکردی ڕەوانەی گەردوون کرد.ئەو کەشتی ئاسمانییەی ناوی نرا (ئسپاتنیك) سەرکەوتنەکەی وەك بۆمبێك لەسەرانسەری ئەورووپادا تەقیەوەو بووە هۆی ترسێکی کتوپڕ. ئەو کارە چالاکییەکی ڕاگەیاندنی گەورەبوو، هەرچەندە سوپاییی نەبوو، بەڵام وەك یەکەمین سەرکەوتنی گەورەی ڕووسەکان لەجەنگی سێیەمی جیهاندا دەرکەوت. بەڵام لەکۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیدا، ئێمە تەنها ئاگاییەکی ناڕاستەوخۆمان سەبارەت بەڕووسیا هەبوو چونکە هێشتا وێناکردنی

جەنگێکی سێیەمی جیهانی کەخۆرهەلآت بیسەپێنێت بەسەر خۆرئاوادا بەتەواوی نادیاربوو. ئێستا کەجەنگی دووەمی جیهانی گەیشتبووە کۆتایی، ئەرکێکی کەئێمە لەواشنتۆن لەئەستۆمان گرتبوو لێکۆڵینەوەی جدیانە سەبارەت بەبەرگریکردن لەئەورووپای خۆرئاواو گێڕانەوەی بەشی زۆری هێزەکانی ئەمریکا بۆ نیشتمان بوو. کارەکەی ئێمەبووە بناغە دانەری بونیادی (یەکێتی ئەتلانتیکی باکوور).

لەلێکۆڵینەوەی گشتی ڕابردوودا ئەوە بەدەست دەهێنین کەبەشێوەیەکی ڕێکەوتانە بونیادێکمان دارشت کەهەموومانی بۆ ئەنجامێکی سەرکەوتووانە لەجەنگی سێیەمی جیهانیدا ئامادەدەکرد.

هەموو ڕۆژێك کەدەگەیشتینە ژوورەکانی نەخشەدانانی ڕێکخراوی بەرگری، نەخشە گەورەکان کراوەبوونەو ئێمە بۆ دۆزینەوەی شوێنگەی سیاسیو ستراتیژی کەئەورووپای تێدابوو سەرقاڵ دەبووین. ئێمە زۆربەی کاتەکانمان لەگەڵ جەنەڕاڵ (مارشاڵ)و یاریدە دەرەکانی بەسەر دەبرد. ئێمە هەم هاوپەیمانو هەم هاوەڵی یەکدی بووین. جگە لە(جوین)، لەئەنجامی بینینی ڕۆڵی خۆی لەجەنگی ئیتالیاو تاکتیکە بەرجەستەکانی خۆی کەدژ بەئیتالیو نازییەکان پراکتیکی کردبوو، بووبووە کەسێکی زۆر توندڕەوو توندوتیژ. بەلآم ئەمریکیەکان سەرنجیان نەدەدایە توانستی سەربازی ئێمەو ڕۆڵی (جوین) لەجەنگە نیزامیەکانیدا. وا دەردەکەوت مارشاڵ کەسێکی هەستیاری نائاسایییە. ئەم حاڵەتەشی لەوەی (جوین) دەچوو.

ئەوەی هەردووکیانی، بەتایبەتی مارشاڵ، گەیاندبووە ئەولایەنە ڕۆحییە بینینی ڕۆڵی فراوانتر بوو کە لەخولەکانی پاش جەنگداو بیناکردنەوەی ئەورووپا، کارێکی ژیانی بوو.

لەماوەی مانەوەم لەپینتاگۆن، لەگەڵ یاریدە دەرێکی ژەنەڕاڵ (مارشاڵ) کە کۆلۆنێلێك بوو بەناوی (جۆرج)و ماوەی سێ ساڵ بوو لەگەڵ (مارشاڵ) کاری دەکردو دەستنێژو فیداکارێکی بێهاوتای بوو، بووبووینە هاوڕێی

خۆشەویست. ڕۆژێکیان منی برد بۆ شوێنێكو پێشنیازی کرد کەسبەینێ بەیانی لەگەڵ (جوین) بچینەوە ئەوێ.

من بە(جوین)م وت: (تۆکاری ئەم ئەمریکییانە دەناسیت کەنەك تەنها وەك سەربازی زۆر بەدیسپلینن بەڵکو زۆریش هەستیارن)و وتم: (بۆیە گەربتوانم پێشنیازێك بکەم، دەڵێم سبەینێ بەیانی زوو پێش کاتی دەوامی پەرمی ڕەسمیی بەیانیان، واتە هەشتو نیو، پێویستە ئێمە بەنهێنی لەهوتێلەکە دەرکەوینو بۆ ڕێزلێنان بچینە سەرگۆڕی جەنەڕاڵ (پرشینگ).

وادیارە جەنەڕاڵ (پرشینگ) لەلای مارشاڵ لەهەرکەسێکی تری کەناسیوویەتی بەڕێزتر بووە. ئەو سەربازێك بوو کەبەتەواوی دەرکی بەماهیەتی شەڕ کردبوو. ئەو ئەم مانایەی بەفراوانی وەرگرتبوو ، بەتەوای وەك جەنەڕاڵ (مارشاڵ)و هاوەڵەکانی کە لەجەنگی دووەمی جیهانیو جێگرەوەکانیان لەجەنگەکانی سێیەمو چوارەمی جیهانیدا ئەوەیان ئەزموون کردبوو، ئەو لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا ئەوەی تێپەڕاندبوو، چونکە لەتەواوی ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا، جەنەڕاڵ (مارشاڵ) هەموو چوارشەو جارێك سەردانی نەخۆشخانەی (والتەر ڕید)ی کردووەو لەگەڵ خۆی نەخشەی مەیدانی شەڕەکانی ئەورووپاو زەریای ئارامی بردووە. جەنەڕاڵ (پرشینگ) لەوێ کەوتووە لەسەرجێگا زۆر نەخۆش بووە. (ئەو بەماوەیەك پێش کۆتایی جەنگ مردبوو).

هەندێ جار لەنێوان ئەو چاوپێکەتنانەدا؛ تەنانەت نەیزانیوەکەچی باسەو هەرماوەیەك جارێك هاتۆتەوە هۆش خۆی. هەرجارێك(مارشاڵ)لەپشتی دەرگای ژوورەکەوە دەوەستا، بەڕێکوپێکی وبەدەنگی بەرز دەیووت: (جەنەڕاڵ(مارشاڵ) دەربارەی ئۆپراسیۆنەکان هەواڵ دەدات.) پاشان لەتەنیشت (پرشینگ) دادەنیشتو پێگەی ئۆپەراسیونەکانی شیدەکردەوە، هەندێجار (پرشینگ) پرسیاری دەکردو هەندێکجاریش هیچی نەدەپرسی.

لەکۆتاییدا مارشاڵ هەڵدەستا. بەڕێکوپێکی سەلامی سوپاییانەی دەکرد. لەسەر شان وەردەچەرخاو دەڕۆیشت.

هیچ کەسێك جگە لەجەنەڕاڵ (مارشاڵ) خۆیو کۆلۆنێل (جۆرج)و جەنەڕاڵ (پرشینگ) بەم سەردانانەیان نەدەزانی. من دەربارەی ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە باسم بۆ جەنەڕاڵ (جوین) کردو بەبیستنی سەراسیمەبوو. بەوجۆرە کاتێك من پێشنیازی ئەوەم بۆ کرد کەسەردانی ئارامگای جەنەڕاڵ (پرشینگ) بکەین ، ئەو زانی کەئەم کارە چەند گرنگە. بەوجۆرەی کەپێشنیازم کردبوو، بەبێ ئاگادارکردنەوەی کەس، لەسەرخۆ پێش سەعات حەوت ونیو لەژوورەکانی هوتێلەکانمان هاتینە دەرەوەو پاش کرداری ڕێزنان لە(پرشینگ)گەڕاینەوە بۆ هوتێلەکەمانو خۆمان بەکاری ڕۆژانەی ڕەسمییەوە سەرقاڵ کرد.

دوای سێ ڕۆژ جەنەڕاڵ (مارشاڵ) نیوەڕۆ خوانێکی باشی لە پنتاگۆن بۆسازکردین. هەموو بەرپرسی بەشەکان لەوێبوون، بەهەمان شێوەش لێپرسراوی زانیاری جەنگیو بەرپرسی زانیاری هێزی دەریایش. جەنەڕاڵ (مارشاڵ) هەستاو وتارێکی کورتی پێشکەش کرد، کەزۆر وروژێنەربوو. ڕوویکردە (جوین)و وتی: (ئێوە دەزانن کەسیستمی هەواڵگری ئێمە باش کارەکانی بەئەنجام دەگەیەنێت. ئێمە دەربارەی ئەو کارانەی کەهەموو ڕۆژێك بەیانیان ئەنجامتان داوە، ئاگادارین. ئێوە نەك تەنها سەربازێکی گەورەن، بەڵکو کەسێکی خاوەن هەستیارییەکی فراوانیشن.)

ئەمە دەرککردنێکی هاوبەش بوو لەنێوان ئەمریکاییو ئەوروپییەکاندا دەربارەی بەهابنەڕەتیەکان کەخزمەتی بەئامانجی جەنەڕاڵ (مارشاڵ)و گەلالەی پێشنیارەکانی بۆ دووبارە بیناکردنەوەی ئەوروپا دەکرد. ئامانجەکەی هۆکارێکی کلیل ئاسابوو لەبونیادنانی کیشوەرێك کەتوانستی بەرگریکردنی لەخۆی لەجەنگی سێیەمی جیهانیدا بووە.

پاش ئەوەی ئێمە لەساڵی ١٩٤٠ بەشێوەیەکی غافلگیرانە تێکشکاین، مارشاڵو هاوەڵەکانی کۆمەکی فەڕەنسایان کرد تابتوانین لەگەڵ زلهێزەکانی

تری جیهان لەسەر مێزی گفتوگۆ دابنیشین. ئەوان دەربارەی فەڕەنساو ساڵی ١٩١٨ وێناکردنێکی باشیان لەلا هەبوو، بەڵام سەبارەت بەساڵی ١٩٤٠ دیمەنێکی جوانیان لەلانەبوو.

ئەوساڵەی کەساڵی سەرکەوتنمان بوو، ئێمە وەك ئەندامی تازە هەڵکەوتووی یەکێتی خۆرئاوا بەبێئەوەی ئالای سپی بەرزبکەینەوە هاوکاربووین لەشکست پێهێنانی سزاری ئەڵمانیا، لەگەڵ جەنەڕاڵ (مارشاڵ) لەم سەرکەوتنەدا بەشداربووین. دەرئەنجام هەوڵەکانی ئەوبوو کەفەڕەنسا توانی دووبارە لەسەر پێیخۆی بوەستێتەوە. شانازی جەنەڕاڵ (مارشاڵ)و دەوروبەرەکەی‌و ڕاستگۆییان لەژیانی مندا بوونە پێشەنگ‌و پێوەرێکیان بۆدانام کەچۆن لەماوەی خولی خزمەتکردنمدا لەوڵاتی خۆمدا کاربکەم.

زیاتری مێژووەکانی پاش جەنگی دووەمی جیهانی ئەوروپا لەکۆتایی دژایەتی‌و کینە لەدڵەکانی جەنگ، لەساڵی ١٩٤٥، لەهەمان دانیشتنەکانی پنتاگۆندا دەنووسران. دانیشتنەکان تارادەیەك کورت بوون‌و من تەنها بۆماوەیەکی کەم بۆئەو چاوپێکەتنانە، لەواشنتن، دەمامەوەو بەخێرایی بۆلای (جوین) دەگەڕامەوە. من پێشتر بڕیارم دابوو سوپا بەجێبهێڵم. (جوین) داوای لێکردم لەپۆستی (پەیوەندیگرتن)ی دەوڵەتی یاسایی فەڕەنساو ئەنجومەنی ڕێسایدا بمێنمەوە، من پەسندم کرد. ئەمە یەکەمین ئەزمونگەریم بوو لەناو پارتێکی سیاسیدا. لەکۆتایی پشووی ساڵانەدا، تەمەنم بیست‌و پێنج ساڵ بوو. لەهەژدە ساڵییەوە بۆماوەی حەوت ساڵ سەرقاڵی جەنگ‌و شەڕ بووم. بۆیە کاتێك جەنەڕاڵ (دیگۆل) منی بانگهێشتی ماڵەوە لە (برادبولونی– دارستانێکە لەدەورووبەری پاریس) کرد، ئامادەی وەڵام دانەوە بووم. پاش کەمێك شۆخیکردن کەبەتەوای لەگەڵ کەسایەتی ئەو وێك نەدەهاتەوە، (دیگۆڵ) ڕاستەوخۆ چووە سەربابەتە بنەڕەتیەکە. ئەو وتی: (مارانش! ئێستا دەتەوێت چی بکەیت؟ دەچیتە دونیای سیاسەتەوە؟ ئەم کاروانە بەکێبەرکێی هەڵبژاردن کۆتایی دێت. هەموو ئەو شتەی کەپێویستە

بیکەت ئەوەیە ناوت بنووسیت. پاشان هەڵدەبژێرێیت و دەتوانی ببیتە نوێنەر.)

وەڵامم دایەوە: (نەخێر، سوپاس بەڕێز. من هاتم بجەنگم، ئێستا جەنگ تەواوبوو. سەبارەت بەکاری سیاسی نەخێر، زۆر سوپاس و مەمنونم. دەمەوێت بگەڕێمەوە زێدی خۆم.)

ئەوەی پێشتر دەربارەی جیهانی سیاسەت بینیبووم، بەتوندی هزری بڕیاردەرمی گۆڕی. سیاسەت و جەنگ، سیاسەت و جاسوسی، لەڕاستیدا سیاسەت و ڕووداوی نێوان وڵاتەکان، هەرگیز بەباشی پێکەوە گرێنەدراون. پاراستنی ماوەی پێویست لەشەڕدا لەگەڵ دوژمنێکی دەرەکی لەهەرجۆرێك بێت، کاتێك زۆرسەخت دەبێت کەتۆ بەتەواوی لەکێشە ناوخۆیی و بابەتە وردەکانی وڵاتەکەتدا تواببیتەوە.

بەماوەیەکی کورت پاش ئەوە، کاتێك (دیگۆڵ) لێی پرسیم سەبارەت بەوەرگرتنی پۆستی کۆمیتەی دارایی پارتە سیاسیەکەی، بڕیارمداوە یان نا، دووبارەو تەنها بۆجارێك پرسیارەکەی دەربارەی پەسندکردنی کاری سیاسی بۆ پێشنیار کردمەوە. ڕازی بووم سەبارەت بەپێشنیازەکەی بیربکەمەوە. بەڵام لەڕاستیدا هیچ حەزم پێی نەبوو لەنزیکەوە ئەزموونی بکەم.

لەوڕۆژانەدا لەهەموو شوێنێك زەمینەسازی دەکرا. من هێشتا گەنج و تاڕادەیەك سادەبووم، بەڵام گەیشتبوومە یەقین کەزەمینە سازییەکان سادە نەبوون.

کاتێك لەدواییدا داوام لێکرا ببمە سەرۆکی دەزگای جاسوسی فەڕەنسا من بەبێ هیچ ئومێدێك لەنێو دەسیسە سیاسیەکانی ناوخۆی گرتبۆوە ئامادە بووم، زۆر گاڵتەجاڕانەبوو کەبەهۆی دووری لەکاروباری سیاسییەوە، دەیانویست ئەوە بسەلمێنن کەسەبارەت بەپێشنیارەکان خاوەنی بڕیارم، بەڵام لەشێوەی زۆر لێکرندنێکی مومکین دا.

پاشان بۆماڵ و زێدم لەنۆرماندی گەڕامەوە. سامانەکەم بەجۆرێکی فراوان لەهۆکاری ترسناکدا خرابووە گەڕ. پاش ڕێکخستنی پێداویستی و کەلوپەلی

ناومالْ، دووباره بۆلای ژیانی کارکردنەکەم گەڕامەوە، هەڵبەتە بەحاڵەتی کینە لەدڵی و بەهاوەڵی چەند هاوڕێیەکی سەردەمی جەنگ کارگەیەکی ئۆتۆمبیلی ئامێری پیشەسازی بەناوی (ترمبك)مان دامەزراند. ئێمە ماتۆڕی هەڵمی پیشەسازیمان بەرهەم دەهێنا کەپێشتر لەناوچەیەکی فراوانتر لەدەوروبەری دەرەوەی شاری پاریس بەرهەم دەهێنرا.

ئەزموونی ئەو ڕۆژانەی چ کارو چ سروشتی کرێکاران فێری ئەوەی کردم کەڕێکخراو بوون و ئەوانەی کەکاری ورد بەلام پێویستیان بەڕۆژانە ئەنجامدەدا، بەرامبەر بەپێداویستیەکانیان هەستیار بوون. ئەم ڕێکخراوەیی و هەستیارییە هەموو پرۆسەی بەرهەمهێنانی بەئاسانی بەرەوپێش دەبرد.

هەردوو ئەم سەرچاوانە بۆ ئەفسەرێکی هەواڵگری وانەی بەبەهابوون. من پازدە ساڵ دوای ئەوەم لەکاری پیشەسازی تایبەتدا بەسەربرد کەپلەبەپلە ئەو توانستەی پێبەخشیم کەبتوانم دوای ئەوە هەرکاتێك بمەوێت، سەربەخۆی دارایی خۆم بخەمە گەڕ. بەتایبەتی کاتێك کەکارگەکەمان لەلایەن کۆمەڵگەیەکی بازرگانی گەورەوە کڕرا، ئارایشتکاری زیندەگیم زیادکرد؛ دیارە ئارایشتکاری لەکاروباری پیشەیی، گەشت کردن و ئەنجامدانی ئەرکەکانی کەزۆربەیان لەلایەن جێنشینەکانی دەوڵەتی فەڕەنسایان ڕابەرەکانیانەوە- هەندێجار وەك کەسێکی ئاسایی و هەندێجاری دی وەك ئەفسەرێکی یەدەگی- دەخرایە ئەستۆم، توانستی هەلگرتن و گوێزانەوەی لەباری هەبوو.

فەرمانەکان، ماهیەتی نهێنی و جوانیان هەبوو. ڕابەرانی فەڕەنسا لەشارەزاییم لەزمانی ئنگلیزی و توانستی دەرککردن بەهزری ئەمریکیەکان و سیستمی کۆمەلایەتی و سیاسی ویلایەتە یەکگرتووەکان سوودمەند دەبوون و لەم ڕێگایەوە دەیانزانی سەرانی ئەو ولاتانە چۆن ڕفتارێك دەنوێنن یان خەڵکی دەربارەیان هەست بەچی دەکەن.

لەمانگی جونی ساڵی ١٩٥٠، کاتێك جەنەڕاڵ (ئایزنهاوەر بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان گەڕابۆوە، سەرکۆمار (ترومن) داوای لێکردبوو بۆ ڕێکخستنی

یەکێتی ئەتلانتیکی باکوری بۆ ئەوروپا بگەڕێتەوە کە لەڕاستیدا هەمان پەیماننامەی فەرمی ڕێکخراوی یەکێتی ئەتلانتیکی باکور یان (ناتۆ) بوو.

ئەو ماوەی یەك هەفتەی تەواوی لەفەڕەنسا بەسەربرد تا دڵنیا بێت کەئایا فەڕەنساو ئەوروپا بەدرێژایی جەنگی سێیەمی جیهانی، کە (ئایزنهاوەر)و (ترومن) هەردووك دەیانزانی لەودەمەدا پێویستە پەیوەستبن پێکەوە، شایانی بەرگریکردنن یان نا؟ کەمێك پێش هاتنی (ئایك) لەحوزەیرانی١٩٥٠، وەزیری بەرگری منی بانگ کردو وتی: (تۆ ئەفسەرێکی یەدەگیت. ئایا بۆماوەی هەفتەیەك وەك یاریدەدەری جەنەڕاڵ (ئایزنهاوەر) دەگەڕێیتەوە بۆ ئەمریکا؟ لەڕاستیدا ئەو لەفەڕەنسایە.)

-هەڵبەتە پاش چەندین پلە کە لەجەنگدا بەدەستم هێنا، گەیشتبوومە پلەی (رائد). ڕەزامەندیم پیشان داو وتم: (بەڵێ).

کاتێك لەگەڵ (ئایك)دا سەرتاسەری فەڕەنسامان تەیدەکرد، بەبەردەوامی لەماوەی ئەو هەفتەیەدا یەك تکای هەبوو: (وێنەیەکی فەڕەنسام بۆ بکێشە.) جارێکیان کاتێك لەپەڕلەمان هاتینە دەرێ، وتی: ( بۆنمونە دەمەوێت بزانم چەند پارتی سیاسی لێرە هەیە؟)

من وەڵامم دایەوە: (باشە، نزیکەی چلو دوو ملیۆن، بەڕێز !)

بەزەردە خەنەیەکی غەمگینانەوە وتی: (دەزانم، دانیشتوانی فەڕەنسا ئەوەندەیە. دەبوایە هەستم پێبکردایە.)

من پێکەنیم. (ئایك) بەپێی سەردانەکانی خۆیو کاریگەرییەکانی کە لەئەفسەرانی شایستەی هێزە سوپاییەکانی فەڕەنسای بینیبوو، قسەی دەکردو ئەم هۆکارانەش لەئەنجامگیریەکانیدا زۆربەرەوپێشەوەی دەبرد. ئەو گەیشتبووە ئەو باوەڕەی کەدەبێت فەڕەنساو ئەوروپا هێزەکانی بەرگییان یەکخەنو، وەك پارێزەری چالاك لەهەرچالاکیەکی سەربازی ئەمریکادا ئامادەبن. ئەم بڕوایە لەگەڵ باوەڕی گشتی لەواشنتن زۆر دژ بەیەك بوون، کەوایان دەبینی ئەوروپا کۆمەڵەیەکی سادەیە لەوڵاتانی لاوازو تەمەڵ

چاوەڕوانن سەربازانی ئەمریکا لەبەرامبەر هەموو پێشهاتێکی نوێدا بەرگرییان لێبکات.
سالێك دوای ئەوەو لەمانگی جونی ١٩٥١ دا، دووبارەلەلایەن فەرەنساوە بەئەرکێکی زۆر گرنگ لەپنتاگۆن ڕەوانەی واشنتن کرامەوە. دروست لەوکاتەدا فەرەنسا لەگێژاودا دەخولایەوە، ئەوەشی بۆ ئێمە ئاشکرابوو بەئەندازەی ئەوەی کەدوای بیست سالْ بەسەر ئەمرکیەکان لەهیندی چینی دا هات، داهێزران و وێرانکارییە ڕۆحیەکان بوو. بێجگەلەوە سوپاکەمان بەخێرایی پەندی وەرگرت، کەهاوتا ئەمریکیەکان کەمێك پاش ئەوە فێری بوون. ئەوان لەجەنگدا دژی جەنگاوەرە کۆمۆنیستەکان لەسەر زەوی و لەناوجەنگە لستانەکاندا سەرنەکەوتن. ئێمە بێهودانە پێویستمان بە پێشکەوتووترین تەکنۆلۆژیا بوو کە لەجەنگدا کاریگەربوو. ئەمەش تاکەڕێگابوو کەئێمە دەمانتوانی ئومێدمان بەپلەیەکی بالآتر هەبێت. لەسەرو هەموو ئەوانەشەوە تەکنەلۆژیای بەرز لەڕێگای ئاسمانیەوە دەگەیشتە ئێرە.
کۆمۆنیستە ڤێتنامیەکان خاوەنی چەکی پێشکەوتوو نەبوون، کەپاشان لەڕوسە هاوپەیمانکانی خۆیان وەرگرت، سەرەڕای ئەم پرسەو بەهەمان ئەو چەکە سەرەتاییانە- چ بەرگری و چ هێرشی- هێشتا دەجەنگان. هەروەها لەگەڵ ئەوەشی کەتوانستی دژە ئاسمانیان تا ڕادەیەك سفربوو، ئاسمانی بێمە ترسیان بەفەرەنسا سپاردبوو ئەوانیش کۆنترۆڵیان دەکرد.بەداخەوە هێزی ئاسمانی فەرەنسا لەجەنگی ئەروپای ڕابردوودا، کە لەبەشێکی کەمی جەنگی زەریای ئارام بەشداری کردبوو، بەتەوای لاواز ببوو. بەپێی ئەمە، (رینە پلوان) کە ئەودەمە سەرۆك وەزیران بوو، لێمی پرسی کەئایا بۆ داواکردنی فڕۆکەی جەنگی پێشکەوتوو تر لەوەی کەهێزەکانمان لەهندی چینیدا بەکاریدەهێنن، دەچم بۆ پنتاگۆن؟ من لەم گەشتەمدا زۆر سەرکەوتوو بووم. چونکە بەزوویی هێلیکۆپتەرو فڕۆکەی جەنگی ئەمریکیەکان کە لەپارێزگاریکردن لەهێزە زەمینیەکانمان لە هندی چینی ڕۆڵی سەرەکیان هەبوو، لەناوچەکە ئامادە بوون.

لەواقیعدا ئەوە یەکەمین هاوکاری ڕاستەقینەی نێوان ئەمریکاو ئەروپا لەیەکەمین کێشمەکێشی جەنگی سێیەمی جیهانیدا بوو؛ شەڕی نێوان خۆرهەلاَتو خۆرئاوا کە لەگۆشەیەکی دووره دەستی ئەم جیهانەدا پێکەوە دەجەنگان. بەلاَم دژوارترین ئەرك لەئۆکتۆبەری ١٩٥٠بەمن سپێردرا. سەرۆك وەزیران (پلوان) منی بانگهێشتی ئۆفیسەکەی کردو لێکۆلیَنەوەیەکی فراوانی لەمەڕ جیهانو بەتایبەتی جەنگی فەڕەنسا لەهندو چین دەستپێکرد.

من بەڕەقیو جەسارەتەوە وتم: (ئایندەی جیهان لەزەریای ئارامدایە.)

پرسی: (ئەی زلهێزە گەورەکانی زەریای ئارام کامانەن؟ لەگەلّ دۆزینەوەی زلهێزە گەورەکانی زەریای ئارام پێویستە دەست بدەینە کارێك بەرامبەر ئەو ولاَتانەی کەخۆرئاوا چاوی تێبڕیوون. بۆنمونە ڕووسەکان، چینیەکانو لەوانەیە ڕۆژێکیش بێت هندی چینیەکان. بەلاَم لەلایەکی ترەوە، نابێت ئەوە فەرامۆش بکەین کەئەمریکیو کەنەداییەکانیش هەن. ئەوانیش دەبنە زلهێزی ولاَتانی دەوری زەریای ئارام.)

(پلوان) بەسووربوونەوە جەختی لەسەر ڕستەی دواییان کرد: (سیاسەتی ئەمریکیەکان لەحەوزی زەریای ئارامدا چییە؟)

وەلاَمم دایەوە: (پرسیارێکی زۆرباشەو وابزانم پێویست دەکات وەلاَمی بدەمەوەو دەبێت زۆر سەرنجڕاکێشانە بێت.)

(پلوان) بەئارامیەوە وەلاَمی دایەوە: (وەلاَمی ئەم پرسیارە سادە نییە. دەتوانیت پرسیاری لەوجۆرە بکەیت؟ دەکرێت ئەرکێك لەحەوزی زەریاری ئارامدا بەئەنجام بگەیەنیت؟)

لەڕاستیدا ئەوە یەکەمین ئەرکی جاسوسی من بوو. بەم واتایە کە ئەوجۆرە ئەرکە لەوردترین کاروبارو بچوکترین زانیاری ستراتیژی لەگەلّ فراوانترین بابەتی جیوگرافو پۆلیتیکی پێکهاتبوو. ئەرکی سەرەوە جگە لەزانیاری دەربارەی مێژوو کەلتوری ئەو کۆمەلگا دوورانە هەموویان، ئاگادربوون لەنیازە هزرییەکانی ئەمریکاو ئاسیاییەکانیش بوو.

ئـەم ئەركـە لەپیشـەی جاسوسـیدا، مەشـقی کلاّسـیکی لـەفێربوون، دۆزینەوە یان ئەنجامگیری ئەو ڕووداوانەی کە بەدرێژایی سیاسەتی ئەمریکا لـەئارادا بـوون یـان خـەملاّندن سـەبارەت بەسـتراتیژی سـەربازیو دیپلۆماتیانەی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەزەریای ئارام لەدەیەی ئایندەدا، بوو.

ئەوجۆرە زانیارییە تایبەتو فراوانە بۆ تێگەیشـتنی وردی ئـەو پەیمانـەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان دابووی پێویست بوو، تا ئـەوان بتوانـن یـەکێتی ئـەتلانتیکی بـاکور لەوناوچانـەی کەڕاشـکاوانە بەناوچـەی (دەرەوەی نـاتۆ) ناودەبرا، بپارێزن.

یەکەمین ئێستگەی ناچاریم لەواشنتن بوو. ئـەو جێگایـەی کەلێکۆڵینـەوەم دەربارەی ئاڵوگۆڕ کردنەکان لەگەڵ جەنەڕاڵ (مارشاڵ) دەکرد. ئەو سەرەڕای ئەم ڕاستییەی کەلەوانەیە ئەرکەکـەم لـەدیدی یـەکێك لەهاوپەیمانانـەوە وەك کـاری جاسوسـی دژ بـەوی دی بێـت، دەرکـی بەبـەهای ئاگـایی فەڕەنسـا سەبارەت بەئامانجەکانی ئەمریکا لەناوچەکانی زەریای ئارامدا دەکرد.

(مارشاڵ) کەنیازەکانی منی بەشارەزا بـوون لـەتانوپۆو ئاسـتی سیاسـەتە فەرمیو ڕوونکراوەکانی ئەو وڵاتانەی دەزانی، وتی: (باشـترین کـارێك بتوانـی بەئـەنجامی بگەیـەنیت ئەمەیـە کـە وەك ئەفسـەرێکی ئـەمریکی ماوەیـەك لەڕۆژهـەڵاتی دوور بەسـەربەریت، ئەگـەر بتـەوێت خـۆت وەك فەڕەنسـییەك بچیتە ئەوێ، هەموو بەچاوی گومانــەوە سـەیرت دەکـەنو دەورت لێدەگرنو ڕەفتـاری جیاوازیـان لەگـەڵت دەبێـت. بـەمجۆرە چۆنـە گـەر خـۆت بکەیتـە ئەفسەرێکی ئەمریکایی؟)

دەربـارەی ئـەم ئەگـەرە کـەمترین گومـانی هـەبوو. بـەمجۆرە لەشـێوەی کۆلۆنێل (دەڤیدئەلکساندەر) خۆم گۆڕی. ئێسـتاش بەڵگەنامـەکانی تایبەتـە بەکەسـایەتیەك کەئـەو پێـی بەخشـیبووم، لـەلام مـاوە. کـارتێکی بچـوك کەوێنەیـەکی لەسـەربوو مۆڵـەتی تایبـەتی دەدامـێ تـا گەشـت بەهـەموو ئـەو فڕۆکـە ئەمریکیانـە بکـەم کـە بەسـەرڕووی زەریـای ئـارامدا تێدەپـەڕین.

بەمەبەستی ناوچەکان لەخۆرهەلاتو باشوور ڕاستەوخۆ (واشنتن)م بەجێهێشت. ئامانجەکان (هایتی)، (گوام)، (تۆکیۆ) بوو، کە ئەودەمانە سەنتەری فەرماندەیی جەنەڕاڵ (داگلاس ماك ئارتور) بوو. من تەنها هەولم دا تێبگەم سیاسەتی ئەمریکا لەوێدا چۆنە؟ لەونێوانەدا فەرەنسا ئەگەری چ ڕۆلێکی هەیە؟

ئەنجامەکانی ڕاپۆرتەکەم لەسەربنەمای چەندین مانگ لێکۆلینەوەی لەکەشی ئاسیابوو، واتە ئەو شوێنەی کەویلایەتە یەککگرتووەکان بوونی تێیدا هەبوو. لەهەندێ شوێن وەك قارەمانانی ئازادیخواز سەیریان دەکراو لەهەندێ شوێنی دی (بەتایبەتی لەژاپۆن) بەناشیرینترین شێوە ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرا. بەمپێیە، ڕاپۆرتەکەم بەکورتەیەکی مێژوویی ناوچەکە دەستی پێدەکرد. ئاماژەم بەوە دابوو کەڕۆمیەکان بالادەست بوون، بۆیە خەلکی خۆرهەلاتی ناوەڕاست دەستکەوتی خۆیان بەدەستهێنابوو ئەوێ ببوە مالوحالٚ ودەریاچەی خۆیان. کاتێك لەماوەی چەندین مانگ گەڕانو گەشت لەزەریای ئارامدا ڕاپۆرتەکەم ئامادە دەکرد، گەیشتبوومە ئەو باوەڕەی کە ئەم زەریایە چارەی هەموو دەردێکی کۆتایی ئەوسەدەیە بوو. بەلام دەرمانی دەردی کام میللەت؟ لەوزەمانەدا باوەڕم وابوو، ئێستاش لەسەر ئەم بڕوایەم کە ئەو زەریایە هەمیشە دەرمانی دەردی ئەمریکا بووەو دەبێت.

لەڕاپۆرتەکەمدا بۆ سەرۆك وەزیران پێناسەی ئەوەم کردبوو کە: (لەئەمریکادا هەمیشە هێزێکی ڕاکێشان بەرەو زەریای ئارام هەیە. لەوانەیە ئەمە زیاتر لەهەموو بابەتێکیتر گەورەترین تاکە مەترسی بۆ ئەورووپا بێت. پەیوەندی خەلکی ئەمریکا لەگەڵ ئەورووپا، سەرزەمینێکی کەباوباپیرانیان پێوەی بەسترابوون، کەمترو کەمتر دەبێتەوە.

بەشێکی گەشتەکەم لەکالیفۆرنیابوو. تا سالی ١٩٥٠، گەواهی ئەوە بووم کەزۆربەی خەلکی لەوێ هێشتا سروشتیانە ژیانیان بەسەردەبردو لەسالانی لاوێتیدا بەگاری سەرداپۆشراو، بەچیاکانی (ڕاکی) داهەلدەزنان. ئەوخەلکانە بەتایبەتی مندالەکانیان هیچ تێڕوانینێکیان بۆ ڕابردووی خۆیانو ئەورپا

نەبوو. ئەوروپا لەوبەری ئەتلانتیکەو ئەوانیش لەمبەری لەئەمریکان .ئـەمریکا لـەلای ئەوچیایانەوەیـە کـەلێرەوە تێدەپـەڕین. کـاتێك خـەڵکی سـەنتەری ئەمریکا بەرەو خۆرئـاوا دەجوڵان، تەنها سـەیری پێشی خۆیـان دەکـردو پێشیشیان زەریای ئارام بوو.

هەرچەندە دەبێت لەبیر بێت کەهێڵی دابەشکاری باکورو باشـور لەجـەنگی باکور– باشور کەئێمە ئەمڕۆ سەرقاڵی ڕووبەڕوو بوونەوەین تیایدا، بـەدەوری گۆی زەمینـدا دەسـوڕێتەوە. ئـەو هێڵـە بەدڵنیاییـەوە لـەزەریای ئـارام‌و ئەتلانتیك دەپەڕێتەوەو دەوڵەتەکانی حەوزی خۆرهەڵاتی ناوەڕاسـت دەکاتـە دووبەش.

دەوڵەتانی ناوبراوی ئەم نێوەندە لەهەریەك لەوجەنگانەی کەئەم سـەدەیە یـان گرتۆتـەوە، بەشـێوەی جۆراجـۆر ڕۆڵ دەبینـن. لـەواقیعدا تەنـها ئـەودوو جەنگەی کە ئەمریکابە درێژایی جەنگی سێیەمی جیهانی بەخێرایی بەشـداری تێدا کرد، ئەمەی سەلماند کەمن لەیەکەمین ڕاپۆرتی جاسوسیمدا بۆ ڕابـەری فەڕەنسا، تا چ سنوورێك لەئایندە بەئاگا بووم. ئەو جەنگانە بەرگری لەنیمچە دوورگـەی کۆریـا لەبەرامبـەر کۆمۆنیستەکانی چـین‌و هاوپەیمانـەکانیان لـە (١٩٥٠–١٩٥٢)و ئەویدی بـەرگریکردن لـەڤێتنامی باشـور لەدەیـەکانی ١٩٦٠و سەرەتای دەیەکانی ١٩٧٠بووە. ئەوانە دوو جەنگ بوون کەئەمریکا بەخێرایی بەشداری تێداکـردن‌و هـەمان ئـەو جەنگانـەش بـوون کـە بەجـەنگی ساردیان جەنگی سێیەمی جیهانی ناوبراوە. هەردوو پێکدادانی سەرەوە لەخۆرهـەڵاتی دوور ڕوویـانداوە. فەڕەنسـا بەشـداری بەبەشـێك لـەهێزە سـوپاییە زۆر گرنگەکانی خۆی لەهەنگاوەکانی ڕێکخراوی نەتەوەکان لەکۆریا کردو ئـەوەش هـەنگاوێك بـوون کـەمن لەدڵـەوە پشتگیرم کـرد. مـن لەوکاتـەداو ئێسـتاش، ئـەوکارەی سـەرەوەم بۆ پارێزگـاریکردن لەئـەمریکا بەپێویسـت دەزانـی. بەتایبـەتی لەهەرشـوێنێکی کەئـەو هەسـت بکـات بـەرژەوەندی لەوێدایـەو لەهـەندێ بەشـی جیـهان وەك ئاسـیاکە ئـەمریکا لەئێمـەش زیـاتر دوای

بەرژەوەندی کەوتووە. بەگشتی ویلایەتە یەکگرتووەکان تاکە هێزی جیهانی بەرەی (باکور)ە.

بەشێوەیەکی گشتی ویلایەتە یەکگرتووەکان تاکەدەستەڵاتداری جیهانە کەتواناو لێوەشاوەیی بۆ جوڵەکردن‌و ڕابەرایەتیکردنی شەڕەکانی لەماوەی جەنگی سێیەم یان چوارەمی جیهانیدا ڕوو دەدەن، هەیە. شەڕەکانی کە لەڕابردوودا بەسەرمان هات یان ئەگەری ڕوودانی لەئایندەدا هەیە، بەهەمان شێوەی کە لەودواییانەدا گەواهی یەکێك لەوجەنگانە بووین لەعێراق، ماوەیەکی گەلێك درێژە کە ئەمریکا بەئاشکرا شانازی بەپەیمانەکانیەوە بەرامبەر بە (ناتۆ) دەکات. پەیماننامەکانی (ناتۆ) بەشێوەیەکی فەرمی لەگەڵ پەیمانی ئەتلانتیکی باکور دەستی پێکردو کۆتایی هات. لەودەمەوەی کەڕووداوەکان لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست‌و بەتایبەتی لەزەریای ئارامدا دەستی پێکردووە، ئاشکرایە کە زۆر ئەگەرێکی لاوازە جەنگی چوارەمی جیهانی لەودوورە دەستەو لەنزیك ئەتلانتیکی باکورەوە ڕووبدات. لەم ماوەیەدا چ پێش‌و چ پاش خانە نشینبوونی جەنەڕاڵ (دیگۆڵ)و پشوودانی لەماڵە گوندیەکەی لە (کۆلمب لدوزاگلین) پەیوەندیم بەخۆی‌و ئەندامانی خێزانەکەیەوە هەبوو. گەرچی هیچ کاتێك وابەستەی هیچکام لەپارتە سیاسیەکان نەبووم، تەنانەت لەناودەستەی پەیڕەوانی (دیگۆڵ)یش نەبووم، لەگەڵ ئەوەشدا جەنەڕاڵ چەندین جار منی بۆ ئەنجامدانی ئەرك بۆ سوودی خۆی بانگ کردووە. بەسەلیقەوە منی لەبەشێکی ئاڵۆزی ژیانی کە پەیوەست بوو بەسیاسەتی پارتایەتیەوە، دوور دەهێشتەوە. سیاسەتەکان‌و پرسە جیهانیەکان ئەوشتانە بوون کەمن پێیانەوە گرێدرا بووم. (دیگۆڵ) ئارەزووی منی بۆ ئەنجامدانی ئەو جۆرە کارانە باشتر هەستپێدە کرد. (دیگۆڵ) لەمانگی جولای ۱۹۵۹، ساڵێك پاش گەڕانەوەی بۆپلەی سەرکۆماری، داوای لێکردم بگەڕێمەوە بۆ (واشنتن)و سەردانی (ئایزنهاوەر) بکەم. داوای لێکردم سەبارەت بەبۆمبی ناوکی فەڕەنسا قسە لەگەڵ (ئایزنهاوەر) بکەم. تا ئەوکاتە دوو وڵات بۆ مبی ناوکیان هەبوو؛ یەکێکیان ویلایەتە یەکگرتووەکان

کەبۆ کۆتایی هێنان بەجەنگی حەوزی زەریای ئارام لەهیرۆشیماو ناکازاکید بەکاریهێناو، پاش ئەوەش بەچەند ساڵ رووسەکانیش ئەو بۆمبەیاز دروستکرد. (دیگۆڵ)یش درەنگ یان زوو دەگەیشتە ئەو باوەڕەی فەرەنساش بۆئەوەی ببێتە هێزێکی سیاسی لەئەوروپای خۆرئاواو ببێتەپارێزەری سەربەخۆیی جیهانی ئازادیان بەلایەنی کەمەوە ئەوروپای خۆرئاوا، پێویستی بەوبۆمبە دەبێت. دەیزانی پێویستە فەرەنسا ببێتە سێیەمین هێزی ئەتۆمی لەجەنگی سێیەمی جیهانیدا تابتوانێت ڕۆڵی سەرەکی لەبەرگریکردن لەخۆرئاوا ببینێت. جگە لەوەش، (دیگۆڵ) دەیزانی کەزانا فەرەنسیەکان لەتوانایاندا نییە بەخێرایی و ئاسانی بۆمبێك بۆ خۆیان دروست بکەن. ئەمریکاش لەودەمانەی سەرەتای خولی پەرەسەندنی هێزی ئەتۆمی خۆی تەحەمولی بەرکەوتی گرانی کردو ئێمەش ناچاربووین بەشداری ئەوخولی ئەزمونگەری و هەڵەیە بکەین. بۆیە فەرەنسا پێویستی بەکۆمەکی ئەمریکا بوو.

بەپێی ئەمە، من لەدواین پیشەیترین ئەرکمدا، ڕاسپێردرام گەشتێکی نوێ بۆ ئەمریکا بکەم؛ ئومێدێکی زۆر لاوازی سەرکەوتنم هەبوو. دیدارەکەمان لەهەمان ئۆفیسی شێوە هێلکەیی کۆشکی سپی، ئەو جێگایەی کەسەرکۆماری ئەمریکا بەتەنها تیایدا دانیشتبوو، ئەنجامدرا. بەگەرمی پێشوازی لێکردم. ئێمە دەستمان بەگفتوگۆ دەربارەی جەنگی دووەمی جیهانی و پێگەی ئەوروپاو فەرەنسا کردو پاشان چوومە سەربە ئەنجام گەیاندنی ئەرکەکەم. وتم: (بەڕێز، جەنەڕاڵ..— چونکە هەمیشە بەجەنەڕاڵ (ئایك) بانگم دەکردو هیچ کاتێك نەمتوانیوە بەجۆرێکی تربیری لێبکەمەوە..— من ئەرکێکم پێسپێردراوە، فەرمانێکی خودی لەلایەن جەنەڕاڵ (دیگۆڵ)ەوە. ئەو کەسێکە تۆ ساڵەهایە دەیناسیت. ئێمە لەنزیکەوە کارمان پێکەوە کردووە. ئەو منی ناردووە تا لەگەڵتانا سەبارەت بەبابەتێکی زۆرهەستیار گفتوگۆ بکەم.) (ئایزنهاوەر) بەئارامی سەری جوڵاندو داوای لێکردم بەردەوام بم. وتم: (جەنەڕاڵ، ئێمە پێویستمان بەکۆمەکی

ئێوەیە تابتوانین بۆمبی ناوکی فەرەنسایی دروستبکەین.) (ئایزنهاوەر) تووشی شۆك بووبوو و ڕاست سەری بڵند کردو وتی: (مومکین نییە). ئێمە گفتوگۆیەکی کورتمان کرد، بەڵام دیاربوو هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە.(ئایزنهاوەر) ڕوونیکردەوە کە پێشتر حاڵەتێکی بڵاو لەترس لەویلایەتە یەکگرتووەکاندا هەبووە کەدەرئەنجامی فراوانبوونی دەستەڵاتی کۆمۆنیزم لەئەوروپا بوو. من بەباشی ئاگاداری شوێنگەی ناوخۆیی ئەو، کەبوو بووە هۆی کوشتاری کۆمۆنیستەکان، بووم.ئەم کوشتارە لەلایەن سناتۆر (جوزف ماك ئارتۆر)ەوە ڕێنمایی دەکرا. پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسا هێزێکی یاسایی‌و بەهێزی مەیدانی سیاسەتی فەرەنسا بوو زۆرینەی کەسانی دەوڵەتیی ئەمریکا ئاگاداری دزەکردنی هێواشی کۆمۆنیستەکان لەلێکۆڵینەوەی ناوکی فەرەنسابوون. لەواقیعدا سەرەڕای نفوزی کۆمۆنیستەکان بەپێی زانیاری بەدەستهێنراو لەچالاکیە جاسوسیەکانی ناوخۆمان، ئێمە لەسەر حەق بووین. پاش ئەوەی لەساڵی ١٩٤١ دا، ئەڵمانیا هێرشی کردەسەر ڕووسیە، کۆمۆنیستەکانی فەرەنسا کەلەسەرهێڵی یەکێتی سۆڤیەت بوون، بوونە ڕەگەزی بەهێزی بزوتنەوەی بەرگری فەرەنسی کەدژ بەداگیرکارە ئەڵمانیەکان دەجەنگان. پارت، پاش کۆتایی جەنگ وەك سەنتەرێك ژمارەیەکی زۆری جاسوسیە فەرەنسیەکانی بۆخۆی کێش کردبوو.ئەو گروپە دەستە بژێرە بەناچاری زۆرینەی پسپۆڕانی ناوکی چینی باڵای ئێمەی لەخۆ گرتبوو. بەوجۆرە، چونکە لەپێشتردا ڕووسەکان لەدەستەی ئەندامانی کادری یانەی هێزە ئەتۆمیەکان بوون، یەکەمین بۆمبی ناوکی خۆیان لەپایزی ساڵی ١٩٤٩دا تەقاندەوەو یەکەمین تەقینەوەی ناوکی– گەرمی خۆیان لە (١٢ئاب١٩٥٢) بەئەنجامگەیاندو دوابەدوای ئەمەش، هەندێ لەئەمریکیەکان شەش ساڵ لەتەقەلاندا بوون بەدووی دەستگیرکردنی دزانی نهێنی ئەتۆمی خۆرئاواوەو، ببوونە ڕاوچی گیان‌و لێیان دەترسان، بەمجۆرەش کەمێك لەباوەڕەکانیشیاندا نالۆژیکی بوون.

گفتوگۆکانی من لەگەڵ (ئایزنهاوەر)و پاشان لەگەڵ هەندێك لەیاریدەدەرەکانی لەهەمان ڕۆژەکانی یەکەمین حکومەتکردنی ئەودا، بەوەڵام دانەوەیەکی بەئەدەبانە بەڵام بەتەواوی‌و بێچەندوچوونانە پێشنیازەکەم کۆتایی پێهێنرا. گەڕامەوە بۆ فەرەنساو ڕاپۆرتم دابە (دیگۆڵ). هەرچەندە من بەوردی خاڵەکانی بیروڕای (ئایزنهاوەر)و پێگەی سیاسەتی ناوخۆیی ئەوم ڕوونکردەوە، (کەپێویستیترین بەشی زانیاری هەرئەفسەرێکی هەواڵگری لەخۆدەگرت)، جەنەڕاڵ (دیگۆڵ) بەجۆرەی پێشبینی دەکرا توڕە بوو.

ئێمە لەئۆفیسەکەیدا لەکۆشکی (ئالیزێ) لەپاریس چاومان بەیەك کەوت. هەمان ئەو جێگایەی کە ڕاپۆرتەکەم تیایدا تەواو کرد. (دیگۆل) لەگەڵ ئەوەی کە بۆ پێشەوەو دواوە هاتوچۆی دەکرد، توڕە بوو هاواری کرد: (من بۆمبەکەم بەدەستدەهێنم، مارانش. تێدەگەیت؟ بۆمبەکەم بەدەستدەهێنم!) (دیگۆل) فەرمانیدا کەچالاکیەکانی دروستکردنی بۆمبی ناوکی فەرەنسا دوو بەرامبەر قورس بکرێت. بەڵام ئەو دەستورە تاساڵی ١٩٦٠ واتە هەشت ساڵ پاش تەقاندنەوەی یەکەمین بۆمبی ئەتۆمی ئەوروپا لەلایەن بەریتانیاوە- کە فەرەنسا توانی پەیوەندی بە یانەی هێزە ئەتۆمیەکانەوە بکات- جێبەجێنەکرا.

ڕەتکردنەوەی پێشنیازەکەی فەرەنسا لەلایەن (ئایزنهاوەر)ەوە، ئاگرێکی نایەوە کەهەرگیز بەجۆرێکی واقیعیانەو بەلایەنی کەمەوە تا ئەوکاتەی (دیگۆل) دەستەڵاتدار بوو، خامۆش نەبۆوە. ئەم پەچەکردارە کاریگەری گرنگی بەسەریەکێتی ئەتلانتیکی باکورو پاشەکشەکردنی فەرەنسا لەباڵی سوپایی (ناتۆ)و لاوازبوونی توانستی کۆمەڵگای زانیاری ئەوروپا لەبینینی ڕۆڵی هەماهەنگی بەدرێژایی جەنگی سێیەمی جیهانی، دانا.

پێنج ساڵ پاش ئەوگەشتەم، کاتێك کارگە تایبەتیەکەم دروستکرد، (دیگۆڵ) بەدەمی خانەنشینکردن گەیشت‌و سەردەمێکی سەخت‌و پڕتوڕەیی لە (کلمبی لدوزاگلین) بەسەردەبرد. دانیشتبوو چاوی

لەجێنشینەکانی خۆی بڕیبوو، گەواهی ئەوەبوو کە لەکاتێکدا باری ئابوری فەرەنسا لەکەشێکی دۆزەخیدا دەگوزەرا کەچی ڕۆژ بەڕۆژ خراپتر دەبوو، چونکە لەهەندێ پرسی لاوەکیدا لەگەڵ یەکتری گفتوگۆیان دەکرد. لەئەنجامدا لەساڵی (١٩٥٨)، (دیگۆل) خۆیدا بەدەست خواستی وڵاتەکەیەوەو دووبارە بۆ ژیانی سیاسی وەك یەکەمین سەرکۆماری کۆماری پێنجەم گەڕایەوە. وڵات وەك کوشتارگایەکی لێهاتبوو.

جەنگی تاڵی جەزایر ڕوو لەتوندبوون بوو. (دیگۆڵ) هەرپاش گەڕانەوەی بۆدەستەڵات، منی بانگ کردو پرسی لێم کە ئایا پۆستێکی فەرمی وەردەگرم؟ منیش وەك چەندین جارانی پێشوو، پێشنیازەکەیم ڕەتدایەوە. من بۆ (جەنەڕاڵ)م ڕوونکردەوە کە: (دنیای سیاسەت لەئاستە ئاساییەکەیدا هەرگیز لەلام سەنجڕاکێش نەبووە. لەنێوان سیاسەتمەدارەکاندا هەست بەئارامی ناکەم. ئەوان دەرك بەویستوخواستەکانی من ناکەن. من ژیانم بەوجۆرەی کە لەژیان تێگەیشتووم فۆرمگیری دەکەم. هەمیشە ئامادەم ڕاژە (خزمەت) بەوڵاتەکەم ووڵاتانی دی ئازاد بکەم تا ئەوانیش وەك بەشێك لەجیهانی ئازاد بمێننەوە. بەڵام هیچ پۆستێکی فەرمیم ناوێت.)

لەگەڵ ئەوەشدا (دیگۆل) جەختی لەسەرئەوە دەکرد کە ئایا لەکارێکی وەك ئەوەی پێشووم، کە لەسەردەمی جەنگدا میانجیگەری نێوان هاوەڵەکانم بووم– (دیگۆل)و جەنەڕاڵ (جوین)– لەوهەلومەرجە ناهەموارەی کەسایەی بەسەر مێژووی تازەی فەرەنسادا کێشابوو، پەسەندەکەم؛ ئەوانەش ئەو هەلومەرجانەبوون کەلەماوەی جەنگی تاڵی ناوخۆ لەجەزایر بەجۆرێکی ترسناك برای لەبەرامبەر برادا ڕاگرتبوو. ئەو کێشمەکێشەزۆر تایبەتمەندی لەجۆری زیانەکانی جەنگی ناوخۆی ئەمریکاو جەنگی ڤێتنامی لەخۆگرتبوو. دەربارەی هەردووجەنگی جەزایرو ڤێتنام، زۆر بوون ئەوانەی گەواهی دەرگیرییەك بوون کەخەبات بوو بۆ سەپاندنی خواستە سیاسیەکانمان بەسەرخەڵکانی تورەدا، کە تاکەخواستیان ئەمە بوو کۆنترۆڵی چارەنووسی

خۆیان بەدەست خۆیان بێت. خۆپیشاندان و دروشمەکان لەپاریس و واشنتن بەتەواوی بێپاشەکشەو هەڕەشە ئامێزبوو، ئەوهەڕەشەیە بەرامبەر بەجێگیری و یەکێتی دەوڵەت و میللەت وەك گروپێك ئەنجامدەدرا. لەسەدەی رابردوودا، زیاتر لەنیوملیۆن لەفەرەنسیەکان وەك کۆلۆنیالنشین– لەواقیعدا وەك پێش قەرەولانی سوپایی–چووبوونە جەزایرەوەو بەدوای بیناکردنەوەی ژیانێکی نوێ و باشتر بۆ خۆیان و وخێزانەکانیاندا وێڵبوون. تاساڵی ١٩٥٤، زۆربەیان وەچەیان خستەوە. زۆربەی جەزایرییەکان لەزۆر ڕووەوە لەبەرامبەر فەرەنسیەکانی هاولاتی تازەی خولی نوێ بوون، باشتربوون. لەڕاستیا هاولاتیە فەرەنسیەکانی خۆشیان ڕەفتاری جیاوازیان لەگەڵیاندا دەنواند. پێیان دەگوتن (پێ ڕەش)، چونکە کردبوویانە خووکە بەپێی پەتی و تەنها بەگۆرەوییەوە بەبیابانی جەزایردا هاتوچۆ بکەن. شەوی ٣١ ئۆکتۆبەری ١٩٥٤، هەموو ئەو ڕووداوانە تەواو بوون. شۆڕشێکی گەورە لەناوخەڵکی جەزایردا بەرپا بوو، کەخواستیان ڕزگاری ولاتەکەیان بوو لەچنگی فەرەنسا. هێزی سوپایی فەرەنسا بەهۆی ئەو جەنگەوەی لەهندو چین لەئاراد بوو لاوازیبوو گیری خوارد بوو. بەلام ئەو ئاشوبەی کە (پاڕەش)ە کانی فەرەنسا نایانەوە، بووە هۆی شەڕێك کە گۆڕا بۆ جەنگی ناوخۆ.

بەلام لەولاتی ئێمەدا، واتە فەرەنسا خەڵکی دەستیان دایە هەڵبژاردنی باڵە جیاوازەکان و بوونە گروپ گروپ. هێزە ئازادیخوازەکان و دژ بەکۆلۆنیالی چوونە پاڵ شۆڕشگێڕەکان و، هێزە میللیەکانیش چوونەپاڵ باڵی (پاڕەشەکان). لەودەمەدا شەڕ دەستی پێکرد کە کاریگەری سەرەتانی و ئاشکرای بەسەریەکێتی ناوخۆیی فەرەنساو توانستی بەڕێوەبردنی سیاسەتێکی دەرەوەی توندوتۆڵ و جێگیرەوە هەبوو. ئەو دەرگیرییانە لەکاتێکدا ڕوویاندا کەمن بەدەر لەخواستی خۆم چوومە ناومەیدانەکەوەو خواستی (دیگۆل) بۆکاری میانجیگەری کردن لەگفتوگۆکانی نێوان (جوین)و ئەوم قبولکرد.

لەڕوانگـەی کەسـایەتیمەوە بەڕاسـتی جێگـای داخ بـوو کـە دەمبیـنی دووهـاوڕێی کۆن چوونەتـە ناوئەو شەڕە تاڵـەوە. (جویـن) کـە لەجـەزایر لـەخێزانێکی مامنـاوەندی فەڕەنسـی لـەدایك ببـوو، بـەئومێدیکی بێـهودەی مەترسیدارەوە دەیویسـت بەسـوود وەرگرتـن لـە(پـاڕەش)ەکـان درێـژە بەکۆلۆنیالەکانی فەڕەنسا لەئەفریقای بـاکور بدات. ئـەویش سـەرەڕای ئـەوەی شوێنی لەدایکبوونی بوو، لەکۆمەك کردنی ئەفریقاشـدا خـاوەنی ڕابردوویـەکی دێرینەی سۆزاوی بـوو. یەکـەمین بەرپرسـیارێتی پـاش تـەواوکردنی خوێنـدن لە(سەن سیر)، لەیەکەیەکی تفەنگدار لەمـەراکیش بـوو.چـل سـاڵی ژیـانی بـە هاتووچۆی نێوان فەڕەنساو بـاکوری ئـەفریقا سـپاردبوو. پـاش گـەڕانـەوەمان لەواشـنتن لـەکۆتایی جـەنگی دووەمـی جیـهانیدا، (جویـن) وەك جەنـەڕاڵی یەدەگی هێزەکانی فەڕەنسا لـەباکوری ئـەفریقا، ڕەوانـەی ئـەوێکرا. گـەرچی گەلێك پۆستی باڵای لەناوسوپای فەڕەنساو هـێزی هاوپەیمانـەکاندا لـەماوەی ساڵەکانی داوایدا پێسپێردرا، هـەگیز پەیوەندییـەکانی خـۆی لەگـەڵ زۆربـەی ئەفسـەرانی پێشـووی جـەنگی جـەزایر کـەدژ بەشۆڕشـگێڕەکان دەجـەنگان، دانەبڕی.

(دیگۆڵ) هەرگیز ئەو پەیوەندییـەی وەك (جویـن)ی بەجـەزایرەوە نـەبوو. هەرگیز لەوێنەی (جوین) لژیونـەری (یەکەیـەکی گـەورەی پۆلیس)، سـوپایی یان سـەربازی نـەبووە. ئەزموونـەکانی (دیگۆڵ) لەشـوێنە دوور دەسـتەکانی وەك خۆرهەڵاتی ناوەڕاست زۆرجار مانەوەی کورتخایەن بـووە. هـەروەها بـۆ ئـەفریقاش تـەنـها دوو دیداری کورتـی هـەبووە. ڕوانگـەی ئـەو بـۆ پرسـە جیهانیـەکان لەئاسـۆی فەڕەنساوەو لەهـەمان جێگاشـدا کۆتـایی پێـهاتو زۆرینـەی پەیوەسـت بەسـەردەمی (لویسـی چـوارده)وە دەبـوو. لـەدیدی (دیگـۆل)ەوە، (لویسـی چـوارده) بەدەسـتەڵاترین پاشـای مێـژووی فەڕەنسابووە. کەسێك بووە حەفتاودوو ساڵ حوکمـی کـردووەو لەوماوەیـەدا دەسترۆیشتوویی و دەستەڵاتی پەرەپێداوە. لەگەڵ ئـەوەش، نـەدەچووە ژێـر باری هیـچ کێشمەکێشـێکەوەو میللـەت لێیدەترسـان و ستایشیشیان دەکـرد.

تەنها دیدێکی (گالوسانتریك)نەی بۆ جیهان هەبوو. (دیگۆل) لەزۆربەی ڕەوشەکانی خۆیدا خۆی بەمیراتگری بیری (لویسی چواردە) دەزانی. (گەرچی سیاسەتمەدارێکی هەستیاربوو هەرگیز ئەم شتەی بەئاشکرا قبوولّ نەدەکرد، بەلاّم زۆرجار خۆی بەو دەچوواند). کەسانێکی کەئەو دەناسن باش دەزانن دروست وەك باوکی دەستەلاّتخوازێك بوو. کاتی گەشتەکانم لەلایەن (دیگۆل)ەوە بۆلای (جوین)و بەپێچەوانەشەوە- دووکەسی دەستەلاّتدارکە سەبارەت بە بەرژەوەندییە مێژووییەکانی فەڕەنسادیدی جیاوازیان هەبوو- بەهیچ جۆرێك دەمێکی خۆش نەبوون. کاتێك (دیگۆل) لەجەنگی فراوانی جەزایردا ئومێدێکی گەورەی بەهاوڕێ گەورەکەی (جوین) هەبوو تاهێزەکانی خۆرهەلاّت لەحالّەتی بێلایەنیدا بهێلّێتەوە، کێشەی تالّی نێوانیان دەستی پێکرد. ئاشکرابوو کە (دیگۆلّ) سەبارەت بە (پارەش)ە کانی باکوری ئەفریقا هیچ بڕوای بە (جوین) نەبوو.

(جوین) بووە یەکێك لەبەرگریکارە گەورەکانی ئەوانو ئامادەبوو کەکاتێك (دیگۆل) هەولّیدا دەرگیرییەکان لەڕێگای دانوستانەوە چارەسەر بکات، سوپای خۆرهەلاّت بکاتە هێزێك، کەبۆ هەموو ویستێکیان ئامادەی ڕازە بێت. لەلای (جوین) ڕۆشن بووکە (دیگۆلّ) هاونیشتمانییە فەڕەنسیەکانی بەناوی ئاشتیکردن لەگەلّ شۆڕشگێڕەگانی جەزایر دەفرۆشێت. بەپێی خواستی (دیگۆلّ)، هەولّم دا تا لەگەلّ هەردوو ڕابەری سەرسەختی توندڕەو گفتوگۆی ڕووبەڕوو بەئەنجام بگەیەنم. دەرئەنجام پاش گەشتو هاتوچۆی چەندبارە لەنێوان بارەگای فەرماندەیی (جوین) لەجەزایرو شوێنی نیشتەجێی (دیگۆلّ) ئەوەم ڕێکخست کەمارشالّ (جوین) بۆ شوێنی نیشتەجێی (دیگۆلّ) بچێت. (دیگۆلّ) لەڕێڕەوێکی تەسکی خانووە گوندییەکەیدا پێشوازی لە(جوین)کرد. ئەوان چوونە ئۆفیسە تایبەتەکەی (دیگۆل)و منیش لەهەمان شوێن ڕاوەستام تا لەگەلّ نێرەرە تایبەتەکەی (دیگۆلّ) ئامادەبم. بەلاّم لەپڕێکدا گەڕایەوە بۆلامو وتی: (ئاهـ، نابێت، تۆ لەگەلّ ئێمە وەرە.)

ئەو چاوپێکەوتنە، دیدارێکــی گونجێنەرنــە بـوو. (دیگۆڵ) ڕووی کـردە (جوین)و دەستی بەقسەکردن کردو وتــی: (تۆ پێشـتریش ئـەوەت قبـووڵ بووە.پێویستە ئەو کارە بۆ ئێمەش ڕێکبخەیت. کارێکی سادەیە.)

(جوین) ڕازی نەدەبوو دەنگە دەنگێکی نابۆوە، بـەڵام (دیگـۆڵ) بـەئارامی بەپاژنـەی پێڵاوەکـەی گەمـەی دەکـرد. هیـچ شـتێك خانەنشــینی نــەدەکرد. جـەزایر لەدەسـت چووبـوو. دەبــوو (پــارەش)ەکــان ئامــادەی قبوڵکردنـی بەجێهێشتنی وڵات بکرێن، یـان ئـەوەی کـە لەگـەڵ شۆڕشـگێڕەکان ئاشـتیان بکردایـە، لـەکۆتاییدا (جویـن) چـووە سـەربابەتێکی هـەڵبژاردنیی تـاریك یـان ڕۆشن، خۆبەدەستەوەدان یان جەنگ، کـە بەسـادەیی لەبـەرچاو ونبـوو. ئـەو تووڕە بووبوو، بۆیە لەوکاتەدا ئامادەی گفتوگۆی ئاشکرا بە ئامادەبوونی مـن لەگەڵ (دیگۆڵ) نەبوو.

بەتەواوی ئاشکرابوو کەهیچ یەك لەئێمە لەسەرەتای ڕۆژەکانی مانەوەمان لەگوندی شوێن نیشـتەجێی (دیگـۆڵ)، هیـچ جـۆرە هەماهەنگیـەکمان لەگـەڵ دەوروبەرەکە پەیدا نەکردبوو. لەهەمان ئەودەمەوە لەساڵی ١٩٥٨ تـا سـاڵی ١٩٦١، لەوکاتەوەی کـە(جویـن) لـەهاوڕێی سـوپایی خـۆی هـەڵاتو هـەروەها ناچار بەکـەنارەگیری لەپیشەسـەربازییە خۆشەویسـتەکەی کـرا، ئـەو دووانـە هەرگیز بۆ جارێکی تر لەهەلومەرجێکی دۆستانەدا پێکەوە گفتوگۆیان نەکرد. لەڕاستیدا هەربەدەگمـەن ڕاسـتەوخۆیانە ڕووبـەڕووی یـەکتر دەبوونـەوە. مـن کەسێك بووم قبووڵم بوو بەئاگری ڕقی ئــەو دووانـە بسـووتێم، وەك چرایـەکی ڕووناك بگرێـم، هەرچـەندە کـاری باشـتر هـەبوو تـا وەرگـێڕی دوو ئاسـتی دژ بەیەكو توندڕەوبم. کەدیارە لەکۆتاییدا (دیگۆڵ) سەرکەوت.

زۆربەی (پارەش)ەکان بۆ وڵاتەکەیان گەڕانەوە، فەڕەنسا توانــی خولێکـی نوێ دەست پێبکات، کەبرینەکانی ئەو جەنگە دروستیان کردبوو سارێژ ببن‌و، وەك هــێزێکی یەکپارچـــەو بـــەهێزی گرنگـــی ئـــەروپی، پێگـــەی شـــیاو لەدانوسـتانەکاندا بەدەستبهێنێت. لەهـەمان کـاتدا دەرگـــیربوونم لەجــەنگی جەزایر سەلماندی ئەوخولە لەئامادە کاریم بۆ جوانـترین کـارێکی کـە تـا ئـەو

دەمەپەسندم کردبوو– واتە سەرۆکایەتی ڕێکخراوی جاسوسی فەرەنسا– زۆر کاریگەر بووە. لەهەموو ژیانمدا هەوڵمداوە سیمایەکی ئاسایی یان لەئاستی خوارەوەم هەبێت، بەڵام کاتێك نزیکەی شەش پێ باڵاو زیاتر لە (٢٢٠ پاوەند) کێشت هەبێت، ئەمە بەوجۆرەی کەمەبەستە، کارێکی سادەنییە. هەڵبەتە مەبەستم لەم لێکچوونە ئەوەیە کە هەمیشە ویستوومە خودی خۆمبم، ئەم بەڵگەیەشم بۆ دووربوون لەکاری سیاسییەوە گەورەیە.

من زۆرهاوڕێی بەرجەستەم هەبوون کەکاتێك دەستیان دایە ئەوکارانە، بەتەواوی گۆڕان. سیاسەتی پارتایەتی، سازش‌و ئارەزووی خۆبە دەستەوەدان دەخوازێت، ئەوکارەی کەمن هەرگیز ئەنجامی نادەم. هەموو هاوڕێکانم‌و زیاتریش هاوەڵانم لەژیانی ئاساییدا ئەمە دەزانن.

(فرانسوا کاستکس) یەکێکە لەوانەی کە لەهەمووکەس باشتر من دەناسێت. ئەو ئەفسەرێکی کۆن‌و هاوڕێ‌و برامە کەخوشکی (کلۆدپەمپیدۆ)، هاوسەری (جۆرج پەمپیدۆ)ی هێناوەو بەبڕوای من یەکێك لەکەڵە پیاوەکانی ئەو ڕۆژانەی فەرەنسا بوو. خاوەنی هەموو ئەو تایبەتمەندیانە بوو کەسیاسەت مەدارێك دەیویست تابیێتە کەڵە پیاو. کەسێکی تێگەیشتوو، زیرەك، هەستیار، خۆش گفت‌و یەکسانخواز بوو. کاتێك (جۆرج پەمپیدۆ) بووە سەرۆك وەزیران، پەیوەندیم پێوەی پچڕا، بەڵام ڕۆژێکیان (کاستکس) لێمی پرسی: (لەکۆتاییدا هاوەڵزاوا منت بینی؟ ئێمە چەند ڕۆژێك پێش ئێستا دەربارەی تۆ قسەمان کرد. حەز دەکات بتبینێت.)

بەوبۆنەیەوە ئێمە ئێوارە خوانێکمان لەماڵی (فرانسوا کاستکس) خوارد. تێگەیشتم کە (پەمپیدۆ) هەمان ئەو کەسە یەکەمن دەیناسم‌و دروست وەك سالانی ڕابردوو بوو. بەتەواوی دوای جەنگ، وەك ناسوپاییەك پەیوەندی کرد بەدەستەیەکی کارگێڕی ژێر دەستی (دیگۆل)ەوە، کە من هەلومەرجی ئەو کارەم بۆ فەراهەم کرد. (دیگۆل) هەندێ جار ڕەفتاری تاڵ‌و نەگبەتی هەبوو.سەرەڕای ئەوەش بەدەگمەن خاوەنی ئەو نیعمەتەبوو کەبتوانێت بەخەتێکی پاك وبەرجەستەی فەرەنسایی شتێك بنوسێت.

لەڕوویەکــەوە، خــاوەنی ڕێزێکــی بــەرز بــوو، بــەجۆرێك کەزۆرینــەی فەڕەنســیەکان بەکەســێکی نائاســاییو دەگمــەنو (مامۆســتا) یــار دادەنا.(مامۆستا)ی پلە باڵای هەموو زانکۆ فەڕەنسەکان؛ پلەیەکی کەپاش ئەنجامدانی زەبەلاحترینو ترسـناکترین فەرمانـەکانو بـەماندوو بوونێکـی زۆر دەدرێت. ڕۆژێکیـان (دیگـۆڵ) ڕووی کردبـووە یـەکێك لـەیاریدە دەرەکـانی بـەناوی (ڕینـە بورویـە)و قیژاند بووی (بورویـە !). ئـەویش وەڵامـی دابۆوە (بەڵێ، نەخێر!)

(بورویە) منی بە(مامۆستا)یەك دەزانی کەدەزانێت چۆن بەزمانی فەڕەنسی پەتی شت بنوسێت. (بورویە) بۆ (جۆرج پەمپیدۆ)، ئەو پیاوەی کە لەواقیعدا خۆی ڕۆشـنبیرێکی ڕاستە قینـەبوو، (مامۆسـتا)یـەکی لێوەشـاوە بــوو کـە دەیتوانی بەفەڕەنسی بخوێنێتو بنوسێتو خاوەنی وزەیەکی جیاکاری وابوو کـە(دیگــۆڵ) دەستخۆشــی لێدەکــرد. لــەماوەی ســاڵەکانی داهــاتوودا هەریەکەمان لەڕێگای خۆیەوە بەرەوپێش دەچووین. پاش جەنگ بووە یەکێك لەبەڕێوەبەرانی بـانکی (ڕوتشـلید). دەمدەمــەمنی بانگهێشــتی نـانخواردنی نیـوەڕۆ لـە (دائـرەی ئـەمریکای لاتـین)ی بـانکی نـاوبراو دەکــرد. لـەکۆتایی هەرژەمێکدا بانگی لەخزمەتکارەکە دەکردو داوای جگەرەیـەکی زۆر گـەورەی دەکـرد کـە بەجوڵەیـەکی خۆنواندنـەوە ئـاگری دەداو چـاوێکی لێدادەگـرتمو دەیگوت: (تۆ دەزانیت کەمن عاشـقی جگـەرەی گـەورەم، بـەڵام هیـچ کـاتێك لەدەرەوە دایناگرسێنم،چونکە حەزدەکەم وەك خـاوەن بـانکێکی دەوڵەمـەند دەرکەوم.) ئێمەشتی زیاترمان هەبوو کەپێکەوەی دەبەستێن.

ئـەو لەیەکـەمینو گـەورەترین خـێزانی (کاسـتکس) بــوو کــە هاوڕێیــەکی دولایەنەی تێدابوو. گەورەترین هاوڕێی من (ئان ماری دوپوی) بوو.

من یەکەمین جار ئەوم لە (ئیتالیا) بینی. لەوێ شـۆفێری ئـامبولانس بـوو. ئــەویش وەك مــنو هاوســەرەکەم لــەژێر فــەرماندەیی جەنــەڕاڵ (جویــن) کـاریدەکردو یـەکێك لەبـەناوبانگترین شــۆفێرانی ئـەمبولانس لـەناو هــەموو هێزەکانی فەڕەنسادا لەکاتی جەنگدابوو. پاشان ڕۆڵی گرنگـتری لەحکومـەتی

سەرکۆمار(پەمپیدۆ) وەك بەڕێوەبەری کابینەکەی (نووسەری سەرۆکی کۆشکی ئەلیزە) دەگێڕا. وابزانم ئەو یەکەمین‌و تاکەژن بوو کە ئەم پۆستەی بەڕێوە دەبرد. من‌و هاوسەرەکەم چەندین ساڵ بووئەومان دەناسی‌و خۆشمان دەویست. کاری دەوڵەتی ئێمە وای لێهات کەئەو یەکەمین کەس بوو کەپێشنیازی بۆ(پەمپیدۆ) کرد تا ڕێگایەك بۆ بەکارخستنم لەکابینەکەیدا بدۆزێتەوە.

پاش کەمێك لەخواردنی نانی ئێوارە لەماڵی (فرانسوا کاستکس) ، (پەمپیدۆ) داوای لێکردم لەکۆشکی ئەلیزە سەردانێکی بکەم. جگە لەوەی لەبەردەم مێزە ڕازاوەکەی دانیشتم‌و جموجولێکم بۆکرد، دەستی کرد بەسەرزەنشت کردنی من‌و وتی: (بۆچی لەوماوە درێژەدا نەهاتویتە سەردانم؟) ڕاستگۆیانە وەڵامم دایەوە: (چونکە هیچ داواکارییەك نەبوو کەبمەوێت پرست پێبکەم)

پاش بێدەنگییەکی کورت، بەدەنگێکی تاڕادەیەك لەتاسەوە وتی: (دەبێت تۆ تاکە کەسی بەرچاوی ئێمەبیت)

پێش ئەوەی بچێتەسەربابەتە بنەڕەتیەکە، باسێکی فراوانمان لەوددەمەی جیهان کرد.

ئەو وتی: (ئێمە پاش (دیگۆل) دەبێت ڕێگرەکانی نێوان خۆمان‌و ئەمریکیەکان لادەین. حەزدەکەیت ببیتە شالیاری فەرەنسە لەواشنتن؟)

سوپاسیم کردو وتم کەچەند دلگەرمی ئەو پێشنیازەی بووم، بەڵام ڕوونمکردەوە کە: (لادانی ڕێگرەکان بەتەواوی تایبەتمەندی من نییە.)

(پەمپیدۆ)سەری بەئاماژەی دەرککردن بەبابەتەکە لەقاند، بەڵام ئەم ئیستدلالە لەلای ئەو بەتەواوی خانەنشینانە بوو. بۆیە هەوڵم دا لەلایەکی ترەوە بچمەناوەوە کە لەوانەیە باش لەشتەکە تێبگات. بەمجۆرە دەستمپێکرد: (بەڕێز، ئێوە دەزانن کە من ماوەیەکی تاڕادەیەك درێژم لەواشنتن‌و لەفەرمانی جۆراجۆردا بەسەربردووە. لەزۆربەی ئەم هەولانەدا، لەکاتی نانخواردنی نیوەڕۆ یان ئێوارەدا، شوێنگەی باشم هەبووە.

تەنانەت هەندێ شەوانیش لەخەڵوەتگەی شالیار شوێنی گونجاو ئامادە دەکرا.

باشترین مێزی نانخواردنو باشترین (ژێرزەمین) لەپایتەختی ئەمریکا کەزۆر ناوداربوون. دیارە من عاشقی ژیانی خۆش، خواردنی خۆش، شەرابی خۆش بووم. ئەگەر دەتەوێت پێم بڵێیت بمرە، تەنها بڵێ لە واشنتن بمرە.)

(پەمپیدۆ) پێکەنی. ئێمە ماوەیەکی زیاتر پێکەوە گاڵتەو گەپمان کردو لەکۆتاییدا وتی: (هەڵبەتە شتێکی تر لەئارادایە کە پێویستە ڕاستگۆیانە بیڵێمو دەتوانیت ناوی بنێیت (فەرمانێکی ناجۆر. ئەوە بۆ تۆ پێشنیاز ناکەم چونکە تۆ هاوڕێمیت.)

من سەراسیمە بوومو وتم: (وادیارە سەرنجڕاکێشە. ئەگەر فەرمانێکی زۆر سەختو ناجۆرە من حەزم پێیەتی، زیاتر بۆمی ڕوونکەرەوە.)

ئەو خاوەن ئەزموونانە لەسەرکورسیە خۆشەکەی جموجۆلێکی کردو زیاتر بردیە پێشەوەو وتی: (باشە، ئەمە جێبەجێکردنی فەرمانێکی نهێنییە. کەسێکم دەوێت دەرەقەتی بێتو بتوانێت دووبارە چاکی بکاتەوە. سەبارەت بەجاسوسی چی دەزانیت؟) ڕاستگۆیانە وەڵامم دایەوە: (باشە بنەماکانی دەزانم. لەفەڕەنسای داگیرکراوو بەدرێژایی داگیرکاری ئەڵمانیەکان لەو وڵاتەدا ماوەیەك جاسوسیم کردووە. گەشتم بۆ (ڤیشی) دەکردو لەگەڵ هاوڕێی خۆشەویستم (ڕاڵف هیزن) کە ئەودەمە هاوکاری یونایتدپرێسی دەکرد، چاوپێکەوتنم ئەنجامدەدا. یان چاوم بەکەسانی دی لەباڵوێزخانەی ئەمریکا دەکەوتو سەبارەت بەچالاکیە جۆراوجۆرەکانی ئەلمانیەکان لەفەڕەنساو نۆرماندی ئەنجامیان دەدا، ڕوونکردنەوەم دەدا. مەیدانەکانی نیشتنەوەی فرۆکە، کەبڕیاربوو دروستی بکەنو، چۆنیەتی سوود لێوەرگرتنیو زانیاری لەوجۆرانە.

دیارە لەدواییدا لەگەڵ جەنەڕاڵ (جوین) کارم دەکردو لەساڵانی کۆتایی جەنگدا لەدیدی جەنەڕاڵێکەوە دەمڕوانییەزانیارییە جاسوسییە

جۆراو جۆرەکانی هاوپەیمانەکان، بەڵام بەداخەوە سەبارەت بەزەمینەی ناوەندی جاسوسی شتێکی کەم دەزانم.) هەڵبەتە دەمزانی کە(پەمپیدۆ) لەڕووی هەموو هۆکارە جاسوسیەکانیەوە تووشی گرفتی زۆر گەورە بووە.

واژەی دەزگای نهێنی ناوێك بوو کەئەو لێی نابوو، بەڵام ناوە فەرمییەکەی (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکیو دژە سیخوڕی) بوو.

دەمزانی گرفتاری چەرخێکی زۆر دژوار بووەو لەڕاستیدا بەهۆی چەندین بەشداری ناشیرینانە لەکاروباری ناوخۆیی وڵاتانی ترو هەروەها وڵاتی خۆشمان لەوانە تیرۆرو پاکتاوی بەکۆمەڵ، چووبووە قۆناغێکی قەیراناویو سەختەوە. یەکێك لەبێزراوترین ئەم دەستدرێژیانە لەساڵی ١٩٦٥ دژبە (مهدی بن برکە) بوو. ئەو پرۆفیسۆرێکی چەپڕەوی زانکۆی مەراکیش بوو، کەبزوتنەوەی نەیارانی پێشەنگی مەراکیشی دروستکردو پاشان لەڕووداوێکی نهێنیدا، دوورخرایەوەو بەدووربوونی لەوڵاتەکەی بەمەرگ مەحکوم کرا. لەپاریس سەرگەردان بوو تا خەڵوەتگەیەکی بێنەوایان گرتیەخۆیو لەوێوە درێژەی بەچالاکیەکانی دژبەڕژێمی مەراکیش دا هەموو تۆڕە ئاسایشەکان پەیوەندی نزیکیان لەگەڵ ئێمە یان لەگەڵ نوێنەرە یاساییەکانمان لەئەفریقای سەروو، کۆلۆنیالەکانی فەڕەنسادا هەبوو. شەوی ٢٩ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٦٥(بن برکە) بەپێی وتەی هەندێ لەسەرچاوەکان، لەچالاکییەکی هاوبەشی دەزگای جاسوسی فەڕەنساو ڕێکخراوی ئاسایشی مەراکیش، فڕێنرابوو. ونبوونی ئەو بووە هۆی شەپۆلێکی توندی تری بێبڕوایی لەناوهەموو دەزگا ئەمنیەکانی فەڕەنسادا.

ڕەنگدانەوەی ئەوەلەجیهانی دەرەکیو لەناوڕۆحیەتی خەڵکی ناوخۆدا کاریگەری قووڵو ناشیرینی بەجێهێشت. لەواقیعدا بەڕزگارکردنی دەزگای جاسوسی، فەڕەنسا دەکەوتە شوێنێکی تازەو توندوتۆڵترەوەو ئەم کارەش بەڕاستی دژواربوو، بەدڵنیاییەوە لەوانەبوو هەموو بەرامبەر

بەوکەسەی بەرپرسی ئەم کارە دەبێت، زۆر توورە ببن. بەوجۆرە ئاشکرابوو کەئەنجامدانی ئەوکارە پێویستە. سەرەتا (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەکان) پێویست دەکات لەبۆتەی پیشەییو دەستەڵاتداریدا بێت. بەجۆرێك کە لەناو زەلکاوی دەسیسەکانی ناوخۆبکێشرێتە دەرەوەو ئەو جێگایانەی کەهیچ دەزگایەکی جاسوسی دەستی بەپیسی ئالودە نەبووە، دووربخرێتەوە. دووەم ئەوەیە هەوڵی بەدەستهێنانی موعجیزەیەك بدات کەبتوانێت پارێزگاری لە ئامانجی نێونەتەوەییو ستراتیژی فەرەنسا بکاتو ڕۆڵی ڕاست لەناو هەنگاوەکانی هەوالگری یەکێتی خۆرئاوا، کە ئەو دەمە بەتەواوی خۆی لەجەنگی سێیەمی جیهانیدا دەبینییەوە، بگێڕێت. (پەمپیدۆ) بەوردی دیقەتی لەشێوەم دەداو بەڕوونی زۆربەی ئەو بیرانەی بەمێشکمدا تێدەپەڕین تێدەگەیشت. لەسەروئەوەشەوە، دیاربوو کەماهیەتی ئەومەترسییەی لەقبولکردنی ئەم لایەنەدا شاراوە بوو، هەست پێدەکرد. بۆیە بەپەلە درێژەی پێدا: (ئەگەر تۆ ئەم فەرمانە ناجۆرە ڕاپەڕێنیت، بەتەنها لەناوگرفتەکاندا جێتناهێلم. ناوت دەنێم (ڕاوێژکاری دەوڵەت).

ئێوارەی ئەوڕۆژە وەلامی (پەمپیدۆ)م نەدایەوە. لەڕاستیدا ساڵێك بەسەرکاتی ئەو گفتوگۆیەدا تێپەڕی. ساڵێك کە لەمێشکمدا چەندەهاجار ئەو پێشنیازە نائاساییەم دەهێناو دەبرد، لەمانگی جونی ساڵی ١٩٦٩، (پەمپیدۆ) وەك سەرکۆمار هەڵبژێردرا. لە پلەی سەرۆك وەزیرییەوە، پاش خانەنشینی (دیگۆل) بەرزبۆوە بۆ پلەیسەرکۆماری. ماوەیەك پاش هەڵبژاردنی، دووبارە چاومان بەیەك کەوتەوە. بەجۆرێکی نهێنی پێی وتم: (ئیتر سوودی نییە. دەزگای نهێنی بەدروستی هیچ کارێك ناکات. سەرۆکی بەشەکەم دەڵێت؛ تەنها دەتوانیت یەك کار ئەنجام بدەیت؛ تێکدانی هەموو دەزگاو دووبارە دامەزراندنەوەی سەرلەنوێ.) لەوەلامدا وتم: (بەڕێز سەرکۆمار، بەڕاستی لەمبارەیەوە هیچ نازانم، بەلام چەند

هەفتەیەك مۆڵەتم بدە، هەرچییەك بتوانم بەلایەنی کەمەوە درێغی ناکەم لەدوورخستنەوەی ئەم گرفتەو ئەنجامی دەدەم.)

هەندێ لەهاوەڵە کۆنەکانی سەردەمی جەنگ لە (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکیو دژە سیخوڕی) بون. تێبینیەکانی ئەوانم کۆکردەوەو سەرم بەزۆر درزوشوێنی تاریکی پەیکەری ئەم دێوەزەبەلاحە- دەزگای جاسوسی-یەدا کرد. ئەم دێوەزەبەلاحە هیچ کۆنترۆڵ نەکرابوو. ئەم کارەم بەوردی بۆ ئەو ئامانجەی هەمبوو ئەنجامم دا. پاشان بۆلای (پەمپیدۆ) لەکۆشکی ئەلیزا گەڕامەوە.

پێموت: (بەڕێز سەرکۆمار، لەوباوەڕەدام لەناوبردنی دەزگاو دووبارە سەرلەنوێ دروستکردنەوەی بیرێکی خراپ بێت، چونکە لەگەڵ ماوەڕابردووەکەی کەمەترسیداریشە، بنەماو چوارچێوەی دەزگاکەت کەهۆکاری دیاریکردنی سیاسەتی تۆیە، دەچێتە قۆناغی قەیراناوی سەرنەکەوتوانەوە. شتێکی کە (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەی دەرەکیو دژە سیخوڕی) پێویستی پێیەتی، پاکسازی تەواوو دەرکردنی ژمارەیەك لە ڕەگەزەتێکدەرو نابودکارەکانە کە دەتوانرێت ڕاستەوخۆو بەبێ پەردەپۆش کاری ئەنجام بدرێت، ئەگەر ئەم کارەبە دروستی سەربگرێت، تۆ دووبارە ئامرازێکی یەکپارچەو تەنهات دەبێت (دەزگای جاسوسی) لەوەرگرتنی سەخترین بڕیارو لەناو تەنگەژاویترین قەیرانەکاندا کۆمەکتان پێدەکات؛ ئەگەر من ئەم کارە بگرمە ئەستۆ، پێویستە تۆ لەسەدا سەد بڕوام پێبکەیتو نەوەدو نۆ لەسەدا قبوڵ نییە.)

(پەمپیدۆ) بەبێوەستان ڕازی بوو. دانانی من تادوایین سات کەممکین بوو بەنهێنی مایەوەو تەنها کاتێك کابینەکەی دامەزراند، ئاشکرا کرا. لەفەڕەنسا پۆستی سەرۆکایەتی دەزگای زانیاری پلەیەکی بەرزە. پێویست ناکات پەرلەمان پشتگیری لێبکات. تەنها پشتگیری کابینەی خودی سەرۆکۆمار بەسە.

تەنانەت وەزیری بەرگریش تا چەند سەعاتێك بەر لەڕاگەیاندنەکە، ئاگادارنەبوو. هەموو سەراسیمەو زۆریان تووشی شۆك ببوون. لەسەعاتی نۆی بەیانی ئەوڕۆژەی دانانی من ڕاگەیەندرا، گەیشتمە بنکەی (تورل) لەبیست کیلۆ مەتری پاریس. ئەوێ بنکەیەکی وەك بنکە سەربازییەکانی تربوو؛ بەڵام تەنها تایبەت بوو بەفەرماندەکانی (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەی دەرەکیو دژە سیخوڕی) واتە (CIA) فەرەنسابوو، کەپاشان بەناوی (دایرەی گشتی ئاسایشی دەرەکی) ناسرا.

هەرچەندە بەشێوەیەکی نافەرمی وەك مەلوانگەیەك بەکاردەهێنراو، لەلایەن ڕۆژنامە نووسانەوە تازە دروستکرابوو؛ لەبەرئەوەی بەتەواوی لەپاڵ ئەوەدا مەلەوانگەیەکی شارەوانی هەبوو. ئێمە بەسانایی ناومان نابوو (دەزگا). کەهەرگیز بۆ مەلەکردن نەچوومە ئەوێ، بەڵام بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی فەسادو بێتوانابییەکی قوڵی کەهاوشانی (دەزگا) لەئارادبوو، ڕۆشتمو لەناویم برد. ئۆتۆمبیلە حکومیەکانم لەنێوڕێگای سەرەکی (بلوار مورتیە)و لەلای شۆستەکانەوە هاتنە ناوەوەو ڕاستەوخۆ بۆ ناوچیمەنێکی سەوزی فراوانی بەسپی نەخشێنراو چوون. ئەفسەرێکی (دەزگای دژە سیخوڕی) لەپڕێکدابینیمیو بەسەلام کردن ئەحواڵپرسی لێم کرد. ئەو بەتەواوی دەیزانی کە گەرچی من کەسێکی ناسوپاییم، بەڵام پلەیەکی چوار ئەستێرەیم هەیە. ئێمە بەخێرایی بەپێپلیکانەکاندا سەرکەوتینو بەناوڕاڕەوە گەورەکانی ڕووبەڕوومان بوو تێپەڕین، تا خۆمان لەبەردەم دیوارێکی گەورەو سپیدا دیتەوە. پاشان شمشێرێکی خێزانی (چارل)ی گەورە لەجۆری (هومر)م بەدیوارەکەدا هەڵواسی کەوەك پنتێکی ڕووناکی دەدرەوشایەوە. بەپەلەبۆلای ڕاست وەرچەرخاینو چووینە ئۆفیسی گەورەی بەڕێوەبەرایەتی جەنەڕاڵ، کەنزیکەی پەنجایارد فراوان بوو. لەوێداخەڵکانێکی زۆر هەبوون کە ئەوبەیانیە چاوەڕوانی چوونی من بوون، بەتەواویش دیاربوو کەحەزیان

بەوەنەبوو لەوێبم. دەمتوانی بەتەنها بەسەیرکردنی سیمایان ئەم شتە لەچاویاندا بخوێنمەوەو لەناوکەشی ئەوێدا هەستی پێبکەم.

ئەوانە تەنانەت نەشیاندەزانی کەبڕیارە هەندێکیان دەربکرێن. هەمان ڕۆژی یەکەم لیستێکی کورت بەڵام گرنگم لەکاروباری هەندێ کەسی دیاریکراو لەگیرفاندا بوو. بەوردی دەمزانی پێویستە سیخورمە لەکوێ بوەشێنمو چ کەسانێك پێویستە کەنارگیر بکرێن. چونکە زۆربەی هێزەکانی لەگەڵ (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکیو دژە سیخوڕی)کاریان دەکرد دژی من خۆیان ڕێکخستبوو ئەو بەرەیەیان هەڵبژارد بوو، بڕیارم دابوو لێدانی یەکەم زۆربێبە زەییانە بوەشێنم. بەپێی ئەمە لەڕۆژی یەکەمداو لەماوەی سێ سەعاتدا، شەش کەسم دەرکرد. ئەوانە کەسانێك بوون نەیاندەویست لەگەڵ من کاربکەنو، بەدڵنیاییەوە ئەوکارە سەرە گێژەی پێخستبوون. هەروەها لەهەمان یەکەمین ڕۆژدا سێ یەکی بەڕێوەبەرەکانم دەرکرد کەبەرجەستەترین بەڕێوەبەرانی لێکۆڵینەوە، جاسوسیو تەکنۆلۆژی بوون. ڕۆژانە ئەم کارەم بەسادەیی ئەنجام دەدا. ئەوانەی کە ئەفسەرانی سوپا بوون، بەهۆی پلەی چوار ئەستێرەیی منەوە، بەدیسپلینو ڕێزەوە دەوەستان. ئەوانی دی ئاساییانە لەبەردەممدا دەوەستانو چاوەڕوانی ئەوەبوون من فەرمووی دانیشتنیان لێبکەم.

ئەو کەسانەشی کە دەمویست بکەونە ژێر کاریگەری سەرسەختی منەوە. پاش ئەوەی بەناو ئۆفیسە دوورو درێژەکەمدا تێدەپەڕینو بەرەو سوچو کەناری مێزەکەم دەهاتن، بەڕەقییەوە دەمووت: (داوات لێناکەم دابنیشیت، چونکە تۆ دەردەکرێیت.)

دیارە تووشی ڕاچەنین دەبوون. یەکێك لەوانە بەسەرسوڕمانەوە پرسیاری لێمکرد: (باشە، بۆچی؟) بەڕاشکاوانە وەڵامم دایەوە، (چونکە بڕوام پێت نییە.)

ئەو وتـی: (بـەڵام تـۆ مـن ناناسـیت. ئەمـە یەکـەمجارە کـە ئێمـە تـۆی تیادەناسین.)

لەکۆتاییدا وتم: (من پێشتر تۆم نەبینیوە. بەڵام دەزانم تۆ چکارەیت.)

بەو ئاسانییە. بـەڵام ئـەو دەسـتبەردار نـەبوو و بەخەندەیـەکی سـاردو گێلانــەوە درێــژەی دایــە: (مــن دڵنیــام کــە دەتوانــین پــەیڕەوی لەبیناکردنەوەی نوێ بکەین.)

لەسەر کورسییەکەم هەستامە سەرپێ.

من کەسێکی بەخۆم‌و لەوڕۆژانەشدا زۆر گەنجترو بەهێزتر وەك گایەکی بەهێز بووم.

یەخـەیم گـرت‌و لەسـەر زەوی بـەرزم کـردەوە. دەرگایــەکی داخــراوی کەنزیکەی پـەنجا پـێ دوورتـر بـوو و چـەند دەقیقەیـەك پێشــتر لێــوەی هاتبووە ژوورەوە، پیشانم داو وتم: (لەماوەی پێنج سانیەدا بەپێی خـۆت دەڕۆیـت ئەگـەرنا مـن دەتکەمـە دەرەوە بەبێئـەوەی دەرگاکـەت بـۆ بکەمەوە.)

یاریدەدەرەکـەم پاشـان وتـی کـاتێك لەدەرگاکـەوە هـەڵاتووە، پێـی وتووە: (بەختت هەیە هێشتا زیندووی، کاتێك بەڕێوەبەری گشتی چنگیت لێگیر بکات دەتوانێت پارچەپارچەت بکات.)

هـەمان ڕۆژ ئــەم هەواڵــە لەسەرانســەری بنکــەی (تــورڵ) بڵاوبــۆوە. ستراتیژەکەی من کاریگەرترین ستراتیژ بوو.

پاشـان لـەماوەی ڕۆژو هەفتـە لـەژمارە نـەهاتووەکاندا، ژمـارەیکی زۆر هەڕەشــەم پێگەیشــت کەزۆربەشــیان زۆر مەترســیدار بــوون. بــەڵام بەدەگمـەن دەمهێشـت تــرس ڕێـم لێبگرێـت. یـەکێك لـەو نووسـینانەم خوێنـدەوە کـە لـەپیتی بـڕاوی گۆڤـارو ڕۆژنامــەکان دروسـتکرابوو: (تـۆ زیاترلـە یـەك هەفتـە نـاژیت). لـەو بڕوایـەدا بـووم بـۆ کارمـەندێکی نـهێنی فەڕەنسا نووسینێکی لـەوجۆرە کـارێکی تاڕادەیـەك قورسـە. یـەکێکی تـر ڕایدەگەیاند: (دەتگرین.)

ڕەگـــەزی زۆر مەترســیدار لـــەناو (دەزگـــای کۆکردنـــەوەی بەڵگـــەی دەرەکیو دژەسیخوڕی) داهەبوون کە پێشتر ســەربە چینــە باڵاکــانو پلــە دەسەڵاتدارەکان بوونو کەمن تائەو دەمە نەمتوانی بوو بیانناسم.
بەوجۆرەی کەدەیبینی، ئەو هەڕەشانە بەرەوڕووی خۆیان بۆوەو، مـن هێشتا زیندووم. هەروەها (دەزگای جاسوسی فەڕەنسا)ش هێشتا ماوە.

بەشی چوارەم:

## هەزاران توێژاڵ

ناوی خوازراوی تایبەتیم لەدەزگا (میل فویولە (Millefeuille)– واتە هەزار توێژ) بوو. ئەم ناوە جۆرێك شیرینی فەڕەنسییە کە لەدەرەوە بەناوی کێکی چەند چینی تێکەڵاو ناسراوەو، بەوردیو لەژمارەیەکی زۆر (گریمان ملیونێك) لەتوێژاڵی کاغەزی ناسکی شیرینی دروستی دەکەن.

بەپێی ئەمە، (دەزگای نهێنی)ش لەتوێژاڵی بێئەندازە دروستبووە. بەڵام لەجیاتی ئەوەی پەیوەست بێت بەشیرینییەکی تایبەت کە هەموو ڕۆژێك بەسەری پەنجەی چێشتلێنەرێکەوە بخرێتە سەر زمان، ئەو توێژاڵانە لەماوەی چەندینساڵدا کۆکرابوونەوەو، پاشان گۆڕابوون بۆ پاشماوەی بەردین، کە تا ئەوکاتەی کەمن چووم، ئیتر ببوون بەبەرد.

لەوێدا تەنها کەسانی بیروباوەڕ کۆنخوازو لەباربەرە کۆکرابوونەوە. باشترینیان بەدەگمەن ڕەوشێکی کاریگەریان بەکار دەهێنا بۆ کۆکردنەوەی زانیاریو ئەم بەرهەمانەشیان لەمەسایلی گرنگی ئاسایشی نێودەوڵەتی بەکار دەهێنا. ئەم شتە ڕێگری ئیدارەی کاروبارەکان بوو و ئاستەنگی بەردەمی کارکردن بوو.

ئەو دەزگایە لەهەلومەرجی ناهەمواردا دەبووە فۆرمێکی بەهێزو تۆقێنەر لەدەستی سەرکۆماردا، کە دادوەرییەکەی ئەویشو کۆنترۆڵی بەسەر ژیانو مەرگی تاکەکانو دواجاریش هەموو توانای لەحکومەتدا دەخستە ژێر پرسیارەوە.

بەهیچ شێوەیەك زیادەڕۆیی نییە گەر ئاشکرای بکەم کەئەمە ببوە خراپترین وەزعی یەخەگیری سەرکۆمار (پەمپیدۆ)؛ هەر ئەوەش لەیەکەم ڕۆژی چوونم بۆ سەربازگەی (تورل) تووشی من بوو. سەرکۆمار لەکارکردنی (دەزگای نهێنی) ناڕەحەت بوو. فڕاندنو ونبوونی (بن برکە)، لەئاشکراترین گەمەکانی (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکیو دژە سیخوڕی) بووکە لەدەروەی فەڕەنسا ئەنجام دەدرا. لە هەندێ بابەتدا، تەنانەت

کەسانی (Milieu)– گروپچی) یان مافیای فەڕەنسا بەگوێرەی نەخشەی داڕێژراو لەلایەن دەزگای ئاسایشی نەتەوەیی‌و بۆ ئەرکی تایبەت‌و دیاریکراو بەکار دەهێنران.

دەوترێت کەهەندێك لەم فەرمانبەرانە قاچاخچێتی مادەی بێهۆشکەرو چەکیان دەکردو ئەوانی دی بەخەڵکی فرێنەر، بکوژو خوێناویترین لێدان‌و بریندارکەر دەدەنران.

بەهەندێك لەکەسایەتیە بەڕاست نەفرەتاوییەکان کە لەحاڵەتی پاککردنەوەی مەلەفە پۆلیسیەکانیاندا بوون، دەوترا کە دوکانێك لەوڵاتی فەڕەنسا بکەنەوەو کەنارەگیری لێبکەن. بەڵام لەهەمان گۆشەوە درێژەیان بەکارە پیسەکانی خۆیان دەدا.

دەڵێن (پیزۆ– دراوی ئیسپانییە)ی ساختە کە لەبازاڕ ئاسانتر لەدراوی فەڕەنسی خەرج دەکرا، دروست دەکراو وەك کۆمەك بۆ هێزی دارایی بزوتنەوەی خەباتگێڕی پێشڕەوی فەڕەنسە لەجەزایر دەنێردرا.

(ئیستپان مارکویك)ی یوگسلاڤی پاسەوانی ئەستێرەی سینەمای فەڕەنسا (ئالن دیلۆن) کوژرا. بەجۆرێك کەجێگای باوەڕنەبوو لەپاریس بڵاوبۆوە کە (مادام پەمپیدۆ) لەپارتێکدا کار دەکات کە ئەو کەسە یوگسلاڤییەش لەوێ بینراوە. بوونی پڕوپاگەندە دژ بەخانم (پەمپیدۆ) کە خانمێکی زۆرباش‌و مێردەکەی خۆش دەویست، بەتەواوی بێبنەمابوو. بەڵام ئەم شتە لەلایەن گروپێك لەنەیارانی سیاسی مێردەکەیەوە کە ئاژاوە چی بوون، بڵاودەکرایەوە. تەنها پاش مانگێك بەبێ ئەوەی تۆمەتە کە لەبڵاوکراوەکاندا بدرێتەپاڵ کەس کۆتایی هات.

ئەو ڕۆژانە لەزۆر ڕووەوە بەڕۆژەکانی (واتە رگێت)و (ئیران– کۆنترا) دەچوون.

هەموو ئەو کەسانەی کەچووبوونە ئەم گێژاوەوە یان غافڵگیرانە خزێنرابوونە ناوی، ئەوانەی کە بەنهێنیی مۆڵەتی کارکردنیان هەبوو، یان

ئەوانەی بەناوی ئاسایشی نەتەوەییەوە کارەکانیان مەحکوم بوو، دەبوو بەخێرایی بسڕێنەوەو لەناو بدرێن.

ئەوانە تەنها بۆ لاوازکردنی ورە، درێژەدان بەغەش‌و هەڵخەڵەتاندن لەکۆمارو لەکۆتایشدا ئاستەنگ نانەوە لەبەردەم حکومەت‌و بەڕێوەبردنی ڕاستەقینەی خودی کەسایەتی سەرکۆمارکاریان دەکرد.

ڕێزو خۆشەویستیەکی زۆرم بۆ سەرکۆمار (پەمپیدۆ) هەبوو. جۆرە ڕێزێك کە لەوباوەڕەدام لەساتەوەختێکی کەپەیمانی دابوو لەسەدا سەد پشتگیرو پەنام بێت، بەشێوەیەکی دوولایەنە هاتبووە ئاراوە. بڕیار بوو من بەرپرسیارێتی ئەو هەنگاوانە بگرمە ئەستۆ کە لەڕووی سیاسییەوە بۆ ئەو دژوارترین کاربوو. بەمپێیەپێش دەستپێکردن‌و پێش ئەوەی کە- بەچاوپۆشی کردن لەمەترسیە بەهێزەکەی- مێشکم بەومەسەلە نائاسایی‌و دژوارەوە جەنجاڵ بکەم، بەدووی گرنتییەکی کۆتاییەوە بووم کەبەتەواوی پشتیوانیم لێبکات. ئێمە بەپێی شێوازی پیادەکراو ڕۆژەکانی یەکەم‌و زۆربەی ڕۆژانی دوای ئەویش، لە ئۆفیسە تایبەتەکەی لە کۆشکی ئالیزێ یەکترمان بینی. دیکۆرەکانی ئەوێ زۆرجوان ڕازاوەبوو. ئەوێ کۆشکێکی گونجاوی بۆنەی جەژنەکان بوو. دیوارەکانی بەئاڵتون ڕووکەش کرابوو. سەربانەکەی بیست فووت بەرزی هەبوو شووشەی پەنجەرەکانی کە لەزەمینی ژوورەکەوە تابنمیچەکان درێژ ببوونەوە وەك دەریایەکی ڕووبەبا لەکۆنێك کە لەئاسن دروستکرابوون دەکرانەوە کە ئەوەندە فراوان دەردەکەوتن دەتگوت باخچەیەکی ڕازاوەیە.

هەرچەندە کەمێك لەپاش نیوەڕۆ تێپەڕی بوو، بەڵام کات تاریکی کردبوو؛ چونکە شەوی زستانی پاریس زووتر دادێت تاواشنتن‌و نیۆرك .

کاتێك لەسەرکورسییە خۆشەکەی لویسی چواردەیەم کەدروست ڕووبەڕووی مێزەکەی سەرکۆماربوو دانیشتم، سێ گڵۆپی بەرزی بچوك، کەلەسەر مێزەکەی لەئاڵتون‌و داری ماهون دروستکرابوو، داگیرسابوون.

من وتم: (بەڕێز سەرکۆمار، ئێوە دەزانن کە کاتێك ئەم کارەم قبوول کرد بەڵێنت دا کە لەسەدا سەد بڕوات لەسەرم بێت.)

بەسادەیی وەلامی دایەوە: (بەڵێ)

درێژەم پێدا: (دەبێت لەبەکارهێنان یان دەرکردنی ئەوانەی کەهەڵیاندەبژێرم دەستم کراوەبێت.)

دووبارە وەلامی دایەوە: (بەڵێ)

بابەتەکە کۆتایی هات. ئینجا دەربارەی ڕووداوەکانی لەدوو ڕۆژی یەکەمی دەستبەکاربوونمەوە ڕوویاندابوو، قسەمان کرد. ئەو خۆشحاڵ بوو کەمن پاکسازی (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکیو سیخوڕی)م بەوخێراییە دەستپێکردووە. لەوشتانەدا کورتەیەکی زانیاری دەربارەی هەلومەرجی ویلایەتە یەکگرتووەکان کەبڕیاربوو سەردانی بکاتو باری (لیونید برجنیف) کە بەتازەیی لەمەترسی ڕزگاری ببوو، پێویست بوو.

ئێمە بەکورتی سەبارەت بەهەردوو بابەتەکە گفتوگۆمان کردو بەڵێنم پێدا پاش گفتوگۆکردنم لەگەڵ پسپۆڕەکانمان لەبەشی لێکۆڵینەوەو ڕاڤەکاری، هەواڵی وردتری بۆ ڕەوانە بکەم.

بەلایەنی کەمەوە لەم بارەیەوە، دەزگای زانیاری فەرەنسا بەهۆی بوونی پسپۆڕانەوە توانستی خۆی لەدەست نەداوە. ئێمە هەستاینو ئەو تا بەردەرگا منی ڕەوانە کرد. پاشان بەدڵ لەباوەشی گرتمو پێکەنی. ئێستا دەمزانی کەبڕوای تەواوی پێمە.هەرگیز لەدەستی نادەمو بەهیچ شێوەیەك بەخراپە بەکاری ناهێنم. بەوجۆرە کاتێك زانیم سەرۆکی وڵات پشتیوانی منە، پەلەم کرد تا ئامانجەکانم بەخێراییەکی هەرچی زووترە پراکتیك بکەم.

یەکەم هەنگاوم، بەئاڕاستەی سەرۆك وەزیران (ژاك شابان دلماس) بوو، کە گەرچی وەك مرۆڤ ڕێزم بۆی دادەنا، بەلام کەسەرنجم لەکارەکانی دەدا، ئەوم بەهێرشکارێکی سیاسی لەفەرەنسا دەبینیو زۆرلێی بەگومان بووم.

لەکۆشکی سەرۆك وەزیرانی فەڕەنسا، کەئۆفیس و شوێن نیشتەجێی لەوێبوون و، پلیکانەی پێشوازی کە لەشوێنی چوونە ژوورەوەی میلەکانەوە لەسەر شێوەی مارپێچ کێشرابوو، بەئاشکرا دیاربوو. ڕێڕەوە مەڕمەڕییەکان، کاتێك بۆ نهۆمی دووەمی بیناکە دەڕۆشتین، دەنگی هەنگاوەکانمانی دەدایەوە. لەوسەرەوە، جەنەڕاڵ (پی یربیلۆت)م بینی کە لەدوو دەرگا گەورەو بەرزەکەی سەرۆك وەزیرانەوە دەهاتە دەرەوە.

(بیلۆت) جارێك بۆماوەیەکی کورت وەزیری بەرگری بوو، کە بەسادەیی بەڵام زۆرخراپ بوو بەملیۆنێر، بەبێ ئەوەی کە سایەتیەکی هەبێت. بۆ قسە دەرپەڕاندنێك وەستاوڕووبەڕووم بۆوە؛ چونکە کەسێکی هەیکەل درشت بوو لەگەڵ مندا شان بەشان وەستا.

لەتوڕەیدا تەقییەوەو وتی: (دانانی تۆکارێکی قێزەونە.ئەم کارە بەتەواوی مافی منە.)

خەندەیەکی ساردم کردو بەئارامی لەدەربڕینی نەجابەتی سوپاسم کردو بەخۆمم وت؛ هەمیشە ئاوێتەکردنی سیاسەتەکانی ناوخۆو کاری جاسوسی چەند مەترسیدارەو ئەو چەندین هاتوهاوارە لاوەکیانە چەند کاریگەرن لەشێرین کردنی کارەکانم لەدەزگای زانیاریدا. خەیاڵە ڕووتەکانم بەگەڕانەوەی ڕێنیشاندەرەکەوە کە ڕاستەوخۆ بەرەو ئۆفیسی بەڕێز (شابان دلماس) بردمی، پوچەڵ بۆوە.

ئۆفیسەکەی ئەمیش وەك ئۆفیسی سەرکۆمار زۆر جوان ڕازاوە بوو و دیمەنێکی بەرەوڕووی باخچەکی قەشەنگی هەبوو. پێشتر بینا فەرمییەکانی فەڕەنسا لەسەرەتادا هوتێلی تایبەتی یان خانووی دەرەوەی شاربوون کەتایبەت بوون بەخەڵکی بەرجەستەی چینە باڵاکانی فەڕەنسا . ئەوانە ناوچەیەکی ئاوداربوون و بۆ دووربوون لەسەنتەرو ئاپۆرەی پایتەختی فەڕەنسا دروستکرابوون. ئەمڕۆ هەندێك لەوانە لەنێوان سیاسەتمەدارو دیبلۆماسە جیاوازەکاندا وەك بەهەشت وابوو.

سەرۆك وەزیران هەستاو بەخەندەوە دەستی گوشیمو ئەحوالپرسی لێم کرد.

ئەو وتی: (هاوڕێی ئازیز، ئێمەهەردووکمان خەباتگێڕی دێرینی بزوتنەوەی بەرگرین. شەرمەزارم کە بۆ ئەم کارە بیری تۆم نەبوو. سەرکۆمار بەهەلبژاردنی تۆ کارێکی نائاسایی کرد.) بەردەوام بوو: (باشترین هیوات بۆ دەخوازمو بەتەواوی جێگای بڕوای منی. هەرکاتێك حەزت کرد وەرە دیدەنیمو ژوورەکەم شەوو ڕۆژ لەڕووتدا کراوەیەو هێڵی تەلەفونەکەشم هەمیشە بۆ تۆ ئازادە.)

کەمێ وەستاو چاوێکی بەمێزەکەیدا خشاند. پاشان بەردەوام بوو: (دەزانیت؟ ئێمە دەتوانین پێکەوە کاربکەین. ئەمە ژمارەی تەلەفونە نهێنیەکەمە، بەتەواوی لەخزمەتی تۆدا دەبم.)

گفتوگۆکانمان لەبابەتی دووبارە بیناکردنەوەی (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکیو دژە سیخوڕی) دەسوڕاو بیروڕا کانم خستەڕوو، وتم گەر دەتەوێت کارەکە بەئەنجام بگات، دەزگای زانیاری فەڕەنسا لەپێگەیەکی بەسوودو وەك ئامێرێکی دەوڵەتی بمێنێتەوە، پێویستمان بە (خێرایی)و (لێوەشاوەیی) هەیە. هەروەها سەبارەت بەکوانی قەیرانی دژوارتر لەجیهاندا ئاڵوگۆڕی بیروڕمان کرد. چونکە خوومان بەنهێنیکارییە وەگرتبوو، ئەو ماوەیەك بێدەنگ بوو. پرسیارم لێکرد کە ئایا قسەی تری هەیە. ئەو وەڵامی دایەوە: (پێویست ناکات کە من دەربارەی پرسە نێودەوڵەتیەکان شتێك بەتۆ بڵێم. زیاتری ژیانتان مامەڵەکردن بووە لەگەڵ ئەو مەسەلانەدا. من دەتوانم چ ئامۆژگارییەکت بکەم؟ باشە کەسێك هەیە.. کەسێکە لەوانەیە بیناسیت.. کەسێکە کەمن یەکجار بۆ ماوەیەکی کەم بینیومە. ئەو دەربارەی ئەم جۆرە بابەتانە شێوازی زۆر دیاریکراوی هەیە. دەربارەی جەنەڕاڵ (بیلۆت) قسە دەکەم. بوارم ڕەخساند تا بەسەر دواڕستەیدا تێپەڕێت. پاشان بەخەندەیەکەوە وتم: (بەڕێز سەرۆك وەزیران، زۆر سوپاسو مەمنونی تۆم. بەڕێکەوت چەند دەقیقەیەك پاش ئەوەی لەئۆفیسەکەی تۆ هاتە دەرەوە،

بینیم.) ئەو بەئاشکرا ڕەنگی سور هەڵگەڕاو تێکچوو. هەردووکمان پێکەنین‌و بابەتەکە گۆڕا. گفتوگۆکانمان زۆر کورت‌و زوو تەواو بوو. ئەگەرچی زۆربەی دامەزرێنەرانی (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکی‌و دژە سیخوڕی) لەوکەسانە بوون کە هەمیشە سەردانی ئۆفیسی سەرۆك وەزیرانیان دەکرد، بەڵام من بەهۆی ئەوەی ڕاستەوخۆ ڕاپۆرتم دەدایە سەرکۆمار، زیاتر هەستم بەدڵنیایی دەکرد. بەگشتی ئەوە (پەمپیدۆ)، (دیسکاردستن)و (میتران) بوون کەمنیان دامەزراند بوو. (هەڵبەتە ماوەیەکی کورت کارم لەگەڵ میتران کرد.) لەگەڵ ئەوەشدا، هەستم دەکرد کە سوود وەرگرتنێکی ورد لەپەیوەندییەکانی نێوان سیاسەتەکانی فەرەنساو (دەزگای جاسوسی) زۆر پێویستە. ئۆفیسی سەرۆك وەزیران لەدەزگای دیاریکردنی سیاسەتەکانی فەرەنسا دوورتر بوو تا ئۆفیسی سەرکۆمار؛ ئەو کەسێك بوو دەبوو بەڕاوێژکردن لەگەڵ نوێنەرەکەی ـ من ـ لەلێکۆڵینەوە لەبارەی جەنگ‌و ئاشتی، دیبلۆماسی‌و ستراتیژی کەڕاستەوخۆو بەشێوەیەکی یاسایی پەیوەستە بەکاری جاسوسی لەدەرەوەی فەرەنسا، دیدێکی جیهانی فراوانتر پەیدا بکات.

بەدرێژایی مێژوو، بۆ سەرکردەی وڵاتێك، بەکارهێنانی دەزگا جاسوسیە نهێنییەکان بۆ ڕاپەڕاندنی چالاکیەکی دیاریکراو کە پەیوەستە بەسیاسەتە ناوخۆیەکانەوە هەمیشە جێگای ڕاڕایی بووە. هەرچەندە دەستەڵاتی بەهێزترین پادشاکانی پیادە بکردایە، هیچ سەرکۆمارێك تا ئەودەمە داوای لێنەکردبووم کارێکی لەوجۆرە ئەنجام بدەم. زۆربەی کەسەکان بێتاوان نەبوون کەمن دەمویست لە(دەزگای دژەسیخوڕی) پاکسازییان تێدا بکەم: ئەوانەش بەهۆی ئاسوودەبوون‌و ڕەخنەگرتن لەسیاسەت مەدارانێکی کەساڵەها بەوردی پەروەردە کرابوون‌و لەلایەن کەسانی پایە بڵندەوە دەست لەپشتیان دەدرا. لەڕاستیدا ئەم کارە باجی سیستمێك بوو کە بەردەوام بەڕێوەبەری گشتی دەگۆڕی‌و، ئەم نەرمە تا چوونی من تایبەتمەندییەکی خوخراپ‌و بەردەوامی (دەزگای دژە سیخوڕی) بوو.

بەدەگمەن بەڕێوەبەرێکی گشتی هەبوو کە توانای سیاسی یان تەمەنی پێویست بۆ بەدەستهێنانی ئەو جۆرەپسپۆڕییەی هەبێت. بەپێچەوانەوە، فەرمانبەرانێکی کەپەیوەندیان لەگەڵ سیاسەتمەدارە دەستڕۆیشتووەکاندا هەبوو، کۆنترۆڵی هەموو (دەزگای دژە سیخوڕی) یان کردبوو. یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی کەمن لەیەکەمین ڕۆژەکانی دەست بەکاربوونمەوە هەستم پێیکرد، ئەمە بوو کە ئەوانە سەرەڕای زرنگی، بیرتیژیو بەهۆشو فێڵاوی، (نیوەزرنگی کەئیتاڵیەکان پێی دەڵێن (فوربیس می)و حاڵەتێکی تاڕادەیەك تایبەتە لەو شوێنانەی کەزەمینەسازی (پلانگێڕی) نهێنیو سیاسی بۆمەبەستی بەرزبوونەوە ئەنجام درابێت)، زۆربەی جارو بەشێوەیەکی گشتی بێفرۆفێڵو ئەوەندە ساویلکەبوون کە هەرچییەکت یبخواستایە، ئەنجامیان دەدا. چەندین جار ئەوەڕویدەدا کە ئەوکارانەی لێیان دەخوازرا، تایبەت بووبەسوودی دۆستێك یان کاروبارێکی تایبەت بوو.

هەموو جارێکیش مەبەستی سەرەکی، (دراو)بوو. بەتایبەت بۆکەسانێکی کەئاشنای دەستەڵات ببوونو، حەزیان دەکرد دەوڵەمەندیش بن.

هەروەها ئامانجیشم ئەوکەسانەش بوو لەدەرەوەو ناوەوەی (دەزگای دژە سیخوڕی) هەوڵیان دەداحکومەت تەنها لەخزمەتی ئەواندا بێت.

ئەگەر (دەزگایەکی جاسوسی)، بگۆڕێت بۆهێزێکی پۆلیسی سیاسی، کاتێك دەستەڵاتی سەرکۆماری لەپارتێکەوە دەگوێزرێتەوە بۆلای پارتێکی دی، ڕابەری دوایی لەناوی دەبات. ئەفسەرێکی زانیاری، پۆلیس نییە. پۆلیس هەوڵدەدات تاوانیار بکوژێت یان دەستگیری بکات، نازانم، بەلام من دەمەوێت سەیری بکەم وبزانم بۆکوێ دەچێت؟ ئەگەر ئەو لەناو بچێت لەوانەیە تاوانێکی دی ڕووبدات. بەکورتی، بۆمن پێنج ساڵ درێژە دەکێشێت تادەیدۆزمەوە. بەمجۆرە، دڵنیام لەگەڵ ئەو هەموو چاودێرییانەی کەتیایدا هەوڵمدا (دەزگای دژە سیخوڕی) لەدەستەڵاتی سیاسییەکانی فەڕەنسا پارێزراو بێت، نەك تەنها هەندێ لەوبەڕێوەبەرانەی کەپێش من لەسەکاربوون، بەڵکو هەندێك لەوانەشی کەپاش من هاتن، ورد نەبوون– لەڕاستیدا خرانە

ژێرفشاری گەورەوە– تابەسوود وەرگرتن لە (دەزگای دژەسیخوڕی) دەستکەوت بۆخۆیان و هاوەڵەکانیان دەستەبەر بکەن.

هەندێك لەوپسپۆڕانەی کەمن ڕووبەڕووی دەبوومەوە، لاف ئەوەیان لێدەدا کەلەلایەن جێنشینە جوداکانی پێش منەوە دامەزرێنراون و پەیوەندی نزیکیان بەکەسانی پایەبەرزی سیاسی و هەروەها بەنوێنەرانی پارتەسیاسییەکانەوە هەیە کەڕۆڵی زۆر سەرەکیان گێڕاوە؛ ئامانجی کۆتایشیان بەکارهێنانی دەستەڵاتێك بووکەدەیتوانی لەمامەڵەی بازرگانیە تایبەتیەکانیاندا، بەتایبەتی لەگەڵ بلۆکی خۆرهەڵاتدا زۆرسوودبەخش بێت. ئەم تاکانەکەمن ناوم نابوون (بازرگانانی موشەکی)، زۆربەی جار لەناوخۆیانداو لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی و کۆلۆنیالەکان ئەو جۆرە مامەڵە پڕ سوودانەیان هەبوو. یەکێك لەکارگوزاران یان فەرمانبەرانی بێ پلەی ئەوان لەئۆفیسەکەمدا لەنێوان ئەوەی کەدەیویست ڕۆڵی خۆی لەهەردوولادا– واتە لایەنی ئێمەو لایەنی ئەوان– بپارێزێت، ڕوونی کردەوەکە: (پێویستە کۆمەکی زیاتری پێشکەوتنی ڕووسەکان بکەین. برجنیف بەخێرایی بەرەو ڕیفۆرمی ئازادیخوازانەی زۆرگرنگ هەنگاودەنێت.)

بۆنمونە لەتەوای کۆپلەکانی خەباتی دژ بەجاسوسیەت یان خەباتێك بەڕەوشێکی تایبەتی هەمان کات، زۆربەی جارو چەندبارە دەمبیست کە: (گورباچۆف) هەمان ڕێگای (تنگ چیائوپینگ)ی گرتووە.

بەمپێیە، دەستم کرد بەجوڵاندنی کەسانێکی کەلەحاڵەتی کۆشش و لەناوبردنی(دەزگای دژە سیخوڕی)دا بوون. ئەوەی من چۆن کێشەکانم بەڕێوە دەبرد، لەدووڕستەدا کورت دەبێتەوە (هەرچەندە لەڕستەی کورت و پوختدا شارەزاییم نییە)، کە ئەوانە لەڕۆژەکانی پاکسازی و پڕ دەسیسەو ئێستاش کاریگەرییان هەیە. زۆربەی جار بەژێر دەستەکانم، چ سوپایی و چ مەدەنیەکان، دەمووت: (بەڕێزان، ئەوەندە باش بن بەبالای کارتی ناسنامەکەتان بەلام نەك لەگەڵ ئەوانەی کەحەز دەکات لەجێگای ئەوان بێت. بەمن چۆنیەتی ئەنجامدانی کار بڵێ، نەك ئەوەی بەڵگەکانی لاوازیمانم بۆ بژمێریت.)

ئەوانــەی کەپــەیڕەوی ئــەم دوو فرمانــەیان کــرد، بــەدرێژایی مــاوەی سەرۆکایەتی من لە (دەزگای دژە سیخوڕی فەڕەنسا) زۆرباش کاریـان کـرد. ئەوان بڕوایان بەمن هەبوو منیـش بەتەنها بڕیـارمدەدا کێ سـەرکەوتووەوکێ سەرکەوتوو نییە. زۆر بـەیجار بەتەنها بڕیـارە گرفتـاویو کۆتاییـەکانم دەدا، کەهەندێجار پەیوەستبوون بەبابەتی مـەرگو ژیانمـەوە. بـەلام هەمیشـەچاوم بڕیبـووە ئامـانجێکی کۆتـــایی کەئــەویش (شــانازیو غــروری دەزگــای دژە سیخوڕی) بوو. مـن زوو ئـەوە تێگەیشتم کەپۆسـتی سـەرۆکایەتی (دەزگـای دژەسیخوڕی) یەکێك لەوکارانەیە کە کەسـەکە تیـایدا دەبێتـە تەنهـاترین تـاك لەجیهاندا. ئەو هیچ هاوکارێکی نزیکی نییە. بڕیاری کۆتایی لای ئەوە. ئەگـەر ئـەنجام پەسـندکراو بێـت، سیاسـەتمەدارەکان دەبنــە خــاوەنی شــانازیو ئەگەرکارەکان بەرەو خراپی شکایەوە، ئەو تاڵترین بەرهـەمی بەردەکـەوێت. لەلایـەکی دییـەوە، ئـەم هەلومەرجـە بـۆ هـەمووە، مەگـەر ئەوانـەی خـاوەن دەستەلاتی بێسنوورو ڕەهایان هەیە.

کاتێك ئێوە حەزتان بەدراوی سـاختەو دەسـتکەوتی تایبـەتو زۆرو سـوود وەرگرتن لێیان بێت، ئیتر تووشی شـۆك بوویـت. هـەندێ هۆکـاری بەربەسـت لەبەردەمتدا هەیە تا هـەندێ لەسیاسـەتمەداران یـان تەنانـەت سـەرکۆماریش بـەلاوە نـەنێیت، چونکـە زۆربـەی کـات لەوتــەکانی ڕەزامــەند نیـت. تەنـها دیسپلینی پۆلایینی خودی کە پێویستەو ئەبێت لـەم کـارە سەرسـوڕهێنەرەدا هـەتان بێـت دەتوانێـت ببێتـە بەربەسـت لەبـەردەم سـەرۆکی دەزگـای دژە سیخوڕی بۆئەوەی خراپ دەستەلاتەکەی بەکارنەهێنێت.

مـن تەنـها لەیـەك کەسـەوە فــەرمانم وەردەگـرتو ئـەویش سـەرکۆماری فەڕەنسابوو. ئەمەش لەبەر ئـەوەی کـەدوا بەرپرسیارێتی دەکەوتـە ئەسـتۆ. ئـەو بڕیـار دەداتو تـۆ ڕەزامــەندبیت یـان نـا، بەدڵسـۆزییەوە بەئــەنجامی دەگەیەنیت.

لەوانەیە سەرکۆنەی بکەیتو هەوڵبدەیت بەئاڕاستەیەکی تردا بیبەیت بەلام گەر ئەو ڕازی نەبوو، تۆ بەوردیو زۆر بەسادەییەوە، فەرمانـەکانی جێبـەجێ

دەکەیت. ئەمە ئەو دەسەڵاتەیە کەڕووداوەکانی جیهان بەرەو پێشەوە دەبات. ڕووداوێکی کە بەپەنجەکانی ئەو کە لەسەرپەلەپیتکەی چەکی ئەتۆمییە، ئاڕاستە دەکرێن. هەمان دەسەڵات لەناو (دەزگای دژە سیخوڕی فەڕەنسا)شدا لەلایەن سەرکۆمارەوە بەکاردەهێنرێت. دەسەڵاتێکی کەپێشتر ئاشکرا بوو لەبەرامبەر خواستی دوژمنانمان لەناو جەنگی چوارەمی جیهانیدا کەلەباری ئێستادا لەگەڵیدا ڕووبەڕووین، پێویستو مایەی ژیانە. تایبەتییەکی تریش هەیە کەپێویستە بەڕێوەبەری (دەزگای دژە سیخوڕی) لەکەسانی دی جیا بکاتەوە.

دەبێت نهێنیترین کەس بێت. نابێت دەستەڵاتخوازی سیاسی یان هیچ جۆرە دەستەڵاتخوازییەکی دی کۆمەڵایەتی بێت. من هەرگیز لەگەڵ بڵاوکراوەکاندا گفتوگۆم نەبووە. لەهەردوو سەرکۆمارم خواست کەدڵسۆزانە لەگەڵیاندا خزمەتم کرد، کە لەهەموو بەئەنجامگەیاندنی بۆنەیەکی فەرمی بمبوورن.

بۆنەکانی لەجۆری میواندارییە پڕشکۆکانی کۆشکی ئەلیزێ، میوانداری ئەو پارتانەی سەرکۆماریان هەڵدەبژارد، شوێنە تایبەتەکانی دانیشتن لەئۆپێراکان، خۆش ڕابواردنە ئاساییەکانی کەکارمەندە پلە بەرزەکانی دەوڵەت قەدری دەزانن.

بۆ سەرۆکی (دەزگای دژە سیخوڕی) ئەم کارانە، دەردیسەرییە، وزەو کاتی زۆری لێدەگرێت. لەگەڵ ئەوشدا، ئەم پەیوەندییانە لەوانەی تووشی ئاڵۆزترین ڕووبەڕوو بوونەوەی بکات یان ناچار بەخۆبەدەستەوەدانی لەبەرامبەر کەسانی دیدا بکات. هەڵبەتە ئاوارتەش بوونی هەیە. بۆنمونەجارێك لەمیوانداریيەکی تایبەتی ئێوارە خوانێکی کۆشکی ئەلیزێو جارێکیش لەکۆشکی (ڤێرسای) ئامادە بووم. ئەوەش لەکاتی چاوپێکەوتن لەگەڵ سەرۆکی دەوڵەتێکی دەرەکی بوو کە پەیوەندییەکی کەسێتیو درێژم لەگەڵیدا هەبوو، ئەو لەگۆشەگیرییەکەی من زۆر ڕەنجابوو. بەپێی ئەم مەرجە بنەڕەتیانەی کە بەتەواوی لەمێشکمدا چەسپیبوون، دەستم بەچوونەناو ئەو

دەزگـا ئـاڵۆزەكرد. كۆششـم دەكـرد بـەجۆرێك فۆرمگـیری بكـەم كـە لەكۆكردنـەوەی زانیـاریو چـالاكیدا كەدەوڵـەتی فەڕەنسـا پێویسـتی بەچاووگوێو مشتی بەهێزی خۆی لـەدەرەوەی وڵات هەیە، لـەجۆری دەزگا پلەیەكەكان بێت.

(دەزگای زانیاریو نهێنی فەڕەنسا) بەتەواوی وەك پێكهاتەیـەكی هونـەری گەورە فۆرمگیری كرابـوو ئێستاش لەسـەر هـەمان شێوەیە. لـەم دەزگایـەدا بەشەكانی داراییو ئیداریو لێكۆڵینەوەش هەیە. هەڵبەتە بەشی تریشی هەیە كە هیـچ هونـەرێك تـا ئێستا لەوێنـەی ئـەوەی نییـە، وەك بەشـی زانیـاری، پەیوەندییەكان، دژە سیخوڕیو ئۆپراسیۆن.

كارمەندەكان، بەسەرپێرسناڵی سـەربازیو مـەدەنیدا دابەشبوون. هـەموو كارمەندە ئاساییەكانی وڵاتیش وەك هـەموو پێرسناڵەكانی لەحاڵـەتی ڕاژەی وڵاتـدا بـوون، هـەمان پلـەیان هـەبوو. لـەم ڕووەوە لەگـەڵ بیرۆكراتـەكانی وەزارەتـەكانی كشـتوكاڵی یـان كاروبـاری دەرەوەیـان ئیـدارەی پۆسـت جیاوازییان نەبوو. پێرسناڵە سەربازییەكان بەزۆری بەشـی سـەرەكی ژیانیـان لەناو (دەزگـای زانیـاری نـهێنی) بەپشـتیوانی پسـپۆڕان لـەوێ بەسـەردەبرد. بۆنمونە بۆ بابـەتی پرسـەكانی عـەرەبو موسڵمانەكان، بابـەتی نـەوت، یـان هۆزە بەدەوییەكان (بیابان نشین)ە كانەوە پسپۆڕ هەبوو.

جۆرێكـی تـری ئەفسـەرانی سـەربازیش هـەن كـە بۆماوەیـەكی كـەم تـا گەڕانەوە یان بۆ كارەئاساییەكانی خۆیان، بە(دەزگا) سـپێردراون. لـەوناوەدا ئەفسەرانی یەدەگیش لەلایەن (دەزگا)وە بـەكار دەخـران كـە بـەپێی توانـای ئاسایی ناسەربازییان تاڕادەیەك لەهەركارێك یان هـەروڵاتێكدا دەخرانە گەڕ. بەوانـەو بەكارمـەندەكانی تـری زانیـاری زۆرجـار دەوتـرا (جاسوسـانی ئیفتخاری). ئەوانە شەقڵی دەزگای (جاسوسـی نـهێنی) یـان تـەواو دەكـرد. ئەوانە دواخاڵو نزیكترین بۆشاییەكانی هێڵـی سنووریمانیان پڕدەكردەوە. ئەوانە لەوانەیە بەدرێژایی ماوەی كاری جاسوسیو زانیاری بۆ چەندین سـاڵ لەپشوودابن، یان هیچ سـوودێكیان لێوەرنـەگیرێت، بـەڵام ئەگـەری ئـەوەش

هەیە لەپرێکدا ببنە ناودارترین ئەندامانی شەوانەی (دەزگای زانیاری).
لەوانەیە تۆ کەسێك پەیدا بکەیت کەشۆفێری تاکسی یان کەسێکی گرنگی دی بێت، بۆنمونە لە کڵێسایەکا یان تەنانەت یەکێك لەوەزیرانی دەوڵەتی بێت.

بۆ هەندێکیان لەبەرامبەرکارەکانیاندا برێکی زۆر دراویان دەدرایە، بەلاّم زۆر بەفەرمانەکانیان بەهۆی خۆشەویستی نیشتمان، بەدڵسۆزییەوە تەنها بۆ شانازیکردن ئەنجامدەدەن. ئەوانە پیاوان‌و ژنانی فەڕەنساین کە لەچوونەناو هەستیارترین ناوچەو ئەو شوێنانەی کەبتوانن شتێکی بەسوود بۆ وڵاتەکەیان ببینن‌و ببیستن، ئازایەتیەك دەکەن کەمەترسییەکانی لەکێشدا نییە.

نالێم ئێمەی فەڕەنسی لەم کارانەدا یان دەربارەی بەکارخستنی ئەوکەسانە بالاّدەستین. هەموو وڵاتێك ئەوچالاکیانە ئەنجام دەدات. ئەمریکیەکان لەبوردی زۆر دوورتر لەوەی ئێمە زانیارییەکانی خۆیان کۆدەکەنەوە. سەرچاوەکانیان چ مرۆڤ‌و چ دارایی، لەبەرامبەر ئێمەدا زۆر زیاترن. دراوسێ سویسرییەکانمان کەهەوڵ دەدەن بێلایەنی خۆیان بپارێزن، لەڕووی ئیرەییەوە تۆڕێکی زۆر فراوانیان پێکهێناوە. لەبەرامبەر هەرتاکێکی سویسریدا نیمچە نیزامیەك هەیە. ئەوان دەتوانن ئەفسەرانی سوپای یەدەگی کەگەشتی زۆریان لەبەردەمدایە بەمەبەستی کاری ئالۆزو نهێنی‌و مەسەلەی دارایی-کە لەتایبەتمەندیەکانی وڵاتی سویسرایە- ئامادەبکەن. ئەوان توانستی پاراستنی دەزگای جاسوسی (برن)، یان هەرشوێنێکی تری سەرەکی لەکاروباری سویسرا کەبەباشی بزانن بیپارێزن هەیەو، زۆر لێهاتوون.

لەمبارەیەوە، هەموو دەزگا زانیاری-جاسوسیەکان، سەرچاوەی هاوبەشی زۆریان هەیە. ئەوانە هەموویان وەك یەك میوە گوشی پەیکەر زەبەلاحن. کەزانیارییە دەستکەوتووەکان دەرژێنرێتە ناوییەوە. ڕۆژانە سەدەهاو هەزارەها زانیاری دەخرانێنە ناو ئەم دەزگا گوشەرە گەورەیە تەنها هەندێکی نەبێت کەبابەتی سەرەکی‌و سەرنجڕاکێشە ئەوانی دی فڕێ دەدات. هەندێك

لەم زانیارییە دراوانە بەوردی شیتەڵ دەکرێتو مادەی ڕۆژانەی بۆ کۆشکی ئەلیزێی لێپێك دەهێنرێت. چاودێریکردنی تەواوی پرۆسەی کۆکردنەوەو دابەشکردنەوەی زانیاریی گەرچی وەك کارێکی گرنگ دەرناکەوێت، بەڵام بنەڕەتیترین بەشە. ئەم بەشە ناڕەحەتترینو قورسترین قۆناغەکانی کارەکەیە.

لێرەدا (جیمس بۆند) کار ناکات، بەڵام کارەکەش لەشارەزایی (متاهریس) کەمترنییە. هەندێك لەکارمەندەکانمان کەپێشتر لەچالاکی جۆراوجۆردا بەهۆی پەڕەشووتەوە لەپنتی کارەکانیاندا خۆیان هەڵداوەتە خوارەوە، بەهۆی فشاری تاقەت پڕوکێنی کاری جاسوسییەوە تووشی زۆر ناڕەحەتی هاتوون. کۆکردنەوەی زانیاری، پێویستی بەپسپۆڕێکە کە لەزۆربەی شتە بڕیار لێدراوەکانو نهێنی ترینیان لەهەرگۆشەو کەنارێکی ئەم سەرزەمینەدا توانای لەباری هەبێت. ئەوانە بێریی تایبەتی سوپاییان نییە، بەڵام چەکدارن بەتوانستی بەدەستهێنانی زانیاری فراوان لەبچوکترین زانیاری لەناو کتێبەکان، بڵاوکراوەکان، ڕادیۆو دەقی ڕاپۆرتەکاندا. لەگەڵ ئەوەشدا، دەبێت لەجیاکاری مەبەستی سەرەکیو بینینی واقیعیو جدی لەساختەو پڕوپاگەندەو بلۆف شارەزاییان هەبێت. بۆنمونە لەنێوان کڵاوچیانی نێودەوڵەتیدا، ژمارەیەکی زۆر لەکەسانی خاوەن زانیاریو پیشە هەیە کە بەرامبەر بەدراو ئامادەی گۆڕینەوەی زانیارییین. ئەوانە چ کەسانێکن کەلەژێر سێبەری ئەم پەیکەری زانیارییەدا لەچالاکیەکاندا بەشداری دەکەن؟

زۆرترینی ئەم خەڵکانە، کەسی ئازاو بەکرێگیراو و کڵاوچی کۆمەڵگای جاسوسین کەبەهۆی ڕووداوێکی بچوکەوە دوچاری دودڵیو نەخۆشی بوون- کەئەوە قووتی نەمردنیانە-و لەگۆشەو کەناری جیهانو لەسەر پاشماوەی خوانی کەسانی دی هەوڵ دەدەن نانبخۆنو نیوەڕۆژە دا بین بکەن. بەڵام هەندێکیش لەوانە لەمەیداندا وەك ئەستێرە دەدرەوشێتەوە. ئەوانە زانیارییەکیان لەبەردەستدایەکەیان بەدەستیانهێناوە یان لێزانانە دروستیان کردووەو مەبەستیانە بیفرۆشن. چۆن ئەم زانیارییانە بەدەست دێت؟

دەتوانرێت بوترێت هەندێك جار بەهۆی کاری دروستو هوشیارانەوە کە بەهۆی کەسانی بەکرێگیراوەوە ئەنجام دەدرێت. زۆربەی جار بەهۆی چاوپێکەوتنەوە، سفرە خوانیەکانی ئێواران، بڵاوکراوەی دەرەکی کە لەگەڵ کەمێك ڕاڤەو تۆزقاڵێك سەلیقەی کەسایەتیان کەدەبێتە مەزەی مەسەلەکە، بەدەست دێت. پرۆفیشناڵەکان پێش ئەوەی کەدراو بەکەسێك بدەن، خۆیان بیردەکەنەوە کەئایا ئەم زانیارییە بەهای چەندە؟. لەگەڵ ئەوەشدا، لەتوانایاندایە بەبڕوا بەخۆبوونەوە بڵێن:

(ئەوشتەی کەتۆ بۆمنت پەیداکردووە، بێ بەهایە)، یان (لەڕاستیدا ئێمە پێشتر زانیاریمان لەوبارەیەوە هەبووە.)

من جارێکیان لەگەڵ کەسێکی چەند سەرەلەکارەکەیدا ڕووبەڕوو بوومەوە کەچەندین ساڵ پێش دامەزراندنم وەك بەڕێوەبەری گشتی (دەزگای دژە سیخوڕی) کەموزۆر بەهۆی زانیاری ساختەوە خۆی دەژیان. ناوە نهێنیەکەی (کاردینال) بوو، کە لەدواییدا بەهۆی بواری کارەکەیەوە لە(فڕۆکەی دیاریکار) یان (بۆندار)دا – فڕۆکەی نائاسایین کە لەحاڵەتی فڕین بەسەر زەویدا دەتوانێت بوونی دەبۆی نەوت دیاری بکات یان لەڕاستیدا بۆنی بکات– ناوبانگی پەیدا کردبوو. دەوڵەتی فەڕەنسا ملیۆنان دۆلاری خەرجکرد تا لەدواییدا زانی بۆتە قوربانی هەڵخەڵەتاندنێکی گەورە. بەڵام بۆ من لەهەمان ئەوکاتەی کە زانیارییەکانی کاردینالم بینی، بابەتەکە ڕۆشن بوو. چونکە دەمزانی کەکاردینال بەهۆی کۆمەکی ناودارێکی بەلجیکییەوە کەپیاو چاكو دڵ ساف بوو، کاری دەکردو ئەم پەیوندییە وەك شتێکی زیاد لەمتمانەیەکی قووڵ دەردەکەوت.

ئەو شتانەی کە کاردینال لەڕاپۆرتە زانیارییەکانی خۆیدا بۆ خاتری دراو ئاشکرای دەکرد، لەگەڵ پێودانگی پێدانی دراو لەزالگەی پشکنینو چەندین ڕۆژنامەی ڕۆژانەی کە بۆئەو مەبەستە دابین دەکراو چاوەڕوانی لێدەکرا، یەکانگیر نەدەبوو؛ لەسەرەمان ڕیتم هەندێکجار چەند پسوڵەی داواکاری گرانی دەنارد تا لەلایەن (دەزگای دژە سیخوڕی)یەوە بدرێت. من لەماوەی هەمان چەند ڕۆژی یەکەمی چوونمدا، یارییەکانی کاردینالم بۆدەرکەوتو

بەیاریدەدەرە سەرەکیەکەی خۆم، کەئەو کاتە(دیدیە) بوو، فەرمانمدا کەخۆی دەری بکاتە دەرەوە. بەهۆی ئەوەی کەسێکی فەڕەنسیو لەسوپادا پلەدارێکی بەرجەستەبوو، (دیدیە) لەبەئەنجام گەیاندنی یەکەمین فرمانم دوودڵی کرد. بەمپێیە، (دیدیە) خەتای بوو کەکاتێك سەردەمی دەستکردن بەچالاکییەکە هات، تێزەکەم گۆڕیو دەستم کرد بەهەڵگێرانەوەی گشتی دەزگای جاسوسی. چالاکییەکی کەمن ناوم نابوو (چالاکی مشکیخورمایی–گیانەوەرێکی گۆشت خۆرەو مارڕاو دەکات). ئێمە بەبێ ئاگاداری پێشەکیو لەپڕێکدا دەستبەکار بووین، (دیدیە) کاتێك پێش هەمووشتێك ناوەنهێنییەکانم ئاشکرا کرد، وڕوسەراسیمە بوو. بۆ ڕوونکردنەوە وتم: (کاتێك مشکیخورماییەك دەچێتە ناو کۆمەڵێك کەروێشکە وە زارەترك دەبن، بەبێ ئاڕاستە بەشڵەژاوییەوە لەهەوڵی پەیداکردنی ڕێگای دەربازبوون بۆ دەرەوە دەبنو لەوکاتەدا تاکە کاری کەدەبێت بکرێت ئەمەیە کە نیشانە شکێنێکی لێوەشاوە بەتفەنگێکەوە بنێرێتە بەردەمی کونەکان تا ڕاوی کەروێشکەکان بکات.)

یەکەمین سەعاتەکان گرنگترین ساتەکان بوون. بەهەمان شێوەی کەچاوەڕوان دەکرا، کاتێك (دیدیە) لەناودەزگادا دەستبەکار بوو، بەتەواوی ئەم ڕووداوەی بەسەرداهات. ژمارەیەك لەکەروێشکە پەرێشانو پەرتبووەکان خۆیان گەیاندە ئۆفیسەکەی. من بەتەنیا لەژوورەکەم کەهاوژووریی بوو دانیشتبوومو بێسە برانە چاوەڕوان بووم تاکارەکانی تەواو بکات.

بەزووی ژووری یاریدە دەرەکەم پڕبوولەو لاشانەی کەبەدرۆوە خۆیان بەبێهۆش دەنواند. یەکێك لەوکەسانە کە لەڕووی دەستکەوتی تایبەتی (دەزگای دژە سیخوڕی)یەوە سامانێکی گەورەی کۆکردبۆوەو لەونێوانەشدا لەچاودێریکردنی ئەو سیاسەتمەدارانەی کە لەوانەبوو لەکۆتاییدا ببنە ڕاوێژکاری دەزگا بێئاگا نەبوو، بەپێی دەستووری ڕاستەوخۆی منو بەهۆی (دیدیە)وە وەدەرنرا. فرمانم بە (دیدیە) کرد: (بانگی بکەو پێی بڵێ کاری تەواو بووە.)

(دیدیە) ئەو پیاوەی بانگکردو هەواڵی دەرکردنەکەی بۆ خوێندەوە. ئەو کەسەربە ئاستە باڵاکان بوو توڕە بوو وتی: (تۆ دەزانیت کەمن کەسێکی زۆر گرنگم، مەبەستت ئەوەیە کە بەڕێوەبەری گشتی خۆی پێم ناڵێت کە دەرکراوم؟.)

بەهەمان شێوەی کە لەدەرگای نیوە کراوەی نێوان ژوورەکانمانەوە گوێم لێبوو، بیستم کە (دیدیە) بەئارامیو ئاگادارکردنەوەوە وتی: (بەڵێ، ئێوە بەختتان هەیە کەخۆی پێتان ناڵێت. چونکە لەو حاڵەتەدا بەپێی خودتان دەچنە ژوورەکەیەوەو بەدەستەبەرە دێیتە دەرەوە.)

من توندوتیژو ڕەق بووم، بەڵام بەویژدان بووم. کاتێك (دەزگا) دروست کاربکات، دەبێتە پێکهاتەیەکی جوان لەهەستی هونەریو دیسپلینی سەربازی.

بۆئەوەی ئەم دەزگایە لەجەنگی سێیەمی جیهانیدا – یان وردتر لەوە لەچوارەم – فەرمانەکانی ڕاپەڕێنێت، دەبێت هەست بەجیاوازییە لاوەکیەکانی مێشكو کۆمەڵگای دوژمن بکات. لەگەڵ ئەوەشدا، ئامادەبین تا لەناو بواری دووەمی ساتدا کە لەداهاتوودایە ئەو هەڕەشە سامناکەی کەڕووی لەئاسایشی نەتەوەیی ئێمە کردووە، پوچەڵ بکەینەوە. ئامانجی من لەچالاکی (مشکی خورمایی)درەو کردنی کەسانێك بوو کە لەدەرئەنجامی ئەم فەرمانەدا بێدەستەڵاتو بێ توانا بوون، هەروەها بووە هۆی گەیشتن بەپلەی بەرزی هەستیاریو دیسپلین لەنێوان فەرمانبەرانێکی کەئازایەتیو داهێنانی فکریان هەبوو. لەکاتێکدا شانبەشانی ئەم ئامانجانە جەختیشم لەسەر خاڵە جوانەکانی دیسپلین دەکردەوە. ڕۆژێکیان، بەتەواوی ماوەیەك دوای دەستپێکردنی چالاکی (مشکی خورمایی)، ئەفسەرێکی لاو بەهاوارکردنەوە لە دەرگای سەرکی ژوورەکەمەوە هاتە ژوورەوەو بەتاسەوە دەیووت کەماوەیەکە فەرامۆش کراوە. من بەهۆی بێ ئەدەبیو شکاندنی دیسپلین، دوو هەفتە زیندانیم کرد.

کارمەندانی (دەزگای دژە سیخوڕی) دەیانویست دەریچەیەکی تـر بۆ خزەمتکـردن لـەپاڵ کارەکانیـاندا دروسـت بکـەن. ڕۆژێـك کـەپاش نـانخواردنی نیوەڕۆ بـۆ سـەربازگەی (تـورڵ) دەگەڕامـەوە، پاسـەوانی دەرگـای سـەرەکی ئۆتۆمبیلەکـەمی ڕانـەگرت، چونکـە بەئاشـکرا ناسیبووی. بەشـۆفێرەکەم وت: (ئۆتۆمبیلەکـە ڕاگـرە). (سـتروین)ی ڕەنگ کلی بەدەنگێکی بەرزەوە ئیستۆپی گرتو وەسـتا. وتم: (کەسێك بنێرە بـەدوای فەرماندەکـەدا.) فـەرماندە گەیشـت کـە هـەموو گیـانی دەلـەرزی ، هاتـە نـاو ئۆتۆمبیلەکـەوەو دانیشـت. دیـاربوو کـەناوبانگم پێـش خـۆم گەیشـتبووە ئـەوێ. ڕوونمکـردەوە کـەچی بـووە. وتم: (سەربازەکەت فەرمانەکەی خۆی بەجێنە هێنا. ئەگەر جارێکی تـر شـتی وا ڕووبدات، تۆ دەردەکرێیت.)

هیـچ کـاتێك دیسـپلینم بـەخوارو خێچـی جێبـەجێ نـەکردووە. ئەگـەر ڕسـوایییەکی گـەورە لـە (دەزگـای دژە سـیخوڕی)دا ڕوویبدایـە، مـن بەرپرس دەبووم‌و گرنگ نەبوو کەهۆکارەکەشی چەند بچـوك بوایـە. مـن بـەتوندی پـەیڕەوی ئـەم یاسایەم دەکـرد کـە دەبێـت نـەزم‌و دیسـپلین لەسەرەوە بۆخوارەوە جێبەجێ بکرێت‌و ببێتە مایەی ئارامی.

دەزگا دەبێت وەك یەکەیـەکی سوپای بێت‌و هـەرتاکێك ناچاری خزمـەت کـردن لەویەکەیـەو وڵاتەکـەی بێت؛ پێـش ئـەوەی خزمـەت بـەخۆی، یـان هەرکەسێکی دی، ڕێکخراوو فەلسـەفەیەکی سیاسـی دی بکـات. بـەپێی ئەمـە ئەوەی کەڕوویدەدا جێگـای سەرسووڕمان نـەبوو، بۆیەپاکسـازی (دەزگـای دژە سـیخوڕی) کـەمن دەستپێشـخەریم تێدا کـرد، سـات‌و خـولی ناخۆشـی بەدوادا هات. کەسانێك هەبوون هەوڵیان دەدا مـن لـەناو ببـەن، چونکـە مـن لەهەوڵی دارنینی پلەکانیاندا بووم، لەڕوویەکیشەوە تا ڕادەیەك سـەرکەوتوو بوون. ئەو کێشەیەی بەناوی کێشـەی (دولویـت) ناسـراو سـەرنجی زۆریشـی بۆخۆی کێش کرد، ئەوەی کە بەتەوای ئاشکرا نەبوو، ئەمە بوو کەکێشـەی ناوبراو دەرئەنجامی ڕاستەوخۆی جموجوولەکانم بەچـەند ئاڕاستەیەکی نـاو

(دەزگای دژە سیخوڕی) بوو، کەبەدوای پاکسازیو هەوڵدان بۆ وەستاندنی جموجووڵەکان بەوجۆرە کەوتەوە. بەحوکمی عەقڵی سەلیم دەبوو خۆیان هەنگاوی لەوجۆرە نەنێن کەنەشیان نا. دەرئەنجام ئەم کارەبەشی خۆی درێژەی کێشاو دواکەوت ئیتر هیوایەك نەما کە ئەو ڕەگەزانە جموجوڵو هەوڵێك بدەن. لەیەکێك لەچاوپێکەوتنەکانم لەگەڵ هاوشانی ئینگلیزی خۆم،(سیرجان ئار) ئاگادار کرامەوە کەپێشنیارێك لەلایەن ئەوەوە لەئارادایە. ئێمە لەئۆفیسی (MI6) (دەزگای جاسوسیو نهێنی بەریتانیا) چاوپێکەوتنەکەمان کردبوو.

ئۆفیسەکەی پڕبوو لەوێنەی سەرۆکەکانی پێشووی (IS) (ئینتلە جنس سێرڤەیس)ی بەریتانیا کەزۆربەیان بەرگی مەدەنیان پۆشیبوو، تەنها چەند دانەیەکیان نەبێت یونۆفۆرمی سوپاییان لەبەردابوو کەلەپێش ئەواندا یونۆفۆرمی ڕەنگی هێزی دەریایی ڕەش بوو. ئەو بەئارامیو لەسەرخۆ دەستی بەقسەکردن کردو بەهەڵبژاردنی وشەو بەوردی، هزری بەرجەستەو ناوداری خۆی دەخستەڕوو. بەبێ خۆتێکدان، بەهەمان شێوەی ئنگلیزێکی خوێنساردو خاوەن پرنسیپو ئەدەب، ئاشکرای کرد کە: (لەئاماژەکانەوە وا دەردەکەوێت کەتۆ هەموو هەوڵی خۆت خستۆتە گەڕ بۆ پاکسازی یەکجارەکی دەزگای زانیاری نهێنی فەڕەنسا. سەیری دەرەوە بکە. لەوێدا هەنگاوی لەناودانی تۆ لەهاویشتندایە.)

وەڵامم دایەوە: (سوپاست دەکەم کەمنت ئاگادار کردەوە، (سیرجان). ئەو هەنگاوانە کێو چۆن مەیسەر دەکرێت؟) ئەو وتی: (دەبێت لەبەهاردا چاوەڕوانی بکەیت.) بەتەواوی بەوجۆرەی کەئەو باسی کردبوو، لەبەهاردا کێشەی (دولویت) دەستی پێکرد. سەرەتا بەمادەی بێهۆشکەر دەستی پێکردو بەتراژیدیایەکی تاڵ کۆتایی هات، بەڵام نەك لەلای خودی منەوە. لە پێنجەمی ئاپڕێلیساڵی ١٩٧١، بەیانی زوو لەلایەن ئەفسەری ئێشکگرەوە، تەلەفۆن بۆ ماڵەکەم کرا کەکۆنە ڕۆژنامەنووسێك بەناوی (ڕاجەر دولویت) کەبۆ تۆڕی ڕادیۆو تەلەفزیونی فەڕەنسا (کەپاشان بە– RTF A– ناسرا)

کاری دەکرد، لە بەندەری (ئەلیزابت) لە (نیوجەرسی) دەستگیرکراوە، ڕایگەیاندووەکە بەو ئۆتۆمبیلە بەهۆی قەیاغەوە لەفەڕەنساوە گەیەنراوەتە ئەوێ، نزیکەی (٤٤,٥) کیلۆگرام هیرۆینی بردووە. ئەوکەسە کارمەندی (دەزگای دژە سیخوڕی) فەڕەنسا نەبوو، بەلاّم پاش چەند هەفتە لێکۆڵینەوەی توندوتیژ، سەرئەنجام دانی بەتاوانەکەیدا نا بوو، بەپۆلیسی ئەمریکای ڕاگەیاندبوو کەبۆ ئەفسەرێکی (دەزگای دژە سیخوڕی) فەڕەنسا بەناوی (پۆڵ فورنیە) کاردەکات. ئەوکاتە (دولویت) بەڕەسمی گیراو زیندانی کرا. چەند ئەمریکیەك هەبوون کەهەولّیان دەدا سوودێکی باش لەم بابەتە وەرگرن. لەنێو ئەوانەدا لێکۆڵیارێکی گەنج بەناوی (هربرت. جی. ئیسترن) بوو کە لە (نوارگ)و (نیوجەرسی) کاریدەکرد. لەڕاستیدا کەئامانجی ئەوو ئامانجی دوژمنەکانم لەفەڕەنسا، ئەوەبوو کەزیرەکانە بمخەنە داوەوە. هەلّبەتە ئامانجیشیان (دەزگای دژە سیخوڕی) بوو کەبەسەرپەرشتی من کاریدە کرد، تالە کاری مادەی بێهۆشیو کرداره تایبەتە دارا ییەکانیو. ئەو چالاکیە توندوتیژو فێلاّویانەوە بگلێت یان بەلایەنی کەمەوە فشارهێنان بۆ دەزگای دژە سیخوڕی فەڕەنسا– بۆچوونە ناو ڕووداوەکانی مادەی بێهۆشکەرەوە تا لەکۆتاییدا ئەو تۆڕە تەنها ببێتە دەزگایەکی دراو دروستکردن. پەیوەندییەکانی فەڕەنسا– ئەمریکا لەماوەی چەند مانگدا ناهەموارترین قۆناغەکانی خۆی بەسەردەبرد. بەلاّم من لەگۆشەوکەناری جیهاندا هاوڕێی دەستەلاّتدارم هەبوو. (تۆماس واتسۆن) کوڕی دامەزرێنەری (IBM) کەئەو دەمەشالیاری ئەمریکا لەفەڕەنسابوو، بەخودی خۆی لەبلاّوبوونەوەی ئەو ڕسواییە لەفەڕەنسا ڕێگری دەکردو، لەناخیشەوە لەوەی کەویلایەتە یەککگرتووەکان بەئاشکرا سوودی لەبەدناوکردنی کەسێك دەبینی کە گەورەترین دۆستی ئەمریکاو خەلّکی ولاّتێك بوو کە بەهاوپەیمانێکی زۆرگرنگ دادەنرا، بەقولّی نیگەران ببوو. تەنها لەپاش کارەساتی واشنتنو ماوەیەك پاش کێشەی سەرەوە کە بڕیاربوو بچمە سەربابەتی ئەمریکابینیم لەم ڕووداوە وانەیەکی مێژوویی فێربووم. تا ئەو دەمەی بابەتی (دولویت)

لەئارادابوو هەولّم دەدا هەموو هەنگاوێك بگرمەبەر بۆ دووركەوتنەوە لەچاوپێكەوتن لەگەلّ كاربەدەستانی ئەمریكایی بۆئەوەی دەرنەكەوێت لە فەرەنسا یان ئەمریكا كە كەوتوومەتە ژێر كاریگەری بابەتەكە یان دارێژەرانیەوە. كەسانێكی لەپشتی ئەم دەسیسەیەوە بوون پروپاگەندەشیان دەكرد كە كاربەدەستانی چینی ناوەڕاست لە (دەزگای جاسوسی) فەرەنسادا سەرانی بنەرەتی شێوە مافیایەكن بۆ بلاّوكردنەوەی مادەی سڕكەر كە لەژێر پەردەی هەمان شێوازداو بەهۆی ئاسانكارییەكانی (دەزگای دژە سیخوڕی) فەرەنساوە كاردەكەن. یەكێكم لەوجۆرە كەسانە، كە لەلایەن دەزگا دەولّەتیەكانەوە خرابووە بەركار، دەناسی. كاتێك كەڕامگەیاند دەمەوێت ببمە قەشەی كلّێسا، ئیتر توانای كۆنترۆلّكردنی ترافیكی مادەی بێهۆشكەری لەدەستدا. هەلّبەتە هەموو بەسەرهاتەكە لەسەرەتایەوە تاكۆتایی درۆیەكی ڕووت بوو. ئەم بابەتە بەخێرایی لەهەردوولای ئەتلانتیكەوە بۆ مەسەلەیەكی سیاسی گۆڕاو بەدرێژایی ئەو ماوە سەختو دژوارە بەڕێكوپێكی سەردانی سەرۆك (پەمپیدۆ)م دەكرد. سەركۆمار لەهەمولایەكەوە بووە ئامانجی هێرشەكان. بەلاّم تەنانەت جارێكیش لەوبارەیەوە پرسیاری لێنەكردم. ئەو نەیدەویست من بخاتە ژێر فشارەوەو دەیزانی كەهیچ شتێك نییە كەبتوانم پێی بلّێم، تەنها ئەوەی كەچۆنم بوێت بابەتەكە چارەسەر بكەم. بەلاّم ئەوكاتە هیچ ڕوونكردنەوەیەكی وردم بۆ باسكردن نەبوو. سەرۆكایەتی (پەمپیدۆ) دەسەلاّتی ڕاپەڕاندنی ئەنجامی زیرەكی ئەوبوو، كەسێكی بەبڕیارو توندوتۆلّ بوو. لەگەرمەی ئەم نەهامەتیە ترسناكەدا، ڕۆژێكیان بەیانی كەمن لەمالّەوە سەرقالّی خۆئامادەكردن بووم بۆ ئۆفیسەكەم بڕۆم، پەیكێك لەلایەن سەركۆمارەوە بەماتۆڕێكی ڕەنگ ڕەشەوە هاتە ئەوێ. زەنگی لەنهۆمی خوارەوەدا. خزمەتكارەكەم پێشوازی لێكردو ئەویش بەبێ هیچ قسەیەك، لەجانتایەكی كەتایبەت بوو بەنێردراوی سەركۆمار پارچەیەكی ڕەشباوی پێچراوەی دایە دەست خزمەتكارەكەم، كەكردمەوە وێنەی (جۆرج پەمپیدۆ)م لەناوقاپێكی میتالّیدا بینی كەڕستەیەكی سادە، بەلاّم زۆر گرنگی لەژێر

دانووسرا بوو: (بۆ خزمەتگوزاری فەڕەنسا، کەمن بڕوام پێیەتی.)و ئیمزای کردبوو : (جۆرج پەمپیدۆ).

ناتوانیت بیهێنیتە بەرچاوت کە ئەم شتەچەند کاریگەری لەسەرم دانا. بەقوڵی دەرکم پێکردبوو. ئەوە ئاماژەیەك بوو کەپیشانی دەدا من زیاتر لەهەر ئەندامێکی نزیك یان ئازیزێك بەهام هەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئاماژەیەك بوو بۆبەرزی سروشتی واقیعیانەی ئەو. (پەمپیدۆ) بەدرێژایی ماوەی ئەو ڕووداوانە پشتی منی دەگرت بەڵام لەئەنجامیشدا نەمانزانی کێ لەپشتی ئەو دەسیسانەوەیە کەدژ دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنمان لە (دەزگای دژە سیخوڕی) داخەریکە. لەئەنجامدا ئەم هەوڵانە شێرازەی هەموو (دەزگای دژە سیخوڕی) لەبەریەك هەڵدەوەشاندو ئەگەری نزیکیش ئەوەبوو کەخودی حکومەتەکەی (پەمپیدۆ)ش بڕوخێت. لەلێکۆڵینەوەی دادوەری کەلەلایەن دادوەرێکی سەرەکی فەڕەنساو وەکیلێکی ناوچەییەوە کرا، لێپرسراوە پەیوەندیدارەکان لەبەدەستهێنانی بەڵگەی دیاریکردنی هەرجۆرە تاوانێك ناکام مانەوە. لەوهەلومەرجانەدا، کە ئاوەکان لێڵن، هەندێجار سێبەری ماسییەکی گەورەی تێپەڕ دەبینیت، بەڵام ناتوانیت وردەکارییەکانی دیاریبکەیت. سەبارەت بەگرێکوێرەی (دولویت)یش بەهەمان شێوە بوو. لەگەڵ ئەوەی کە ڕووداوێکی شاراوەی گاڵتەجاڕیانەشی تێدابوو.

ساڵی دوایی، کوڕەکەی (سیرجان)، کە نەجیبزا دەیەکی ئنگلیزیو زۆر بەویقاربوو، منی لەو گرفتانەی کەخەریکی ڕوودان بوون ئاگادار کردەوە، لەهەمان کاتدا خۆی بووە قوربانیو تووشی دەسیسەی مادەی بێهۆشکەربوو. (سیرجان) ئەوەی بەڕیسوایی دەزانی کەسومعەی ئەوی لەناو دەزگای نهێنی ئینگلستان دەڕووشاند. لەوانەیە ئەوەش دواهەنگاوی کەسانێك بووبێت کەڕووداوی (دولویت) یان ڕێکخستبوو، ئەگەری ئەوەش هەبوو کە لەبەرامبەریدا هیچ وەڵامێکمان پێنە بێت. ئامانجی سەرەکی چالاکی (مشکی خورمایی)و لەڕاستیدا هەموو ئەو کارانەی کەمن لەماوەی

هــەمان هەفتــەو مانگــەکانی یەکــەمی دەســتبەکاریمدا ئــەنجامم دەدا، دروســتکردنی چوارچێوەیـەکی هـزری نــوێ بــوو لەناوهــەموو دەزگــای دژە سیخوڕی فەڕەنسادا، لەسەرەوە بۆ خوارەوە.

هەموو ئەندامێکی دەزگای جاسوسیو لەسەرو ئەوەشەوە هەموو تیمێکی چالاکی دەبوو جۆرێك کاربکات کـەوابزانێت بەڕاستی لەمـەیدانی جەنگدایـە. بەچوونم لەنۆفەمبەری ساڵی ١٩٧٠، زانیم کەلێوەشاوەیی بەشی ئۆپراسیونی دەزگا، واتە ئەو فەرمانگەیـەی کـەدەبوو توانـای ئـەنجامدانی کارەکـانی وەك هـێزێکی لێدەری لێوەشـاوە هـەبێتو، لەهەلومەرجـەکانی جـەنگی سـێیەمی جیهانیدا بـەهێزەکانی هێڵـی پێشـەوەی دەزگـای دژە سـیخوڕی دابـنرێت، بەپراکتیکانــەو لەڕاســتیدا کارەکــانی هــاتبووە ســەر ســفر. دووبــارە بیناکردنەوەی ئەو دۆخە ناچارییەی (دەزگـای دژە سـیخوڕی) کـاتێکی زۆری دەویستو گرفتاویترین کاری من بوو. ئـەم لاوازییـە پێویسـتی بەدامـەزراندنی یەکەیەکی سەربازی شایستەو بەتوانا لەسەرەوە بۆخوارەوە هەبوو، لەپشـتی ئەوەشـەوە، پێویسـتی بــە گۆڕیــنی شــێوازی فکــری بەشــی ئۆپراســیۆنی سیخوڕی، بەهەمان شێوەش بەشی نیزامی دەزگای (دژە سیخوڕی) بوو.

لەڕابووردوودا دەستورێکی نادروست، پێشبینیەکانی ئەفسەرێکی دەخستە ژێر کاریگەرییەوەو تورەی دەکـرد. لـەبوارێکی فراوانـتردا، داوای ئـەنجامدانی جۆرەکـارێکی لێدەکـرا کـەدیاربوو شایســتەی ئەفســەرێکی نـیزامی نــەبوو. بەجەختکردنەوە توانیم ئـاڵوگۆڕێك لـەبواری پلەبەرزکردنـەوەدا دروسـتبکەمو بـەدەنگدانی پەرلـەمانی بگەیـەنمو لــەم ڕێگایــەوە کەسـایەتیە نیزامیـەکانم بەتەوای هەمان ئەو پلانەیان وەردەگرت کە هاوپلەکانیان لەسوپای ئاسـاییدا بەدەستیان هێنابوو. بەڵام من هەرگیز نەگەیشتمە دوا ئامـانجم. دوا ئامـانجم بەرزکردنەوەی خێرای پلەی ئەفسەرانی جاسوسی بوو کەبۆ فیداکاری گـەورە ئامـادە دەبـوونو ژیانیـان لەناهـەموارترین هەلومـەرجدا بەسـەردەبردو ئــەو دژواریانــە یــان وەك بەشــێك لــەژیانی ڕۆژانــەی ئاســاییان پەســندکردبوو. ڕاستیەکەی ئەوە بوو کە ئــەو ئەفسـەرانە وەك هاوشـانەکانی خۆیـان لەیەکـە

جیاوازەکانی سوپای فەڕەنسا نەبوون، بەڵکو بەشێوەیەکی هەمیشەیی و نەپچڕاو لەجەنگدابوون. لەڕاستیدا، وەرگرتنی بەرزکردنەوەی پلە لەمەیدانی جەنگ، دیاردەیەکی ئاسایی ژیانی ئەفسەرانە لەجەنگەکاندا؛ کەدیارە بۆ ئەفسەرانی جاسوسیش ئەم بابەتە ڕاستە.

بۆ هەندێ کەس، ئەم بەرزکردنەوەیە لەخولی سەرۆکایەتی مندا مومکین بوو، وێنایەکی کەدەربارەی (دەزگای جاسوسی) فەڕەنسا لەئارادا بوو، پرۆفیشناڵی تر، جدیترو بەگوتەی ئێمەی فەڕنسایی وەك شتێکی گرنگ دەرکەوت. بۆنمونە دەربارەی جەنەڕال (جانین لاکان) کە بۆماوەی شەش ساڵ وەك ئەفسەری باڵا لەگەڵ مندا کاریدەکردو بۆپلەی جەنەڕاڵ بەرز کرایەوەو لەکۆتاییدا، دواین پلەی سەرۆکی گشتی سەنتەری هاوبەشی سوپای فەڕەنسابوو. لەماوەی خولی سەرۆکایەتیمدا، دەزگای ئۆپراسیۆنم وەك یەکەیەك لەهەزاران پیاوو ژن کە لەئاستە جیاوازەکانی ڕەسمیو ناڕەسمیدا بوون دروست کرد. دووبارە تازەکردنەوەی یەکەیەکی لەوجۆرە پێویستی بەسەبری نائاساییە. بەشی ئۆپراسیون بۆ بەرجەستەترینو گرنگترین یە کەگۆڕا. ئێمە گەڕاینەوە بۆهەموو یەکەچەتر بازەکانی سوپای فەڕەنساو داوای خۆبەخشان بۆ یەکەیەکی تایبەتمان پێشکەش کردو بۆ هەردە کەس یەك کەسمان هەڵبژارد. هەریەك لەوانە لەبواری جیاوازدا شارەزاییان هەبوو؛ بۆنمونە هونەری ناسینی بەڵگەنامە، تفەنگو دەمانچە. لەنێوانیاندا شارەزای چەتر بازی، ژێرە مەلە، تێکدانیش هەبوون. ئەوانە سەربازی نائاسایی بوون. هەندێك لەوانە کە لەناویاندا ئەفسەران بەپلەی جەنەڕاڵ، ئەفسەرانی پلەبەرزو نزم، پلەدارانو ئەفسەران بەپلەی تر هەبوون کەبەهۆی کاری بەردەوامیانەوە لەفەڕەنسا یان لەشوێنانی تری جیاجیا لەسەرانسەری جیهان، خاوەنی ئەزموون بوون.

زۆربەی لاوانی کەماوەی خزمەتکردنی خۆیان لەلای ئێمە تەواوکردبوو، (دەزگای دژە سیخوڕی) یان بەشوێنێکی نمونەیی دەزانی بۆیە لەوێ مابوونەوە. هەندێك لەوانە لەگروپی سەربازانی یەدەگیو هەندێکی دییان

لەهێزەکاتیەکانی یەکەکانی سوپابوون. سەرۆکی پرسنالّی نیزامیو سەرکردە جیاوازەکانی سوپا کە توانای ناسینی کەسانی بەتواناو تایبەتیان هەبوو (ئێمە زۆربەی کات پێویستمان بەوانە دەبوو) خۆم بەوردی فێرم دەکردن. بۆنمونە، ئەفسەرانی زەمینی، دەریایی، یان ئاسمانی، دەیانتوانی بەگرنگترین زمانەکان قسەبکەن. ئاشکرایە لەڕەوشی ئاسایی هەریەکەیەکی پیادەی نیزامی، توانای قسەکردنی هەرئەفسەرێك بەزمانی (پەتی) گرنگی زۆری پێنادرێت.

بەلاّم لەدەزگاکەی مندا، ئەوە بەکەسێکی دەگمەن دادەنرێت. کاتێك مەبەستەکانمان ناسرا، بەدەستهێنانی شارەزایی بەشێوەیەکی فراوان ئاوڕی لێدرایەوەو، لەیەکە نیزامیەکانی سوپای فەرەنسا دا بواری فراوان لەبەرجەستەترین ئامادەکاریەکانمان بەدەستهێنا، دیارە بەهیچ شێوەیەك ژنانمان لێبەدەرنەکردبوو. زۆربەی ژنان، ڕاڤەکارانی زانیاری بوونو ئێمە ژمارەیەکی کەمان لەئەفسەرانی ژنی بەرجەستە لەیەکەکانی ئۆپەراسیۆندا هەبوو. هەندێك لەوانە پسپۆڕی کیمیایی، ئەلکترۆنی، یان فیزیای ئەتۆمی بوون یان لەبواری تاکتیكو ستراتیژی نیزامیدا تایبەتمەند بوون. ئەوانی دی پسپۆڕانی باشترین هونەر بوون، وەك هەلومەرج سازاندن بۆ بەداوەوەکردنی دەستنیشان کراوان. قۆناغی دوایی، ڕێکخستنی بەرکار هێنراوەکان بوو.

ئەوانەسەربازانی پلەیەك بوون. بەلاّم دەیانویست بەشێوەی گروپی کاربکەنو زۆربەیان لەژێر سامناکترین هەلومەرج لەتاریکترین شەوەکانو لەقولّترین ئۆقیانووسەکاندا، سەرقالّی ئەنجامدانی فەرمان بوون. بەپێی ئەمە، ئێمە هەلومەرجی دژوارمان هەلّدەبژاردو ئۆپراسیۆنی تایبەتی شەوانەمان لەخۆرهەلاّتی ناوەڕاستو ئەتلانتیك ڕێکدەخست. لەوکاتەدا لەناو فڕۆکەیەکی کەناوی نەبیسترابوو، چەندین چەتر باز ڕێك لەسەر سەرمانەوە خۆیان فڕێدایە دەرەوەو تەنها بەماوەی چەند سەد مەترێك لەڕووی ئاوەکەوە واتە لەدواساتدا چەترەکانیاندە کردەوە.

ئەوشتانەی کەپێویستی ژێر ئاوبوو لەگەڵ خۆیان هێنابوویانو لەناوشتەکانیاندا بەلەمی چوپی کۆکراوە هەبوو. ئەوانە پرۆفیشناڵ بوون. تا چوونی من لەوێ نەزمو دیسپلینو ڕۆحیەتی بەرز لەنێوان ئەوانەدا هیچ باسێکی نەبوو. پیاوانو ژنانی ئێمە دەبوو تەنانەت لەکاتی مەشقکردنیشدا ئامادەبن ژیانیان بۆ وڵاتەکەیان فیدابکەن. ئەوانە وەك نەناس لەگۆڕی بێناوونیشان دوور لەماڵو خێزانو بێهیچ قەدرزانییەك دەنێژرێن. هەروەهاش بزوێنەری ئەوکارەشیان هەیە. هەوڵم دەدا ببمە بزوێنەریانو وەك باوکیان خۆم بنوێنمو، زۆر خێراش گەیشتمە ئەم ئەنجامە کە هەندێ جار دەبێت سەرۆك خۆی پێش هەموان بچێتە کێڵگە مین ڕێژکراوەکەوە. بەپێی ئەمە جارێکیان لەکاتی سەردانی بەشە جیاوازەکانی دەزگا بەبێ ئاگادارکردنەوەی پێشوەخت وەستامو دەستم کرد بەگفتوگۆو وردبوونەوە لەگەڵ ئەوکەسانەی کەسەرقاڵی ئەنجامدانی کارەکانیان بوون. لەدەرەوەی پاریس لەدووری شارو لەکەناری دەریا، هێزە تایبەتەکانمان بەتایبەت پیاوانی قورپاقەیی شەڕکەر لەیەکەکانی هێزە گرنگەکانی زەمینی، دەریاییو ئاسمانی پاسەوان بوون. سەردانم دەکردنو ڕۆژێك لەلایان دەمامەوە. لەنێوان ئەوانەدا شەو کاتێك نانم دەخواردو دوای نانخواردن، پێکەوە گۆرانیمان دەوت. ئەم کارانە چەندین جار لەلایەن منەوە دووبارە دەبۆوە.

لەمانگەکانی یەکەمی وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتیم لەدەزگای (دژە سیخوڕی) فەرەنسا، لەوانەیە جوانترین کارم، دۆزینەوەی هاوسەنگی نێوان ئەفسەرانی سوپاییو ناسوپایی بووبێت. لەدەزگاکەمدا، مەدەنییەکان، کارمەندی ئاسایی بوون کە لەبەڕێوەبەری بەشەکانو سەرۆکی لقەکان پێکدەهاتن. ئەم هاوسەنگییە لەڕووی چۆنایەتیەوە وەك وەزارەتێکی بچوکی دەوڵەتی بوو، لەکۆتاییدا، سێیەکی کەسایەتیەکان ئەفسەرانی سوپایی بوون.

بەچوونم بۆ ئۆفیسی سەرەکی، لەپڕێکدا بێبەزەیترین پڕوپاگەندە بڵاوبۆوەو هەموو جێگایەکی گرتەوە. هەندێ لەمەدەنیەکان ترسا بوون. ئەوانی تر پێیانو تبوون: (هیچ هۆکارێك لەئارادا نییە تا نیگەران بن، ئەو

خۆی کەسێکی مەدەنییە. خۆی لەسوپاوە هاتووەو مەدەنیشی لەهەموو شوێنەکان دامەزراندووە.)

دیارە هەردوو ئەم گروپانە (سوپایی‌و مەدەنییەکان) بەهەڵەدا چووبوون. هەریەکەیان خاڵی بەهێزی‌و لاوازی تایبەت بەخۆیان هەبوو. بەرامبەر بەو مەدەنیانەی ڕاستگۆیانە خزمەتی وڵاتەکەیان دەکرد ڕێزێکی زۆرم لێدەنان. لەلایەکی دییەوە، سوپاییەکان پشتیوانی هەموانن‌و لەتەواوی بیست‌و چوار سەعاتی شەو ڕۆژو، تەنانەت یەك شەممەکان‌و ڕۆژانی مۆڵەت‌و ڕاستەوخۆ لە خومەتکردندان. دەرکردنی کەسێکی سوپایی هیچ گرفتێکی نییە. بەئاسانی بەسەرناوەکەی‌و ئەویەکەیەی بۆی دەگەڕێتەوە هێلێك دەکێشیت. بەڵام من ئەوەمزانی کەدەرکردنی کەسێکی مەدەنی زۆر ئاڵۆزترە. بەهەرحاڵ گروپێکم لەڕاوێژکارانی شەخسی پێکهێناو، وەزارەت‌و ئیدارەکانیش بەناردنی کاك یان خانم فلان کەڕووکەشانە لەلایان چالاك نەبوو ڕەزامەندبوون. بەپێی ئەمە کاتێك بەرکار خراوە نوێیەکان کەدێنە دیدەنیم، دەبوو چیم بکردایە؟

ئەوانە دەیانووت: (حەزم لەژیانێکی سەرنجڕاکێشە. هەرچیم‌و هەرچی دەکەم نامەوێت بەهۆی ئەوەوە ڕێزم لێبگیرێت. ئەگەر شتێکی هەڵەم کرد، بەکەماڵی ویستەوە ئامادەم سزاکەشی بدەم. بەپێچەوانەوە، ئەم ژیانە تاڕادەیەك مایەی ناڕەحەتی نییەو بۆ ئازادی دەجەنگم.)

ئەگەر کەسێك لەڕووی بەدەنییەوە شیاو بوایەو خاوەنی وزەی داهێنەرانەو هۆشێکی بەرجەستە بوایە، وەڵامێکی پۆزەتیڤانەم دەدایەو دەمگوت: (بەکەماڵی حەزی خۆت دەتوانیت سەرقاڵی کاری زانیاری بیت‌و لەڕێگای ئازادیدا خزمەت بکەیت.)

سەبارەت بە بەرکارخستنی هێزەکان، ئێمە زۆر لەژێر فشاردابووین، کە تا ئەوپەڕی دەبوو هۆشیاری خۆمان بین. هیچ کاتێك لەڕۆژنامەکاندا ئاگاداری ئاساییمان بڵاونەدەکردەوە، یان وەك ئەوەی لە (CIA) دەکرا، لەستونێکی کۆلیژدا، بەرکار خراوەکان بەجۆرێکی ئاشکرا نەدەبینران. من جەنتلمانێکم بەناوی دکتۆر (مۆریس بکویو) هەڵبژارد کە لەبنەڕەتدا جەنەڕاڵێکی سەردەستەبوو، بەڕێکەوت ببوە پزیشکی شەخسیم. بڕیاربوو ئەو ببێتە

بەرپرسی هەموو کاروبارێکی بەرکارخراوەکان. پێموت: (پیاوان‌و ژنانێکی کەتەواو ڕووخۆش، شادو لەجێگای خۆیان ڕازین‌و مەبەستی سەرەکیان خزمەتکردنە بە(ئازادی)، ئەوانە ئەو کەسانەن کە ئێمە مەبەستمانە. ئەوانە تاکە ئامێری ئێمەن.)

ئەو بەجۆرێکی شیاوانە ئەم کارەی بەئەنجامگەیاند.

هەرتازەدامەزراوێك یەکەمین جار لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی پزیشکییەوە بەوردی کۆنترۆڵ دەکرا. کارمەندانێکم دەویست کەپێکهاتەیان توندوتۆڵ بوو، ڕازی بوون، خاوەنی تەندروستییەکی باش بوون، لەژیاندا خۆشبەخت بوون‌و بەرامبەر بەخۆیان هەستێکی چاکیان هەبوو. ئەگەر خێزانیان هەبوایە، حەزم دەکرد خێزانەکانیان ببینم، کاتێکیش دەبوونە کەسایەتیەکی گرنگ، سەردانی دەرەوەی وڵاتیان بۆ ڕێکبخەم. خۆی‌و هاوسەرەکەیم بۆ نانخواردنی نیوەڕوان بانگهێشت دەکرد. ئەم کارەم چەند بارەو، لەگەڵ هەموو پلەدارەکانی فەرماندەیەکەمدا ئەنجامدەدا. پاش نانخواردن قاوەیەکمان فڕدەکردو جگەرەیەکمان دەکێشا. پاشان لەحاڵەتی قاچەکانیان وردەبوومەوە، چونکە ئەوکەسانەی کەخەریکی گوێڕاداشتنن، ڕووخساریان کۆنترۆڵ دەکرد، بەڵام قاچەکانیان لەژێر مێزەکەدا بۆ کۆنترۆڵ نەدەکرا. بەهەرحاڵ، شڵەژاوی خۆیان دەردەخست. تا ڕادەیەك هەردوای دەستبەکاربوونیان تەنانەت لەوردترین ڕاڤەکارەکانیش داوام لێدەکردن کەهەندێکی دیار لەکاتەکانیان بۆمەسەلەکانی دەریادوورەکان (وڵاتانی ئەوپەڕی دەریا) تەرخان بکەن.

ئەمریکییەکان لەکاری جاسوسیدا گرفتێکی سەرەکیان هەیە. سەیری ئەمریکا دەکەن‌و لەسەرشێوازی ئەمریکایی بیردەکەنەوە .تۆ دەبێت بچیتە هەندەران‌و بەزمانی خەڵکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست قسە بکەیت. بۆنمونە، زمانی خەڵکی شەقام‌و کۆڵان بزانیت‌و هەست بەبیرو ئارەزووەکانیان بکەیت؛ ئنجا دەتوانیت ڕاڤەکارێکی زانیاری‌و جاسوسێکی باش بیت لەوناوچەیەدا. بەوجۆرەکاتێك لەهەڵبژاردنی کارمەنداندا ئەو وردەکارییانەم ئەنجام دەدا،

هەمیشەش لەدەرەوەی دەزگا لەوبارەیەوە گفتوگۆم لەگەڵ کەسانی دیدا دەکرد، بەگومانەوە لەگەڵمدا ڕەفتاریان دەنواندو ڕوونکردنەوەکانمیان بەکەم دەگرت. وایلێدەهات ئەم کارمەندانە ئەوەندە بڕوایان بەخۆیان پەیدا دەکرد کە بابەتێك لەگەڵمدا بخەنە ژێر گفتگۆوە. ئاسایی بوو بۆئەوانەی دەیانویست بزانن بۆچی دەزگای جاسوسی فەڕەنسا هیچ کاتێك ڕۆشنبیران یان تەنانەت کەسانی ناسراوی کۆمەڵایەتی بۆلای خۆی ڕاناکێشێت. وەك ئەو کەسانەی کەخزمەتکردنیان لەدەزگانهێنیەکانی بەریتانیاو ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بەشانازییەکی گەورە بۆیان حساب دەکرێت. لەو باوەڕە دام کەهۆی ئەمەسادەیە. ڕۆحیەتی میللی خەڵکی فەڕەنسی ڕێگا بەوە نادات کەسوود لەوجۆرە کەسانە بۆ ئەوجۆرەکارانە وەرگرین. هەمان هۆکاری سادەیە کەبۆچی هەمان شێوازی کلێشەیی ناودەزگا جاسوسیەکانی دی لێرەش بەکارناهێنرێت. بەپێچەوانەوە، لەبەرتیانیا دەستووره کارمەندەکانی لەسەرانی زانکۆ دیارەکان بەگەڕ دەخەن. بۆنمونە ڕۆشنبیرێکی ناودار دڵبەندی نهێنیو سیمبولی ئەم پیشەیە بووە. لە بەریتانیادا تا ئەم دواییانەش خەڵکی بەدەگمەن دەیانزانی کەچ دەزگایەکی نهێنی بوونی هەیە؟ خەڵکی بەرامبەربەوەی کەکێ ببێتە سەرۆکی (دەزگای ئنتلجنس) بیروڕایەکی تایبەتیان نەبوو. ئەو تاکێکی نەناسراوبوو کەبەوردی لەلایەن پلەدارانی دەزگای نهێنییەوە پارێزگاری لێدەکرا. بەشێوەیەکی ڕەسمی پێیان دەگوت (MI6). ئەگەر دەسیسەیەکی وەك ئەوەی (گرین پیس) یان (دولویت) بهاتایە ئاراوە، وتارڕانی ئەنجومەنی گشتی بەریتانیا یان سەرۆك وەزیران بەسادەیی بەمجۆرە دەدوان کە: (باشە ، لەلای من ئاشکرا نییە کەتۆ دەربارەی کام دەزگا قسە دەکەیت.)

یەك (وشە)ی تایبەت بۆ ئۆفیسی هەموو ڕۆژنامەکان دەنردرێت، بەم هۆیەوە بابەتەکە لەهەموو بڵاوکراوەکانو لەئەنجامدا لەهزری گشتیدا پاك دەبێتەوە. بەکورتی، کارکردن لە (دەزگای ئنتلجنس) کارێکی دەقاودەق پیشەیی بوو. هاوشانەکانمان لەئەورووپای ڕۆژهەڵاتیدا، مەسەلەی

دامەزراندنیان ئاسانتر کردبوو. بەهۆی ئەودەمارگیرییە نائاساییەی کەبەرامبەر بەدەزگای زانیاری- جاسوسی خۆیان هەیانبوو، ئەم ولاتانە لەبارەی دامەزراندنی بەرجەستەترین کەسانی نێو خەڵکی خۆیان گرفتیان نییە. ئەوانە بەپێی کارو فەرمانەکانیان گەشتی دەرەوەی ولات دەکەن، بەلام گەشتەکانیان بەهیچ شێوەیەك وەك گەشتی کەسانی تری ولاتەکەیان نییە. باشترین یاریدەدەر، باشترین قوتابخانە، باشترین ئەپارتمانو بەبەهاترین جلوبەرگ یان هەیە. واتە هەلومەرجێکی کەدەستی لەسەدانەوەدی هاولاتیەکانیان ناکەوێت. بەلام سەرەڕای ڕووکەشی نائاساییان، نەشارەزاو بێ هۆکاری پێویستی کاری جاسوسی دەردەکەون، ولەلای ئێمە ئاشکرایە کەلەکاری دامەزراندندا تووشی هیچ گرفتێك نابن.

(KGB)بۆئەوانەی کەبەختی هەڵبژاردنیان بەردەکەوێ، پێشنیاری زۆر سەرنجڕاکێش و هەلومەرجی ئاسانو ئاسایش لەژیاندا دەکات. گرفتەکانی تری ئێمە لەماوەی ساڵەکانی دامەزراندندا گرفتی دارایی بوو. بەگشتی، سەرچاوەی سنووردار لەبەردەستی دەزگای زانیاری ئێمەدابوو. لەبارەی بودجەوە، ناچاربووین ماوەیەکی زۆر درێژ بەهەگبەیەکی زۆر بچوکەوە ببڕین. بودجە تایبەتکراوەکانی ولاتانی ئەورووپای خۆرهەلات کەپەیوەست بوو بەتاكو پێداویستیەکانەوە (وەك زۆر کەسانێکی چینە بالاکانی هاوشانی من بوون) جیاوازی گاڵتە ئامێزی هەبوو لەگەڵ سەرچاوەکەمەکانی ئێمەو لەڕاستیشدا لەگەڵ زۆربەی دەزگا زانیاری-جاسوسییەکانی ولاتانی خۆرئاوا. بودجەی فەرەنسا کە کەموزۆر لەگەڵ بودجەی بەریتانیادا وێکدەهاتەوە، لەلای خۆیەوەو بەپێوانە لەگەڵ دەزگای جاسوسی ئەڵمانیای خۆرئاوا یان (CIA) زۆر سنووردارو کەم بوو. مافی کەم، هەلومەرجی دژواری کارکردنو نەبوونی لێوەشاوەیی لەم سامناکترین پیشانەدا، وای لەکارمەندانی ئاسایش دەکرد کەهەموو ژیانی فیدای خزمەتکردن بە(دەزگا) نەکات. بەپێی ئەمە جێگای سەرسوڕمان نییە کە لەهەموو دەزگای دژە سیخوڕیو لەنێو هەموو ئەفسەراندا، ڕاستیو شەرافەتو بڕوای ڕاپەڕاندنمان نەدەبینی. ژیان زۆر

ئاڵۆزەو بیری خراپ لەکاری ئێمەدا زۆرو فراوانەو برەوی هەیە. هەمیشەو بەگشتی هەموو دەزگایەکی زانیاری ناوخۆیی بەدووی ئەو ئامانجەدا وێڵە، بەڵام بەدرێژایی ئەوسالانە دەزگای دژە سیخوڕی وەك ئامڕازەکانی تری ناوەوەو دەرەوەی فەڕەنسامەبەستی بەهێزی دەسەڵاتو پاراستنی سیاسیانە بووە، ڕۆڵی پارێزەرێکی ئاسایشی ناوخۆیشی بەهۆی لەدەست دانی ئەودوو هۆکارەوە زۆر لاوازبووە. بۆیە هەرپاش چوونم بۆئەو دەزگایە ژمارەی کەسایەتیە مەدەنی و سەربازییەکانم لەیەدەگەکان زیادکردو ڕاستەوخۆ کردمنە بەرپرسی کاری گرنگ. ئەوانە کاریان چاودێریکردنی کەسانێك بوو کە کەلەلایەن دەزگاوە دادەمەزران و کاریان پێدەسپێردرا کەهەڵبەتە لەم چاودێریکردنەدا چالاکییەکانی خۆمی لێدەرنەکرابوو. بەدەستووری خۆم بووکەمنیش وەك هەرکەسێکی تر لەژێر هەلومەرجێکی وردی ئاسایشدا چاودێری دەکرام. زیاتر لەسەدا سێی کارمەندەکان ڕاستەوخۆ سەرقاڵی ئەم چالاکی چاودێریکردنە نهێنییەی جموجۆڵی باقی کارمەندەکانی تری دەزگا بوون. ئەم چاودێریکردنانە هەم بەتاك دەکراو هەم بەتەکنیك. چاودێریکردن بەئۆپەراسیونی ئەلکترۆنیو لێوردبوونەوەی ورد لەهەموو چاوپێکەوتنە گوماناوییەکان.

بۆنمونە هەرکەسێك لەدەزگاکەمان کەدەیویست گەشتی هەندەران بکات، ناچاربوو هەمیشە داوای مۆڵەتی تایبەتی بکات. هەندێ جار پرسیار لەمن دەکرا کەئایان دەزگای زانیاریو دژە سیخوڕی فەڕەنسا سمراود، من هەمیشە وەڵامم دەدایەوە: (هەڵبەتە سمراوە. ئەگەر دەزگایەکی زانیاری نەسمرا بێت، تەنها دەتوانرێت زەنی ئەوە بکرێت کەبۆ کەسانێکی کەکاریان سمینی بەرەی بەرامبەرە خاوەنی هیچ سەرنجڕاکێشانێك نەبووە.)

بەهەرحاڵ هیوادربووم کەهەر سمینێکی کەڕوویدابێت بچوك بووبێت یان پێش ئەوەی ببێتە جێگای مەترسی یان بەرژەوەندییەکانی دەزگا یان وڵات - بە بەلاوەنانی بەرژەوەندی تاك تاکمان- بخاتە مەترسییەوە، ئاشکرا بکرێتو ڕاوەستێنرێت. بەدرێژایی ئەو سالانە، ژمارەیەك کەسانی تایبەتمان ناسی

چونکە زۆرلێیان بەگومان بووین، خۆمان لەبەلایان ڕزگارکرد. ئێمە لەزۆربەی ئەو خانووانەی کەلەدەرەوەی وڵات هەمانبوو، ئامێری مایکرۆفۆنی شاراوەمان دەدۆزییەوە. لەیەکێك لەچاودێرییەکانمان بەسەربالوێزخانەی خۆمانەوە لە (وارشۆ)، چلوچوارمایکرۆفۆن یان ئامێری گوێڕاداشتنمان دۆزییەوە کە لەماوەی ئەودوو مانگەدا دانرابوون؛ چونکە پێش ئەوماوەیە ئەوێمان پشکنی بوو، لەهۆکارەکانی جاسوسی کردن پاکمان کردبۆوە. کاتێك کەزانیم پسپۆڕەکەمان لەبواری دژە سیخوڕی کەشارەزاییەکی بێوێنەی لەهۆکارە ئەلکترۆنیەکاندا هەبوو لەوگەشتە پێویستەی وارشۆ گەڕاوەتەوە، داوامکرد کەسەردانم بکاتو ڕۆژی دواتر لەئۆفیسەکەی خۆم چاوم پێیکەوت. داوای دانیشتنم لێکردو خواردنەوەیەکم بۆ بانگ کردو دەستی بەقسەکرد.

بەلەخۆباییەکەوە وتی: (ئاه..مسیۆ، تۆ دەزانیت کەتەنها لەناو ئۆفیسەکەی سەفیردا چوار مایکرۆفۆن دانرابوو، ئێمەش هەموویمان دۆزییەوە.) جانتایەکی هەڵگرتبوو کەپڕ لەئامێرەکانی گوێبیستن بوو.

گریمانەی ئەوە لەئارادابوو کە گفتوگۆ تەلەفونیەکانمان کۆنترۆڵ دەکرێتو لەلایەن کەسانی خۆمانەوە یان لایەنی بەرامبەرەوە چاودێری دەکراین. بەلایەنی کەمەوە کە دەزگا مۆڵەتی بەکارهێنانی ئامێری گوێڕا داشتنی پێدەداین ئێمەش بەپێی ئەوە سوودمان لێوەردەگرت. هیچ کات دەستبەرداری ئەمجۆرە بیرکردنەوانە نەبووم. ئێمە دووچاری بەدگومانی نەبوو بووین، بەڵام ئەم بیرکردنەوەیە ئێمەی زۆر پاراستبوو. ئەو هەڵسەنگاندنەی کەدەیگووت لەنێوان ئێمەشدا هەمان بەدگومانی کەلەناو(CIA)دا لەلایەن (جیمز ئنگلتۆن)ەوە هاتبۆئاراوەو، بڕەوی هەبوو، ڕەتمدەدایەوە. فەرمان بە(ئنگلتۆن) کرابوو کە دەسەڵاتی سەرەتانی سۆڤیەتی ڕشیشەکێش بکات. نزیکەی ماوەی بیست ساڵ، (ئنگلتۆن) لەیەکەیەکی دژە سیخوڕی (CIA) کاری دەکرد، ئەفرێنەری (یاڵ–گەردن)و (OSS) بوو. خاوەنی شیعرێکی بیریارانەو ناوی

جیاجیابوو: دایك، ڕێوی، ڕۆحی خۆڵەمێشی، تەن، ماسیگرو مێش. لەکۆپلە جیاوازەکانی ئەم شیعرەدا لەوەی چۆن خۆی دەبینێت ئەوانی دی چۆن ئەم دەبینن شیعری هۆنیوەتەوە. لەگەڵ دەستبەکاربوون لە (٢٠)ی دیسامبەری ساڵی (١٩٥٤)، مۆڵەتی کردنەوەی ڕێگەیەکی قوڵی بۆناو (CIA)– کەتاو ئەودەمە خاوەنی بیرۆکراسیەتێکی توندوتۆڵ بوو– پێدرابوو. لەڕاستیدا بەدووی جۆرە ئاژەڵێکی– واتە مشکە کوێرە –دا دەگەڕا. ئەوانەی بۆلایەنی بەرامبەر کاریان دەکردو لەمبارەیەوە بەتایبەتی جگە لەئیمپراتۆریەتی ڕووسیا کەسی تر لەبەرچاوان نەبوو.

لەماوەی بیست ساڵی دواییدا، ئەم سەرۆکە تەواو عیارە جاسوسییە لەگەڕانی شێتانەیدا کەبەدووی مشکەکوێرەی فێڵبازی ناو سەری (CIA) دەگەڕا، هەموو جۆرە ئامێرێکی شیاوی بەکارهێنا. لەگەرمەی کارەکەی خۆیدا، زیاتر لەسێ سەد کارمەندی کردبووە بەرپرسی هەموو خەیاڵو وەهمێکی کاتی خۆی. بەدرێژایی ئەو ماوەیەو لەژێر چاودێری ئەودا، (CIA) دەها هەزار نامەی لەڕێگای پۆستو لەویلایەتە یەکگرتووەکانەوە بۆ یەکێتی جەماوەری سۆڤیەتی ڕەوانەکرد کەناوی دەملیۆن کەس لەلیستی کۆمبیوتەری تێدابوو. هەڵبەتە، تەنانەت بۆ کارمەندانی دەوڵەتیش یاساغ بوو کەنامەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بکەنەوە. بەڵام زۆربەی هاوڕێکانی (ئنگلتۆن) تەنانەت دوژمنەکانیشی لەسەرئەوە کۆکن کەئەو زیانەی ئەو گەیاندنی بەئاژانسی جاسوسی ئەمریکا، لەبارەی بێبڕوا کردنو لێکۆلینەوەی توندوتیژانە لەسەردەستی دوو جاسوسی باڵای ڕوسیای سۆڤیەتیەوە بووە. ئەوانیش ئەمانە بوون: (ئاناتۆلی گۆلستین) کە لەهلسنکی لەساڵی ١٩٦١ ناسراو (یۆری نوزنکۆ) کە ئەمەیان لەساڵی ١٩٦٤ دا چووە سویسرا . هەریەکە لەلایەن ڕەگەزە جیاوازەکانی (CIA) گومان لێکراوێکی ناسراو بوونو گومانیان لەسەربوو کە سیخوڕی دەبڵ بن (دوولایەنە) کەبەکاری زانیاری نادروست یان کاری پوچەڵ کردنەوە دەست پێشخەری بکەن.

بەهەرحال (ئنگلتۆن) لەماوەی کارەکانی بۆ ناسینی مشکەخورمای ڕووسی، بەکردنەوەی فایلەکانی بەشی ڕووسی لە (CIA)و، لێکۆڵینەوەیان، (گولستین)ی وەك خراپە کارێکی بنەڕەتی دەستنیشانکرد. لەماوەی ئەو چەند مانگەدا بەفرمانی ڕاستەوخۆی (ئنگلتۆن) گروپێکی تایبەتمەندی خاوەن ئەزموون و شارەزای کاری ڕووسیا تەنها بەبچوکترین گومان یان ئامارەیەك لەچالاکی گۆشەگیر کران. بەشی ڕووسی لە (CIA)، لەماوەی ئەوسالانەدا، بەگشتی لەتوانای دەستنیشانکردنی خراپەکاران لە هەرمەیدانێکی چالاکی و لەهەرچینێکدا، لەکار کەوتبوو. بەماوەیەکی کورت پاش وەرگرتنی پۆستەکەم لەساڵی ۱۹۷۱ ، چووم بۆ (لانگڤی)و (ڤێرجینا) بۆیەکەمین چاوپێکەوتن لەگەڵ هاوتا ئەمریکیەکەم (ڕیچارد هلمز)و جاسوسی گەورەو دەستە ڕاست (جیمزئنگلتۆن). ڕۆژێك دوای سەردانەکەم لەگەڵ (هلمز) بۆسەردانی (ئنگلتۆن)، کە ئەوکاتە کەسایەتیەکی ئەفسانەیی بوو، لەوێ مامەوە. قسەکردنەکانمان سەرەتایەکی زۆر پشکنیناویانەی هەبوو. بەئاوازێکی ڕەق پێمی وت: (لەڕاستیدا هیچ شتێك شاراوەو نهێنی نییە. تۆ بۆ دیدەنی من دێیت نەك بۆلای بەڕێوەبەری گشتی.)لەو هەلومەرجەدا کەهیچ قسەیەکم پێنەبوو بیکەم ، بەتەواوی سڕبوو بووم بۆیە ئەویش درێژەی پێدا: (بەهەرحاڵ، کارگێرەکەمان لە پاریس فەرمانبەرێکی (KGB)یە ! هاوسەرەکەشی لەوخراپترە.)

بەبڕوای من سەرۆکی بارەگای (CIA) لەپاریس پیاوێکی زۆرباش بوو. لەوکاتەدا زۆر بەسەغڵەتی هەناسەم دەدا، نزیکەی سەعات پێنجی عەسربوو کەبوتڵێك ویسکی هەڵپچڕی و دەستمان بەخواردنەوە کردو تادوایی قسەم نەکرد. پاشان وتم : (بەڕێز (ئنگلتۆن) ئەگەر ئەو کەسێکی جاسوسی (KGB)یە بۆچی لەناوی نابەیت یان دەستگیری بکەیت؟)

وەلامی نەدایەوەو بەردەوام بوو لەخواردنەوەی بوتڵە ویسکییەکە. تا کۆتایی ئەو عەسرە خۆی بە تەنها ئەو بوتڵەی خواردەوە. من هەموو

عەسرانێك جگە لـەپێكێك یـان دووان زیـاتر ناخۆمـەوە. كاتـێ لـەكۆتاییدا هەستایە سەرپێو منی تا دەرگاكە ڕەوانـە كـرد، گەیشتمە ئـەو بڕوایـەی كـە پێویسـتـە بەرامبـەر بـەو ڕوو قایمیـەی ئـەو جـارێك بـۆ هـەتا هەتایـە وەڵامێكی بدەمەوە. بۆیـە وتم: (بـەڕێز (ئنگلتـۆن)ی ئـازیز، مـن سـەرۆكی دەزگای جاسوسی فەڕەنسام. لەگەڵ سەرۆكەكەت گفتوگۆ دەكەم، تەنـها لەگـەڵ ئـەو.) پاشـان وتم : (هیـوادارم پێـش ئـەوەی ئۆفیسـەكەتان بەجێبهێڵم، دەستگیرم نەكەی.)

ئـەو پێكـەنیو منیش ڕۆشـتم. لەوانەیـە ئـەولای وابووبێـت كـەمنیش جاسـوس یـان فەرمانبـەری سـەرۆكی دەزگـای جاسوسـی سـەرۆكایەتی گشتی یان دەزگای سوپای سۆڤیەتیو ئەندامی نانیزامی (KGB)م.

بەبڕوای من (جەیمز ئەنگلتۆن) كەسێك نـەبوو كـە ئێمـە وەك سـەرۆكی یەكـەی دژە سـیخوڕی خۆمـان پێویستمان پێـی بـوو بێـت. ئەگـەر تـۆ بـەگومانكردن بەرامبـەر بەكەسـێك، تەنانـەت لـەنێو هاوڕێكانتـا دەسـتت بـەكاركرد، بـەوجۆرە ئیـتر دەتوانـی بـۆ كـوێ بچیـت؟ مـن تەنـها سـێ داواكـاریم لەفەرمانبـەرەكانی دژە سـیخوڕی خۆمـان هـەبوو. شـێتی گومـانلێكردنو دوودڵیـت نـەبێت، مـەیخۆر نـەبیت، كلێشـەیی (ڕۆتیـن)ی كارنەكەیت.

لەگەڵ ئەوانەشدا ئێمە تووشی جـەنگێك ببوویـن كەدوژمنەكـەمان نـەك تەنها بەدگومانی نەبوو، بەڵكو واقیع بینیش بـوو. ئێمـە بەخۆشـحاڵییەوە لەگەڵ هەموو مامڵەمان دەكرد، بەڵام نیازی بەرزكردنەوەی ئاسـتی كـاری جاسوسیو ئامادەكارییەكانیشمان هەبوو.

بـەڵام كلێشـەیش هـەبوون كەتاڕادەیـەك لـەكاری جاسوسـی ئـەو سەردەمەشدا بـەكاردەهێنران. بەداخـەوەم كەهـەرگیز تووشـی ئـەمجۆرە جاسوسـە فانتازیـا پـڕ باقوبریقانـە نـەبووم، ئەوانـەی كەبـەرگی ڕەشو ترسناكیان دەپۆشیو سـەریان لەیەخـەكاندا ون دەكـرد، خـاوەنی عـەقڵی بێگەردو سەرنجراكێشنو دارابوونو جگـەرەی درێژ لەگۆشـەیەكی لێویـان

دەسوون. دەربارەی دەزگا جاسوسیو نهێنیەکان، ئەفسانەی گەورە هەیەو چەندەها جار لە تەلەفزیۆنەوە پەخشکراوە، لەرۆمانەکان، گۆڤارەکانو هەموو جۆرە فیلمێکدا هەیە. لەپاڵ بابەتی (عیشق)دا، (جاسوسی)یش بابەتێکە کەکاری زۆری لەسەرکراوە. نووسەری رۆمانسیو جاسوسی سەرکەوتنی کەم بەدەستناهێنن‌و هەڵبەتە ئەمە هەمان ئەوشتەیە کە لەلایەن زۆربەی خەڵکیەوە دەستخۆشی لێدەکرێت، واتە بزواندنی زۆر بەهێز، کەسایەتی گەورە ترو قەبەتر لەژیانی واقیعی، کارو دەسیسەی کەموزۆر نهێنی، هەڵخەڵەتاندن‌و رۆمانسیەت‌و فرمێسك‌و خوێن، هەموو ئەمانەمایەی ستایشی کۆمەڵە. تەنانەت خودی خۆشم لەوهەمەجۆری سینەمایانە بەدوور نەبووم. لەڕاستیدا ناچاربووم کەمێك وریاتریم لەزیادەڕۆیکردن لەشێوازەکانمدا. بەپێی ئەمە لێرەدا بەهیوای بەخشین، دان بەمانەدا دەنێم. چەندەها جار بەشەمەندەفەر یان فڕۆکە بۆ جنێڤ یان برۆکسل دەچووم. لەوکاتانەدا بەگشتی ڕینکۆتی یەخە درێژم دەپۆشی کە دەتوانرا بەرزبکرێتەوەو بەتەواوی ڕووم داپۆشێت. دەمەو عەسر بەهۆی شەمەندەفەرەوە وێستگەی باکوریان وێستگەی رۆژهەلاتم بەجێدەهێشت. ڕۆمانێکی سەرنجڕاکێشی ئاساییم لەگەڵ خۆم دەبردو لەکەنار پەنجەرەیەك ڕۆدەنیشتم‌و لەئارامیدا تەماشای ناوچەکانی وڵاتم دەکرد. کاتێك دەگەیشتمە جنێف یان برۆکسل، پیادە دەبووم‌و لەڕیزی سەرەی تاکسیدا دەوەستام‌و بەسەبرەوە چاوەڕێی تاکسیم دەکردو دەچوومە ئەو شانۆگەرییەی کە پێشتر دەستنیشانم کردبوو. خۆمدەکردە میوانی فیلمێکی (جەیمس بۆند)، هەمیشە خۆم لەبەرامبەر وەسوەسەکانی هەلاتن لەدەستوورەکانی ئەخلاق‌و کار دەپاراست. هەرگیز بەچوون بۆ ئەو فلمانە لەپاریس خۆم نەدەخستە مەترسییەوە، چونکە لەسەدا سەد کەسێکی بەدخو پەیدا دەبوو کە دەیناسیمەوەو دەستی دەکرد بەبڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی بێبەزەییانە.

سەرەڕای ئــەوەش لەوانەیــە بــەمجۆرە بڵێت: (ئـازیزم سـەیرکە کـاتێك سەرۆکی دەزگای دژە سیخوڕی بەدوی تەڵەکەبازییەکانی جـەیمس بۆنـدو شێوازی ئـەو داوێـل بێت، ئـەبێ ئــەم دەزگایــە دووچــاری چ حاڵــەتێك بووبێت؟.)

ئەم قسە لۆکانەیان هەڵبەستراوانە لەوانەیە لەلایەن کەسـێك یـان چـەند کەسانێکی نـەیاری منـەوە کـە لەسیســتمی ئاسایشــی فەڕەنســادا کــار دەکەن بازاڕی پێگــەرم بکرێـت. لەبەرئــەوە هەرچــەندە ڕەنجـاو دەبـووم، زوو تێدەگەیشتم کەدەزگای دژە سیخوڕیەکەمان، تەنــها هـێزی ئاسایشــی فەڕەنســا نییــە. نــەیاری هەمیشــەیی نێــوان ئێمــەو(فەرمانگــــەی چاودێریکردنی وڵات) زۆر بەیجار توانای وڵاتی لاواز دەکـردو هـەندێجاریش دەبووە نانەوەی هەلومەرجی نالەبار. هەڵبەتـە ئـەم نـەیاریو کێبەرکێیـە کاتێك گەورە دەبوو کە مەسەلەی بەرژەوەندی دەوڵەت ووڵاتــی فەڕەنسا لەئارادا نەبوو. (فەرمانگەی چاودێریکردنی وڵات) تەنها بەرپرســی کارێکـە لەناوخۆی فەڕەنسادا، کە دەزگا هاوتاکـەی (FBI)یـە. دەزگاکـەی ئێمـە، واتــە دەزگــای کۆکردنــەوەی بەڵگەنامــەو دژە ســیخوڕی فەڕەنســا کــە دەزگایەکی تایبەت بەدژە سیخوڕیو زانیاری دەرەوەی فەڕەنسابوو (دوو جیاوازی سەرەکی لەگەڵیدا هەبوو)، بەرپرسی ئــەنجامدانی هــەموو کــارێك بوو جگە لەناو فەڕەنسا. لەماوەی چەندینساڵدا، دەزگـای کۆکردنــەوەی بەڵگەنامــەو دژە سـیخوڕی فەڕەنسـا زیـاتر وزەو کـاتی خـۆی لەکێبــەرکێ لەگــەڵ وەزارەتــی نـاوخۆ بــەفیڕۆدا، کــە سەرپەرشــتیاری (فەرمانگــەی چاودێریکردنی وڵات)بوو. لەڕووی دابینکردنــی بەرژەوەندی هــەردوولاوە، هــەوڵمدەدا جۆرێك پــەیوەندی لــەنێوانیاندا پێکبــهێنم کــەدیارە بۆمــاوەی چەندین ساڵ کاریگەری هەبوو. لەوشـێوە فرەسـەنتەرییە لەکۆکردنــەوەی زانیاری ناوخۆیو دەرەکی هیچ کــاتێك بەئــەندازەی خــەباتکردن لەشــەڕە جۆراوجۆرەکــانی کــە لەجــەنگی سێیەمی جیهانیو بــەناچاری لەجــەنگی چوارەمی جیهانیدا سەریهەڵدا، پێویستو مایەی ژیان نــەبوو. لەهــەردوو

ڕووەکەوە پێش ئەوەی جەنگی سێیەمی جیهانی بۆ چوارەم بگۆڕێت، بەرەکان سمرابوون. بەپێی ئەمە، یەکێك لەکارەکانم کەپاش دانانم لەساڵی ۱۹۷۰دا پێی هەستام، پەیوەست بوو بە وەزیری ناوخۆوە بەڕێز (ریمۆن مارسلن). هەلم بۆ ڕەخساند تا شارەزای دیدە بنەڕەتیەکانم بێت دەربارەی ئەو بابەتە. پێڕاگەیشتنی دوای ئەوم (جان روشە)بوو، کە ئەودەمە سەرۆکی (فەرمانگەی چاودێریکردنی وڵات)و کەسێکی کامڵو نیشتمان پەرستێکی گەورەبوو. بەرەو ئۆفیسە پڕ لەباقوبریقەکەی لەبینایەکی گەورەی دێرین کە کەوتبووە پاڵ وەزارەتی ناوخۆو لەپشتی تەلاری ئەلیزێ لەخوارووی فەڕەنسا بوو ڕێنمایی کرام. کاتێك هەردووکمان لەسەرکورسیە خۆشەکان لەگۆشەیەکی فراوانو خۆشدا دوور لەمێزە جەنجاڵەکانی، کەهەموو ڕۆژێك کاری لێکۆلینەوەی ئاسایشی ناوخۆیی خەڵکی فەڕەنسی لەپشتیانەوە ئەنجامدەدا، دانیشتین، بڕیارمدا ڕاستەوخۆ بچمە سەربابەتە بنەڕەتیەکە. بەرنامەی کارەکەم سادەبوو: کۆتایی هێنان بەنەیارییەکی بەشێوەیەکی جدی لەکۆتایی جەنگی دووەمی جیهانییەوە لەنێوان دوو دەزگای سەرەکی ئاسایشی کۆماری فەڕەنسادا هاتبووە ئاراوە.

من وتم: (من نەچەپمو نەڕاست. تاکە پەیوەندی من خزمەتکردنە بەفەڕەنساو دەوڵەت.)

(روشە) بەهەمان شێوەی کەمن درێژەم پێدا، بەوردی گوێی گرتبوو. وتم: (بۆیە تکا دەکەم لێبگەڕێیت لە هەلومەرجێکی هەماهەنگیدا پێکەوە ژیانو کار بکەین. ئیتر لەنێوان دەزگاکاندا جەنگو چەقۆ لەیەکسوییین نەمێنێتو لێبگەڕێ سەر دوژمنی بنەڕەتی بپەرژێین.)

هەڵبەتە بۆ هەر بەڕێوەبەرێکی (فەرمانگەی چاودێریکردنی وڵات) کێشە بوو لەگەڵ ئەو واتایەی کەلایەنگری بەرژەوەندی دەوڵەتی فەڕەنسابوو، بەجۆرێکی ئاشکرا سەرکێشی بکات. هەرچەندە لەکۆتاییدا گەیشتمە ئەو بڕوایەی کەجێنشینەکانی پێش ئەو هەوڵیان داوە ئەوجۆرە

ڕێککەوتنە لەناوببەن. لەدڵەوە لەوبڕوایەدام کە (ڕوشە) لەماوەی دەستبەکاری خۆیدا درێغی لەهیچ هەوڵدانێك نەکردووە بۆ دامەزراندنی ئەو هەماهەنگییە کە لەدەیەکانی ڕابووردووی پێش ئەودا وەك دیارترین واقیعیەت لەمەیدانی کێبەرکێیدا لەئارادا بوو.

ئەمە شتێك نەبوو کەهەردوو سەرۆکی (فەرمانگەی چاودێریکردنی وڵات)، یان (دەزگای دژە سیخوڕی فەرەنسا) بەشێوەیەکی سوكو ئاسان بەدەستی بهێنن، تەنانەت هیچ کام لەدەزگا هاوتاکانیشیان وەك (FBI)و (CIA) بەئاسانی بەدەستیان نەهێناوە. ئەم هەماهەنگییە، هەنگاوێك بوو کە ئێمە ناچاربووین کاری لەسەر بکەینو هاویشتمان. تاڕادەیەك هەردوای یەکەمین پێگەیشتنم لەگەڵ (ڕوشە) بواری هەوڵدانێکی هاوبەشمان لەخولی خۆماندا کە واقیعەتێکی بەرچاوبوو، هێنایە ئاراوە. مەشقێکی هاوبەشی ڕاهێنانم لەدورگەی (کریس)و لەژێر فەرمانی یەك فەرماندەییدا ڕێکخست کەهەدوو فەرماندەیی (فەرمانگەی چاودێریکردنی وڵات)و (دەزگای دژە سیخوڕی) هاوبەش بوون. پۆلیسە لاوەکانی (فەرمانگەی چاودێریکردنی وڵات)و هاوکات کارمەندانی ئێمەش وەك ژێر دەریاوانیو پسپۆڕی تێکدان لەئۆپەراسیونەکەدا بەشداربوونو هەلیکۆپتەرو فڕۆکەیان بەکار دەهێنا. ئێمە لەدواین ڕۆژدا، لەجەوێکی کراوەدا ئێوارە خوانێكو ئاهەنگی برژاندنمان بۆ سازکردن. هەم (ڕوشە)و هەم (مارسلین) وەزیری دەوڵەت، کە(ڕوشە) ڕاپۆرتی دەدایە، بەهۆی یەکێك لەفڕۆکەکانمانەوە هاتن تا ئەو ڕۆژە لەگەڵمان بەسەربەرن. ئەم هەوڵو تەقەلایانە لەم ڕووەوە، زۆر بەسوود بوو بۆ بەلاوەنانی بێبڕوایی نێوان دەزگاکانمان، بەلایەنی کەمەوە لەسەرئاستی چالاکیەکان یاریدەدەر بوو. لەگەڵ ئەمەشدا لەنێوان دەزگای دژە سیخوڕیو کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکیو یان دەزگای جێگرەوە کردارییەکەی واتە (فەرمانگەی گشتی ئاسایشی دەرەکی)و (فەرمانگەی چاودێریکردنی وڵات) هێشتا ڕووبەڕوو بوونەوەی زۆر لەئارادا مابوو.

کەشی ئێستا وەك کەشی ڕابووردوو نییە، بەڵام هێشتا کێبەرکێی زۆر زۆربوونی هەیە. کاتێك جۆری جەنگەکانی کەجەنگی چوارەمی جیهانی دروست دەکەن تاوتوێ دەکەین، هەموو هەوڵەکانمان دژ بەتیرۆریزمو ترافیکی مادە سڕکارەکان کەهیچ سنوورێك ناناسن، لەڕاستیدا دابەشکردنی کاری جاسوسیە ناوخۆییو دەرەکییەکان زیاتر برەو پێدەدەنو لەهەمان کاتیشدا هەموو ئەو دەزگایانەشی تووشی دەرگیری هاتوون پێویستە هەنگاوی گونجاو بنێن. زۆربەی کات، بۆ ڕاوێژکردنی ڕووبەڕوو کاتی کەممان هەیە. دەزگاکان دەبێت لەدڵەوەو زۆر سادە لەهەموو کاتەکاندا پێکەوە کاربکەنو هەریەکەیان بزانن کە تارادەیەك ئەوەی ڕوودەدات لەسەر زەمینەی لایەنی بەرامبەر ڕوویداوە. لەساڵی ١٩٨٣، (فەرمانگەی چاودێریکردنی وڵات)و (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکیو دژە سیخوڕی) ژمارەیەکی زۆریان لەسیخوڕانی باڵای سۆڤیەتی، کە لەدەرەوەی باڵوێزخانە لەپاریسو لەبواری (لان) کاریان دەکرد، ئاشکرا کرد. لەلایەن سەرکۆمارەوە بڕیاری یەکلاکەرەوەی سیاسیانەدرا، بەپێی ئەوە هەموویان بەیەك جار لەوڵات بەدەرنێین؛ کەئەم بڕیارە لەحەقیقەتدا ئاماژەیەکی شاراوەو دراماتیکیشی هەبوو. سەرەڕای بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە، پاش چەند ساڵێك لەوبڕیارەی سەرەوە شەپۆلێکی جدی لەدەزگا سیخوڕییەکانی ڕووسیادا بەرپا کردبوو. یەکێك لەوکارمەندانە ئەندامی بەشی ڕاگەیاندنی باڵوێزخانەی ڕووسیا بوو. کوڕی ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی ڕووسیا بوو کە لەخولی دوای خرۆچۆف بەرپاکسازی کەوتو لەکۆتاییدا وەك شالیار نێردرا بۆ تۆکیۆ. ئەو پێشتر وەك ئەندامی دەستەیەکی بازرگانی کە لەجەزایر بوو کاریدەکردو لەوێدا بۆیەکەمجار بەناسنامە واقیعیەکەی کەڕەگەزێکی باڵای جاسوسی بوو، ئاشکرابوو. جیاواز لەهەموو ئەندامانی بەشی ڕاگەیاندن لەبالوێزخانەی سۆڤیەتی، بەهۆی شارەزایی لەزمانی فەڕەنسی کەوەك ئاڵتەر ناتیڤەکەی بێکەموکوڕی بوو، ناسراوبوو. بەخێرایی کارەکانی ئەنجامداو لەگەڵ زۆر

لەهاوتا فەرەنسییەکانی چینەکانی سەروو، بەتایبەتی ئەوانەی کە لەڕادیۆو تەلەفزیۆن بوونو بەتایبەتی هاوشانە ئەمریکیو هەندەرانیەکانی لەفەرەنسا دەژیان چاوپێکەوتنی سازداو بووە هاوڕێیان. لەهەمان کاتدا، ببوە هاوەڵی نزیکی (یولی ڤورنتسف)، شالیاری دەستەلاتداری سۆڤیەتی لەپاریس کەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیست بوو بڕیار بوو بۆ ڕووسیا بگەڕێتەوەو وەك ڕاوێژکاری وەزیری کاروباری دەرەوەو نوێنەری سۆڤیەت لە دانستانەکانی چەکی ستراتیژی لە ژنێڤ بەشداری بکات. بەپێی ئەمە، (KGB) لەئەنجامی پەیوەندییەکانو شوێنگەی ئەمەوە لەتوانایدا هەبوو ژمارەیەکی زۆر لە دژە سیخوڕەکان بکاتە ناو (CIA.)یەوە. بۆنمونە، لەسەر داوای ئەوبوو کە لەوسەردەمەدا نەڕووسەکانو نەهیچ کام لە دۆستو هاوپەیمانەکانیان کۆمەکی باڵی (ابوعباس)ی بەرەی ئازادیخوزای فەلەستینیان نەکرد، کەچالاکی فڕاندنی کەشتیو کاری ترسناکی (ئاکیلە لائورو)یان ئەنجامدا.

گەیشتنی بەڕۆژنامەنووسانی چینی بالای فەرەنساو هاوشانە گرنگە خۆرئاواییەکانیان، کە ئەو زۆربەی کات ئالوگۆڕی زانیاری لەگەڵ ئەنجام دەدان، ئەو توانایەی پێبەخشیبوو کەهزری گشتی خۆرئاوا بەتایبەتی لەفەرەنساو ئەوروپای خۆرئاواو بەهەمان شێوەش دیدی ئەمریکیەکان سەبارەت بەپرسە ئەوروپیەکان کەچۆن ئەو مەسلانە ڕەت دەکەنەوە، بەوپەڕی وردیو لێزانییەکی وەستایانەوە هەڵبسەنگێنێت. ئێمە کاریگەری زۆرمان لەم تاکەوە بەدەستهێنا بوو.

(فەرمانگەی چاودێری ولات) لەنزیکەوە چاودێری چالاکیەکانی ئەوی دەکردو لەنێوان ڕۆژنامەنووسە ئەمریکیەکانی کە ئەو پەیوەستی لەگەڵیان هەبوو، ئەو پەیوەندیانەی بەهێز دەکرد. لەلایەکی دییەوە، (فەرمانگەی ئاسایشی دەرەکی) گەشتەکانی ئەوی بۆ دەرەوە، بۆنمونە بۆ لۆکسامبۆرگ، برۆکسلو ژنێڤ بەرنامە ڕیزی دەکرد. ئێمە ئەومان کۆنترۆڵو ناساند بوو.

ئەوەی بۆچی مانەوەیمان لەخۆرئاوا پێخۆش نەبوو، مەسەلەی هەمان کەروێشکەکەیە؛ چونکە دەمانزانی بەتەواوی لەژێر چاودێریدایە.

ئەو بەتەواویو لەژێر چاودێریدابوو. ڕۆژنامەنووسانێکی کە لەگەڵیدا لەپەیوەستی سادەوبەردەوامدا بوون، بەتەواویو کەوتبوونە ژێر کاریگەری ئەوەوە. بەڵام لەکۆتاییدا ڕووسەکان زیرەکیەکەیان خستەلاوەو بانگهێشتیان کردەوە.

ئەم بابەتەیەکێك لەدیارترین هەماهەنگیەکانی نێوان دوودەزگای ئێمە، واتە فەرمانگەی چاودێریکردنی وڵاتو فەرمانگەی گشتی ئاسایشی دەرەکی، بوو. بەدبەختانە ئەم هاوکارییە هەمیشە نەدەبووە هەوێنی واقیع.

دابەشکردنی کار، شتێك بوو کە بەکەماڵی ڕاحەتەوە لەلایەن دەزگا نهێنیەکانی فەڕەنسا، کە لەخزمەتی وڵاتدا بوون قبووڵ کرابوو. لەلای من جەخت لەسەر ئەوە کرابۆوە کەڕێگا نەدەم ئەو جۆرە ئۆپەراسۆنانە کاریگەری هەبێت لەسەر پەیوەندییەکانمان لەگەڵ هاوپەیمانە خۆرئاواییەکانمان. لەهەمان ڕۆژی دامەزراندنمەوە، هەموو هەوڵم بۆ پەیداکردنی ئەم هەماهەنگییە لەگەڵ دەزگا جاسوسیەکانی دی ناو ئەم خێزانە گەورەیەی خۆرئاوا خستبووە کار.

ئەم بابەتەم لەدەستپێکی سەرتاوە داناوبەپێی گرنگی ئەوەش، سەردانی هاوشانە ئەوروپیەکانی خۆم دەکردو لەوخاڵەی سەرەوە ئاگادارم دەکردنەوە. ستراتیژییەتی من ئەوەبوو کەساڵی دووجار لەکاتی پێویستدا چاوپێکەوتن کەپێشتر هەرگیز بەنامەڕێژی بۆ نەکرابوو، پێشنیاز بکەم.

لەو دانیشتنانەدا دەربارەی بابەتە پەیوەندیدارەکانی هەردوولا گفتوگۆمان دەکرد. ئێمە بەنۆبە سەردانی یەکتریمان لە پاریس، لەندەنو میونیخ دەکرد. هەڵبەتە لەوێدا تەنها سەرۆکە بنەڕەتیەکانی دەزگا

زانیارییەکانی ئەوروپا ئامادە دەبوون، کە فەڕەنسا، بەریتانیا، ئەڵمانیا بوون.

ئەگەر ئێمە بەشێوەیەکی جدیانە لەشەڕ دژ بەئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی لەجەنگی جیهانی سێیەمدایەکمان بگرتایە، ئەوێ تاکە شوێنێک بوو کە هەماهەنگی وەك بنەڕەتیترین کارێکی گونجاو بەرجەستە دەبوو. ئەمریکیەکان لەودانیشتنانەدا ئامادە نەدەبوون. لەهەموو خولی دەستبەکاریم وەك سەرۆکی دەزگای جاسوسی فەڕەنسا، هیچ کاتێك دانیشتنی هاوبەشی نێوان سەرانی (CIA)و سەرۆکی ئاژانسە جاسوسیەکانی هاوپەیمانان لەئەوروپا پێك نەهات. لەجیاتی ئەوە من گفتوگۆی ساڵانەو جودام لەگەڵ ئەمریکیەکان ڕێك دەخست.

کاتێك (جۆرج بوش) بووە سەرۆکی (CIA) ئەمریکا بەشداری ئەو دانیشتنانەی دەکرد. چەندین جار بەوە تاوانبار دەکرام کە ئەو زانیارییانەی لەبەردەستدایە نەمداوە بەئەمریکیەکان. جێگای سەرسوڕمان نییە کە بۆچی ئەمجۆرە یەکێتییەی نێوان وڵاتە بنەڕەتیەکانی باکور یان خۆرئاوا بەهێز نەبووە. لەگەڵ ئەوەشدا، جێگای پرسیاریش نییە کە بۆچی دەسەڵاتە جاسوسیەکانی کە ئەنجامەکانی جەنگی سێیەمی جیهانیان ئاسانتر کردو تاڕادەیەکیش توانای بەرگریان لەبەرامبەر جەنگی چوارەمی جیهانیدا پێبەخشین، گەشەیان نەکرد. بەڵام هۆکاری ئەم هەلومەرجەش بوونی هەیە. لەڕاستیدا، بەوجۆرەی کە من لە(ولیام کەسی) لەکاتی یەکەمین چاوپێکەتنماندا ، بیستم، هۆکارێکی سادەی ئەو هەلومەرجە ئەمەیە کە لەزۆربەی ئەو ساڵانەدا هەرکاتێك شتێکت بەئەمریکیەکان دەوت، بەیانی ڕۆژی دواتر هەموو کەس دەیزانی. یەکەمین جار کەدیداری هاوشانە ئەورووپیەکانی خۆم کرد، هەموو کارتەکانم لەسەرمێزەکە خستەڕوو، ئاشکرابوو، کە گومانو دوودڵی لەوێدا هەبوو، کەهەندێکیان بۆ سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانی دەگەڕایەوە. بەڕێوەبەری گشتی (BND) دەزگای جاسوسی

بەهێزی دەوڵەتی ئەڵمانیا، لەگەڵ هاوپەیمانەکانی دی جگە لەئەمریکیەکان ئامادە دەبوو. ئەو ئیرەیی‌و هەستە توندەی کە ئێستاش ئەورووپای لەیەك دابڕیوە، دەزگاکانیشمانی لەیەکتر دادەبڕی‌و نێگەتیڤانەی دەهێشتەوە. (هەڵبەتە تاڕادەیەکی دیاریکراو هێشتا لەیەکتری دابڕیوە.)

چونکە داوام لێکرابوو کە یەکەمین دانیشتن لەسەنتەری ئۆفیسی پاریس ساز بکەم، بەندە هەمان شتی کردو پاش ڕێکخستنی دەستم بەقسە کردن کرد: (بەڕێزان، من سەرۆکی دەزگای جاسوسی فەڕەنسام. بەرگری لەبەرژەوەندیەکانی فەڕەنسا دەکەم، بەڵام لەهەمان ساتدا یەکێکم لەسەرانی دەزگا جاسوسیەکانی هاوپەیمانان. ئێوە دەزانن من کێم‌و خەڵکی کوێم. هیچ شتێك حەشار نادەم. پەیوەندیم لەگەڵتاندا بەدڵ‌و دڵسۆزانەیە. ئەگەر گرفت یان ڕووبەڕوو بوونەوەیەك لەنێوانماندا هەبووە، ڕێگا بدەن بیخەینە ڕوو، گفتوگۆ دەربارەیان بکەین. ئێمە لەحاڵەتی ڕووبەڕووبوو نەوەداین لەگەڵ دوژمنێکا، کە ئەوانە تەنها دوژمنانی دیمکراسین. ئەگەر دەوڵەتەکانمان گرفت یان جیاوازییان لەگەڵ یەکدیدا هەیە، دەبێت ئێمە لێرەدا بیانخەینە ڕوو، دەربارەیان ئازادانە گفتوگۆ بکەین.)

لەگەڵ ئەوەی کە درێژەم بەقسەکانم دەدا، دەنگە دەنگی ڕەزامەندی لەدەوری مێزەکەوە دەبیسترا. وتم: (بەندە زۆر بەتاسەوەوە کە پێش دەستپێکردنی لێکۆلینەوە، ناونیشانێك بخەمە ڕوو کە ئەویش ئەمەیە من هەرگیز درۆتان لەگەڵ ناکەم، چونکە بڕوام بەدرۆکردن نییە.) ڕوومکردە نوێنەری ئنگلتەراو بەخەندەوە وتم: وەك: (ساشاگیتری) کە برناردشۆی فەڕەنسی تیایدا دەڵێت (هەرگیز درۆمەکە، چونکە تۆ پێویستت بەمێژوو هەیە.)

دەرئەنجامی ئەم دانیشتنە هەماهەنگییەك لەئاستێکی نائاسایی نێوان سەرانی ئاژانسە جاسوسیەکانی ئەورووپا بوو، کەجارێکی تر هەرگیز دووبارە نەبۆوە. کاتێك بەڕێز (برین تقوی) پیاوی ناودار کەسەرۆکی

دەزگای کوێرِا داشتنی بەریتانیا لە(شلتنهام) بوو وێنەی گفتوگۆیەکی بڕاوی بۆ (MI6) لە لەندەن نارد، کۆپییەکی دەقاودەقی وەك ئەوەشی بۆ من لەپاریس ناردبوو. (دەزگای (گوێڕاداشتن)ی بەریتانی بەشێك لەزانیاری ئەلکترۆنی لەسەرئاستی جیهانی زۆر بەهێزو زەبەلاح بوو، کە بە (GCHQ) ناسراوە.

دەزگایەکی تەلەکسی جفرەیی لەئۆفیسە جیاوازەکانی مندا هەبوو، کە پێشتر دانرابوون. لەهیچ شوێنێکی جیهاندا، کارێکی گەورە ترو تاڵتر لەبڕینی پەیوەندی کە لەلایەن بەرتانیەکانەوە دەکرا نییەو، ئێمە هەردووکمان ئەوەمان دەزانی. فەلسەفەی ڕاستگۆیی تەواوی خۆم کە لەیەکەمین دانیشتن لەگەڵ هاوشانەکانم خستمە ڕوو ئەوانیش بەئاشکرا ڕەزامەند بوون، هەمان فەلسەفەی خولگەیشە لەکاری ڕابەرایەتی کردنمدا. ئەم فەلسەفەیە لەڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەو سیاسەتمەدارانەی پەیوەندیم پێیانەوە هەیە، لەگەڵ هاوشانانی خۆم لەدەرەوەی ولاتو هەڵبەتە لەگەڵ هاوکارەکانیشم لەدەزگادا پیادەی دەکەم.

## زەمینەی ئۆپراسیۆنەکان یان خەونەکان

کاری جاسوسی پەیکەرێکی زەبەلاحە کە لەڕەنگو فۆرمی جیاواز پێکهاتووەو، ئەم ڕەنگو فۆرمانەش بەردەوام لەگۆڕاندان و شەقڵی نوێ لەخۆ دەگرن. سیخوڕی بریتییە لەگەڕانێکی بەردەوام بۆ بەدەستهێنانی پارچەی تۆکمە پێکەوە گرێدراو، کە ڕاڤەکارانی دەزگا نهێنییەکان بۆکاملّ کردنی پەیکەرە زەبەلاحەکە کۆیدەکەنەوە. بەلاّم دروست کاتێك دەتەوێت جێگایەکی خالّی بەپارچەیەکی نوێ پڕ بکەیتەوە، پەیکەرەکە فۆرمەکەی دەگۆڕێت. لەزۆر ڕووشەوە لەپارچەکانی ناوەوەی فڕۆکەیەك دەچێت. لەژووری تایبەتی فڕۆکەواندا، کەسێك هەیە کە بڕیار دەدات. زانیاری بۆ فڕۆکەوان، کە لەولاّتیشدا واتە سەرکۆمار، مایەی ژیانەو بەبێئەوە ناتوانێت بفڕێت. ئەگەر دەزگا گونجاوانە کار نەکات، تەنها پڕبێت لەکەسانی هەوەسبازو نەشیاوو گەمژەو تەنانەت نادروست کاریگەری لەسەر سەرکۆمار دەبێت. ئاشکرایە لەوحالّەتەدا لەلای کەسە نوێیەکان و گەشتیارەکانی، کە هەمان کەسانی بەڕێوەبەرایەتیەکەی و ئەندامانی حکومەتەکەین، پێگە نێو نەتەوەیەکەی لاواز دەبێت، ولاّتەکەی لاواز دەبێت. ناتوانێت هەموو ئەو فاکتەرانەی، ئەو توانایەی پێدەبەخشن تا لەکاروانێکی ڕاست و دروستدا ڕابەرایەتی ولاّت بکات و بەرەو ئامانجەکانی بەرێت، بەدەستبهێنێت. جیهان بەجۆرێکە کەتەنانەت لەهەلومەرجە ئاساییەکانیشدا، سەرکۆمار لەبۆشاییە جیاوازەکان و زۆرجاریش لەکەشوهەوای پلە سفردا فڕۆکەوانی دەکات. ئەگەر ئەو خاوەنی ئەو هۆکارانە نەبێت کە ئاگاداری دەکەنەوە چی چاوەڕوانی دەکات، چۆن دەتوانێت خۆی لەکارەسات بەدوور بگرێت. بەدرێژایی مێژوو لەهیچ ساتێکدا بەشانازیکردنەوە ناوی هیچ دەولّەتێك نەبراوە کە بەبێ دەزگای جاسوسی و سیخوڕی توانیبێتیان کارێك ئەنجام بدەن. بیست و پێنج سالّ بەر لەئێستا، (سانتزو) فەیلەسوفی گەورەی چینی خاوەن تیۆری جەنگ،

که خۆی کارمەندێکی زانیاری بووە، وتوویەتی: (جاسوسی چاك، پێشەنگی سەرکەوتنە.)

بەڵام ئەمڕۆ، سەرکەوتن بەوشێوە ئاشکرایەی کە لەڕابردوودا بووە وانییە. ئەگەری ئەوە لەئارادایە کە سەرکەوتن لەگەڵ باڵادەستی خاوەن ڕێسای سەربازی، سیاسی، دیبلۆماتیدا دووانە بێت، هەروەها ئەگەری ئەوەش لەئارادایە سەرکەوتنە ئەخلاقیەکانو تەنانەت هەندێجاریش زۆر بەرچاوانە سەرکەوتنی ئابووریش لەخۆبگرێت. سیخوڕیی ئابووری وەك چەکێکی ستراتیژی بەکاریگەرییەکی نوێوە هاتۆتە ئاراوە. بەتایبەتی لەسیستمی نوێی ئابووریمان لەڕووداوەکانی جەنگی چوارەمی جیهانیدا. ئابوورییە تێکشاوەکانی جیهانی سێیەم کەپڕاو پڕ پشت بەسامانە نەوتییەکەیان دەبەستێتو دکتاتۆرەکانی کە دەسەڵاتیان بەندە بەهێزی ئابووریو توانای کڕینی چەکەوە لەبازاڕە ئابوورییە کانن.

ئەمڕۆ وەك بەشێکی دی لەئامڕازەکانی سیخوڕی کردن، کە وردەوردە گرنگی پەیدا دەکات- بەتایبەتی لای ئەوانەی کەمانگی ولاتانی ئەورووپای خۆرهەلاتن- دەزگاکانی ئابووری زیاترو زیاتر دەچنە پاڵ خولگەی ئامڕازەکانی سەرەوە. سیخوڕی ئابووری لەجوغزی توانستە جەنگیەکاندا بۆ ڕەگەزێکی سەرەکی ئاسا گۆڕاوە.

لەسەردەمی قەیرانو دژە کرداریەکاندا چەکی ئابووری یەکەمین چەکە بەکاربهێنرێت. جگەلەوە، لەکاتی بەکارهێنانی گونجاودا ئەم چەکە ئەوەشی سەلماندووە کە دەتوانێت فاکتەرێکی فشاری هەستیار بێت بۆ گێڕانەوەی ڕابەرە نالۆژیکیەکان لەئەنجامدانی کاری ئاژاوە چێتی. لەوڕووەو، بۆنمونە لەڕووی سیاسی، دیبلۆماتی یان سیخوڕی سەربازییەوە سەقامگیرتر دەبن، گەر زانیاریی خاو بەباشی سوودی لێوەربگیرێت دەتوانێت چەکێکی کاریگەر بێت.

لەکۆتایی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧١، دروست لەوتافەدا کە ئاژاوەکەی (دلویت) بەکۆتاییەکی پڕ دەردیسەر دەگەیشت، زانیاریم دەستکەوت کە

ئەمریکیەکان دەیانەوێت لەهەژدەی دیسامبەردا بەهای دۆلارنزم بکەنەوە.
لێکۆڵیارێکی کە لەبارەگای فەرماندەییەوە ئەو زانیارییەی پێدام، یەکێك بوو لەجێگای بڕواترینی بەڕێوەبەرەکانمو سەرۆکی بەشێك بوو کە ناوم نابوو (دەزگای سیخوڕی ئابووری). ئەم بەشە نەك تەنها زانیاری ئابووری کۆدەکردەوە، بەڵکو بەوجۆرەشی کە لەهەمان سەرەتای دەست بەکاربوونمەوە زانیم، سیخوڕی بواری پیشەسازیشی لەخۆگرتبوو. لەودەمەدا کە ئەم دەزگایە زیاد لەوزەو توانستی خۆی کاریدەکرد، لەڕاستیدا بواری بۆ دەڕەخسا لەناوهەموو ئۆپەراسیۆنە سیخوڕییەکانی دەوڵەتی فەرەنسادا هاوبەشی بکات. یەکێك لەو بوارانە وەك ئەمەی خوارەوە بوو:
کاتێك هەواڵی دابەزینی بەهای دۆلاری ئەمریکیم پێگەیشت، کە هەواڵێك بوو بەوزووانە لەڕووداندا بوو، دەستووبرد تەلەفۆنی (هێڵی سوورم) هەڵگرت، کەڕاستەوخۆ بەئۆفیسی سەرکۆمارەوە بەسترابوو، داوای چاوپێکەوتنێکی خێرای سەرۆکۆمار (پەمپیدۆ)م لە کۆشکی ئەلیزە کرد. دیاربوو سەرچاوەی زانیارییەکانمان نەك تەنها مێژووی ئەنجامدانی ئەو هەنگاوەیان پێشبینی کردبوو، بەڵکو نزمبوونەوەی ئاستی بەهاکەشیان پێشبینی دەکرد. بەوجۆرە بەهەلومەرجێکی لەبارەوە بۆ وەڵامدانەوەی هەرپرسیارێکی کە لەلایەن ئەو بانکدارە بەرجەستە فەڕەنسییەوە بکرایە چوومە ئۆفیسی سەرکۆمار. بەپەلە دەستم کرد بەخستنە ڕووی سیناریۆکەو دڵنیایی خۆمم لەدروستی هەواڵو بڕوای سەرچاوەکە بۆ دووپات کردەوە.
لەسەرکۆمارم پرسی: (ئایا مۆڵەتی ئاشکرا کردنی ئەم هەواڵەم پێدەدەیت، بۆنمونە لای وەزیری ئابووری؟)
وەلامی دایەوە: (نەخێر، دەبێت تەنها من بیزانم.)
(پەمپیدۆ) تاڕادەیەك لەبەرڕابردووی‌و تاڕادەیەکیش لەبەرڕەوشتو ڕەفتاری خۆی، لەو ڕووانەوە کە وەك بابەتی هەستیار دەهاتنە پێش، زۆربەی جار بۆ ڕاوێژکردن ڕاستەوخۆ پەیوەندی دەکرد بەبانکی فەرەنسی‌و سەرۆکەکەیەوەو لەبابەتەکەی دەکۆڵییەوەو، ئێستاش بەهەمان شێوە بوو.

(پـەمپیدۆ) زۆر بـڕوای بـەوەبوو کـە مـن ڕێـز لـەهزرەکانی دەگـرمو نـهێنی دەپارێزم لەئەنجامدانی هـەرجۆرە چالاکیـەکی سیخوڕیدا ئاگادارکردنـەوەی، کەشتێکی پێویست بوو، بـەڕێزلێنانیش دەزانم. بەمپێیـە، کـاتێك لەئابلۆقـەی ئاگادارکردنـەوەی لـەو جـۆرە دیدارانـە ڕزگـار دەبـووم، دەمتوانـی نەخشـەی ئۆپەراسیۆن لەبەشەکانی ڕاپەڕاندنی خۆماندا بگوێزمەوە بۆ حاڵەتی پراکتیـك کردن. کارەکە بەوردی لەژێر ڕۆشنایی تیژی جۆراوجۆر یان لەگەڵ کەسانێکی کەپەیوەندییان لەگەڵ دەوڵەتدا مایەی نکوڵی لێکـردن نـەبووە ئـەنجامدەدرا. ئەوانـە پەیوەسـتبوون بـەبانکی فەڕەنسـا، بـانکی سـەنتەریو سـەنتەری هاوجۆری خۆیان لەویلایەتە یـەکگرتووەکان، واتـە خەزنـەداری فیدراڵـی، کـە دەیـانتوانی چالاکیـەکی نـهێنی کەهاوشـانی بـەرزترین ئاسـت بێـت بەئـەنجام بگەیەنن.

بانکی سەنتەری بەکڕینی دۆلارو فرۆشتنی فرانك لەژمارەیەکی زۆری بازاڕی جیهانیدا، توانی سوودی زۆر گەورە بەدەستبهێنێت کەتەنـها بـۆ دابینکردنـی هەموو چالاکیـەکانی دەزگـا تاماوەیـەکی پـاش منیشو لەوانەیـە تـا کۆتـایی ئەوسەدەیەش، بەسبووبێت.

ئایا ئێمە لەنەگونجاوی گرفتارییە ناجۆرەکانی دۆسـتو هاوپەیمانـەکانمان سوودمەند نەدەبووین؟

لەوانەیە، لەوکاتەدا، ئەگەرچی ڕووداوی لـەوجۆرە کـەمتر دەهاتنـە پـێش، بـەڵام هـەندێ گەمـە لـەئارادابوو. ڕۆژێـك بـۆ تـۆو ڕۆژێـك لەسـەرتۆ. ئەوانـە ڕووداوێك بوون پیشانیان دەدا کەبنەڕەتی ترین کار کۆکردنەوەی زانیارییـەو، ئاشکرای دەکـرد کـەچۆن ئـەم هـەنگاوە دەتوانێـت لەڕابەرایـەتیکردنی وڵات، تەنانەت لەوساتانەشی کەئارامی پێش قەیرانە، سوودبەخش بێت.

چـەندین جارفـایلم لەسەرکەسـایەتی پلـەداری دەوڵـەتێکی دەرەکـی بـۆ سەرکۆمار ئامادە کـردووەو، دروسـت بەچـەند ڕۆژێك بەرلـەوەی ئـەو کەسـە سەردانی فەڕەنسا بکات، پێشـکەش سـەرکۆمارم کـردووە. ئەوانـە زۆربـەیان فایلی کەسایەتی بوون، کەلـەوڵاتی خۆیداو لەلایـەن کارمـەندانی ئاسایشـەوە

لەوێ ئامادە کراوە. لەئەنجامدا، سەرکۆمار پێش ئەوەی میوانە دەرەکیەکەی پرسیارەکەی بکات، وەڵامەکانی ئامادە بوو.

سەرەڕای ئەوە، ئەمجۆرە زانیاریی کۆکردنەوانە، ئەو خاڵانەیان دەخستەڕوو کە بەتەواوی بەرژەوەندییە کەسایەتیەکانی لەخۆگرتبوو. بۆنمونە، ئەگەر پلەدارێك بیویستایە لەکاتی سەردانی بۆ فەرەنسا چاوی بەمن بکەوێت، ئاسایی بوو پێش ئەو هەنگاوە پەیوەندی بەباڵوێزخانەی خۆیان لەپاریس دەکرد. هەڵبەتە من دەمتوانی پەیامەکانیان بخوێنمەوە. باڵوێزخانەی ناوبراو لەماوەی هەفتەیەك یان مانگێك کارکردنە ناودەزگاکەمان دەرئەنجام وێنەیەکی خەیاڵی لەسەرم ئامادە دەکرد، کە دووبارە لەلایەن هەڵسوڕێنەرانی خۆمانەوە دەدرایەوەو بۆ پەیوەندیکردن بەمنەوە بەسوود بوو. لەکۆتاییدا ئەو پلەدارە دەرەکییە، ئەم پەیامو وێنەیەی بۆ شالیارەکەی خۆیان دەنارد: (ئەمە هەمان ئەو کەسەیە کە دەمەوێت چاوم پێی بکەوێت، چ بەرپەرچدانەوەیەکی بەرامبەر بەپرسیارەکانم دەبێت؟ بەبڕوای تۆ پێشبینی چی دەکەیت؟)

تا ئەو ساتەی ئەو دەگاتە ئۆفیسەکەی من، نەك تەنها دەزانم کە میوانەکەم بالآی چۆنە! مانۆڕی گفتوگۆو تایبەتمەندییەکانیشیم دەزانی، بەڵکو ئەو شتەشی کە لەم سەردانەیدا دەیویستو ئەوەشی تاکوێ دەتوانم لەگەڵیدا بڕۆمو دواهێڵی سنووردار لەکوێدا بکێشم، زانیارییم دەربارەی هەمووی هەبوو.

سیخوڕی وەك فۆرمی نووسین بەشێوەیەکی فراوان بەسەرکارەکانی بازرگانی، ئابووری، زانست، پیشەسازیدا زاڵ بووە. لەگەڵ بوونی تەکنۆلۆژیای تیرۆریزمو چەکە کۆکوژو تۆقێنەرەکان، ئەمجۆرە سیخوڕیکردنە بە بەلاوەنانی کاری پسپۆڕی بەسەرداشکان، زۆر ئاڵۆز دەبێت. هەریەکە لەدەزگا جاسوسیەکان ناچارن تەکنۆلۆژیای پێشکەوتووی بەکارهێنراو لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا بەدەستبهێنن، تا بتوانن ئەو شتەی دوژمن مەبەستێتی ئەنجامی بدات دیارییبکەنو تێبگەن تا چ ڕادەیەك دەتوانن

دامەزراوە پیشەسازییەکانمان بخەنە بەرمەترسی تێکدان، لەهێرشو دژەکان بیپارێزن. ئەم سووربوونی بەدەستهێنانە لەسەدا سەد بەرەو دۆزینەوەیەکمان دەبات کە بەئاشکرا لەمەیدانە ناسەربازییەکاندا زۆر سوودبەخش دەبن. ئەمجۆرەی کاری سیخوڕی، توانای زانینی ڕێگەی ڕووداوەکان لەوڵاتێکی تردا بەدەزگا دەبەخشێت، کە لەوانەیە چەندین ساڵ کاری تێدا کرابێتو بەملیۆنەها دراو بۆ فروانکردنو کاملکردنی لەخەرج درابێت. ڕووسەکان لەم بوارەدا هەوڵی زۆر گشتگیرانەیان داوە. لە نیۆرك، شەش ئەندامی بالوێزخانەی ڕووس هەموو ڕۆژێك لەئۆفیسی وەرگرتنی پاسپۆرتو ئیدارەی کاروباری بازرگانی کۆدەبوونەوە. ئەوانە بەشێوەیەکی فەرمی لەوێدا کۆدەبوونەوە، بەئاسانی کۆپی هەموو فایلو پاسپۆرتێکی کە لەماوەی بیستو چوار سەعاتی ڕابردوودا دەرچوو بوون، ئامادە دەکرد، بەڵام هەنگاوەکانی تریان کەمتر شێوەی یاسایی هەبوو، کە لەبواری سیخوڕیی پیشەسازی دا دەتوانرا گەورەترین سوودی لێوەربگیرێت.

ژاپۆنیەکان لەوبارەیەوە پسپۆڕ بوون. پیشەسازی ژاپۆنی پەیوەندییەکی نزیکی بەدەوڵەتەوە هەیە. کارمەندەکانمو خودی خۆم سەبارەت بەئەنجامدانی چالاکی لەدەرەوەی وڵات لێکۆلینەوەمان ئەنجام دەداو، هەوڵم دەدا بزانم لەفەڕەنسادا ئامانجیان لەکوێدایەو تەکنۆلۆژیایەکی کە بەبێ مۆڵەت کۆپیان کردووە، چۆن دەتوانن لەنێو دووژمنەکانمانەوە بۆ وڵاتانی تری ببەن. لەفەڕەنسا، ئەم چالاکی دژە سیخوڕییە بەگشتی لەئەستۆی (فەرمانگەی چاودێری وڵات) دایە. کارێکە کەئەوان بەچاکیو لێهاتووییەوە پێوەی سەرقاڵن. زۆر جاران ئێمە ئالوگۆڕی هەواڵو بەرپرسیارێتیمان هەبووە. تەکنیکی ژاپۆنیەکان وەك گۆلکەرێکی سادەبوو. کاتێك شتێکی دروستکراو سەرنجی ڕادەکێشان، کە تەکنۆلۆژیایەکی گرنگی دەویستو بەشێوەیەکی تایبەت ئامێری پێویست بوو، سوودیان لەئاستی گەورەو گرنگ وەردەگرت. ئەگەر بگەیشتنایەتە ئەو دەرئەنجامە، کە بۆنمونە فەڕەنسا یان سویسرا بەرهەمهێنەری ئەمجۆرە بەرهەمانەن، بەپەلە نوێنەرێکیان رەوانەی

ئەوێ دەکرد. شتێکی لەوجۆرە لەساڵی (١٩٧٨) ڕوویدا، کەسیستمی (سویچنیگ) بەهۆی کۆمپانیایەکی فەڕەنسییەوە تەلەفۆنێکی دیجیتالیی بۆ ماوەی دوور بەرهەمهێنا. ئێمە گرنگی دانی ژاپۆنیەکان بەومەسەلەیەمان لەڕێگای هاوکارە ئینگلیزەکانەوە کە لە(شلتهام) سەرقاڵی گوێڕا داشتنی گفتوگۆکان بوون، زانی. کاتێك قسەمان لەگەڵ کۆمپانیاکەو نوێنەرانیان لەتۆکیۆکرد، سەراسیمە بوون. ئەوان پاش لێکۆلینەوەی ناوخۆیی لەگەڵ ژاپۆنیەکان، لەکۆتاییدا گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە ژاپۆنیەکان لەسەرلێواری ئەنجامدانی کڕینێکی گەورەن، نەك دزینی زانیاری. دەستەلاتدارێکی پلە بەرزی ژاپۆنی کەکڕیارەکە بوو، لەماوەی گفتوگۆی لەگەڵ نوێنەرە فەڕەنسیەکانی تۆکیۆدەریبڕی بوو کە (خواستیاری کڕینی هەندێ لەبەرهەمەکانی ئێوەین.)

پێشتر لەچوارچێوەی دانوستانێکی تەواودا، گفتوگۆی پێویست لەگەڵ پیشەوەرانی فەڕەنسیو سویسری ئەنجامدرا بوو، تا هاوکاری بکەنو کارگەکانیان بەڕووی سەردانکارەکاندا بکەنەوە. بەمجۆرە، ژاپۆنیەکان بەگروپی دوویان سێ کەسی دەهاتن، لەهەمانکاتیشدا کامێراکانیان لەسەر سنگیانەوە بریسکەی دەداو دەسووڕا. داوای بینینی هەندێ ئامادەکاری تایبەتو قۆناغی پیشەسازییان دەکرد. سیخوڕەکەمان ئەوەی بەبیر هێنایەوە کە ئەوان بەتایبەتی دەرکیان بەهەندێ دروستکراوی نوێی تەکنۆلۆژی کردووەو سەرنجی ڕاکێشاون. ئێمە لەنزیکەوە شەووڕۆژ چاوەدێریمان دەکردن. لەشوێنی مانەوەیان لەهۆتێل (ئینتەر کنتینانتاڵ) کۆبوونەوەو لەنێوان خۆیاندا دەربارەی بابەتەکە گفتوگۆیان دەکردو تێبینیو وێنەکان ئەم دەستو ئەودەستیان دەکردو، ئەو ڕۆژە بەوردی ئاستە پێویستەکانیان هەڵسەنگاند.

دەرئەنجام کاری زیاتر هاتە ئاراوە، نوێنەرێکی بەرپرسیان پێشنیازێکی فەڕەنسی پشتگوێ خست تا لەبارەی بەرهەمە نوێیەکانەوە مشتومڕ بکات. یەکێکی تریان بڕیار بوو بۆ دووبارە وێنەگرتن بگەڕێتەوە بۆ کارگەکە. ڕۆژی

دوایی کارگەکە کرایە دوو بەش‌و بڕیاردرا ئەوە ڕۆژی دووەمین‌و کۆتایی دیدەنیکردن بێت.

ئەندامانی ئەوگروپە بەوبیرەی لەمێشکیاندا بوو، بەسەر بەشەکانی کارگەکەدا دابەشبوو بوون. ئەوەش ئامانجی بەدەستهێنانی زیاتری زانیاری وردو مومکین بوو سەبارەت بەماهیەتی قۆناغەکانی بەرهەم لەکارگەکەدا؛ بەڵام سەرپەرشتیارانی ناو کارگەکە باش لەلایەن کارمەندەکانمانەوە ئاراستە کرابوون. دوایین دیدار لەپڕێکداو بەبێ پێشەکی تێکچوو، مشتومڕەکانی دانووستان وەستا، ژاپۆنیەکان بەشکست خواردووی‌و ریسواییەوە بۆ وڵاتەکەیان گەڕانەوە. ئەفسوس ئەم چالاکی دژە سیخوڕییە سەرکەوتنێك بوو کە تارادەیەك دوور لەوڵاتەوە بوو. شکستی زیاتریش هەبوو. ژاپۆنیەکان لەزۆربەی وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاواو ئەمریکاشدا، لەئەنجامی چالاکی لەوجۆرە، بەرهەمی نوێی تەکنۆلۆژییان دەستکەوتبوو. پیشەوەرەکانی خۆرئاوا زۆربەیان دەبوونە کایەی دەستی ژاپۆنیەکان. چاوبڕینە پەیماننامەیەکی ئەفسانەیی هەندێجار تا ئەو شوێنەی دەبردن کە نمونەی کاڵاکانیان بنێرنە ژاپۆن. دوای ئەوە بەبێهیواییەوە ڕووبەڕووی هەمان کاڵا لەنمایشگایەکی بازرگانی خۆرئاوا دەبوونەوە، کە لەنماشگایەکدا دانراوە، هەڵبەتە باشتر دروستکراوەو هەرزانتریشەو مارکەی (دروستکراوی ژاپۆن)ی لەسەرە.

لەوەش مەترسیدار تر ئەوە بوو، زۆربەی ئەم کاڵایانە دەگەیشتنە دەستی دووژمنەکانمان. (توشیبا) کاتێك ئەو تەکنۆلۆژیا پێشکەوتووە ئەمریکیەی بۆ دروستکردنی پەروانەی ژێر دەریای، کە لەکەشتییە جەنگییە ئەتۆمیەکانی سۆڤیەتدا بەکارهاتبوو، بینی سەراسیمە بوون. وڵاتانی بلۆکی خۆرهەڵاتی ئەورووپا ئەمجۆرە تەکنۆلۆژیایەیان لەماوەی چەندین ساڵدا ڕاستەوخۆ دزیبوو؛ گەواهی ئەم قسەیەش دزینی تەکنۆلۆژیای فڕۆکەی (کۆنکۆرد)و (T.S.S)ە.

هەرچەندە لەکۆتاییدا ئەو جۆرە فڕۆکانە لەبواری فڕیندا شکستیان هێنا، بەڵام لەڕاستیدا (کۆنکۆرد)- جگە لەکارمەندە چارە ڕەشەکانی کە لەکاتی

تاقیکردنەوەکاندا تووشی چەندین پێکدادان بوون- وەك کارێکی هاوبەشی فەرەنسی- ئنگلیزی ناسرا. فڕۆکەکە بەناوی (کۆنکۆردی ئیسکی) ناسرا. ئەمەش نمونەیەکی وردو کلاسیکیانەی کاری سیخوڕی پیشەسازییە لەپێودانگە نێونەتەوەییەکاندا. ئێمە لەناو کۆمەڵگای ئازادی خۆرئاوامانەدا چۆن دەتوانین پێش بەمجۆرە دزییانە بگرین؟ لەماوەی چەندین ساڵدا فەرەنساو دەستەڵاتدرانی تری خۆرئاوایی، ئاشکراو بەشێوەیەکی یاسایی، کارخانەی تەواو کامڵیان دەدایە سۆڤیەت (چونکە بۆ سازشکردن دەیانویست کڕیار بەس کلیلەکە بخاتە دەرگاکەوەو دەستبەکاری خۆی بکات). ئۆتۆمبیلە بارهەڵگرەکانی لەلایەن سۆڤیەتەوە لەداگیرکردنی ئەفغانستاندا بەکارهێنرا، لەنەخشەسازی لۆری (کاماریۆر)ەو لەلایەن کۆمپانیایەکی ئەوروپای خۆرئاواوە دروستکرابوون. لەورووە تایبەتانەو لەزۆر سەرچاوەی دییەوە، رێککەوتنی ماوەکورتی هاوبەش، بەتەنیا بزوێنەری سەرەکی بووە؛ کەپێدەچێت جوغزی هاوبەشی کردنەکە کارێکی باش بووبێت، بەڵام لەڕووی هەلومەرجی نەتەوەییەوە، پرسیارێکی سەرسوڕهێنەرانە بوو. ئەو جۆرە کارانە بەپێی بڕیارە دەوڵەتیەکان، تەنها دەبێت تایبەت بن بەکەوشەنی ناوخۆی وڵات. تەنها لەژێر ڕۆشنایی بڕیارە ئاشکراکانی ئاسایشی نەتەوەیی، لەژێر دەستەڵاتی پەیماننامەی (کۆکۆم) (کۆمیتەی هاوکاری چەند لایەنە بۆ هەژموونکردنی هەناردەکان) دەتوانرێت ڕێگری لەناردنە دەرەوەی تەکنۆلۆژیای پێشکەوتوو بۆ ڕوسیا بگیرێت. پەیماننامەی سەرەوە لەنێوان وڵاتە خۆرئاواییەکان لەساڵی (١٩٥٠)وە چووە قۆناغی جێبەجێکردنەوە. ئەم پەیماننامەیە بەربەست بوو لەبەردەم کەسانێکی کەخوازیاری بازرگانی بوون لەگەڵ خۆرهەڵات- بازرگانییەکی کە بۆ کۆمپانیاکانیان پڕسوود بوو، بەڵام کۆمەکێکی گەورەی بەهێزە کۆمۆنیستیەکان و دووژمنانمان لەجەنگی سێیەمی جیهانیدا دەکرد- (لینین) ئەو کەسانەی کە بەرپرسی ئەنجامدانی ئەو جۆرە کارانە بوون ناونابوو (گێلە سوود بەخشەکان).

(ئارماندهامر)ی خوا لێخۆشبوو، باوکیشی یەکەمین میانجیگەری ئەم گرووپە بوون کە لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەتدا پەیوەندییان دروستکردو، بەئاشکرا لەناو ئەو پێناسەیەی (لینین) دابوون. لەهەندێ ڕووەوە، دوژمنەکانمان لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا بەهۆی ویستو ئامانجی کۆمپانیا باکوریو پیشەسازییەکانی بەرهەمهێنەرانی چەك،هەندێجار سنووری کاریشیان تێدەپەڕاند. بازرگانانی چەك لەفرۆشتنی چەكو تەقەمەنیو فرۆکەی جەنگی بەعێراق، بڕێکی زۆر سوودیان لەگیرفان هاویشت. (معمر قەزاف) سەرۆکی لیبیا، لەکۆمپانیا ئۆتۆمۆبیل سازییەکانی ئەروپادا بەبڕێکی بەرچاو سەرمایە گوزاری کردووە. پاکستانو ئەوانیدی لەخۆرئاوا بەهاتنە کایەکەوە وەك کڕیارێکی گەورە بۆ تەواوکردنی ئامادەکارییە پێویستەکانی جموجۆڵ بەرەو بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی، نوقمی شادمانین. کاتێك ئاشکرابوو کە لۆرییەکانی (بینز)، لەساڵی ۱۹۹۱ لەماوەی جەنگی کەنداوی یەکەم، بۆ هێنانو بردنی سەربازانی عێراقی لەبەرەکانی شەڕ بەکارهێنراون، (دایملەر بینز)ی ئەڵمانی بەتەواوی تووشی شۆك بوو. تەنانەت لەوەش خراپتر، فرۆشتنی فرۆکەی (میراژ۲۰۰۰)ی فەڕەنسی بوو بەعیراق بۆ بەکارهێنانی لەجەنگی عێراقو ئێران. بوونی ئەم جۆرە فرۆکانە لەئاسمانی (کوەیت)، مانای ئەوە بوو کە هەندێ لەهێزە ئاسمانیەکانی فەڕەنسا لەوێدا بوونیان هەیە، بەلام بەدرێژایی جەنگی کەنداو لەترسی هەڵەکردن لەگەڵ فرۆکە جەنگیەکانی عیراقو مەترسی تەقە لێکردنیانو بەردانەوەیان، نەخرانە بواری پراکتیکەوە. بەمجۆرە، زۆر پەیماننامەی پەرمیو تەواو گشتیو ئاسایی هەبوونو هەروەها مامەڵەی تریش کەبەنهێنی ئەنجام دەدرا لەئارادابوون، کەزۆرجار دەبوونە بابەتی سەرنجڕاکێشو ئەو بەرپرسانەی ئەوانەیان ئەنجام دەداو پیشەوەرە خۆرئاواییەکان کە مامەڵەی پڕ قازانجیان بەدەست دەهێنا، ئافەرینی خۆیان دەکرد. لەپشتی ئەم چالاکیە بازرگانیانەو زۆریدی لەشتە شاراوەکانو بەهۆی سەیرکردنی تەلەفزیۆنەوە، کارمەندە ئامادە کراوەکانی سیخوڕیو نیشتەجێ لەهەموو وڵاتانی بلۆکی

خۆرهەلاتیو ژمارەیەك لەولاتانی خۆرهەلاتی ناوەڕاستو ئەفریقا، کە بەردەوام درێژە بەهەڕەشەکانیان دژ بەدووژمنەکانیان لەباکور دەدەن، ڕێنمایی و کۆنترۆڵ دەکران. کارمەندانێکی تاڕادەیەکی زۆر- لەنێوان ٣٥ تا٦٠٪- بالوێزخانەکان، کۆنسوڵەکانو کۆمپانیاکانی هەناردەو ئاوردەکان بەڕێوەدەبەنو، زۆربەیان لەژێر چەتری دیبلۆماتیدا شاراوەن. لەکۆمەلگا دیکتاتۆریو کۆمۆنیستیەکاندا، هەموو ئەم گروپانە ڕاستەوخۆ بەرپرسی ئاسایشی دەولەتین، چونکە لەوێ هەرکەسەیان پلەدارێکی ڕەسمییە. ئیمتیازی سەفەرکردنو ژیان لەهەندەران بەسەربردن، لەگەڵ مەرجی چاودێریکردنی توندی خۆرئاوا، زۆربەی جار دووانەی ئەو فرمانەن؛ بەڕێوەبردنی فرمانی هەموو دەزگاکان، لەوانە فرمانی سیخوڕی پیشەسازی، سیاسیو تەنانەت لەوانەش زیاتر چالاکی تیرۆریستانەیە، کە لەوانەیە لەولاتێکی سەرەتاییەوە فرمانی جێبەجێکردنیان دەربچێت. ئەم کارانە لەولاتانی بلۆکی ڕۆژهەلاتیو لەناو ژمارەیەك لەدووژمنانمان لەدیکتاتۆرەکانی جیهان لەحالەتی فراوان بووندایەو ڕاستە. دەستەلاتدارانی فەرەنسی لەوبڕوایەدان کە پلەدارەکانی ئاسایشی سووریا وەك دیبلۆماتی بالوێزخانەکەیان لەفەڕەنسا دامەزرێنراون. ئەوهەنگاوەش بەوە دەرکەوت کە بەنهێنی بۆمبیان لەناوپاریس داناوەو کاری تیرۆریستیان لەسالی (١٩٨٠) ئەنجامداوە، لەوانەش تەقینەوەیەکی مەرگ ئامێزی ڕێستورانتێکی لوبنانی لەشەقامی (ماربۆف)، کە لەدەرەوەی کۆشکی (ئەلیزێ) بوو. بالوێزخانەی لوبنانیو دیبلۆماتەکانی کە لەپاریسو لەندەن نیشتەجێ بوون بەجۆرێکی ڕێكوپێك بلاوبوونەوەو دەستیان کرد بەگەڕان بەدووی چەكو تەقەمەنییەکی کە لەلایەن تیرۆریستەکانەوە لەئەوروپا بەکارهاتبوو.

پێویستە ئێمە توانای دژە سیخوڕیمان پەرەپێبدەین، چونکە دووژمنەکانمان هەولی خۆیان دژ بەکارمەندەکانمان، دەولەتەکانمان، بازرگانیو پیشەسازییەکانمان بەهێز کردووە. دەبێت ئێمە ژمارەی دیبلۆماتەکان، یان سیخوڕەکانی کە لەهەردوو لاوە بواری کارکردنیان

پێدراوە، یەکسان بکەین، تا کاری چاودێریکردن ئاسان بکەین. لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەکی گشتی خۆ دووربگرین لەبەکارخستنی بیانیەکان لەناو دامەزراوە جێگیرەکانی وڵاتانی دیدا، بەوجۆرەی کە لەڕابردوودا ئەمریکیو فەڕەنسیەکان دەیانکرد، بەڵام هەرگیز ڕووسەکان نەیاندەکرد. چونکە ئەوە تەنها بەدەردیسەری کۆتایی دێت. لەهەریەك لەڕووەکانی ئەم شێوانە، ڕووسەکان خاوەن پشکنو بەچنگیشی دێنن، کە بەهۆیەوە گەمەکە لەسەر زەوی واقیع بەسوودی خۆیان دەگۆڕن.

ئەوان بۆ بالوێزخانە نوێیەکەیان لەواشنتن شوێنێکیان هەڵبژارد بەسەر گردێکەوە بوو، کە دەیڕوانی بەسەر پایتەختدا. ئەو شوێنە بارەگای سەرکی چالاکی سیخوڕی پەیوەندی ئەلکترۆنیان بوو. لەمۆسکۆ کاتێك بالوێزخانەی نوێی ئەمریکا لەهەمان کاتدا، واتە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠، دروستکرا، ڕوسەکان بۆ هەل دەگەڕان تاخاڵی لاوازییان بدۆزنەوە، بەهۆی ئامێری گوێڕا داشتنەوە، ئاگاداری گفتوگۆکانیان بن. لەگەڵ ئەوەشدا نابێت ئێمە بەوگومانانەی کە سەرچاوەکانمان لەگۆشەو کەنارەکانی جیهاندا دەتوانن زۆر وردترو سوودبەخشانە تر لەڕووی پوچەڵکردنەوەی هەڕەشەکانی سۆڤیەتەوە کار بکەن، ڕازیو خۆشبەخت بین، چونکە (KGB)و دەزگای هەواڵگری سەربازی ڕووسیا بەهەمان شێوەی کە لەهەموو ڕوسیادا سەرقاڵن، بەوجۆرەش لەناو فەڕەنسادا درێژە بەکارەکانیان دەدەن. لەوانەیە تەنها بەوە ئۆمێدەوار بین کە لەداهاتوودا ئەو توانایەی لەدەست دەدات، بەڵام ئەوە پەیوەست نییە بەدەمی ئێستاوەو، لەلایەکی دییەوە نابێت ئێمە ئاستی پارێزگاریکردن لەخۆمان نزم بکەینەوە. هێشتا ڕەگەزە سیخوڕە ڕوسەکان لەبارەگاکانی دەکەونە ناو پاریس، مارسی، لیۆن (ئەو شوێنەی کە ڕێکخراوی پۆلیسی نێونەتەوەیی لەم دواییانەدا بارەگای خۆی تیا دامەزراندووە)و ناوچەکانی دیش، چالاکی دەنوێنن. دەبێت ئێمە سەرچاوە بۆ چاودێریکردنو بەدواداچوونی دوژمن لەهەرناوچەکی سنوری، بۆ ئەوانەی لەپشتی سەنتەرە هەستیارەکانمانەوە سەرقاڵی ئەنجامدانی چالاکین– بەتایبەتی بەرامبەر

بەدووژمنە نوێیەکانمان- ڕێك بخەین. هەمیشە لەوە نەدەگەیشتم کە بۆچی دەبێت گروپی پارێزراوانی سۆڤیەتی چوار تا پێنج جار بەرامبەر بەچاودێرانی ئێمە کە لەولاتی ئەواندا هەمانە، ژمارەیان زیاتر بێت. یەکسانی کارمەندان دەبێت بەشێوەیەکی یاسایی بێت. ئێمە چەندین ساڵە ڕێژەیەکی یەکسانمان لەناو ولاتە دیکتاتۆرییەکانی ولاتانی جیهانی سێدا دامەزراندووەو پەیڕەومان کردووە. لەولاتی ئەواندا، ئێمە بەتەواوی لەژێر چاودێریو کۆنترۆڵ داینو، تەنانەت ناشتوانین دوویاردە بجولێین بەبێ چاودێر. هیچ کامێك لەم هەلومەرجانە لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت جیاوازی بنەڕەتی نییەو لەزۆربەی پایتەختەکاندا، لەپاش جەنگی کەنداوەوە، توندتر بووە. لەگەڵ ئەوەشدا دیپلۆماتەکان، یان سیخوڕەکان لەولاتی ئێمەدا بۆ هەرشوێنێك دڵیان پێی خۆشبووە چوونو ئازاد بوون. ئەندامانی (KGB)و کارمەندانی هەوالگری سەربازی ژیانێکی سەرسوڕهێنەرانەیان هەیە. دەتوانن هەرکەسێکی کە دەستنیشان کراوە چاوپێکەوتنی لەگەڵ بکەن، دەتوانن (بەکەمترین ڕێگری دیاریکراو) بۆ هەرشوێنێك کەبیانەوێت سەفەربکەن؛ ئەوانە بەبێ هیچ چاودێرییەکی تایبەتی ئەنجام دەدرێت. لەشارێکی وەك پاریسدا، شوێنێکی کە لەدەیەکانی ١٩٧٠و سەرەتای ١٩٨٠دا لەوپەڕی شکۆداری خۆیدابوو، چەند سەد فەرمانبەرێکی بالای سیخوڕی بلۆکی خۆرهەلات- جگە لەسەدەها کەسی کە لەولاتە دیکتاتۆرییەکانی جیهانی سێیەمەوە هاتبوون- وەك دیپلۆمات سەرقاڵی ئەنجامدانی چالاکی بوون، کە لەڕووی فیزیکیەوە چاودێریکردنیان کارێکی زۆر دژوار بوو. لەمۆسکۆ جۆرە ئۆتۆمۆبیلێکی تایبەت هەیە بەئاسانی چاودێری خەڵك دەکەن. ئەنجامدانی کارێکی لەوجۆرە لەپاریس، لەندەن، یان نیۆرك- شوێنێکی کە هاتووچۆ تیایدا جەنجاڵە- تاڕادەیەك نەگونجاوە. کارمەندو دیپلۆماتەکانمان لەمۆسکۆ بەبێ فەرمانی فەرمی مۆڵەتی دەرچوونیان لەناومۆسکۆدانییە. ئەفسەرانی نیمچە سەربازی تایبەت یان سێ میل بەدرێژایی شارێکان بۆ چاودێریکردنیان بەدوویاندا ڕەوانە دەکرێن. ئەگەر یەکێکی ئێمە لەپاش دەرچوونی لەخاڵە

کۆنترۆڵکراوەکان لەگەڵ یەکێکی ئەوان ڕووبەڕوو نەبۆوە، ئەفسەرانی نیمچە سەربازی بەدوویاندا ڕەوانە دەکرێت؛ ئەوانە تەنانەت لەکاتی لێقەومانیشدا کۆمەکیان پێنەدەکرین. ڕۆژێکیان لەزستانی ساڵی ١٩٧٦، من لەپاریس ئەفسەر کارمەندێکم بینی، کەوەزیری کاروباری دەرەوەی فەڕەنسابوو، کە هاوشانی وەزیری دەروەی ویلایە تەیەککگرتووەکانی ئەمریکای ئەنجامدەدا. بەهەرحاڵ، ئێمە پاش چەندین ساڵ یەکتریمان ناسییەوە، چونکە بەدرێژایی ماوەی خزمەتکردنم لەدەزگای جاسوسی فەڕەنسادا بەدەگمەن پەیوەندی ڕاستەوخۆم هەبووە. ڕاپۆرتەکانی من ڕاستەوخۆ دەچووە بەردەم سەرکۆمار، لەکاتێکدا کەبودجەی دەزگاپێویستی بەپشتگیری سەرۆك وەزیران هەبوو.

بەشی زانیاری وەزارەتی دەرەوە کەڕێنمایی وەزیری کاروباری دەرەوەی دەکرد لەگەڵ ئێمەدا کەناڵێکی جیاوازی زانیاری بوو. زۆرجار ئەفسەرانی زانیاری، یان دیپلۆماتەکانی وەزارەتی دەروەوە ئاگادار دەکران، کە بنەمایەکی واقیعو گرنگی کە دەبێت چاودێری بکەن جۆری ئەو زانیارییانەیە کە سەرچاوەکانی ئێمە بەشێوەیەکی جیاواز بۆ دەوڵەتیان ئامادە دەکرد.

وەزیری کاروباری دەرەوە بەمنی وت: (هەواڵی خۆشم لەلایە، بڕیارە بەمزووانە لەگەڵ هاوەڵە ڕوسەکانمان چاوپێکەوتن ئەنجام بدەین، بڕیارە مۆڵەتی دروستکردنی کۆنسوڵیەکمان لە (لینینگراد) بدەنێ. ئەوانیش هاوشێوەی ئەوە لە(مارسی) دروستبکەن.)

وتم: (ئاخ..خوای من، دەتوانم بپرسم ئەوان دەتوانن چەند کەسیان لەمارسی هەبێت؟)

وەلامی دایەوە: (دەوروبەری پەنجا کەس) من وتم: (ئەی ئێمە لەلینینگراد چۆن؟)

وتی: (پێنج کەس، دیارە گەر خەڵکی سیڤیلمان دەست کەوێتو ئامادەبن بچنە لینینگراد.)

بەتووڕەییەوە سەیری بەڕێزیم کردو دەرمخست کە نەك هەر هەواڵێکی خۆش نییە، بەڵکو ناخۆشترین هەواڵیشە. دەرئەنجام، ژمارەی کەسانی ڕێگا

پێدراوی سۆڤیەتی لەمارسی کە مکرایەوە. بەمجۆرە، دوای چەندین مانگ، دەستەلاّتدارانی ئاسایشی فەرەنسی دەستیان کرد بە بەدوادا چوونو چاوەدێری ڕۆژانەی ڕوسەکانی لەمارسی سەرقاڵی کار کردن بوون. زانیمان کە نیوەی بالوێزەکان سیخوڕی پرۆفیشناڵینو کار بۆ دەزگای جاسوسی سۆڤیەت دەکەن. بۆچی ڕووسەکان ئەم بەشەی فەرەنسایان ئەوەندە بەلاوە گرنگ بوو؟ هەڵبەتە ئەو جێگایە بەندەرەو لەسەر دەریای ناوەڕاستەو شوێنی ئامادەکاری دەریایی ئێمە بوو. ژێر دەریاییە ئەتۆمیەکانی فەرەنسا لەتۆلۆن جێگای سەرنجی تیژی سوپای ڕووسیا بوو. ئەو گرنگی دانەیان لەبەرخاتری هاتووچۆی کەشتیەکانی خۆیان نەبوو- کە ئەمڕۆ لەڕێگای مانگی دەستکردو ئامێرە ئەلکترۆنیەکانەوە زۆر ئاسانتر ئەنجام دەدرێت- بەڵکو بەهۆی سیخوڕی کردنەوە بوو بەسەر کەشتییە جەنگیەکانەوە. لەڕاستیدا لەوحاڵەتەدا دەیانتوانی کۆکردنەوەی زانیاری لەسەرنەخشەی مانۆڕەکان، ئامانجە سەربازییەکانو ئامادەکارییەکانی وڵات تەنها لەڕێگای پەیوەندی لەگەڵ کارمەندانی هێزی دەریایی فەرەنساو کارمەندە سیخوڕەکانی ڕوسیا بەئەنجام بگەیەنرێت. سەرەڕای ئەوەش نابێت ئێمە ئەوە فەرامۆش بکەین کە ئەو شوێنەی نزیك (مارسی) دامەزراوەی لێکۆڵینەوەی تایبەتی فەرەنسای تیا کۆکراوەتەوە. (A.B.M)و ژمارەیەکیش لەکۆمپانیا نەتەوەییەکان لەتاقیگەکانی ئەوێدا سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بوون.

چەند مانگ دوای ئەوەی ڕوسەکان کۆنسۆلیەکەیان لەوێ کردەوە، ترسی من زیاتر بوو. سەرۆکی (A.B.M)ی فەرەنسا لەئۆفیسەکەی خۆم سەردانی کردم. بەویقارو لەخۆباییەوە دەستیبە قسەکردن کرد: (دووچاری گرفت بووم، بەهۆی ئەوەی کە ئێوە دەناسم، ڕێگام بەخۆمدا کە دیدەنیتان بکەم. یەکێك لەئەندازیارەکانم لەبەشی لێکۆڵینەوە لەدامەزراوەی تاقیکاری سەرەکی (A.B.M) لەخوارووی فەرەنسا، شێتو شەیدای کچە ڕوسێکی سەر بەکۆنسۆلی ڕوسیا لەمارسی بووە، لەلام سەیرە کە بۆچی؟

وەڵامم دایەوە: (بۆچی ناوێ، من لەلام سەیر نییە.) تایبەتمەندیەکانی ئاڵوگۆڕکردنی کۆنسوڵەکانی (لینینگراد ومارسی)، هەروەها ماهیەتی تازەی ڕوسیا لەوناچەیەم بۆ ڕوونکردەوە.

هەڵبەتە (لینینگراد)یش بۆ ئێمە وەك بنکەیەکی گوێڕا داشتنی دەزگاکەمان سەرنجڕاکێش بووە. بەمپێیە بۆچی جیاوازی گەورە لەژمارەی کارمەندەکان هاتبووە ئاراوە؟ یەکەم، لەبەرئەوەی ئێمە بەپێی پێویست خەڵکی سیڤیل یان سەربازیمان نەبوو. سەرەڕای ئەوەش، دامەزراوەی سیاسی فەرەنسا لەگەڵ دابینکردنی تەواوی پێداویستیەکانی نیشتەجێبوون و خزمەتگوزاری سەرەکی ژیان بۆ کارمەندەکانی نەبوو. لەم ڕووەوە بێبڕوایی قوڵ و هەمەلایەنە لەسەر دابەشکاری هەمەچەشنەی نێوان ئەندامە دیپلۆماتە فەرەنسیەکان و گروپەکانی زانیاری لەگەڵ هاوشانەکانیان لەدەزگاکانی ئەمریکاو بەریتانیادا توندتر ببوو. تەنانەت لەنێو دیپلۆماتە پرۆفیشناڵەکانیشدا، کە دەبوو باشتر هەست بەچۆنیەتی کاروبارەکان بکەن، تێگەیشتنی بنەما کاڵ و کرچ سەبارەت بەکاروبارەکانمان تەشەنەی کردبوو.

دیپلۆماتەکان لەبەر ڕۆژی ڕۆشناو کارمەندانی زانیاری لەژێر پەردەپۆشی زۆر نهێنیدا کار دەکەن. سەبارەت بەفەرەنسا، هاوکارەکانمان زۆربەیان بەهۆی جیاکردنەوەی کارەکانیان وەك ئەفسەری زانیاری لەکاری کەسانی سەربازی فەرەنسا دووچاری گرفت بووبوون. بێچەندوچوون، زۆربەی کەسە ڕاپەڕێنەرەکانمان لەیەکە ئاساییەکانی ناوسوپاوە هاتبوون و ئەم بابەتەش لەزۆربەی دەزگا زانیارییەکانی تریشدا هەروایە. بۆیە تێگەیشتنی کاڵ و کرچ هەبوو، کە توانای بەلاوەنانیشی نەبوو؛ زۆربەیجار کە ئەو بیروڕایانە دەبوونە دوژمنی ڕاستەقینەو ڕووبەڕوو، دوودڵییەکان زیاد دەبوون. بەمجۆرە چالاکیەکانی ئێمە لەگەڵ چالاکی سەربازەکان یان دیپلۆماتەکان لەچیدا جیاوازن؟ ئەوە کاری سوپایە کە توانای سوپاکانی پەیمانی (وارشۆ) هەڵبسەنگێنێت. زانینی ئەوەشی کە ئەفسەرەکانیان چۆن بیردەکەنەوەو چۆن ورەیان بەرز دەبێتەوە، چۆن دەوروژێن و هەلومەرجە ڕۆحیەکانیان

چییه، لەئەستۆی ئەواندایە. کە دیارە ئەو شتانە زۆر دژوارن‌و، بەڵام لەهەمان کاتیشدا مایەی ژیانــە. لـەم ڕووەوە، دۆزینـەوەی ئـەوەی کـە تیرۆریسـتەکان چۆن بەرەو ئامانجەکان دەچن، یان چۆن ئامانجەکانیان هـەڵدەبژێرن، خاڵی سمینیـان لەکوێدایـە، چـەك‌و هاوپەیمانـەکانیان کامانـەن، هـەموو ئەمانـە دەتوانـن بەربەسـتی ڕوودانـــی ڕووداوێکـی کارەسـات بـاربن. زانیـاری کۆکردنـەوەی ئـەم بوارانـە بـۆ ڕێگا گرتـن لـەبازرگانی مـادەی بێهۆشـکەر، سیخوڕی پیشەسازی‌و هەڕەشەو وێرانکارییەکانی تر کـە بەرامبـەرکارەکانمان دەکرێـت، زۆر پێویسـتە. ئەوانـە مەترسییەکن کـە دژوارییـەکانی پـەیمانی (وارشۆ) سەخت تردەکات. بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کـەمن سـەرۆکی دەزگـای دژە سـیخوڕی فەڕەنســا بــووم، دیــاربوو کــەزانینی جموجۆڵــی یەکــە سەربازییەکانی پەیمانی (وارشۆ)، چەند هەفتە پێشتر یان چەند ڕۆژو سەعات زووتـر بـۆ حاڵــەتی ئامادەباشــی‌و ئاگادارکردنـەوە دەتوانێـت هــەنگاوێکی پەڕاوێزی بەڵام زۆر گرنگ بێت بۆ بەرگریکردن لەئەوروپای خۆرئـاوا. بۆنمونـە ئێمە بەوردی سەرنجی بێسنوورمان لەسەرسوپای بیستەمی میکانیکی گاردی ڕوسـی دانـابوو (ڕوسـەکان لـەزۆر ڕووەوە نـاوە قەیسـەرەکان بۆیەکــەکانیان هــەڵدەبژێرن) زەمینـەی کـاری گروپەکـەمان پەیوەسـت بـوو بەبــەرلینی خۆرهەڵاتـەوەو، یـەکێك بـوو لەوگروپانـەی گەرشتێك ڕوویبدایە لەســەرتاوە لەلایەن پەیمانی (وارشۆ)وە هێرش دەکرایە سەری، لەوانە بـوو کەسـانێك بـن لەحاڵەتی ڕوودانی جموجۆڵێکی گشتیدا لـەدیواری ئاسنینەوە بـەرەو کـەناڵ ڕابماڵرێن.

شەوێك لەماڵەوە تەلەفۆنم بۆکرا. لەنزیك جێگای خەوتنەکەم دوو تەلـەفۆن هەیە. یەکێکیان تایبەت‌و فـەرمی‌و ئـەویدییان هێڵـی تایبـەتی کۆنتـرۆڵ کـراو بەئۆفیسەکەمەوە لەسەنتەری بەڕێوەبەرایەتیەوە بوو. دووەمیان تا درەنگانی شـەو زەنگــی لێـدەدا. ئـەمجارەیان هــەواڵێکی شـومی ڕاگـەیاند. یـەکێك لەیاریدەدەرەکان بەجۆرێکی ڕەمـزی وتـی: (لـەپاش نیـوەڕۆی ئـەمڕۆی ئـەم کارە سەرگەرم کارەی ئێمەدا، شتێکی تازە ڕوویداوە.)

ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٧٣) بووکاتێك سوپای میسرو سوریا دژ بەسوپای ئیسرائیل ئامادەبوو بوون، کە ئەم ڕیزبەندییە وەك کارەساتێکی ناخۆش بەسەر عەرەبەکاندا شکایەوە. لەوپاش نیوەڕۆیەدا بەڕێوەبەری بەشی زانیاریی سەرپێییانە پێی وتم: (سەیرە، یەکەی چەتر بازانی (ئایکس) لەڕوسیای سۆڤیەتیدا هیچ وەڵامێکی نەداونەتەوە). ماوەیەکی دوورودرێژ هیچ کاردانەوەیەکمان لەلایەن مۆنیتەرەکانەوە نەبوو. ئەو یەکەیە، یەکەیەکی بەرجەستەی سوپای سووری نیشتەجێ لەجێگایەکی خوارووی مۆسکۆ بوو، کەگوێمان لەگفتوگۆکانیان دەگرت. ئێستا لەپڕێکدا دەنگەکە نەمابوو، وادیارە بێدەنگییەکی ڕادیۆیی لەئارادا بێت. پاش بیستنی ئەوە فرمانماندا بەگشت مۆنیتۆرەکان: (لەوەی کەڕوو دەدات ئاگادارم بکەنەوە. ئەوەی کە لەدەست چووە دووبارە بەدەستی دەهێنینەوە، لەوبارەیەوە پرسیار لەهاوپەیمانەکانمان بکەن.)

لەئۆفیسەکەم مامەوەو سەعات بەسەعات بەدووی هەنگاو بەهەنگاوی کارەکاندا دەچووم. هەمووجارێکیش وەڵامەکان وەك جاری پێشوو بوون: (هێشتا وەڵام نەدراوەتەوە.)

هەموو سۆڤیەت دیارنەمابوو. بەدرێژایی شەو هەڵوێستەکە سات بەسات ئاڵۆزتر دەبوو. هەواڵەکان باسیان لەوە دەکرد کە فڕۆکەی بارهەڵگر لەبەشی خوارووی سنووری تورکیا- ئەو شوێنەی کە ئەمریکا ئامێری ئەلکترۆنی وردو فراوانی تێدا هەبوو- لەحاڵەتی هاتووچۆدا بوون. بەپێکەوە لکاندنی هەموو ئەو شتانە، بەخێرایی گەیشتمە ئەوئاکامەی کە ئەگەری ڕوودانی خراپترین شت لەئارادا بێت. گەڕامەوە بۆلای دەستەی باڵای یاریدە دەرەکانمو، وتم: (دیارە بابەتەکە ئەمەیە کە ئەوان لەحاڵەتی چوونەناو خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدان.) پسپۆڕەکەمان لەبواری فڕۆکەوانیدا بەرەو لای نەخشەنماکان چوو، ئێمە لەسەرمێزی کۆنفرانسی ناو ئۆفیسەکەم بڵاوببووینەوە. کاغەز لەهەموو شوێنێك بڵاوببۆوەو کارمان لەسەردەکردن تابزانین ماوەی شوێنی ونبوونی یەکە چەتر بازەکەی ڕووسیا تا شوێن گریمانەی ئامانجەکانیان

لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەفڕۆکە چەند سەعاتە. بەواتایەکی دی، چ کاتێك دەتوانین دڵنیا بین کە ڕوسەکان بەشدارییان لەوێدا کردووە؟

لەوجێگایەدا چەند ئامانجێکی گریمانەیی لەئارادا بوو؛ لەوانە بەرزاییەکانی جۆلان، ئەو شوێنەی پێگەی ئەو ئامادەکاریانەی سوریا بوو کە لەلایەن سۆڤیەتەوە ئەنجامدرابوو، ئیسرائیلیەکان بەهۆی هێزی ئاسمانییەوە زیانێکی زۆریان بەوجێگایە گەیاندبوو. بیابانی سینا، شوێنێکی کە لەڕاستیدا تێیدا هێزە ئامادەکراوەکانی میسر لەلایەن سوپای ئیسرائیلەوە تێك شکێندرابوون.

چواردەورم بەئەفسەرانی زانیاری فەرەنسا گیرابوو. ژەنەڕاڵێکی کەسەرۆکی بەشی زانیاری بوو لەگەڵ ئەفسەرە پلەدارەکانی‌و لەهەمان کاتدا پسپۆڕانی ئاسوپایی هەموو کۆببوونەوە. هەریەکەیان بەسەرەی خۆی کورتەی هەواڵەکانی خۆیانی پێڕادەگەیاندم، پاشان هەموو چاویان بڕییە من. لەوساتەدا، وەك بەڕێوەبەری (دەزگایەکی نهێنی)، پرسیاری هەستیارم لەخۆم دەکرد: (ئایا پێویستە تەلەفۆن بۆ سەرکۆمار بکەم؟) لەکۆتاییدا بەپێی ڕەمەك یان هەستی شەشەم بڕیارمدا سەر کۆمار بێدار نەکەمەوە. دەرئەنجامی هوشیار بوونەوە ئەوەی سەلماند کەهیچ ڕوونەداوە. پاش چەند سەعاتێك دووبارەیەکە ڕوسییەکان لەسەر ڕووە ئەلکترنیەکانمان بەدەرکەوتنەوە. بەهیچ جۆرێك نەگەڕابوونەوە بۆ وڵاتەکەیان. ئێمە ڕوونکردنەوەی زیاترمان لەلانەبوو. بەڵام ئەم ڕووداوە پێویستبوونی بنەڕەتیانەی زیاتری کاری زانیاری دەرخست، کە ئەویش پێویستبوونی کۆکردنەوەی زیاتری ڕەگەزو زۆرتری زانیاریی بوو. لەهەڵسەنگاندنەکانی کۆتاییدا، ئەنجامگیری‌و دەرکی کەسێتیمان، کە هەستێکی بەبەهای بەرهەمی ساڵەهای ئەزموون بوو، وای دەردەخست کە دەبێت دوابڕیار بدرێت. ئەو بڕیارە لەوانە بوو پەیوەست بێت بەچارەنووسی وڵاتەوە. دەمانتوانی لەوڕووداوەوە چەندین وانە فێرببین: یەکەم، لەوانەیە گرنگترینیان ئەمە بێت، ئاوڕدانەوە لەبابەتی پەیوەندی نێوان بەڕێوەبەری گشتی دەزگای دژە سیخوڕی‌و سەرکۆماری فەرەنسا. لەوشەوەدا کاتێك کێشەکە ئاشکرا بوو

گەیشتینە یەقینێك کە بەتەواوی لەسەرلێواری کارەساتێکی جیهانی ڕاوەستابووین- کە پەیوەند بوو بە بەشداریکردنی سۆڤیەت لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست- لەمەوە خاڵێکمان بۆ ڕوونبۆوە. هێڵێکی تەلەفونی ڕاستەوخۆم لەگەڵ سەرکۆمار هەبوو، کە لەتەنیشت گۆشەی مێزەکەمدابوو، بەڵام گەر سەغڵەتم بکردایەو هیچ ڕووینەدایە، متمانەکەم لەکەداردەبوو. ڕاستیو وردبینی ئاشکرای بەڕێوەبەری دەزگای جاسوسی لەبەرامبەر سەرۆکەکەیدا، واتە سەرکۆمار، هەمان متمانەیەتی. لەکاتێکدا هیچ لەئارادا نەبێت کە سەرۆکەکەی فرمانی جێبەجێکردنی بدات لەوانەیە هەمووشتێك ڕووبدات. ئیتر لەبەردەم ئەو منداڵە بچوکەدا ئارام ناگرێت کەهاواری کرد: (ئای گورگ، ئای گورگ.. هات). ڕاگەیاندنی مەترسی هەڵبەستراو تا دووجار مومکینە وەك کێشەیەك لێیبڕوانرێت، بەڵام لەجاری سێیەمدا کاتێك بەڕاستی ڕووداوەکە ڕوودەدات، کاردانەوە بەمجۆرە دەبێت: (هەمان شتە، دووبارە هەمان شتە.)

لەهەموو ئەمانەش گرنگتر، تۆ تەنیا دەمێنیتەوە. کەسانێکی لەگەڵتانو بەشێکن لەکارەکەت، تەکنیك کارو پیشەگرێکن دەتوانن وردترینو کاملترین زانیاری کەشیاوی بەدەستهێنانە لەدیدی سیخوڕێکەوە، ئامادە بکەن، بەڵام ئەوانە توانای بڕیاردانیان نییە. داوەریکردن لەپیشەدا دوایین قۆناغی زانیارییە، بەتایبەتی لەزۆری وڵاتە ئەوروپیەکان، لەوجێگایانەی کە بڕیار کۆمیتە نایدات، وەك ویلایەتە یەکگرتووەکان- بەڵکو بەهۆی خودی دەستەڵاتدارانەوە بەتەنها دەرێت، کارێکی پێویستە. ئەوانەی تەنها خودی خۆیان بەرپرسن لەئەنجامدانی کارێك کە لەلایەن پسپۆڕانێکەوە ئامادەکراوە کە خودی ئەوانی دامەزراندووەو متمانەی پێیانە.

دووەمین وانەی گرنگ کە لەکێشەی یەکەی (ئایکس)ی سۆڤیەتدا دەتوانرێت بەدەست بهێنرێت کامەیە؟

بابەتەکە پەیوەست بوو بەگەورەکردنو خستنەڕووی زانیاریٔ خاو کەچۆن سوودمان لێوەرگرت یان دەربارەی چ هەنگاوێکمان نا، چونکە ئامێرەکانی بەدەستهێنانی زانیاری ئێمە باشترەو کاریگەری ساتی هەیەو لەهەمان

کاتیشدا دوژمن هەڵخەڵتێنەریشە. بۆیە دەبێت لەبرەودان بەوهۆکارانەو لەکارکردنیشدا بەرەو پێشەوە بچین. ئەم کارە لەڕاستیدا گەڕانەوەیە بۆ بنەڕەتیترین بەها گەلێکی ڕیفۆرم کراو کە بۆ گەیشتن پێیان پێویستە ڕاقەکاری پرۆفیشناڵی دەستڕۆیشتوو بەسەر پرسە جیهانیەکان بکەینە بەرپرسیان. لەڕاستیدا ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنە خێرایەی زانیارییە بەدەسهێنراوەکان لەهەلومەرجی واقیعی سەردەمێکدا بنەمای شوێنگەو ڕابردووی ئەوەیە کە لەم بارەیەوە قابیلی ڕوونکردنەوەیە. بۆیە لەکۆتاییدا بەبەرزکردنەوەی کێشانەی گرنگی ئەو توانستە خێراییە لەکاردا بەدڵنیاییەوە بەهەمان ئەنجام کۆتایی دێت، کە لەوبوارەدا هەوڵی بۆ دەدرێت. ئنگلیزەکان لەمەسەلەی شیتەڵکردندا ڕەوشێکی دێرینەیان هەیە. ئەوان ( S. A. S.) (دەزگای ئاسمانی تایبەت)و (S.S.B ) (دەزگای دەریایی تایبەت) یان بۆ بەئەنجانگەیاندنی هەرکارێك هەیە، بەڵام گەر پێویستیان بەهەڵگرتن‌و گواستنەوە بێت، دەبێت بگەڕێنەوە بۆلای هێزی ئاسمانی پادشایی‌و ئەگەر پێویستیان بەکەسانی دی بێت بۆ بەهێزکردنی یەکەکانی چالاکی نواندن، ناچارن بگەڕێنەوە بۆلای سوپای ئاسایی یان هێزە دەرياییەکان کە تارادەیەك کەمتر سەرقاڵییان هەیە. من وەك سەرۆکی گشتی دەزگای دژە سیخوڕی فەڕەنسا، تاکە سەرۆکی دەزگای سیخوڕی خۆرئاوایم کە بەسەرتەواوی چالاکییە تایبەت‌و گشتیەکان، کە پێکهاتوون لەکەسایەتیەکان، فڕۆکەکان، زانیاری تاکەکان، کۆنترۆڵی پێرسناڵیم هەیە. ئەم ڕەگەزانە بەخێرایی‌و بەخاترجەمی‌و یەکپارچەیی کاردەکەن‌و،گرنگ نییە کەماهیەتی کارەکە چییە. لەڕاستیدا باشترینی ئەو کارانە ئەو جۆرانەن کە یەکگرتوو یەکپارچەن. ئەگەر بکەویتە ناوچەیەکی جەنگەلییەوە، ئەگەر دوو سیخوڕی شارەزای بچوك، کە لەهەمان یەکەی تۆن، لەنیوەی شەودا بەپاسکیلەوە بێنە ئەوێ‌و، بەهۆی ڕووناکی لایتەکانیانەوە ڕێنمایت بکەن. تۆش هەموو ڕۆژێك لەگەڵ هەمان دەستە نانبخۆیت، بەتەواوی دڵنیا دەبیت لێیان. چونکە بۆجاری داهاتوو دەزانیت ئەوان لەژووری فڕۆکەوانی فڕۆکەیەکدا دەبن‌و تۆش

کەسێك دەبێت بەهەڵکردنی ڕووناکی بچوك لەسەر زەوییەوە ڕێنماییان دەکەیت. ئەوە هەمان ئەو کارانەیە کە ئێمە تیایاندا بالا دەستترین. ئەمریکیو ئینگلیزەکان بەوجۆرە نین. لەلقی چالاکی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکادا، سیستەمی پلەیەکی دۆزینەوەی شەڵەژان لەسیخوڕییە ئەلکترۆنیەکاندا، ڕادارە. ئەم سیستمانە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری خاو. ئەوەشی کە ئەمریکیەکان لەئنگلیزو فەڕەنسیەکان جیادەکاتەوە، ئەوەیە کە دەزگا جاسوسیەکانی ئەمریکا ئەوەندە زانیاری چالاکی دووبارە بوەوەیان هەیە، کە وەك ئینگلیزەکان توانای پەرچەکرداریان بەرامبەر بەوشتەی کە هەموو ئەم ئامێرانە بۆ ئەوبارە بەکار دەهێنرێت، یان وەك فەڕەنسیەکان توانای جموجۆلی خێراو کاریگەریان نییەو ئەوەیان لەدەستداوە.

هەڵبەتە لەکۆتاییدا هەموو ئەو کارانەی کە بەڕێوەبەرانی سیخوڕی دەتوانن ئەنجامی بدەن، خستنەڕووی باشترین پێشکەوتنە کانیانە لەلای سەرۆکی وڵات، کە بەتەنها خاوەنی بڕیارە. بەدرێژایی جەنگی دووەمی جیهانی، لەمیانەی ئەو پەیوەندییانەی کە لەگەڵ سەرانی دەست ڕۆیشتووی هاوپەیمانەکان لە (ڤێرسای) هەمبوو، چیرۆکێکی سەرنج ڕاکێشم دەربارەی (چەرچڵ) بیست، ئەوەی دەردەخست کەترسناکترین جموجۆڵێکی کە لەسەربنەمای باشترین زانیاری بەردەست ئەنجامدراوە، چەند مایەی ژیانە. ئینگلیزەکان لەوسەردەمەی سەرقاڵی جەنگ بوون و، هێزی ئاسمانی ئەڵمانیا دەست ڕۆیشتوویی خۆی بەسەر ئاسمانی بەریتانیادا سەپاندبوو، ئینگلیزەکان سەرقاڵی شیتەڵکردنی پەیامە نهێنییە ڕەمزییەکانی ئەڵمانیا بوون. کردنەوەی ڕەمزەکانی ئەو مەتەڵە نهێنییە خۆپاراستن بوو لەجەنگی دووەمی جیهانی، کە وایلێدەکردین پەیامە هەرە شاراوەکانی چالاکیەکانی ئەڵمانیەکان لەهێرشە کتوپڕە ئاسمانیەکاندا بخوێنینەوەو، ئەم توانایەش یەکێك بوو لە جیاکارییەکانی فڕۆکەوانانی هاوپەیمانەکان کە دەچوون بۆ شەڕ دژ بەنازییەکان. ڕۆژێك سەرۆکی هێزی ئاسمانی پادشایی بەچەند هەواڵێکی چوونیەکەوە چووبوو بۆلای چەرچڵو پێی ڕاگەیاندبوو: (بەڕێز، سەرۆك

وەزیران، ئێمە لەناو نهێنیەکاندا بۆمان ئاشکرابووە کە ئەڵمانەکان بەنیازن هێرشێکی کتوپڕ بکەنە سەرشارێکی بەریتانیا.)

چەرچڵ پرسیبووی: (بەڕێز، مارشاڵی ئاسمانی، کام شار؟)

وەڵامی دابۆوە: (بەڕێز سەرۆك وەزیران، نازانم، بەڵام لەماوەی چەند ڕۆژێکدا تێدەگەین.)

پاش چەند ڕۆژێك گەڕابۆوەو بەچەرچڵی وتبوو: شارەکە(کاونتری)یە..

ئەوان بەوەدەزانن کەئێمە پەیامەکانیان شیتەڵ دەکەین، ئێمە دەتوانین چی بکەین! ئەوان کۆدی ڕەمزەکانیان دەگۆڕن‌و، ئێمە لەئایندەدا بەرامبەر بەپەیامەکانیان کوێرو کەڕ دەبین.)

چەرچڵ هیچ گومانێکی نەبوو، بەڵام کەسانێکی کەلێوەی نزیك بوون دەیانووت بەدرێژایی جەنگ ئەوە گرفتاویترین بڕیاربوو کە بەلایەنی کەمەوە دەربارەشی پێشبینی هەبووە، زۆر سادانە وەڵامی دابۆوە: (ئێمە هیچ ناکەین.)

شەوی (١٤و١٥ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٠) هێزی ئاسمانی ئەڵمانیا شارەکەیان تەخت کردو، ئەوێ بووە دۆزەخێکی ڕاستەقینە. بڕیارەکەی چەرچڵ دواین سوود وەرگرتن لەکاری سیخوڕی پیشان دەدات. زانینی وردو هەبوونی توانا بۆ کارکردن یان نەبوونی هیچ توانستێك بۆ هیچ جۆرە کاردانەوەیەك.

بۆ هەموو وڵاتێك بونی توانا کە بەپێی ئەوە بجوڵێتەوە باشە، بەڵام وەك دەسپێك هەموو وڵات پێویستی بەڕابەرێکی نەتەوەیی هەیە، کە لەهەمان کاتی بوونی جڵەوی دەستەڵات دڵسۆز بێت‌و خاوەنی بڕیاردان بێت لەپەیڕەوکردنی سیاسەتێکی جیهانی‌و ناوخۆی، کە لەگەڵ چارەنووسی وڵاتەکەی گونجاو بێت. خەڵکیش ئەوەندە هۆشیان هەبێت کەداوای دەستەڵاتێکی پلەیەك بکەن کە ئەرکەکانی خۆی نەخاتە سەرشانی کەسانی دی‌و، هەروەها لەدەستەڵاتیشدا بمێنێتەوە. یەکێك لەیاریدە دەرانی ئەوجۆرە

دەستەڵاتە دەزگای دژە سیخوڕییە کە پێویستە لەگەڵ بوونی هە
هەڕەشەیکدا قورسایی خۆی هەبێت.
یەکەمین دیدارم لەواشنتن لەگەڵ (ئادگار هۆڤەر) لەساڵی (١٩٧٠)، کەمێك
پاش دامەزراندنم بوو. لەو گەشتەمدا (هلمز)و (ئەنگلتۆن)یشم بینی. ئەو وەك
سەرۆکی (فەرمانگەی چاودێریکردنی وڵات) نەك وەك (سەرۆکی گشتی
دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکیو دژە سیخوڕی) پێشوازی
لێکردم. ناسراوبوو بە(جانەوەری بەڕێز)ی دژە سیخوڕی. بەجۆرێك بەهۆی
چیرۆکێکەوە، کەپاشان هەربەهۆی ئەوەشەوە کاریگەریم خستە سەرسەرۆك
(پەمپیدۆ)و (ژیسکار دستن)، کەوتمە ئەزموون کردنی. ئێمە لەئۆفیسی (هور
لەبارەگای فەرماندەیی (FBI) کە لەبەردی سفتو شێلمانە بەسەلیقە
ڕازێنراوەتەوە، دانیشتبووین. بەکوپێك قاوەوە لەسەر کورسییەك
دانیشتبوومو چەند شوێنێکی گریمانەییم بۆ خستەڕوو: (ڕێگابدە وایدابنێین
تۆ بەرەو خاڵێکی دوور لەسەنتەری فەرەنساوە دەڕۆیت. لەوێدا تەقینەوییەك
ڕوویداوە، کاتێك پۆلیس دەگەنە ئەوێ هەزاران دۆنم لەزەوی بەبێ دەنک
خۆراکێك یان جوجەڵەیەك لەپاشماوە ماوەتەوە. بۆیە داوای پسپۆڕانی بواری
ئەتۆمی دەکەنو ئەوانیش پشتگیری ئەوشتە دەکەن کە سەراسیمەی
کردوویت، هۆکارێکی بچوکی ئەتۆمی بووە. ئەو بۆمبە هی تۆ نەبووە
بۆمبێکی ڕوسیش نەبووە، بەڵام دوای چەند سەعاتێك پێش ئەوەی هەواڵەك
دزە بکات، تەلەفۆن بۆ سەرکۆمار دەکرێت. ئەو دەنگە نەناسراوە ناوی
ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕی نەناسراو ڕادەگەیەنێت. ئەو دەڵێت: (ئەمە
بچوکترین نمونەی ئەو کارانەیە کە ئێمە دەتوانین ئەنجامی بدەین
لەجێگایەکدا لەناوپاریس دامێنراوێکی تری ئەتۆمیمان شاردۆتەوە
کەملیۆنێك جار لەوەی پێشووتر بەهێز ترە. مەرجەکانمان ئەمانەن: ژێر
دەریاییەکانی فەرەنسا لەناوەڕاستی دەریای ئەتلانتیکدا نقوم دەکەیت
هەموو ئاڵتوونەکانی فەرەنسا لەبانك ڕادەکێشیتە دەرەوەو هەمووی
لەکیسەیەك دەخەیت، کەنیشانەی پڕێتی پێوە دیارەو، سبەینێ پاش نیوەڕۆ

بەپیادەڕۆیی بەرەوی کۆشکی ئەلیزێ دەڕۆیت.) باشە سەرکۆمار چی بکات؟ ئەگەری ڕوودانی شتی لەوجۆرە لەئارادایە؟

(هۆپەر) بەسادەیی وەڵامی دایەوە: (ئەوە کارێکە ئەوان بۆ ئەنجامدانی پێویستیان بەخودی ئێمەیە.)

پێکەنیم. وەڵامێکی دڵنیابەخش بوو لەلایەن پرۆفیشناڵێکی بەرجەستەوە، کە بەتەواوی لەبواری کاری پۆلیسی یان سیخوڕیدا خۆی دروستکردبوو. لەوبڕوایەدا بوو کەخۆیو دەزگاکەی لەبەرامبەر هەر هەڕەشەیەکی دەرکیدا خۆگرن. هەڵبەتە (هۆپەر) ڕاست بوو. دەزگاکەی ئەو جۆرێك بوو کە فەرەنساش کەموزۆر لەوێنەی ئەوەی هەبوو. بەڵام (FBI) هەمیشە پێویستی بەخەڵك هەیە، خەڵکی ئامادە ترو بەهەمان شێوە سەرمایەی زیاتر بۆ بەگەڕخستن.

ئەمڕۆ دەزگا جاسویەکان- چ ناوخۆیو چ دەرەکی- پێویستیان بەئامڕازە تا لێبڕاوانە لەئاست وەڵامدانەوەی هەر هەڕەشەیەکی دەرەکیدا بن. ئەو ئامڕازانە هەمان کۆکردنەوەی زانیاری، شیتەڵکردنیانو کارکردن لەسەر بنەماکانیانە لەهەرکاتێکی پێویستدا. ئێمەلەسەر دوو زەمینەی براوتنو زەمینەی وێناکردنو خەونەکان سەرقاڵی ڕۆڵگێرانین. بۆ فەرەنساو تەنانەت بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش، بوون بەدەستەڵاتدارێکی جیهانی دەبێت خواستێکی جیهانی هەبێت، ئەوەش پێویستی بەوەیە لەهەموو جێگایەکدا ویستە سیاسیەکان، دیپلۆماتیەکان یان سوپاییەکان فراوان بنو ببنە واقیع. پەیڤەکان بەتەنها، دەستەڵاتن بەسەر سەرەتا یترین فۆرمی مومکیندا. توانای کارتێکردن یان هەنگاوی کاریگەرانە- تەنانەت ناسینی ئەوەشی کەفەرەنسا یان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا توانای ئەنجامدانی کاری لەوجۆرەیان هەیە- بۆ پارێزگاریکردن لەداهێنانی سیاسیو بڕیارە دیپلۆماتیەکان پێویستن.

ئەم پرنسیپە لەسەردەمی (لەناوچوونی بێچەندوچوون)و جەنگی چوارەمی جیهانیدا لەسەدا سەد ڕاستە. ئەو سەردەمەی کە تیرۆریستانو ئەو

دەوڵەتانەی ئەوان بەفەرمانی تیرۆرەوە ڕەوانە دەکەن تەنها لەچەمکی تۆڵەسەندنەوەیەکی ئاشکراو خێراو بێبەزەییانە تێدەگەن. هەندێك جار ئەو ساتانە دێنە پێشەوە کە ئیتر کارتی دیپلۆماتی ناتوانێت کارێك بەرەوپێشەوە بەرێت، ئەوەش ئەو دەمەیە کە دەبێت بلۆف تیا لێبدرێت. وڵات پێویستە بەبێ ڕاگەیاندنی ئاشکرای جەنگ، ئەو توانایەی هەبێت لەدەرەوەی سنوورەکەی چالاکی ئەنجام بدات. جموجۆڵی لەبابەتی گەیاندنی کۆمەك بەکەسانێکی لەمەترسیدان ڕزگارکردنی ڕیشەی نەتەوەیی خۆی یان ڕفاندنی نەیار، یان ئەنجامدانی چالاکیەکی نەشتەرگەریانەی خێراو دەرکێشانی غودەیەکی شێرپەنجە ئاسا کە جەستەیەکی لەهاوپەیمانەکان ژەهراوی کردووە، هەبێت.

فەرمانی یەکەیەکی سوپایەکی ڕێکخراو، چوونە ناو خاکێکی دەست نیشانکراوو داگیرکردنی خاکەکەو پاشان پاراستنێتی. چالاکیەکانی ئێمە کارێکی نەشتەرگەریانەیە، کە دەبێت لەشەودا ئەنجام بدرێتو، تا سپیدەدەم کارەکە تەواو بووبێت. ئەمجۆرە لێدانانە لەزارەوەی جاسوسیدا وەك نەشتەرگەری دێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوجۆرە گروپانەی چالاکی نەشتەرگەری ئەنجام دەدەن ، لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا، لەناو ماوەی موشەکە بالیستیکە کیشوەر بڕەکانی مەترسیدارترین دوژمنەکانماندان. تیرۆریستان نەك ئامڕازی پێویست، بەڵکو ئارەزووشیان نییە سوپایەکی هەمیشەیی لەژمارە نەهاتوو، دامەزراوەی سوپایی فراوان لەجەزایری دوورە دەست، نەپاپۆڕی زەبەلاحی لەجۆری بارهەڵگری گوێزانەوەو ڕاکێشانی سوپاییان هەبێت،چونکە پێویستیان بەهیچ کام لەوانە نییە. کە لەبەرێکی مێشکێکی بچوك، بەڵام تیرۆریستی کە کوشندەترین کارو پێشنیاز جێبەجێ دەکاتو، ترسو بیمو ئاشوبێکی فراون دەنێتەوە، کاریگەری هەمان هۆکارو ئامێری جۆراوجۆری هەیە. ئەوانە ئێمە لەچەك دادەماڵن وورەی بەرگریمان کەمەکەمە سست دەکەن.

دروست لەوکاتەی لەنۆرماندی دابەزین ووزەیەکی بەهێز پاڵی پێوە دەناین بجەنگین، ئێستا ئێمە پێویستمان بەهەمان شتە بۆ سەرکەوتن لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا، دژ بەجۆرێکی نوێ لەدوژمن؛ هەڵبەتە گەر ئامانجی سەرکەوتنمان هەبێتو، بڕیار بێت بەشێوازی خۆیان لەگەڵیان شەڕ بکەین، دەبێت گروپی دەستە بژێرمان هەبێت بۆ ئەم پێشبڕکێیە، کە لەڕاستیدا تیایدا دوژمنەکانمان زیاد لەسنووری خۆیان پێیان لێڕاکێشاوە، ئەوەش هێزی تایبەتە کە بەچەکی ئەتۆمی دنیای سیخوڕی دادەنرێت.

ماوەیەك بەر لەچوونم وەك بەڕێوەبەری گشتی بۆ دەزگا، دەزگا هەندێ هەنگاوی هاویشتبوو کە لەڕووی ئەخلاقییەوە نادروستو لەڕووی یاساییەوە یاساغ بوون. دیارە ئەم شکستیە لەلایەن دەوڵەتی فەڕەنساوە پشتگیری لێ نەکرابوو .(CIA)ش بەوە تاوانبار کرابووکە بۆتە مافیاو ئازار بەخەڵکی دەگەیەنێت.

جێنشینە کۆنەکانی من زۆربەیان ژنانو پیاوان، تاوانبارانو تاوان چیەکانیان بەکرێ دەگرت تا تاوان بکەنو، کەسانی چەکدارو بێسەروبەرەو تاوانچی ڕێك بخەن. بۆ دەزگایەکی ئاسایش تاوانکاری لەوە خراپتر بوونی نییە. پیاو کوژێك یان چەقۆکێشێکی بەکرێگیراو، زۆر مەترسیدارەو زۆرجاریش بۆ ئەو کارانە بێسوودە، چونکە سەرەتاو کۆتایی لەلای ئەو دراوە نەك فرمانەکەی. تاوانبارە بەئەنجامدانی کاری نایاسایی بۆ سوود. سەرەڕای ئەوەی بەچەند بەرابەرکردنی دەست موچەکەی لەوانەیە هەوڵ بۆ وەرگرتنی بەرتیل بداتو هەڵگەڕێتەوە، کە لەوحاڵەتانەدا لەوانەیە کەنارەگیر ببێتو بازنەیەکی خراپەکاری دروستبکاتو لەکۆتاییدا لەوانەی لەپڕۆفیشناڵو تاوانکارەکان خراپتر بێت.

بەپێی ئەمە شتێکی کەمن دروستم کردبوو، دەزگایەکی سادەبوو. تەنها کەسانێکی تێدا دامەزرابوو کە بەشەرەفو خاوەن پرنسیپو ئادابو خاوەن هزر بوون. هەر تاکێك دەبوو لەدەرەوەی بازنەی دەمارگیریو دەستەگەری بۆ دەرەوەی دەزگاو تەنها بۆ وڵات کاری

بکردایـــه، چونکـــه کەسـایەتیەکانی دەزگایـــەکی نـــهێنی هەمیشـــه لەجەنگدابوون. ئەم حاڵەتە لەهەمان کاتیشدا پێویستی بەحەزو دنەدان هەبوو. سەرۆکی دەزگای نهێنی ئیسرائیل جارێکیان تاریفی ئێمەی کرد، کە (مۆساد) پرۆفیشناڵترین‌و چالاکترین دەزگای سخوڕییە لەجیهاندا. بەڕێوەبەرەکەی بۆ سەردانم هاتە کۆمەڵگای (تۆرڵ) لەپاریس.

وتـی: (موسـیۆ، بـەڕێز بەڕێوەبـەری گشـتی، ئێمـەو ئێـوە، تەنـها کەسـانێکین کـەدەتوانین هێرشـی لـەجۆری (ئنتبـە) ئـەنجام بدەیـن‌و بەکۆتایشی بگەیەنین. بەداخەوە ئێوە دوو شتتان نییە؛ فڕۆکەی ماوە درێـژو ئـەویدی بوێـری سیاسـی‌و دەسـتبەکاری لـەناو دەوڵـەتاندا.) لەوەڵامدانـەوەیدا دوودڵیم نـەکرد: (سـەبارەت بەیەکـەم، کـارێکی ئاسـان نییە، بـەڵام سـەبارەت بـەدووەم ڕێگـەو هۆکـار هەیـە.) لـەماوەی دواییدا ئێمە چەندین کاری لەجۆری هێرشـی (ئنتـە)مـان ئـەنجامدا، کـە بەگشـتی سەرکەوتوو بوون. بەڵگەنامە هەیە کە هەرگیز جیـهان هیچی دەربارەیان نەبیسـتووە. ئێمـە بەدرێژایی ساڵ سێ یان چوار چالاکیمـان ئـەنجام دەداو، لـەماوەی هـەموو سـەرۆکایەتی منـدا نزیکـەی چـل چـالاکی ئـەنجامدرا، کـەهیچ کەسێك لـەدەرەوەی دەزگـاو تەنانـەت لـەناو ئاسـتە باڵاکانی دەوڵەتیشدا هیچی دەربارەیان نەبیست.

لـەناو ئێمەشـدا کەسانێك هـەبوون کـە تاڕادەیـەك بەئاشـکرا کاریـان دەکرد. ئەم حاڵەتە تایبەت بـوو بەهـەندێ کـەس کەمۆڵـەت دراوم ناویـان بهێنم، لەناو ئەوانەدا دەتوانم ناوی (بۆکاسـا)، ئیمپراتۆرەکـانی ئـەفریقای ناوەڕاستو چالاکیەکانی پۆلیس لەزائیر، بهێنم.

هەڵبەتـە ئـەنجامدانی چـەندین فرمـانیش هـەبووە کەئـەنجامی ناخۆشـی بەدواوە بووە؛ بۆنمونە چەندین ڕەگەزی سـەر بـەدەزگای فەڕەنسا کوژراون یان بەسەختی بریندار بوون. چەندین جار ڕوویداوە کە پیاوان‌و ژنـان لـەکاتی نواندنـی پاڵـەوانێتیدا، بەنـهێنی مـردوون‌و خـەڵکی وڵاتەکەشـیان بەتـەواوی نەیناسـیوون. لـەدواجار شـوێنگەی دەزگـای نـهێنی ئاوایـە. ئـەم دەزگایـە، دەزگای نهێنی ئەفسانەی (جیمس بۆند)نییـە، بـەڵکو دەزگایەکـە لەجیـهانی

واقیعـدا، بـەڵام بەنـهێنیو لـەتاریکیدا کـار دەکـات. چونکـە لــەدەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامـەی دەرەکـیو دژە سـیخوڕی فەڕەنسـادا، کـاری بـاوو دێرینی (بێدەنگی) زیـاد چەسپاوە، ساڵەهایە کــە ڕۆحیـەتی توندوتـۆڵو کارناسی لەنێوان ئەندامەکانیدا درێژەی هەیە. من هەرگیز توانـای ڕاڤـەکردنی هەموو ئەو سنورو ئەندازەی ئازایەتیو لەخۆبووردوویو فیداکاریـەم نییـە کـە ئەندامەکانی پیشـانی دەدەنو، بـەندەش ماوەیـەکی درێژ بەشـانازیکردنەوە فەرماندەیی ئەوانەم کردووە.

هـەموو ئەمانـە ئێمـە بۆ دوو پرسـیاری سـەرەکی کـە لەلایــەن سـەرۆکی (مۆسـاد)ەوە خرایـە ڕوو، دەگێڕێتـەوە. لـەدیدی منـەوە، بوێــری سیاسـیو بـەڵێنی دەوڵـەتی فەڕەنسـا تاڕادەیـەك هـەرکات پێویســتمان پێـی بووبێـت لـەئارادابووە. هەڵبەتــە لــەکاتێکدا کــە چالاکیـەکانمان (چ ســـەرکەوتوو چ سـەرنەکەوتوو) بووبـن گــەر لەچوارچێوەیــەکی تەنـهادا لــەژێر چـاوەدێری بەلایەنی کەمەوە ئاسایشـی پەرلـەمانی یـان گشـتیدا بێـت، بوێـری سیاسـیو بەڵێنی دەوڵەتی باشتر پراکتیك دەکرێن. لەپانتاییەکی لەوجۆرەدا، سـەرۆکی دەوڵــەتو ڕاوێژکارەکـانی دەتوانــن لــەچوارچێوەی فـــەرمانێکدا، بـــەپێی دەستەڵاتی ڕێگا پێدراویان- کەهەمان ئامرازی سیاسی، دیپلۆماتیو سوپاییە یـان سیاســەتمەدارییە- بڕیـار بـدەن. بـــەڵام کـــاتێك کــە ڕووداو، داوای دادپەروەری دڵنیاکەرەوەو خێرا دەکات، هۆکاری ترو گرنگتریش بۆ هەنگاوی دڵخوازو خێراو بێ دوودڵی لەئارادیە. هەمیشە هەستی جێگـیرو تاڕادەیـەکیش فراونخـواز لەبازنــەی سیاسـی فەڕەنســا- لەڕاستیشــدا لــەزۆر شـوێنی ئەوروپاشدا- بوونی هەیە، کە هەرچی بۆ بـەرگریکردن لەبەرژەوەندییـەکانی کۆمـار پێویسـت بـووە، بەئەخلاقیـەتێکی ئاشـکرای سـنووردارەوە قـابیلی پەسـندکردن بـووە. ئـەو مۆراڵـە سـنووردارە لەلایـەن خـودی سـەرکۆمارەوە بڕیـاری لێـدراوەو، لەکۆتایشـدا بەرپرسـیاربووە لەبـەردەم فەرمانبـەراندا. هەندێجار ڕوویدەدا کە ئەگەرو دوودڵیو گومان لەوێدا دروسـت دەبـوو، بـەڵام هـەرچۆنێك بێت ئـەو بـەهای بێچـەندوچوونی خـەڵك بـوو. بەلایـەنی کەمــەوە لەوجۆرە حاڵەتانەدا، ئەو میراتگری دەسەڵاتو شکۆی پاشایەتی فەڕەنسایە.

ئێمەی ئەورووپی، بەوجۆرەی کەمن لەیادمە، زاراوەیەکمان بۆ ئەوە هەیە بەناوی (عەقڵی گشتی) وڵات.

ئەمریکیەك ناتوانێت دەرك بەوە بکات کەهەندێجار دەزگای دەوڵەتێك ناچارە کارێك ئەنجام بدات کە نائەخلاقیەو، تەنانەت نایاسایشە. ئەو جۆرە بڕیارانە چەندین جار تەنها لەلایەن خودی سەرکۆمارەوە دراوە. بەڵام بەدرێژایی کارکردنم لەپۆستی بەڕێوەبەری گشتی دەزگای سیخوڕی فەڕەنسا زۆربەی جار بەفرمانی کۆنکرێتیانە کار دەکرا. هەندێجار خۆم بڕیاری جێبەجێکردنی فرمانێکم دەداو هەندێجاریش وەك ڕێزلێنان بۆ سەرکۆمار دەمخستە بەردەمی ئەو.

بۆنمونە، نەمدەتوانی بەبێسپاردنی شتێك بەسەرکۆمار بڕیارێکی تاك لایەنە بدەم، چونکە ئێمە هەموومان یەك یەکەی هزریمان پێکهێنابوو. لەوبارانەدا سەردانی سەرکۆمارم دەکردو، دەموت: (بڕیاری ئەنجامدانی فلانەکارم داوە، کە بەتەواوی جێبەجێ بکرێت.) پاشان بەدەست ئەوبوو کەبڵێت: (نەخێر، بەهیچ شێوەیەك نابێت، من ڕێگا بەکاری لەوجۆرە نادەم.) یان زۆر بەئاسانی هیچ نەڵێت. ئەمە ئاماژەیەك بوو کە لەماوەی کارکردنمدا لەگەڵ سێ سەرکۆماردا فێری بووبووم کەبێدەنگی مانای ڕازی بوونە.

جارێکیان لەکاتی گفتوگۆکردن لەوبارەیەوە لەگەڵ سەرۆك (ڕیگان)دا، چیرۆکێکم دەربارەی (تالێران)ی وەزیری دەوڵەتی ناپلیۆنەوە بۆگێڕایەوە، کەکەسی بەهۆش و زیرەکی سەردەمی خۆی بووە.

لەسەرەتای سەدەی نوزدەدا، کەسێکی بەجێماوی سەربەوەچەی دەستە بژێرەکان هەبوو، کە دەکرا سوودی زۆری هەبێت. پۆلیسی نهێنی ئەودەمە لەوبەری سنوری بەلژیکاوە دەستگیریان کردبوو. بەگزادەیکی ئینگلیزی بوو سەربەکۆشکی پادشایی (بۆربۆن)، ڕایگەیاندبوو کە پادشایەتی فەڕەنسامافی پادشایەو، ناپلیۆنی بەتاکە دوژمنی تەخت و تاجی پادشاییەتی پێناسە کردبوو. ئەو بەگزادە لاوە خۆش سیماو پێست ناسکە لەشەوێکی شومدا کەباڵی بەسەرپاریسدا کێشابوو، دەستگیرکرا. ناپلیۆن لێی دەترسا، چونکە کەسایەتیەکی بەهێزی خەڵکی (بۆربۆن) بوو، کەلایەنگری زۆری هەبوو.

بەهاتنی بۆ پاریس، پۆلیسی نهێنی بردیان بۆ قەلای (ونسن) لەدەرەوەی شاری پاریس، پاشان بەبێوەستان لەڕۆژی دواییدا لەبەرامبەر جۆخەی ئاگرو چاڵی رشداتیر بارانیان کرد. ڕۆژی دواتر کاتێك (تالێران) بەم ڕووداوەی زانی شلەژاو چووە ئۆفیسەکەی ناپلیۆن‌و، وتی: (بەڕێز، ئەم کارە لەتاوانکردن خراپترە، هەڵەیەکی گەورەیە.) مەبەستی وەکو ڕۆژی ڕووناك ڕۆشن بوو. لەوئاستەدا، واتە ئاستی ئیمپراتۆرێکدا، تیرۆری سیاسی کارێکی گونجاو بووە لەدیدی جەنگ‌و پێداویستی بەرژەوەندی نەتەوەییەوە، بەلام ئیتر ئەو مانای (عەقلی هەموو ولات)ی نەدەگەیاند. بەلکو کارەکەی وەك ڕقێکی کەسێتی خێزانی دەردەکەوت. بەوجۆرە لەماوەی ڕشتەکارەکانم کە لەگەڵ (CIA) ئەمریکادا هەمبوو، تێگەیشتم پەیوەندی نێوان دەزگا جاسوسیەکان‌و دەولەت لەئەمریکادا زۆر جیاوازە لەوەی ئێمە. هەموو بەڕێوەبەرێکی (زانیاری مەرکەزی) لەهەموو ڕووەکانەوە ناچارە چاودێری بەرپرسیارێتی خۆی بێت.

سروشتی (دەزگای جاسوسی) ئەویش بەجۆرێکە کەپێویست دەکات بەردەوام چاودێری لقەکانی سیاسی‌و دیپلۆماتی بکات کەخۆی بەرپرسی بەڕێوەبردنیانە. هەڵبەتە خەلکی ئەمریکا بەرامبەر بەپرسە ئەخلاقیەکان زۆر هەستیارن. دیارە ئەمە میراتی جیاوازو ئازاری سەردەمی ڤێتنامە. زۆرینەی ئەمریکیەکان ئەو شتەی کە بۆ ئاسایشی نەتەوەیی پێویستەو، لەلای هەرتاکێك پەسندە، بەکوێرانە پەسندی ناکەن. لێرەدا هەرکارێکی سیاسی‌و هەڵبەتە سەربازی دیاریش، لەدیدگای سیمایەکی ئەخلاقییەوە، پێش بابەتە خۆش‌و گرفتاوییەکان، بەوردی دەخرێنە ژێر توێژنەوەوە. پاشان لەڕوانگەی ئاسایشی نەتەوەیی، بەرژەوەندییە گشتییەکانەوە، لێی دەکۆلرێتەوە، کە ئەمریکیەکان زیاتر لەئەوروپیەکان بەتایبەتی ئێمەی فەرەنسی بەهەموو ئەو مێژووە درێژەی ناو جەنگە ناوخۆیەکانەوە، پێناسەی دەکەن. لەسەرتاوە تا کۆتایی، ئەمریکیەکان تەکنیك بەکار دەهێنن، کە تەنها لە چوارچێوەی پێناسەکانی ئەو کۆمیتەی ئاژانسەدا ڕێگا پێدراوە، کە سەرانسەر دەستوور گەلێکە بۆ تێپەڕاندنی کارەساتە جیهانیەکان بەرەو جەنگی چوارەمی

جیهانی. سیستمی دەوڵەتی کۆنترۆڵی و هاوسەنگیەکان، بەتەواوی لەسەردەمانێکەوە کەیاسا بنەڕەتی و ڕێساکان نووسراون، کاری لەژیانی ئاسایی خەڵك کردووەو، بەردەوامی پەیوەندی یەك لەدوای یەك دەبەخشێتە بەڕێوەبەرانی (CIA) ئەمریکا.

ڕۆڵی چاودێری ڕەسمی کە لەلایەن کۆنگرێسەوە بەڕێوە دەبرێت، بەڕێوەبەری دەزگا بەردەوام پێش و پاشی هەرچالاکییەك، چ سەرکەوتوو چ سەرنەکەوتوو، بەرەو ئەوپەڕی هوشیارکردنەوە دەبات. من لەماوەی یازدە ساڵی ڕابردوودا، هەرگیز بۆهیچ کارێك بۆ پەرلەمان نەچووم. بەڵام بۆ خۆم بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ ڕابەرانی وڵاتانی ئەورووپا هیچ ڕێگرنەبووم. کاتێك کارێکی لەوجۆرە لەمن داواکرا، بەژمارەیەك لەسەرانی دەزگاکانی جاسوسیی و ئەمریکام ڕاگەیاند. ئەوانەی کەمن چاوم پێیان کەوتبوو، کەڕاستەوخۆ لەگەڵ چەند ئەندامێکی کۆنگرێس کاریان دەکرد، هیچ گرفتێکیان تێدا نەدەبینی. یەکێك لەبەڕێوەبەرانی جاسوسی پاش چەندین ساڵ کاری جاسوسی لەیەکێك لەدەوڵەتە گەورەکانی ئەوروپادا، دەستی دایە کارێکی مەترسیداری گەورەو خۆی لەواقیعیەتی ئامادەکراو لەسیاسەتەکانی ناوخۆو خەڵکانێکی کە پشتگیریان دەکرد، جیاکردەوە.

سپاردنی کار بەسیاسەتمەداری ئەمین و جێگای متمانەو ئاست بەرز لەڕاستیدا جۆرێکە لەکۆنترۆڵکردنی ڕووداوەکان و ڕیفۆرمی کاروبارەکان. ئەوانە بەگشتی ئەرکی چاودێریکردنی ئەندامانی کۆنگرەێسیان لەئەستۆ بوو زیاتر کاریان بۆ سەقامگیرکردنی هەماهەنگی دەکردو، ئەندامەکانی کۆنگریسیش هۆشمەندی سیاسی خۆیان دەخستە سەر دیدەزانیاری و سەربازییەکانی بەڕێوەبەری دەزگای جاسوسی. بەدرێژایی ڕاژەم، زۆرم لەئەندامانی پەڕلەمانی فەڕەنسا دەبینی و خول بەخول دۆستیان بووم. لەدوایداو سەرئەنجام کۆمیتەیەکی زانیاری لەنێوان وەزیرەکان و لەژێر چاوەدێری ئۆفیسی سەرۆك وەزیران پێکهات، کە لەلایەن کەسی سەرۆك وەزیران یان نوێنەرەکانیەوە فەرمانەکانی ڕادەپەڕاند. ئەم گروپە سەبارەت بەهەنگاوەکانی من مافی ڤیتۆی نەبوو، چونکە من وادار نەبووم لەکاتی ئەنجامدانی هەرکارێکی جاسوسیدا ئەو گروپە ئاگادار بکەمەوە. من و زۆربەی

جێنشینەکانی پێش‌و پاش خۆم خاوەنی دەسەڵاتێکی هەمەگی‌و بێسنوور بووین.

ئەوە ئێمە بووین کەهەواڵی گونجاومان هەڵدەبژارد بۆئەوەی بەسەرکۆماری بڵێین. توانای خیانەت کردنیشمان بەسەرکۆمار هەبوو. دەستەڵاتمان بەسەرزۆر سەرمایەی نهێنی- لەڕاستیدا هەموو دانراوە نهێنیەکانی فەرەنسا- دادەشکا. کۆنترۆڵی نیوەی زیاتر ئەو میانجیگەریانەمان لەبەردەستدابوو، کە هاوشانەکانمان لەئەمریکی ڕووسی‌و بەریتانیەکان بەهیچ جۆرێك نەدەخرایە بەردەستیان. وەك بەڕێوەبەرانی دەزگا دەمانتوانی پاسپۆرتی ساختەو کەلوپەلی ساختە لەهەموو جۆرێك ئامادە بکەین. هیچ سنورێکمان نەدەناسی. یەکەیەکی پەڕلەمانی تایبەتمان هەبوو کە لەبارەگای هێزی ئاسمانیدا جێگیربوو. لەماوەی یازدە ساڵدا تەنانەت بۆ جارێکیش لەڕیزی چاوەڕوانی کۆنترۆڵی هێڵی ئاسمانی یان کۆنترۆڵی پاسپۆرتدا نەوەستاوم. دەسەڵاتێکی کە ئێمە دەمانتوانی پیادەی بکەین، لەلایەکەوە مەترسیداربوو لەلایەکی دیشەوە زۆر پێویست بوو. سەرئەنجامی هەرکارێکی بەڕێوەبەر خۆی دوچاری گرفت دەکرد؛ لەکاتی دوچاری گرفتدا دەسەڵاتێکی سەرەکی هەبوو بۆ کاردانەوە.

بەشی شەشەم:

## یادەوەری‌و سیاسەتەکان

کاتێك دەستم کرد بەلێوردبوونەوە لەوردەکارییەکانی (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەو دژە سیخوڕی) فەڕەنسا، کە لەساڵی (١٩٦٧)دا وەك بەڕێوەبەر دانرام، ڕووبەڕووی هەندێ مەسەلەی لاوەکی بوومەوە. ڕۆژێکیان لەبارەی یەکێك لەوپرسانەوە بەستەیەکی گەورەی نوسراوم بینی، کەدیاربوو بەڵگەنامەی لەسەریەك هەڵچنراوبوون‌و لەناو ژوورێکی باش کلۆم دراودا پارێزراو بوون. نوسراوەکان بەتۆپەڵی ناجۆرو بەشێوەیەکی ناشیرین کۆکرابوونەوەو لەگۆشەیەکدا فرێدرابوون. لەلێپرسراوی بەشی ئەرشیف، کە لەگەڵمدابوو، پرسیم: ( ئەوانە چین؟)

بەسانایی وەڵامی دامەوە: ( ئۆو.. ئەوانە ئەرشیفی ئەڵمانیەکانە)

ئەوانە ئەرشیفی ناسراویی نازییە گشتاپۆکان‌و (هێزەکای بەرگری) ئەڵمانیا بوون، کە لەکاتی ئازادکردنی پاریسدا دەستیان بەسەردا گیرابوو. چونکە کاتێك ئەڵمانیەکان لەپاریس پاشەکشەیان کردبوو بواری ڕێکخستنی ئەوانەیان نەدابوون. لەدرێژەی قسە کانمدا وتم: ( چەندن؟).

وتی : (دەتەن، زیاتر یان کەمتر)

لەئەورووپای داگیرکراودا، دەزگای هەواڵگری سەربازی، (هێزی بەرگری ئەڵمانیا)و (پۆلیسی نهێنی دەوڵەت) یان گشتاپۆ لەهەموو شوێنێکدا هەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم تۆڕی ئاسایشی ئەڵمانیایە سیستمی کاربۆنیان داهێنابوو، کە دەربارەی هەموو شتێك شەش حەوت وێنەیان لەبەردەگرتەوە. وێنەیەك لەبەشی ئیدارەی ناوخۆ دەمایەوە، یەکێکی دی بۆ بارەگای فەرماندەیی لە پاریس دەڕۆشت، کۆپییەکیش بۆ فەرماندەیی گشتی سوپای ئەڵمانیا لەپاریس دەبوو بنێردرێت، دیارە وێنەیەکیش بۆ بەرلین دەڕۆشت. لەبەرلین، دەربارەی هەر کەسێکی گرنگ کە توانای گێڕانی ڕۆڵێکی هەبوبێت، هەرکارمەندێکیش کە لەناو خەڵکدا کارێکی پێ سپێردرا بێت، هەر ڕووداوێکی گەرچی لاوەکیش بووبێت‌و لەسەرزەمینە داگیرکراوەکاندا

ڕوویدابێت، بەڵگەنامەی لەسەر هەبووە. لەسەنتەری ئارشیفی پاریس دەربارەی هەموو فەڕەنسیەکان، وەك هەموو پایتەختی وڵاتە داگیرکراوەکانی دی لەوجۆرە بەڵگەنامانە هەبوون.

ڕووسەکانیش شارەزای ئەم جۆرە سیستمە بوون. هەموو لەو باوەڕەدا بوون کە(ستالین) بەهۆی فاکتەری سیاسیو ڕۆحییەوە دەیویست لەکۆتایی شەڕدا یەکەمین کەس بێت کەپێ بنێتە ناو (بەرلین)ەوە. بەوهۆیەوەی کەملیۆنەها کەس لە ڕووسەکان بەدەستی هێرشبەرە ئەڵمانیەکان کوژرا بوون، فەرماندەیی هێزە هاوپەیمانەکانیش بەرامبەر بەخواستەکانی ڕازی بوون، بەڵام فاکتەری سەرەکی کەڕوسەکان دەیانویست لەپێش هەموانەوە بچنە ناو (بەرلین)ەوە ئەوە بوو، کەپێش ئەوانی دی دەستبگرن بەسەر سەنتەری ئارشیفی نازییەکاندا. ئەم بەڵگەنامانە ئارشیفی سەرەکی ئەڵمانیای سەربازیو سیڤیلی بوون، کە لەژێر چنگی گشتاپۆو (هێزەکانی بەرگری لە ئەڵمانیا)دا بوون. ئامانجیشیان بەرتیل دانبوو بەوهاوکارە ئاشکرایانەی، کە لەسەرانسەری ئەو قەڵەمڕەوەی لەلایەن ئەڵمانیاوە داگیرکراوبوو، کاریان دەکرد.

ڕوسەکان سوودی باشیان لەوئەرشیفە بینی، لەڕاستیدا لەماوەی چەندین ساڵدا زۆر لەوکەسانەی کە لەلیستی نازییەکاندا ناویان تۆمارکرابوو، ناسیانو پەیوەندییان پێوە کردن. هەریەك لەوئەرشیفانە پشکی جیاوازی لەخۆگرتبوو. لەناو ئەوانەدا تاکەکانی کەپاشان وەك نمونەی بەرزو خاوەن ڕێز لەسەنتەرەکانی ناو کۆمەڵگاکانی خۆیاندا دەرکەوتن خرانە ژێر کۆنترۆڵەوە. جارجارێك لەگەڵ ئەم کەسە چارە ڕەشانە ڕووبەڕوو دەبوومەوە.

ئەوانە بەهۆی هاوکاریکردنیان لەڕابرردودا، بەوهەژموونکردنەی کەڕوسەکان بەسەریاندا هەیانبوو، بەهۆی ئەو بەڵگەنامانەی کە بێبەزەییانە ڕووبەڕوویان دەکردنەوە، کەوتبوونە داوەوەو، بۆ بەئەنجام گەیاندنی ڕاژەی جیاواز بۆ خاوەنە نوێیەکانیان کەڕوسەکان بوون، کە نەبەزەییان بەرامبەریان هەبوو نەسوودێکی بۆ حاڵەکەشیان هەبوو، دەخرانە ژێر فشارەوە. لەژێر

ناونیشانی خواستراودا وتاریان، بەناو هێنانیشەوە، دەربارەیان لەرۆژنامە بڵاوەکاندا دەنووسی. چاوپێکەوتنی رادیۆی‌و تەلەفزیۆنیان بۆ رێك دەخرا، کە تیایدا دیدی تایبەت دەخرانە روو، کەهەموو ئەوانە باجێك بوون لەکونجی زیندانی تاکە کەسیدا لێیان سەندرابوو. ئەم تاکتیکانە لەحوکمی هەرەشەی راستەوخۆو رووبەروو دابوون بەرامبەر بەهەندێ لەهاوڵاتییە بەرێزەکانمان، کە لەلایەن دوژمنێکی بەهێزەوە ئەنجام دەدرا. تاکتیکێکی نوێ بوو کەلەلایەن روسەکانەوە بۆشەر لەجەنگێکی نوێدا گیرابوە بەر. لەراستیدا ئەوانە لە ئەوروپادا یەکەمین کێشمەکێشی جەنگی سێیەمی جیهانی بوو. ژمارەیەکی کەمی کەسایەتی فەرەنسی دەیانزانی کە (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەو دژە سیخوری) زۆرترین ئەرشیفەکانی ناو فەرەنسای بەدەست هێناوە. وەزیری داد هەندێکی لەوانە وەرگرتبوو، هەروەها پۆلیسیش هەندێکی لەلابوو؛ هەردوو ئەم سەنتەرەش بەباشی پارێزگارییان لەوبەڵگەنامانە دەکرد. بەهەمان شێوەش (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکی‌و دژەسیخوری)و لەدوایشدا ئەڵتەرناتیڤەکەی، واتە (فەرمانگەی گشتی چاودێریکردنی وڵات)، رۆتینانە پارێزگارییان لێدەکرد. بەپێوانە کردنی ئەورێچکە جودایەی کەروسەکان هەیانبوو، لەراستیدا ئەم بەڵگەنامانە بەکاغەزی بێ بودجە دادەنرا. بەڵام لەلای فەرەنسیەکان ، بەمادەی تەقینەوەدا دەنرا.

بەدرێژایی بیست‌و پێنج ساڵ کەس بوێری ئەوەی نەبوو سۆراغیان بکات‌و تەنانەت چاوێکیان پێدا بخشێنێتەوە. بروا هێنان بەم شتە بۆمن گرفتێکی گەورەبوو، لەکۆتاییدا داوای هەڵسەنگاندم کرد، تا تێبگەم کاتی چەند دەوێت هەموو ئەم ئەرشیفانە لێکۆڵینەوەی لەسەربکرێت‌و رێنمایی پێویستی بۆ دابنرێت.

پاش چەند رۆژ لێکۆڵینەوە، بەرێوەبەری ئەرشیف هاتە لام، وتی: (موسیۆ، بەرێوەبەری گشتی! پێش هەموو شتێك کارێکی لەوجۆرە کاتێکی زۆر دەبات‌و برێکی زۆر دراوی دەوێت. دەبێت ژمارەیەکی زۆر

خەڵك بۆ لێکۆڵینەوەیان تەرخان بکەین. سەرەڕای ئەوەش، پێویستمان بە پسپۆڕانە تا ڕێکیان بخات، کەدیارە ئەوەش کارێکی سادە نابێت. پێویستمان بەکەسانی دییە کەبزانن بەباشی ئەڵمانی قسە بکەن‌و، بڕێکی باش هوشیارییان دەربارەی دەزگای جاسوسی ئەڵمانیا هەبێت.)

دیارە لەم ڕووەوە تەگەرەی زۆر لە ئارادایە. کەسانێکی زۆر کەم لەم جۆرانە هەن کەبەسەر زۆربەی پنتەکانی وڵاتدا دابەش بوون. تیمێکم لەوجۆرە کۆکردەوە. ئەم تیمە پێکهاتبوو لە ئەفسەرێکی بەرجەستەو ناودار، (عقید یو)و ئەفسەرێکی یاریدەدەرو بەهاوکاری تیمێکی شەش کەسی پلەداری ئاشنا بەهەردوو زمان. بەڵگەنامەی لەو جۆرە بەگروپێکی بچوکی وەك ئەمە کار کردنێکی نائاسایی‌و سەرمایەیەکی زۆرو ماوەیەکی تاڕادەی دوو ساڵی پێویست بوو. بڕیارمدا بەئارامییەوە درێژە بەم کارەبدەم‌و، فرمانی لێکۆڵینەوەی قوڵی سەرەتاییانەم دەرکردو، بڕیار درا بۆ لێکۆڵینەوەی سەرەتایی چەند نمونەیەك هەڕەمەکیانە دەربهێنرێت. ئەوەی ئاشکرا دەبوو ناخۆش‌و تەنانەت بەئازاربوو. دەتوانرا بەئاسانی ئەو بەڵگەنامانە ببینرێن کە پەیوەست بوون بەکەسانێکەوە کەهێشتا لەژیاندا بوون‌و سەرقاڵی چالاکی بوون. بەخێرایی ناوی کەسانی ناودارو پیاوان‌و ژنانی دەوڵەمەند، کە لەکاتی جەنگدا وایان دەردەخست ئەندامی وەفاداری بزوتنەوەی بەرگریی‌و نیشتمان پەروەری ڕاستەقینەن، دەرهێنرا. لەبەرامبەردا، ئەم حەقیقەتە دەرکەوت‌و ئاشکرابوو کە ئەوانە بەکرێ گیراوی دەزگای نهێنی ئەڵمانیاو گشتاپۆ بوون. تەنانەت بەڵگەنامەی ڕێکەوتی پارە وەرگرتنەکەشیان ئیمزا کردبوو، کە لەڕاستیدا پاداشتی خیانەت کاریەکانیان بوو.

لەودەمەدا بیرم کردەوەو گەیشتمە ئەو بڕوایەی کەیەکێك لەزیانبارترین گەندەڵییەکان لەفەڕەنسادا دووبەرەکی‌و جیاوازیکردنە. لەوکاتەوەی کەسانێك لەنێو ئەم ئەرشیفە بەبەهایەدا ناسران، کە هێشتا لەژیاندا بوون، ئیتر پێویستمان بە گەڕانی ناوسەتڵی خاشاکەکانیان‌و هەڵگێڕانەوەی ئنجانەی گوڵەکانیان نەبوو؛ تەنانەت گەر ئەنجامی

باشیشی لێبکەوتایەتەوە یان بەلایەنی کەمەوە وانەوپەندی گرنگو بنەڕەتیشی بۆ داهاتوو لەدوو توێیدا بوایە. سەرەڕای ئەوەش، پلەوپایەیەکی کە جەنگی فەڕەنسا لەگەڵ خۆیدا هێنای لەیادم نەکرد. بۆ هەموو ئەوانەی کەسەبارەت بەدەستەبەرکردنی ئازادی بۆ فەڕەنسا مایەی دەستخۆشی لێکردن بوو، بەهەمان ئەندازەی یەکسانیش تاوانبارکردنو ئەشکەنجەدانو تەنانەت خراپتریش لەوانە لەئارادابوو.خودی خۆم هەندێك لەوئەرشیفانەم خوێندەوە، لەوانەبوون کە بەتەوای سەرنجی منیان ڕاکێشابوو. سەرنجم دا بڕێك لەناوەکان نەنووسراون، تایبەت بوو بەوکەسانەی کە بەکرێگیراوی نازییەکان بوونو، هەندێکی دییان لەوانەبوون کەخۆیان بەئەندامی بزوتنەوەی بەرگریخواز دەناساند، بەلأم سەربە گروپی خراپترین خائینەکان بوون.
بەهۆی ئەو بڕیارەمەوە کە ئەم ناوانەم بە بەشێکی دانبڕاو لەکارەکەم دەزانی کەوتبوومە بەرهێرشی بێزراندن. بەلأم لێکۆڵینەوەکانم لەسەرئەرشیفی نازییەکان بەتەواوی دروستی بڕیارەکەمی سەبارەت بەبردنیان لەگەڵ خۆمو خوێندنەوە یان بەمەبەستی پەرەپێدانی سەردەمی ئێستاو داهاتووی (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکیو دژە سیخوڕی) بەبێ هەستی لەزەتبردنو لەخۆبایی بوونو شانازیکردن بەڕابردووەوە- دەسەلماند. سەرئەنجام هیچ کارێکی دی منی لەگەیشتن بەو بابەتە هەستیارو گرنگانە نەدەگێڕایەوە. ئەم بابەتانە لەڕاستیدا چوونە ناو جەنگێکی سیخوڕییانەی سەرانسەری جیهانی بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، بەناچاری گرفتاری جۆرێك لەدەسیسەی فەڕەنسیەکان ببووم، کەجێنشینەکانی پێش منیشی لەتەلەزگەوە پێچابوو، هەموو تۆڕە جاسوسیەکانی فەڕەنسای لاواز کردبوو، کارایەکەشی وەك دەزگایەکی جاسوسی گەورە لەناو بردبوو. لەوێدا دەتەن لەم بەلگەنامە گرنگو جەنجالأنە لەژوورێکی تاریکی باش پارێزراو لە دەوورووبەری شاری پاریس، بەبێسوود لێوەرگرتن فرێدرابوون. لەبارەی ویلایەتە

یەکگرتووەکانی ئەمریکا یان بەریتانیای گەورەوە، پاش بیست و پێنج یان چل ساڵی دوای ڕووداوێك زانیم ئەوانیش لەم بارەیەوە بێدەنگ بوون، کە هەڵبەتە بێدەنگیەکەشیان مایەی باوەڕکردن نەبوو. بەڵام دەبێت ئەوەش بووترێت کە نەبەریتانیاو نەئەمریکا لەڕووی داگیرکردنی خاکەوە دووچاری زیان نەبوون. پرسەکان لەو وڵاتانەدا لەگەڵ وڵاتی ئێمەدا هەرگیز وێك نەدەچوون و وەك یەك نەبوون. (CIA)ی ئەمریکی، وەك دەزگاکانی هاوشانی خۆی لە بەریتانیاو فەرەنسا لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگ دەستیان گەیشتبووە هەندێ لەفایلەکانی گشتاپۆو دەزگا سیخوڕییەکانی ئەڵمانیا، سەرەڕای ئەوەش، بڕێکی زۆرتر زانیارییان دەستکەوتبوو، چونکە ڕێك پێش کۆتایی هاتنی جەنگ بەماوەیەکی درێژ لەگەڵ ژەنەڕاڵ (راین هاردگهان)، کە سەرکردەیەکی بەرجەستەی یەکەی هەواڵگری ئەڵمانیەکان بوو، کاریان دەکرد. هەموو باش دەیانزانی کە لەگەڵ خۆیدا ژمارەیەکی زۆر خەڵکی شیاوو شایستەو فایلەکانیانی هێناوە. لەناو ئەو زانیارییە زۆرەی کە لەلایەن گشتاپۆو دەزگا سیخوڕییەکانی ئەڵمانیاوە بەدرێژایی جەنگی داگیرکاری ئەورووپای خۆرهەڵات و خۆرئاوا کۆکرابوونەوە، فایلی باشترین نەخشەکێشانی شەقامیشی تێدابوو. هەڵبەتە سەرچاوەیەکی تایبەتیشی تێدابوو، کەسێك بوو خاوەن پەیوەستیەکی نزیك بەدەزگای نازییەکانەوە بەدرێژایی جەنگ، ئەو کەسەش جگە لە(کۆرت ڤالدهایم) کەسی دیکە نەبوو.

ئەو کەسەی پاشان بووە سەرکۆماری (نەمسا)و، لەلای لایەنگرانی لەسەرانسەری نەمسادا بێگوناح و، لەلای کەسانی دی مایەی نەفرەت بوو. لەماوەی دامەزراندنیدا لەپۆستی سکرتێری گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەڕێز (ڤالدهایم) هەرگیز بەهۆی ڕیشەی شێوازی پارێزەکارییەکەیەوە ڕەخنەی لێنەگیرا. تاڕادەیەك بەهۆی پیادەکردنی سیاسەتێکی دووبارە بووەوە کە تەنها دەیتوانی بۆ بلۆکی خۆرهەڵاتی زۆر گونجاو بێت، ڕەخنەی لێدەگیرا. باشە ڕوسەکان بەهۆی ئەوەی لەماوەی

ئەو ساڵە درێژانەدا ئەو بەڵگەنامانەیان لەلابووە تاوانباریان دەکرد؟ لەوانەیە. ئەی بۆچی ئاشکرایان کرد کەئەو بەڵگەنامانە دژیە سەرکۆماری نەمسادا بووە؟ کەسێکی کە بێگومان دەیانتوانی درێژە بەکۆنترۆڵکردنی بدەن.

ناتوانین هەرگیز وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە. بەڵام دەوڵەتی سەربازی فەرەنسا، کە بەشێکی فەرەنسای وابەستەی بەرلین بوو، ئاگاداریدا کە فایلێکی لەوجۆرەی (ڤاڵدهایم) هەیەو ڕاستەقینەیەو ڕابردووەکانی تێدایە. هیچ لەیادم نییە فایلێکی لەوجۆرەم دیبێت. پۆلیسی نێونەتەوەیی فرمانەکانی دەزگا نهێنیەکانی خۆرئاوایان لەئەستۆدا نییە، بەڵکو ئەمە ئەرکی دەوڵەتە کە پرس بەدەزگا نهێنیەکان (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکیو دژە سیخوڕی) فەرەنساو دەزگا جاوسیەکان سەبارەت بەبیروڕایان لەسەر کەسێك بکات. تا ئەوەندەی من لەیادم بێت سەبارەت بە(کۆرت ڤاڵدهایم) هیچ پرسیارێك لەئێمە نەکراوە؛ بەمجۆرە ئەرشیفەکانی ئێمەو ئەڵمانیەکان بەبێ دەست لێدان مابوونەوە. ئەمڕۆ ئێمە ئامرازی ترمان هەیە بۆ لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی بارودۆخی خەڵکی ناسراوو زۆر گرنگ لەسەرانسەری جیهاندا. لەپانتایی جەنگی چوارەمی جیهانیدا، کاتێك تیرۆریستو قاچاخچیانی مادە سڕکارەکان گروپی هێرشکارنو ناوو ناسنامەیان بەپێی پێویست وەك پۆشاکی خەوتن دەگۆڕنو، لەکاتێکدا ناوی خۆرهەڵاتی بەئەندازەی (ژاندیو) یان (جین دڤیونت) واتادار دەبێتو دەهلیزەو گۆشەی تاریکی خەڵوەتگاکان دەتوانن بکوژێك وەك بیرێکی ڕەش هەڵلوشێت، زانیاریو هەواڵگری کەسێتی دەتوانێت زۆرگرنگتر لەبەڵگەنامەی ورد مایەی ڕێنمایی کردن بێت.

(KGB)و دەزگا جاسوسیەکانی دی خۆرهەڵاتی بەتوانا ترو زیاتر ئاشنان لەبواری هەواڵگری کەسێتیدا. یەکێك لەوسەرچاوانە بەگەڕخستنی دەسەڵاتدارانی ناو ڕێکخراوی نێونەتەوەییەکانە، کەفایلی کەسایەتی

جیهانیان هەیە. ئەم جۆرە چالاکیانە لەکاروباری هەموو ڕێکخراوە جاسوسیە نێونەتەوەییەکاندا لەپنتی سەنتەریدایە. دەزگاکانی ڕوس‌و هەروەها فەڕەنسیەکانیش بەتاسەوەن بۆ دامەزراندنی کەسانی خۆیان لەپۆستە سەرەکیەکانی هەندێ لەڕێکخراوە نێونەتەوەییە تایبەتەکاندا.
سەرەڕای ئەوە، هەموو ئەوەش دەزانن کە هەندێك لەکارمەندی هەواڵگری زانیارییەکانی ئێستاو ڕابردوو، پۆستی دیپلۆماتی گرنگ‌و سەرەکیان بەدەستەوە بووە. ژەنەڕاڵ (فرنون والترز)، کە وەك جێگری دەزگای (CIA) ئەمریکا کاری دەکرد، پاشان بوو بەنوێنەری ئەمریکا لەڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان‌و، ژمارەیەك ئەرکی دیپلۆماسیانەی گرنگ‌و نهێنی بۆ سەرکۆماری ئەمریکا بەئەنجام گەیاندو، پاشان پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، وەك باڵوێزی یەکەمی وڵاتە یەکگرتووەکان لە ئەڵمانیدا دەست بەکار بوو.
لەچەند ساڵی ڕابردوودا نازناوی (دوو شەقڵی جاسوسی توندوتۆڵ) یان لێنابووین؛ ئەمەش ڕاستیەکی تێدابوو، کە ئێمە درێژەمان بەدۆستایەتی خۆمان دەداو لەهەموو کاتێکی گونجاودا لە پاریس، نیۆرك، یان هەر جێگایەکی دی کە بتوانین یەکتری ببینین، ئاڵوگۆڕی بیروڕامان دەکرد. چونکە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی دەزگای نهێنی، لەناو جەنگی چوارەمی جیهانیدا، بوونی زانیاری پێرسناڵی زۆر پێویستە. بەپێی ئەمە، بەلاوەنانی جەنگەکانی لەڕابردوودا ڕوویاندابوو، ئەم دەرخواستە بووەتە شتێکی گشتگیری کە دەسەڵاتدارانی هەواڵگری لەهەموو جێگایەکدا ئامادەی چاودێریکردن بن، لەڕاستیشدا خاوەنی توانایەکین کە هەمووشتێك دەزانین‌و دەربارەی هەرکەس کە بمانەوێت زانیاریمان هەیە.
لەڕاستیدا گەر تۆش بەئەندازەی من لەکاری جاسوسیدا پێشینەت هەبێت، خۆبەخۆ زانیاری گرنگ بەهەندی باش دەربارەی کەسانی گرنگ‌و پلە بەرز کۆدەکەیتەوە، کە تەنانەت یەکجاریش ئەوانت نەبینیوەو پەیوەندیت پێیانەوە نەبووە.

باوەڕی بڵاو بەوجۆرەیە کە ئەم زانیارییانە لەڕێگای بێسیمەوە دەگەنە ئێمە، لەڕاستیشدا چاودێری ئەلکترۆنیش یەکێکە لەگرنگترین ئامرازەکانی کارکردن. لەفەڕەنسا مۆڵەتی (گوێڕا داشتن)ی تەلەفۆنمان هەبوو، بودجەکەی ڕاستەوخۆ لەلایەن سەرۆك وەزیرانەوە دابین دەکرا، بەڵام زۆر لەچالاکیەکان لەلایەن دەزگا جۆراوجۆرەکانی ئاسایشەوە ئەنجامدەدران. لەماوەی یازدە ساڵدا، هەموو ڕۆژێك لەسەرمێزی کارکردنەکەم ڕاپۆرتی بێسیمی دانرابوو. ئەو ڕاپۆرتانە کورت کرابوونەوە، بەڵام گەر ڕوونکردنەوەی دوورو درێژم بویستایە، بەسبووداوام لەیەکێك لەیاریدەدەرەکانم بکردایە، کە لەماوەی چەند دەقیقەیەکدا خواستەکەم جێبەجێدەکرا. کارەکانم بەجۆرێك ئەنجام دەدا کە هەرگیز سوودی خراپم لەوبڕوایە وەرنەدەگرت. بەمجۆرە، دان بەهەندێ خاڵی لاوازی خۆمدا دەنێم. لەیەکەمین ساڵی ڕاژەکرنمدا لە (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکیو دژە سیخوڕی) فەڕەنسادا، پێش ئەوەی بەتەواوی لەژیانی ئاساییم گۆشەگیرببم، زۆرجار بۆ تازەکردنەوەی ئەو پەیوەندییانەی کەلێی دابڕابووم، لەشارنانم دەخوارد. ساڵێك لەژێر هەژموونی ئەزموونی بەردەوامداژیام و، لەژێر فشارێکی زۆردا ئارامم گرتو، گوێیەکانم لەبەردەم ناشیرینترین وشەدا کەڕبوونو پرسیاری گەمژانەی زۆریان بیست.

لەناو ئەو پرسیارانەی کەدووبارە دەبوونەوە، زۆرجار ئەم پرسیارە دەبیسترا: (ئایا مایکرۆفۆنتان بۆمن داناوە؟) وەڵامی منیش هەمیشە بەمجۆرە بوو: (تۆ پێویستە زۆر ئاگات لەخۆت بێت.)

یەکێك لەوگاڵتە جاڕییانەی حەزم دەکرد لەبۆنەکاندا ئەنجامی بدەم، کە بەدەگمەن دەچوومە ئەو شوێنانە، گاڵتە کردنێك بوو حەزم زۆرپێی بوو، هەرچەندە گەمەیەکی بچوك بوو وامدەزانی زیانی نییە، بەڵام کە بەڕابردوودا دەچوومەوەتا ڕادەیەك دوو دڵ دەبووم لەئەنجامدانی، لەگەڵ ئەوەشدا دان بەوەدا دەنێم کەچێژم لێوەر دەگرت.

کاتێك کەسێکی ناودارم دەبینی خۆی بەگرنگ دەنواند- خواش دەزانێت پاریس‌و زۆربەی شارە گەورەکانی دی جیهان، لەوانە نیۆرك‌و واشنتن پڕن لەم جۆرە کەسانە- دووی دەکەوتم‌و پەنجەم لەکونە لووتەکانی ڕۆدەکرد. (دیارە ئەوەشم قبووڵە کە ئەم جۆرەکارانە بریندارکردنی پێوە بوو)، پێکەنینێکی ئانارشیستیانەم بۆ دەکرد: (ها! ها! ها!).لەو کاتانەدا دەمتوانی بیبینم کە لەتوڕەیدا ڕەنگی دەپەڕی. لەحاڵەتی وڕبووندا بەخۆم دەوت: (پێویستە تێبگات.).بەڵام ئەم گەمەیەم یەکجار ئەنجامدەدا. یەکێك لەهاوڕێ باشەکانم،(پییر مسمر)، کە بەدرێژایی جەنگی دووەمی جیهانی سەربازێکی باڵابوو، بوو بەسەرۆك وەزیرانی فەرەنسا، پیاوێکی بەتەواوی بەئەدەب‌و شایستەو واقیعی بوو، لەهیچ ڕوویەکەوە شایستەی سەرزەنیشت کردن نەبوو، کاتێك ڕووبەڕووی من بۆوەو پەنجەکانم لەکونە لووتەکانی ڕۆکرد، بەخوێن ساردییەکەوە چاوی تێبڕیم‌و بەهێواشی وتی: (مەبەستت چییە؟ ها،ها،ها!) لەدوای ئەوەو لەوشوێنەوە ئیتر گاڵتە کردنە بچوکەم کۆتایی پێهات.

لەڕاستیدا لەنێوان کەسایەتیە سیاسیە گرنگەکاندا، کەسانێك هەبوون کەهیچ شتێکیان نەبوو حەشاری بدەن، دیارە ژمارەشیان کەم بوو. گومانی تێدا نییە ژمارەی ئەوانە لەئەمریکا، شوێنێکی کە پێودانگی ئەخلاقی بۆ کەسە تایبەتەکان لەبەرزترین ئاستدایە لەچاو وڵاتانی وەك ئێمەدا، زۆرکەمترە. بەڵام ئەوانەی بەشێوازی درۆکردن هەوڵ دەدەن شتێك پەردەپۆش بکەن، هەمیشە خۆیان دەزانن کە بەڕێوەبەری گشتی دەزگای جاسوسی فەرەنسا ئەو شتە (دەزانێت). لەحەقیقەتدا ئەو کەمتر لەکەسانی دی سەرقاڵی خەیاڵ پڵاوییە. بەڵام خاڵی لاوازی زۆربەی خەڵکی ئەمەیە کە ئەوشتەی ئەو دەیزانێت ئەوان لێی ئاگادارنین. کێشەم لەگەڵ کەسدا نییەو، وایبە باش دەزانم لەکاتێکدا کە نازنن بیر لەچی دەکەمەوە، لێیان دوور بکەومەوە. بەپێودانگێکی فراوانتر، ئەو جۆرە مەسەلانە ڕادەربڕینێکی کلاسیکیانەیە؛ شتێکی کە ئێمە لەڕابردوودا

بەردەوام وەك دەستكەوتێكی باش بەكارمان هێناوە. زانیارییەكانمان لەنێو ڕێكخراوە تیرۆریستیەكاندا باشتر بەكاردێت تا لەناو دەزگا گەورەكاندا، كە پێكهاتەیان توندو تۆڵترە. تیرۆریستەكان وابیردەكەنەوە كە ئێمە تا ڕادەیەكی مومكین زانیاری وردو زۆرترمان سەبارەت بەچالاكیەكانیان هەیە. هەوڵو تەقەلاكانیان بۆ داپۆشینی شوێن پێكانیان، كە لەوانەیە ئێمە هەرگیزنەیان دۆزینەوە، بەناچاری براوتنیان سست دەكات؛ بۆ ئێمە لەهەموو هەلومەرجێكدا دەرزییەكی كە بەهێواشی دەجولێت، زۆر باشترە تا دەرزییەكی بەخێرایی لەجولە دایە.

سیاسەتمەدارانێكی، كە پێویستە لەڕووی لێكدانەوەو لەڕاستیشدا باشتر لەكەسانی دی هەست بەپرسەكان بكەن، لەگەڵ تیرۆریستەكانو قاچاخچیانی مادە سڕكارەكان سەبارەت بەوەی كە دەزگا جاسوسیەكان ئاگاداری هەمووشتێكن، لەبیروڕادا هاوبەشن. هەندێجار دەبیستم كەداوا لەسیاسەتمەدارە پلەیەكەكان دەكرێت تا دەربارەی هەندێ دەسیسەی دارایی زۆر ئالۆز لێكۆڵینەوە ئەنجام بدەن، ئەوانیش لەكاتی لێكۆڵینەوە كە دابەردەوام ئەوە بەگوێی مندا دەدەن كە خۆیان هیچ ڕۆڵێكیان تیایدا نییە. بەڵام لەكاتی بەئەنجامدانی كارەكەو وردبوونەوە لەوردە كاییەكانی پەیوەست بەومەسەلەیەوە، بەئاشكرا من لە گەندەڵیەكانی خۆیان ئاگادار دەكەنەوە. بەم شێوەیەو بەپێی پەیڕەوكردنی ئەم سیاسەتە، بەخێرایی كاری نوێی خۆم دەناسم، كە زۆرجار چەمكی تەواو جیاوازو دروستو نادروستی لەخۆگرتووەو، لەڕاستیشدا پێودانگی تەواو جیاوازی مۆڕاڵی هەلگرتووە.

ئەمەش بەلگەی ئەوەیە كە بۆچی ئێمە بەتەواوی لەدەرەوەی كەناری سیاسەتە ناوخۆییەكان دەوەستین. دیارە جگە لەحاڵەتی ئاوارتەییەكی دەگمەن، كە پەیوەستن بەئاسایشی نەتەوەییەوە یان ئابوری وڵاتو باری گرنگیانەوە.

بەشی حەوتەم:

## ڕازە بەدوو بەڕێز

لەماوەی کارکردنمدا لەپۆستی سەرۆکایەتی دەزگای جاسوسی فەرەنسا لەڕازەی دوو بەڕێزی تەواو جیاواز لەیەکتریدا بووم؛ (جۆرج پەمپیدۆ)و (ڤالری ژیسکاردستن). بۆ بەڕێوەبەرێکی گشتی دەزگایەکی جاسوسی گرنگترین پرس ئەوەیە کە هەرگیز هەوڵ بۆ ڕازیکردنی لێپرسراوەکەی نەدات. لەحاڵەتێکی گەلێك دژوارداو لەپاش دەمەدەمەیەکی دوورو درێژو ئاڵۆز لەگەڵ سەرکۆمار (جۆرج پەمپیدۆ) بەبێدەنگی بەرەو دەرگاکە گەڕامەوەو تەواو لەوساتەی ئۆفیسەکەیم جێدەهێشت کە لەکۆشکی (ئەلیزێ) دابوو، وتم: (بەڕێز سەرکۆمار! شتێکی گرنگی مارشاڵ (دیفویلار)م لەیادە، کە لەنامەکەیدا بۆ (لویسی شازدەیەم) نوسیوێتی، کارێکی ئاسان نییە هەم ڕازە بکەیتو هەم لایەنی خۆشت قایل بکەیت)

لەڕاستیدا پەیوەندی نێوان کۆشکی ئەلیزێو (دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکیو دژە سیخوڕی) ئەوەندە یەك دەستانەو ئاساییو، لەگەڵ سەرکۆمار (پەمپیدۆ) ئەوەندە گەرم بوو، کە ئیرەیی لەمرۆڤدا دەجولاند، بەپێچەوانەشەوە بەدرێژایی دەستبەکاربوونی (ژیسکاردستن) تاڕادەیەکی دیارو ئاشکرا ئەم قوڵی پەیوەندییانە بەرەو لاوازی دەڕۆشت. هەردوو سەرکۆمار لەسەدا سەدو بێچەندوچوون متمانەیان پێم بوو. گەروانەبوایە نەمدەتوانی بەوچۆنایەتیو ئازادییەوەی کە هەمبوو لەڕازەیاندابم. بەڵام شێوازەکانیان دەقاودەق وەك کە سایەتیەکانیان لەڕیشەوە جیاواز بوونو، بەتایبەتی پێشینەیان کەزۆر لەیەکدی جوودابوو. (پەمپیدۆ)م باش دەناسی، بەڵام (ژیسکاردستن) وەك نهێنییەکی ناودڵی ماسك پۆشێکی شاراوە مایەوە. دەرککردنیان بەماهیەتی (دەسەڵات)و سوودوەرگرتن لەجاسوسیەت لەبنەماوە جیاوازبوو. هەرکەسەیان پەیڕەوەی پرسە هەنووکەیەکانی سەردەمی خۆی دەکردو، هەولیان دەدا بەشێوازێکی تەواو جیاواز لەیەکتری دەری ببڕن. (جۆرج پەمپیدۆ) هەمان ڕۆڵەی چاکی

جەنگی دووەمی جیهانی بوو، کەپێی نابووە ناودەمی جەنگی سێیەمی جیهانییەوە. (ژیسکاردستن) وانەکانی ڕەفتارو سیاسەتەکەی لەبۆتەی مەیدانەکانی جەنگی سێیەمی جیهانیدا فێرببوو، هەوڵیدەدا لەبەکارهێنانیاندا لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا کەموزۆر سەرکەوتوو بێت، کە دروست لەوکاتەی پۆستەکەی بەجێهێشت یەکەمین کێشمەکێشەکانی سەری هەڵدا. (فرانسۆمیتران) جێنشینی (ژیسکاردستن)، کەمن تەنها چەند مانگێك بەپێی حوکمی یاسا تا پۆستەکەم دەگۆڕا لەڕاژەیدا بووم، ئاوێتەیەکی نامۆی دوو جەنگە. بەرهەمی جەنگی دووەمی جیهانی بوو کەهەوڵی دەدا ئەزموونەکانی لەناوجەنگی چوارەمی جیهانیدا پیادە بکات بۆ ئەوەی ببێتە خاوەنی پشکی تەواو تیایاندا؛ ئەوەش بەبێ ئەوەی لەناو بۆشایی نێوانیاندا لەجەنگی سێیەمی جیهانیدا دوچاری شۆكو فشار ببێت)

وەك ڕاژەکارێکی (پەمپیدۆ)و (ژیسکاردستن) پێمنایە ناودوو سەردەمی تەواو جیاواز لەمێژووی فەڕەنساو مێژووی دەزگای جاسوسی فەڕەنسا. ئەم بزاوتە لەسەر ئاستی توانا زۆرەکانی دەزگای جاسوسی فەڕەنسا لەبۆتەی ئەرکێکی گۆڕاوی نەوەد پلە بیدابوو، کەشایانی تێبینی کردن بوو، لەهەمان کاتیشدا دڵی مێژوو بەردەوامی بەلێدانەکانی خۆیدەدا. لەماوەی نێوان دەستبەکاری ئەو دوو سەرکۆمارەدا، گەیشتمە ئەو باوەڕەی کەئەو ئاڵوگۆڕە دەرئەنجامی بەشداریکردنی جیاوازانەی هەریەکەیان لەجەنگی دووەمی جیهانیو هاوکاری تەواویان لەگەڵ جەنەراڵ (دیگۆڵ) بووە.

(پەمپیدۆ) لەساڵی (١٩١١) لەدایکبووەو، پێش تەمەنی سیو سێ ساڵی لەسەردەمی ئازادی فەڕەنسادا، کاتێك یاریدەدەرێکی (دیگۆڵ) لەتەقەلای دۆزینەوەی مامۆستایەکدا بووە کە فەڕەنسی بزانێت، ئەمی دۆزیوەتەوە، ئەوکاتە ئەم خولی سەرەونگونکردنی جانەوەرێکی سەرگەشتەی تێدەپەڕاند، واتە ئەودەمەی ڕوسیای ستالینی لەدۆستێکی لابەلای خۆرئاواو سوێندخواری هیتلەرەوە وەك دوژمنێکی سەرسەختی نازییەکانو ئەندامی یەکێتی خۆرئاوا، لەکاتی سایەخستنی جەنگی دووەمی جیهانیدا، دەرکەوت. گومانێکی زۆری

لەیەکێتی سۆڤیەت هەبوو، ئەو گومانەشی بەرئەنجامی پەنهانیەکانی ئەو شەڕانە بوو. هەرگیز نەیتوانی جۆرێکی دی لەڕوسیا بنوارێت. چاوتێبڕینە هەمیشەییەکانی لەڕۆڵی ئێمە، لەسەرکەوتن لەجەنگی سێیەمی جیهانیدا، هەمان ئەو ڕەتکردنەوانەیان سەپاندبوو. لەوکاتەدا ئەو لەناوڕووداوی داهێزارانی کۆلۆنیالیزمدا دەژیاو، لەپاڵ (دیگۆل)دا لەجەنگی خانەخوێ ڕاپەڕیوە ناوخۆییەکانی جەزایردا لەڕاژەدابوو، گەواهی لەدەستچوونی دوایین کۆلۆنی فەڕەنسا لەسێ کیشوەری جیاوازدابوو. تیرۆریزم، لەوجۆرەی کە ئێمە وەك سەنگی سەرەکی ناوجەنگی چوارەمی جیهانی ناسیمان، لای (پەمپیدۆ) زیاتر بەرئەنجامی جەنگی ناوخۆبوو، کە دەیویست بەخێرایی‌و بەبێ بچوکترین زیان کۆتایی پێبهێنێت. لەلای ئەو کەمتر وەك هێرشی دەرەکی‌و سزادان دەردەکەوت. بەهەرحاڵ، (ژیسکاردستن) دوای (پەمپیدۆ) هاتبوو. ئەو لەساڵی (١٩٢٦) لەدایك ببوو، لەسەردەمی ئازادی فەڕەنسادا تەنها هەژدە ساڵ تەمەنی هەبوو. پەیوەندی نەکرد بەبازنەی سیاسی (دیگۆڵ)ەوە تا ئەوکاتەی جەنگی جەزایر بەتەواوی ڕاگەیەندرا. لەلای ئەو چەمکە سوپاییەکانی جەنگی دووەمی جیهانی زیاتر حەقیقەتێکی مێژووی بوون تا چەمکێکی بەرجەستە، چونکە لەساڵی (١٩٤٥) لەڕیزی سوپادا خۆی ناودێرکرد، واتە دروست لەکۆتایی جەنگی ئەڵمانیادا بوو. جەنگی سێیەمی جیهانی لەکاتێکدا ڕوویدا ئەو لەناو تاکتیکە سیاسی‌و سەربازییەکانیدا دەژیاو، یەکەمین دەرگیرییەکانی جەنگی چوارەمی جیهانی بۆ ئەو ڕووداوێکی سەخت‌و گرنگ بوو. کاتێك (پەمپیدۆ) بووە سەرکۆمار، زۆرجار پاش کارەکەم دەچوومە کۆشکی (ئەلیزێ). هەموو ئەوانەی تیمی سەرۆکایەتی کۆماریان پێکدەهێنا لەوێ بوون‌و، بەچواردەوردا لەسەر کورسی جوان‌و خۆش لەئۆفیسی سەرکۆماردا دەنیشتن. لەناو ئەوکەسە ئاساییانەدا یەکێکی باڵابەرزو میهرەبان بەدووچاوی تیژڕەو لەحاڵەتێکی ناجێگیردا لەوێ بوو، ئەوکەسە(جاك شیراك) بوو، کە پاشان وەك وەزیری کاروباری ئابوری دەستبەکار بوو، بەڵام دوای ئەوە ڕاستەوخۆ بووبە سەرك وەزیران‌و،

هەمیشەش لەناولیستی پاڵیوراوانی سەرنەکوتوو بۆ پۆستی سەرکۆماریدا بوو. بەڵام من زیاتر سەروکارم لەگەڵ (پیرجولیت)ی کۆنە ڕاوێژکاری سەرکۆماردا هەبوو. چەندەها جار لەگەڵیدا پەیوەندی نزیکم گرتووە، لەیەکەمین جارەوە کە سەرکۆمار پرسەکەی منی بۆ تازەکردنەوەی دەزگای دژە سیخوڕی فەرەنسا پێشنیازکرد، تا ئەودەمەی لەدواینجاردا ئەو ئەرکی گۆڕانکارییەم پەسندکرد، چەندین جار چاوپێکەوتنم لەگەڵیدا ئەنجامدا. چونکە لەماوەی ساڵی یەکەمو، لەڕاستیدا سەخترین ساڵەکانی کارکردنم، چەندین جاری تر چاوم پێی دەکەوت. هەلی لەژمارە نەهاتوومان بۆدیدارو گفتوگۆ سەبارەت بەپرسە جوداکان لەڕەهەندە فراوانەکاندا دەڕەخساند. ئەو پرسیارانەی کە دەبوو سەرنجی سەرکۆماری بۆ ڕابکێشرێت، پێش هەموو شتێك لەنێوان خۆماندا دەربارەی وردەکاییەکانی لێکۆڵینەوەمان ئەنجام دەدا. ئیتر ئەگەر خودی خۆم یان بەپێی ئاسایشی ناوخۆی دەستەی وەزیران شتێکی گرنگ هەبوایە، لەپشتی مێزەکەمەوە دادەنیشتمو دەستم دەکرد بەتاوتوێ کردنی. بەڵام زۆرجار تاوتوێکردنەکانمان لەسەر پرسە گرنگو هەنووکەییەکانی وڵات یا سیخوڕی فراوان دەبوو. چوونم وەك سەرۆکی دەزگای جاسوسی فەرەنسا لەگەڵ پیلانە گەورەکەی (مارکویك) ئەوەندە ماوەیەکی زۆری لەنێواندا نەبوو. کێشەکەی (مارکویك)و بەئاشکرا لەسێدارەدانی، کەپاسەوانی ئەستێرەی فیلمە فەڕەنسیەکان (ئالان دیلۆن) بوو، ئەو پڕوپاگەندانەی لەدەورەی (مارکویك) بوون سەبارەت بەپەیوەندییەکانی بەگروپە ناجۆرەکانەوە، کە لەشوێنە جیاوازەکاندا وێنەی کەسایەتیە باڵاکانی دەوڵەتیان گرتبوو، هەندێ کەس لەوبڕوایەدا بوون (پەمپیدۆ) منی دامەزراندووە تا ئەو دەسیسەو پڕوپاگەندانەی بەخێزانەکەیەوە لکێنرابوون ڕیشەکێش بکەمو، کۆتایی بەپاشماوە قێزەونەکانیان بهێنم. هەڵبە تەکاری لەوجۆرە بەسانایی بنەبڕ نەدەکرا. ئەم تێڕوانینە نادیدە گرتنی هەموو کارە ناوخۆییەکانی سیستمی پیشاندەدا. تەنا لەهەلێکی ڕەخساودا دەمتوانی لەگەڵ سەرکۆمار باس لەقوڵترین هەستەکانی

سەبارەت بەناو زڕاندنی خۆیو هاوسەرە باشەکەی بکەم، ئەو هەلەش لەکاتی دووبارە بوونەوەی چاوپێکەوتنەکانمانو لەدەمێکی زۆر دوورو لەکۆتایی ڕۆژێکی سەختدا هاتە پێش؛ هەرچی لەدڵیدابوو لەلام هەڵی ڕشت. کاتێك باسی لەوکارانە دەکرد کە دوژمنەکانی، جگە لەوەی لەگەڵ خۆی کردبوویان، لەگەڵ هاوسەرەکەی ئەنجامیان دابوو، چاوەکانی فرمێسکیان تێزا.

ئەم ژنو مێردە خاوەنی خەسڵەتێك بوون، کەلەم سەردەمەدا دەگمەنە. ئەوان عاشق بوونو بەتەواوی خۆیان بۆ یەکدی تەرخان کردبوو. دانبەوەدا دەنێم کە لەوگفتوگۆیەدا لەوانەیە گەمژەییم کردبێت.

پێناسەی (پاریسی سەرنج ڕاکێش)م بۆ سەرکۆمار تاریف کرد: پاریسێکی خۆدەرخەر کە هەمیشە خەریکی بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە بوو، تانەی دەداو تەشەری لەخەڵکی دەگرتو، هەریەك لەبکەرانی ئەو ڕەفتارانە تەقەلایاندەدا باشتر لەکەسانی دی ئەنجامی بدەن. ئەوانە وەك ئەو قرشانەن کە بەبۆنکردنی خوێن لەناو ئاودا، کە ئامازەی برینداربوونی بوونەوەرێکی دییە، ملی ڕێگا دەگرن بۆ کوشتنی. بەسوعبەتەوە وتم: (کاتێك عەقڵ نوقسانەکان دەهاتنە پاریس، زۆرجار بەهۆی هەمان ئەو قوربانیانەوە، بۆنمونە سەرنج ڕاکێشەرەکان کە بۆئەو بیرکورتانە هەڵخەڵەتاندنیان تایبەتمەندی خۆی هەبوو، تووشی پایە ماڵیو سەرکوتکردن دەبوون؛ زۆربەیان نەیاندەتوانی ئەوەببینن کە دواکەوتوویو سایەی ڕەش باڵی بەسەر چ جێگایەکی کۆمەڵگادا کێشاوە.

(پەمپیدۆ) بێدەنگ بوو، بەزوویی تێگەیشتم کە کاردانەوەکەی دەرئەنجامی شوێنە تایبەتیەکەیەتیو، بەرامبەر بەکەسانی دەوروپشتی هەڵسەنگاندنی هەڵەی هەیە. دەردێکی کوشندەی دی بەڕێز (پەمپیدۆ) بەهۆی کەسانێکەوە هاتبووە ئاراوە، لەناویشیاندا سیاسەتمەدارانی پارتەکەی خۆی کە شوێنکەوتی (دیگۆل) بوون. ئەوانە کەسانێك بوون لەکێشەی (مارکویك)و زۆر دی کەدوای ئەو کێشەیە هاتنە ئاراوە، لەپشت نابوتکردنیەوە بوون. سەبارەت بەنەخۆشییەکانی ئەو هیچم نەدەبیست. هەوڵەکانی بۆ ڕیسواکردنی خانم (کلۆدیا پەمپیدۆ)، خانمی یەکەمی فەرەنسا

دەدرا، تەنها بەرپرسیارێتی هاوسەرەکەی فراوانتر دەکرد. تادوا سەعاتەکانی ژیانیشی ئەم تۆمەتە سایەی بەسەر هەموو دەزگا حکومیەکانیدا کێشابوو. خۆی ئامادەکردبوو دەربارەی ئەم بابەتە هیچ باس نەکاتو، منیش ڕاستەوخۆ پاش وەرگرتنی بەرپرسیارییەکی گەورە لەکاتی نەخۆشکەوتنی ئەودا ئەم شتەم زانی. نەخۆشییەکەی تاماوەیەکی دوورودرێژیش دوای سەرکۆمارییەکەی لەلای جیهان ئاشکرا نەبوو. ڕێزو حورمەتی زۆرم بۆی هەبوو، کاریگەری زۆریشی لەسەرم هەبوو کە پەیوەندنەبوو بەهەستی بێدەنگیەکەی دەرهەق بەو بابەتەی سەرەوە. دیارە بۆ باشتربوونی نەخۆشییەکەی هەڵبژاردنی بێدەنگیو جۆری ڕەفتارێك، وەك ئەوەی هیچ شتێك ڕووی نەدابێت، ڕەنگدانەوەی هەستی ڕاستەقینەو نیشتمان پەروەری بوو، کە تا دواساتی گونجاو دەبێت درێژە بەجێبەجێکردنی ئەرکەکانی لە پێناو ڕابەرایەتی کردنی وڵاتدا بدات. هەندێك حەزیان بەوەبوو دەست لەکار بکێشێتەوە، بەڵام ئەو بەرامبەر بەوکەسانەی کە ئەم بابەتانەیان لەڕوونەدەدا، پەیوەستییەکی هاوڕێیانەی هەبوو. بەدرێژایی ئەوماوەیە، درێژەی بەکارەکانی خۆی دەدا. کۆبوونەوە ڕێکوپێکەکانی لەڕۆژانی چوارشەممە، دیدارە تایبەتیو گشتیەکانی، هەمووی بەبێدابڕان جێبەجێدەکرد. تادوا هەفتەی تەمەنی، واتە مانگی مارسی ساڵی (١٩٧٤)، لەگەڵ ڕۆژەکانی دیدا هیچ جیاوازییان نەبوو. ڕۆژی پێنج شەممە چاوی بە(ڤالری ژیسکاردستن) کەوت، کەتا ئەوکاتە وەزیری دارایی بوو. لەڕۆژی هەینیدا پێشوازی لەوەزیری دەرەوەی خاوەن شوێنگەی نێونەتەوەیی (میشێل ژوبر) کرد؛ لەکۆتایی هەمان هەفتەدا، وەك نەریتی خۆی چوو بۆ ماڵە گوندییەکەی لە(ئورویلییە). تا ئەوکاتە هیچ دیاردەیەك لەنەخۆشییەکەی، کە لەشێوەی شێرپەنجەی لیمفاویدا بوو، دەرنەکەوتبوو. بەڵام لەڕاستیدا نەخۆشییەکەی لەدواین قۆناغی خۆیدابوو؛ لەپڕێکدا ڕۆژی یەك شەممە لەهەمان شوێندا باری تەندروستی بەرەو داڕمان چوو. دووشەممە بەئەمبولانس بۆ ئەپارتمانەکەی لەپاریس گوێزرایەوە. بەدرێژایی

ماوەی هاوڕێیەتیمان چەندین جار بۆ دیدەنیکردنی بۆئەو ئەپارتمانە چووبووم. ئەوێ جێگایەکی ڕازاوەو گرانبەهاو نموونەی ئۆفیسی سیاسەتمەدارە پایە بەرزەکانی فەرەنسا نەبوو. (پەمپیدۆ) وەك زۆربەی هاوتایانی خۆی، کەخاوەنی ئەوشتانەن، خاوەنی داراییەکی زۆرنەبوو. هیچ کاتێکیش مەبەستی نەبووە ئەپارتمانێکی لەوجۆرە بکڕێتو، بەهیچ جۆرێکیش بەهۆی ئەو پێگەیەی کەهەیبوو، یان تیایدا ڕاژەی بەوڵاتەکەی دەکرد، بیری لەبەرژەوەندی دارایی خۆی نەدەکردەوە.

ئەو ئەپارتمانە، وەکو زۆربەی ئەپارتمانەکانی دی ناو پاریس کە بۆ کرێن؛ موڵکی کۆمپانیایەکی بیمەیی بوو. (پەمپیدۆ) زۆر سادەبوو، تەنها کرێچییەك بوو. بەیانی ڕۆژی دوایی، واتە سێ شەممە، هێشتا ئەوەندەی هێز لەبەردامابوو کەبتوانێت چەند نوسراوێکی فەرمی ئیمزا بکاتو، دەستوری کاری ڕۆژی داهاتووی ئەنجومەنی وەزیران دەربکات. پێش خۆرنشینی هەمان ڕۆژ لەحاڵەتی بێهۆشیدا ڕۆنیشتو، لەسەعات نۆی شەودا بەتەواوی خۆی بەمەرگ سپارد. کۆچی لەناکاوی (پەمپیدۆ) بۆ هەمووومان بەئازارو سەغڵەتی بوو. ئەو شەوەی کەمرد، ژمارەیەکی زۆری خەڵك هێرشیان بۆ کۆشکی ئەلیزێ هێنا. چواردەوری کۆشك بەتەواوی ڕووناك بوو. کامێراو مایکرۆفۆنەکان لەزۆر شوێن دەبینران. تا ئەو دەمە بەهیچ شێوەیەك بۆ سەرەخۆشیکردن سەردانی کۆشکم نەکردبوو، بەڵام زانیم کەخەڵکانی دەوروبەری سەرکۆمار، لەڕاوێژکاران‌و خێزانەکەی وەك شێت بەدوومدا دەگەڕێن. دەزگا بەهۆی تەلەفونی ناو ئۆتۆمبیلەکەوە ئاگاداری کردمەوە، کەکۆشکی ئەلیزێ دەیەوێت قسەم لەگەڵدا بکات. بەخێرایی گەڕامەوە بۆ ئۆفیس‌و لەدوای تەلەفون بۆ ئاسایش زەنگم بۆ ئۆفیسی سەرکۆمار لێدا کەببووە پرسەخانە. وادیار بوو کە دەمو دەست کە نزیکترین کەس لە سەرکۆمارەوە ئەوەی بەمێشکدا هاتبێت کە لەوانەیە بەڕێز (پەمپیدۆ) لەپاش خۆی میراتنووسییەکی سیاسی بەجێهێشتبێت. ئەمە بیرێکی تەواو بەرزبوو. شتێکی لەوبابەتە دەیتوانی

ئامارژە بەجێنشینی دوای خۆی بکات. ئەگەر (پەمپیدۆ) کەسێکی شیاوی بۆجێنشینی لەوکارەدا دیاریبکردایە، تەنها ناوی کەسێك کەبتوانێت حکومەتی فەرەنسا بەڕێوە بەرێت، ئەو نەهامەتیەی لەناو دەبرد کەئەوکاتە هاتبووە ئاراوە. کەسێکی کە لەئەگەری بەهێزو ئالوگۆڕێکی کتوپڕی ڕای گشتیدا هەڵبژێردرا بوو، لەهەڵبژاردنی داهاتوودا جێنشینێکی هەڵبژێردراو دەبوو. لەوگفتوگۆ تەلەفۆنیەدا ئەوەندە تێگەیشتم کە لەکۆشکی ئەلیزێ مەسەلەیەکی زۆر خێراو پێویست لەئارادایە. هیچ کەسێك نەیدەتوانی جانتاکەی (پەمپیدۆ) بکاتەوە، چونکە کەس نەیدەزانی کلیلەکەی لەکوێیە. ئەم جانتا فەرەنسیانە، سەرەڕای ئەوەی چەند قفلێکیان هەبوو، یەك کلیلیان هەبوو، کە لەو نەخۆشیو پەرێشانییەی (پەمپیدۆ)دا کەس سەری نەپەرژابوو بزانێت کلیلەکەی لەکوێ داناوە؟

(دەزگای جاسوسی) سەرەڕای تواناکانی دی، تاکە باڵی دەوڵەتی فەرەنسی بوو خاوەنی بەرزترین ئاستی شارەزایی کردنەوەی جانتابوو. ئێمە لەبەشی قفڵ دروستکردندا سەرسوڕهێنەرترین جادووگەرمان هەبوو. لەکۆمەڵگای (تورل)دا ژوورێك بەڕیزێك جانتا هەبوو، کە لەناودارترین دروستکراوە ڕەسەنەکانی جیهان بوون. پسپۆڕەکانم دەیانتوانی بەبێ کلیلو لەماوەی تەنها دوو دەقیقەدا هەریەکێك لەوانە بکەنەوە.

بینەرانێکی کە ئەوەیان دەبینی دەیانووت: (ئەی خوایە. چەند ترسناکە)و بێ دوودڵی دەگەیشتنە ئەو باوەڕەی کە هەرچییەك بکەن بۆ شتە بەهادارەکانیان ناکرێت پارێزراو بن. لەگەڵ کردنەوەی جانتاکەدا، خۆشبەختانە هیچ بەربەستێكو تەنانەت بچوکترین ڕێگریش نەدەهاتە بەردەمی پسپۆڕان. لەڕاستیدا ئاسایشی ڕاستەقینە واتە ڕێگری کردن لەخەڵکی دزو جەردە لەدەست بەسەراگرتنی جانتایەك لەودەست درێژییانەی کەڕوو دەدەنو، کە بەها بنەڕەتیەکەی لەپاراستنی ناواخنەکەیدایە.

ئەو شەوە پێش ئەوەی بارەگای فەرماندەییم بەرەو کۆشکی ئەلیزێ بەجێبهێڵم، زانیم کەجانتاکەی سەرکۆمار فیشەیەکی سێ ژمارەیی بووەو، لەسێ دووگمەی بچوك پێکهاتووە کە دەبێت پێش بەکارهێنانی کلیل ئەو ژمارانە بدۆزرایەتەوە. لەوکاتەدا، واتە سەعات دەی شەو، سەرۆکی بەشی کلیلسازیم بانگ کردو لێم پرسی: (پسپۆڕەکەت، کە لەکردنەوەی فیشەدا وەستایە لەکوێیە؟.)

وتی: (داوای لێبووردن دەکەم بەئەرکێك بۆ دەرەوەی وڵات ڕۆشتووە.)

ئنجا پرسیارم کرد: (ئایا کەسی دیت لەبەردەستا هەیە؟)

وتی: (بەڵێ، لەماڵەوەیە، کە لەدەرەوەو شوێنێکی دوور لەشارە.)

بەخێرایی بەدوویماندا ناردو، بەهۆی تەلەفۆنە کۆنترۆڵکراوەکەوە بەکۆشکی (ئەلیزێ)م ڕاگەیاند، کە لەگەڵ گەیشتنی جادوگەرانی قفڵو ڕستە کلیلەکەی دەگەینە ئەوێ. بەڵام دەبێت ئەم شتە لەبەرچاوی ڕۆژنامەنووسانو وێنەگرانو هاتووچۆکارانی لەبەردەم کۆشکەکەدا مۆڵ بوون بشاردرێتەوە. ئۆتۆمبیلەکەمان لەدەرگای پشتەوەی کۆشکەکە، واتە شەقامی (گابرێل) نزیك بۆوە. بەپێی ڕێککەوتنێکی پێشوەخت بەچراکانی ئۆتۆمبیلەکە ئاماژەیەکی تایبەتمان نارد. پاسەوانەکان دەرگایەکی گەورەی ئاسنیان کردەوە، کەڕێگای چوونە ژوورەوە بوو لەسەر شەقامی (گابریل)ەوە بۆناو باخێك لە گۆشەیەکی ناو کۆشك. شەقامی ئەلیزێ خۆی شارێیەکی تایبەتیو بچووك بوو. وەك ڕێگای نێوان کۆشکی سپیو دامەزراوەی بەڕێوەبەرایەتی ڕاپەڕاندن لەواشنتن بوو. چونکە بیناکانی بەرامبەر کۆشکی ئەلیزێ جێگای ئۆفیسەکانی سەرۆکایەتی کۆماری بوون، بۆیە ئەو ڕێگایەمان هەڵبژارد. لەناو چیمەنەکەوە بەخێرایی بەرەو خودی کۆشکەکە چووینو گەیشتینە لاڕێیەك کەدەرگاکەی بەشیشی ئەستوور دروستکرابوو، تایبەت بووبە پێشوازیکردنو کردنەوە بەڕووی مەیدانەکەی بەردەمیدا. لەپلیکانەکانی

پشتەوە گەیشتینە ئەپارتمانی خودی سەرکۆمار. دەمودەست جانتاکەیان پیشان داین‌و، خۆمان لەناو گەرماوەکەی سەرکۆماردا بینییەوە.

پسپۆڕەکەمان کەرەستەی تایبەتی کلیلەکانی کردەوە، دەستکێشەکانی لەدەستی هەڵکێشاو بۆ ینباخەکەی شل کردەوە-بۆ ینباخی جۆراو جۆری هەبوو، کە بەپێی شوێن‌و کاری خۆی دەیگۆڕی-لەگەڵ ئەوەش دەمزانی کەنازانێت ئێمە لەچ حاڵێکداین. لەسەر لێواری حەمامەکە دانیشت‌و کاتێك خەریکی ئەمدیوو ئەودیوکردنی جانتاکەبوو، رووم تێکردو پێموت: (چەند دەخایە نێت بۆ کردنەوەی؟)

وتی: (بەڕێز بەڕێوەبەری گشتی، دوویان سێ دەقیقە.)

لەسەر زەوییەکە چوارمشقی لێیدانیشت‌و خەریك بوو دەست بەکارەکەی بکات، کە لەپڕێکدا شتێکم بەبیردا هات‌و بەخۆمم وت: (پێویستە کەسێکی دیش وەك گەواهی لێرە بێت، ئەگەر کەسێکی دی لێرە نەبێت چی دەبێت؟) لەماوەی چەند خولەکێکدا دەرگاکەی کردەوە. نامەیەکی دەستنووسم دۆزییەوە، میراتنامەیەکی سیاسی بوو. کردمەوە (هەڵبەتە ئەمە تەنها خەیاڵێکی رووتی خۆم بوو، چونکە نەئەم کارانە لەهی من بوو، نەلەشێوازی کارکردنیشمدا بوو). بابڵێین میراتنامەکەی بەناوی (ئایکس)ەوە ئیمزا کردبوو، کەمن حەزم بەچارەی نەبوو، لەگیرفانم دەئاخنی. دیارە دوای ئەوە مێژوو دەگۆڕا. هەموو ئەم بیرانە لەماوەی چەند چرکەیەکدا بەمێشکمدا تێپەڕین. هاوارم کرد (پەلەمەکە ! )، جادوگەری کردنەوەی قفڵەکە واقیوڕما.

دەرگای گەرماوەکەم کردەوەو دکتۆر (ئالان پەمپیدۆ)، کوڕی سەرکۆمارو (پیرژۆلێت)ی ڕاوێژکارم بانگ کردو ڕێگام دان بێنە ناو گەرماوەکەوە، کە لەوکاتەدا خەریکبوو دەرگای جانتاکە دەکرایەوە. شوێنەکە تەسك بوو، ئێمەش چوارکەس بووین‌و ترشابووین بەسەر یەکدا. بەڵام لەکۆتاییداو دوای دوو دەقیقە جادووگەری ناسراو کارەکەی

بەئەنجام گەیاند. دەرگای جانتا کرایەوە، بەهەرحاڵ هیچ میراتی نامەیەکی سیاسی تێدانەبوو.
سەردەمی (پەمپیدۆ) کۆتایی پێهات؛ خولی (ژیسکاردستن) دەستی پێکرد.
یەکەمین چاوپێکەوتنم لەگەڵ (ژیسکاردستن) کاتێك بوو کە لە(٢٠ تەمموز ١٩٧٣) بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ هاتبووە کامپی (تۆرل). لەودەمەدا بەباشی ئاشنای پرسە نێودەوڵەتیەکان نەبوو، هەڵبەتە جگە لەکاروباری دارایی دەوڵەتی، چونکە وەك وەزیری کاروباری دارایی لەڕاژەدا بوو. لەبەرئەوەی دەرچووی ڕشتەی بەڕێوەبەرایەتی دارایی دەوڵەتی بوو، هەموو پێشینەی پیشەکەی وەك بیرۆکراتێك لەلقی ئابووریو دارایی دەوڵەتی فەرەنسادا بوو. لەبەرئەوەی زرنگانە پێشبینی پرسەکانی دەکرد، لەسەردەمی ئەودا بوو کە دەسەڵاتی سیاسی واقیعبینانەی فەرەنسا بونیاد نرا. (ژیسکاردستن) لەهەمان ئەو ڕۆژە سەرەتاییانەی کارەکەیەوە ئاشنای دەسەڵات بوو.
پرسە نێونەتەوەیی، سوپاییو بەتایبەتی جاسوسیەکانی تەنها وەك دوا ئامرازی سیاسی بەکاردەهێنا. بۆنمونە لەڕووداوەکانی پەیوەستن بەململانێی سیاسییەوە، یان وەك ئامرازێك بۆ پەیداکردنی بنەمایەك بۆیەکگرتن لەگەڵ کەسانی دی کەئەگەری ئەوەیان لێدەکرا سەروکاریان لەگەڵ ئەو بابەتانەدا هەبێتو بتوانن کۆمەکی پێبکەن. خاڵێکی سەرسوڕهێنەری دی هەبوو ئەویش ئەمەبوو، کەبەباشی لەگەڵ وەزیری کاروباری دەرەوەیدا (میشێل ژوبیر)، کە لەڕاستیدا وەك نەیارێکی سیاسی خۆی سەیری دەکرد، نەدەگونجا. ئەوکاتەی (پەمپیدۆ) کەمتر لەساڵێکی تەمەنی مابوو، من پێشتر دەمزانی کە نەخۆشە، لەدیدی منەوە لە(تەمموز١٩٧٣) ئەگەری دوو جێنشینی لەئارادا بوو. یەکێکیان (ڤالری ژسکاردستن)و ئەوی دیان (فرانسوامیتران) بوون. بەتەواوی دەمزانی چ بەڵایەکی گەورە بەسەر فەرەنسادا دێت، گەر سەرکۆمارێکی

کە لەئایندەدا جڵەوی دەسەڵات بەدەستەوە دەگرێت بەتەواوی ئاشنایەتی لەگەڵ ئامرازێکی ئاڵۆزی وەك ئەو دەزگایەی من ڕابەرایەتیم دەکرد، نەبێت. ئامرازێکی کەپەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بەسامناکترین ڕووداوەکانی ڕۆژانەوە، کەکۆماری فەرەنسا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە.

چەندین جاربینینی ڕۆڵی پزیشکێك، کە بەبیستەرێکی پزیشکیەوە بەوردی گوێ بۆ لێدانە لاوازەکانی دڵی نەخۆشەکەی ڕائەدێریو، بەدووی دۆزینەوەی یەکەم هێمای نەخۆشیەکەدا دەگەڕێت– واتە شڵەژانێکی کەئەگەری ئەوە هەیە بەبێ هیچ دیاردەیەکی پێشەکی سەرهەڵبدات– بەتوندی کاری تێدەکردم؛ لەوێشەوە کە تاکە سەرچاوەم بۆ بەدەستهێنانی بیروڕای دووەمم تەنها سەرۆکی وڵات بوو، دەبوو تا ئەو شوێنەی کەدەسەڵات بواری پێدەدام ئاگاداری بکەمەوە. باشترین قوتابی دەبێت تاڕادەیەکی بەرچاو لەخۆبایی نەبێتو، لەکاری بینیندا تا ئەندازەیەکی گونجاو ئارامیی هەبێت.

کچە مامەکەم (ترزدوستن پال)، کەیەکێکە لەڕۆماننوسو پێشەنگە ئەدەبیەکان، ئاشنایەتی باشی لەگەڵ پێشبینی سیاسیدا هەیە. ڕۆژێکیان پێشنیازی کرد (ژیسکاردستن) بۆنیوەڕۆ خوانێك بانگهێشت بکەم. لەوکاتەشدا (ژیسکاردستن) وەزیری خەزنەداری فەرەنسا بوو، بەڵام دیاربوو لەڕێگەی سەرکەوتن بۆ سەرکۆماری لەچالاکیدایە. (ژیسکاردستن) چوو بوو(ترز)ی لەئۆفیسەکەیەوە لە (فلاماریون) لەبنکەی (دولودیۆن)، کە(ترز)ی بەڕێوەبەرو سەرپەرشتیاری گشتیو نووسەرەکانی ئەوێ بوو، لەگەڵ خۆی هێنابوو. کاتێك ئۆتۆمبیلەکان گەیشتنەناو بارەگای فەرماندەیی پێچکەی ئۆتۆمبیلەکانیان بەناو چیمەنێکی سەوزی فراواندا سوڕا، یەکێك لەیاریدەدەرەکانم گەیشتە ئەوێو، ئەحواڵپرسی لە (ژیسکاردستن)و کچە مامەکەم کردو، لەپلیکانەکانەوە بەرەو نهۆمی سەرەوە تا بەردەم دەرگای بەڕێوەبەری گشتی پێشوازی لێکردن، بەتەنیشت (کۆپلە سرودێکی کریسمس)دا، کە

بەدیوارەکەوە هەڵواسرابوو، تێپەڕین. ئەو تابلۆیە وەك خاڵکی گەشاوە سێبەرێکی گەورەی خستبووە سەرزەوییەکە. (ژیسکاردستن) لەدواییدا باسی لەوەکرد کە ئەو دیمەنە چەند کاریگەری هەبووە. کاتێك هاتنە ئۆفیسەکەم، هەستامە سەرپێ، تێبینیم کرد کەچاوەکانی بچوك بوونەوەو سەرنجی گرتە سەرنەخشەیەکی گەورەکە بەدیوارەکەدا چەسپ کرابوو. ئەو نەخشە جیهانییە بەخاڵی ڕەنگاو ڕەنگو نیشانەی ئاڕاستەکردنی سەرنجڕاکێش، کە هەندێکیان بەرەو ئیسرائیل کێشرابوون، داپۆشرابوو. یەکەمین وتە لەدەمی (ژیسکاردستن) دەرپەڕی ئەمەبوو: (بۆچی ئەو هەموو ئاراستە بڕانە ڕوویان لەئیسرائیل کردووە؟) ڕوونمکردەوە: (زانیارییەکانمان ئاماژە بەوەدەدەن کە ئیسرائیل لەلایەن سوپای عەرەبە یەکگرتووەکانەوە بەرهێرش دەکەوێت.) (ژیسکاردستن)سەری لەهەمووشت سوڕمابوو، چونکە کاتێك ئەو وەزیری دارایی بوو، (پەمپیدۆ) ئەوی لەهەموو ئەنجامێکی کاری دەرەکی، سیاسی، سوپایی یان زانیاری دابڕیبوو.

بەنۆشینێکی ئیشتها کەرەوە دەستمان پێکردو، لەسەردوو کورسی بەردەم مێزێکی چەرمی گەورەی ڕەنگ قاوەیی دانیشتین. پشتمان لەپەیکەرێکی گەورەی (ئیدوارد دانتە)بوو، کەوێنەی نەجیب زادەیەك بوو بەبەرگی ئاڵتونی جەنگیو کڵاوێکی ئاسنینەوە، کە پەڕی سپی پێوە بوو.

کاڵا پۆشەکە هێمایەکی فەرمانداری بەدەستەوە بوو، کە بەسەر ئەسپێکی قاوەیی زۆر بریقەدارەوە بوو. (ژیسکاردستن) بەوردی سەرنجی وێنەکەی دا. پاشان بۆ نیوەڕۆ خوانەکە دانیشتین، کەسەرۆکی بەشی دەریاییەکەمان ئامادەی کردبوو. چەند هێلکەو بڕێك پەتاتەو قارچكو شیری تێکەڵ کردبوو. پاش ئەو خواردنە بڕێك گۆشتی مەڕو میوەی شیرین دانرا. (ژیسکاردستن) بەدرێژایی ئەوماوەیە چەندجار گەڕایەوە بۆلای نەخشەکەو بەسەراسیمە بوونەوە، بۆنمونە دەربارەی ئاڕاستە

برەکانی بەرەو ئیسرائیل‌و میسر کێشرا بوون، پرسیاری دەکرد. ئەگەرە بەهێزەکانی ڕوودانی شەڕی نێوان ئەودوو وڵاتەم بۆ ڕوونکردەوە.

گەرچی بەسەرنجدان لەپێشبینی کردنی هێرشی ڕوسیا بۆسەر ئەفغانستان، کە لەڕاستیدا لەبەشی سەرەکی دواساڵەکانی سەرکۆماری ئەودابوو، ئەم قسە فرێدانە کەمێك گاڵتە جارِیانە دەهاتە بەرچاو، ئەو گرنگی زۆری دەدا بەڕووداوی ئەفغانستان‌و لەکۆبوونەوەی سەبارەت بەموشەکەکانی بەشی خوارووی ڕوسیا کەبەرەو ئەفغانستان‌و بلوجستانی ئێران ئاراستە کرابوون، سەرسوڕمانی خۆی پیشان دابوو.

گفتوگۆکانمان لەهەمان ئەو یەکەم میواندارییەدا لەدەوری خولگەی قەیراناویترین خاڵەکانی جیهان دەسوڕا. دیدەکانی خۆمم بۆ ڕوونکردەوە. پاش نانخواردنی نیوەڕۆ، کاتێك (ژیسکاردستن) ئامادەی ڕۆشتن بوو، پێشنیازم کرد کەچەند توێژینەوەیەکی ئامادەکراوی بۆ بنێرم. سەرەڕای ئەم دەست پێشخەرییە باشەش ،هەرگیز ئەوەندەی لە (پەمپیدۆ) نزیك بووم لە (ژیسکاردستن) نزیك نەبوومەوە. هەرچەندە هیچ کاتێك ئەم دوورییە دەرنەبڕا، بەڵام لەوباوەڕەدا بووم پەیوەست بوو بە پێشینە جیاوازەکانمان لەیەکتری‌و دیدە تەواو جیاوازەکانمانەوە. منیش وەك (پەمپیدۆ) پاشماوەی جەنگی دووەمی جیهانی‌و لەنزیکەوە گەواهی کینەکانی ڕوسیای سۆڤیەتی بووم. بەوجۆرە هەرگیز نەمدەتوانی واز لەناباوەڕیم بەرامبەر بەڕوسیای سۆڤیەتی بهێنم. لەوکاتەوەی کە (ژیسکاردستن) بووە سەرکۆمار، هەندێك لەوانەی دەورووبەری وایان پێباش بوو کە هەستیارترین فرمانی سیخوڕی یان کاروبارەکانی پەیوەست بەسیاسەتی دەرەکی بەدۆستەکانی سەرکۆمار بسپێرێت، کە هەستی دوژمنایەتی کەمترو ئاشتیخوازانەی زیاتریان بەرامبەر بە ڕوسەکان‌و زۆربەی دوژمنەکانی دی لە جەنگی چوارەمی جیهانیدا هەیە. ئەم پسپۆڕانە کە لەکاری جاسوسی‌و سیاسەتی دەرەکیدا هەوەسباز بوون، سەبارەت بەوەی چۆن ڕەوشی ڕاپەڕاندنی دەزگا ڕێك بخەن یان

چۆن ستانداردیو تارەکانو گەشەکردنی ڕەوتی جێبەجێکردنی هەر فرمانێك بچەسپێنن، خاوەنی دیدێکی کورت بینانە بوون.

یەکێك لەوڕاوێژکارانەی کە (ژیسکاردستن) زۆرجار، بەتایبەتی لەمەسەلەکانی تایبەت بەڕوسیا، پشتی پێدەبەست (ژان پاپتیست دۆمنیك) بوو. ئێمە فایلێکی گەورەی (دۆمنیك)مان هەبوو؛ چونکە لەگەڵ کارمەندەکانمان لە(فەرمانگەی چاودێری)، کە کاریان دژە سیخوڕییە، کاری دەکرد. (دۆمنیك) تایبەتمەندبوو لەپیشەی بازرگانیکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی لەگەڵ بلۆکی خۆرهەلات. دراوێکی زۆری لەڕێگای فرۆشتنی گەنم، نقیشكو بەرهەمی دی هەمەجۆرەی خۆراکی بەڕوسەکان بەئاڵوگۆڕکردن لەگەڵ بەرهەمی دی ڕوسی، کە دەیتوانی بەوڵاتە هەژارو کۆلۆنیەکانی فەڕەنسای بفرۆشێتەوە، دەسکەوت ببوو. پەیوەندی بەهێزی بەودەولەتانەوە هەبوو، لەسەرانسەری کیشوەرەکەدا سەرمایە گوزاری دەکرد. بڕیاربوو کارمەندەکانمان لە ئەفریقادا شوێن پێیە زۆرەکانی لەشوێنە جیاجیاکاندا هەلگرن؛ پەیوەندییە سیاسیەکانی (دۆمنیك) بەتەوای ئاشکرابوو.

لەزۆرکاتدا ملیۆنێرێکی گەورەو ئەندامێکی ڕابەریی پارتی کۆمۆنیستی فەڕەنسا بوو. بۆماوەی چەندین ساڵ لەبەرامبەر (ئارماند هامیر) وەك سەنگێکی قورس پەیدابببوو؛ کەسێکی لەوجۆرەو بەوپەیوەندیو ویستە ئاشکرایەوە بەرامبەر بەکۆمۆنیزمی سۆڤیەتی خۆی لەناوبازنەی (ژیسگاردستن)و ئەندامانی دەوروبەری سەرۆکایەتی خزاندبوو. گرفتی سەرەکی باوەڕ بەوجۆرە کەسانەی کە پێیەکیان لەمبەرو ئەویدیان لەوبەری کامپی بەرامبەرە ئەمەیە کە هەرگیز ناتوانیت دڵنیابیت کە لەهەموو سەردەمێکدا وتاربێژی کام لایەن؟ بەوجۆرە (دۆمنیك) توانی بەبەدەستهێنانی بڕواو دڵنیایی ژمارەیەك لەڕابەرانی چارەکە سەدەیەکی ڕابردووی فەڕەنسا، سەرکەوتن بەدەست بهێنێت.

یەكێك لەدەرئەنجامەكانی ئەم هاوكارییە، سەردانی كتوپڕو سەرسوڕهێنەری (ژیسكاردستن) بوو بۆ (وارشۆ)، بۆ كۆبوونەوە لەگەڵ سەركۆماری سۆڤیەت (لیونید برژنیف) لە ١٩ی مانگی مایسی ساڵی ١٩٨٠. لەوانەیە ئەمە سەرنج ڕاكێشترین بابەتی جێی باوەڕنەبوون بووبێت بەرامبەر بەسەركۆماری فەرەنسا یان هەرسەركردەیەكی دی خۆرئاوایی لە هەرسات و كاتێكی دوای جەنگ. (ژیسكاردستن) تێڕوانینی نادروستی هەبوو سەبارەت بە شوێنگەی نێودەوڵەتی و توانستی كەسێتی خۆی، كە بەهەموو جۆرە جموجوڵێك كاریگەری لەسەرجیهان دادەنا.

دیداری دوو سەركردە- برژنیف و ژیسكاردستن- لەخۆرهەڵات و خۆرئاوا، لەهەمان كاتی هەستیاردا، دروست دوای پێنج مانگ لەهێرشی سوپای سوری ڕوسی لە٢٤ی كانوونی یەكەمی ساڵی ١٩٧٩ بۆسەر ئەفغانستان، بەئەنجام گەیەنرا. هێرشەكە بەجۆرێك داڕێژرابوو كە بەلایەنی كەمەوە هەندێك لەودەوڵەتەی كەكرملین وەك قەڵەمڕەوی ستراتیژی ئیمپریالیزمی خۆرهەڵاتی لەبەرچاوی گرتبوو، بیخاتە ژێر ركێفی خۆیەوە؛ ئەم هەنگاوەش دەستڕاگەیشتن بوو بەئاوە گەرمەكانی خواروو. بەئاشكرا دیدەنی (برژنیف)و (ژیسكاردستن) لەپۆلەندا بەئەنجام گەیشت؛ شوێنێكی كەتا ئەودەمە تاكە سەرزەمینی یەكپارچەو هاوسنوری ڕوسیابوو، كەتیایدا مەزهەبێكی كاسۆلیكی هەبوو، دەیتوانی هانی خەڵكی بدات و بۆ بەرگری چەكدارانە ئامادەیان بكات. بەرگرییەكی كە لەپەیوەستبوونی لەگەڵ هەندێ لەكۆمارە كاسۆلیك نشینەكانی خودی ڕوسیای سۆڤیەتی وولاتانی بالتیك- كە لەكۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیدا داگیریان كردبوون- دەبووە مەترسییەكی گەورە. تا ئەودەمە بەرگریكردن لەسەردەمی بەراییەوە لەهزری خەڵكیدا گەشەی كردبوو- كە لەكۆتاییدا بەسەركردایەتی (لخ ڤالسا) بوونە بەشێكی نەپساوەی یەككگرتوو.

ئەگەر تاكە شوێنێك هەبووبێت كەسەركردەی زلهێزێكی خۆرئاوایی نەیویستایە تەنانەت تاكە ڕوسیەكیش ببینێت، ئەو شوێنە (پۆلەندا) بوو.

ڕوسەکان ڕقیان لەپۆلۆنیەکان بوو، پۆلەندیەکانیش بەرامبەر بەوە چارەی ڕوسەکانیان نەدەویستو لەگەڵ ئەوەشدا لێیان دەترسان. هیچ کام لەم پێشینە خامۆشو بێبزاوتانە لەدانوستانێکی سیاسیدا هیچ کارێکی مەیسەر نەدەکرد. لەوێ بارودۆخەکە بەناچاری ڕاگیرابوو، بەتەواوی داگیرکارانە بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، سەردانی سەرکۆماری فەرەنسا بۆ وارشۆ لەلایەن سەرۆکی ئیمپراتۆری سۆڤیەتیەوە تەنها بەئامانجی دەرخستنی کۆبوونەوەکە بوو، کە پەیامێك بۆ هەردوو بلۆك بنێرێت کە بێزیانترین بیروباوەڕی ناکۆك پەسند بکەن. بەڵام ئەم بیرە لەلای فەرەنسا یان سەرکۆمارەکەیەوە چ لەڕووی ئەخلاقیو چ لەڕووی مادیەوە پشتگیری لێنەکرا. لەوجۆرە شوێنەدا سەرکردەیەکی وڵاتی فەرەنسا چۆن دەیتوانی ڕێگا بەخۆی بدات بیرلەوە بکاتەوە  کە لەوانەیە چانسی هەبێت  سەبارەت بەئەفغانستان یان پۆلەندا کاریگەری لەسەر (برژنیف) دابنێت؟ پۆلەندا دروست دوای چەند  مانگ دوای ئەوە بەهۆی هێرشی سەختی یەکێتی شەتەك دراوەوە چووە حاڵەتی خامۆشییەوە.

ئیمپراتۆریەتی ڕوسیای سۆڤیەتی بەهۆی دواین پڕۆژە پڕ لەئاژاوەکانی مەرگی (برژنیف)ەوە، هەناسەی لەسینەیدا پەنگی خواردبۆوە. سەردەم، سەردەمی ئەوەبوو کەچاو لەئایندەو لەڕاستیدا لەدواقۆناغی جەنگی سێیەمی جیهانی ببڕن.

لەجیاتی ئەوە، (ژیسکاردستن)و ڕاوێژکارەکانی گەمەی سیناریۆی ڕێککەوتنو سازشیان ئەنجامدا، کە تەنها بواری بۆ دوژمنەکەمان، سۆڤیەت دەڕەخساند، دروست لەکاتێکی ئێمە ڕووبەڕووی ئەم ئیمپراتۆریەتە شەیتانیو پارێزەکارەکانی دەبووینەوە، تا هەناسە بدەن. ئامادەکاری بۆ سەرکەوتن بەم ڕەوشە ناهەموارو شوومەدا مایەی خۆشحاڵی هاوەڵانی (دۆمنیك) بوو لە خۆرهەڵات. ئەم بازرگانە فەرەنسیە نزیکترین ڕاوێژکاران (میشێل پۆنیا تۆڤسکی) خودی سەرکۆمار (ژیسکاردستن)ی هەڵخەڵەتاند.

بۆ بەئەنجام گەیاندنی داتوستاتێکی تهێنی هەریووکیان بەفڕۆکەیەکی خودی (دۆمنیك) بەرەو پایتەختی پۆڵەندا ڕۆشتن. زۆرمایەی سەرسوڕمان بوو، کە هەرچەندە سەرۆکی دەزگای بژە سیخوڕی فەرەنسا بووم، لەدوا زانیارییەکی نێو کۆبوونەوەکەی هەردوو سەرکۆماری فەرەنساو سکرتێری گشتی کۆمیتەی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت ئاگادار نەکرامەوە. هەڵبەتە من هەرگیز هەوڵم بۆ بەستنی کۆبوونەوەی لەوجۆرەنەدەدا، بەڵام دەبوو دیدە بەبەهاکانی ئەو دانیشتنەم لەلابوایە. لەجیاتی ئەوە زانیاری ئاشکرا بەوردەکارییەوە لەلایەن سەرچاوە تاڕادەیەك ڕەگەزپەرستەکانی (دۆمنیك)و دۆستەکانیەوە، کە لەهەموویاندا بەرنامەی سیاسی تایبەت هەبوو، بۆ (ژیسکاردستن) هات. ئەگەر چی لەوکاتەدا (ژیسکاردستن) چوو بۆ وارشۆ، بەڵام بڕوای هەڵبژاردنەکان پیشانیان دەدا کە بەکەماڵی ئیسراحەت سەرۆکایەتی وەردەگرێت؛ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بەئاشکرا هەستی دەکرد بۆ سەرکەوتن پێویستی بەکودەتایەکی شانۆگەریانە هەیە. کە ئەو کودەتا گریمانەییە بۆ هەڵەیەکی گەورە گۆڕا. بەلایەنی کەمەوە بۆ فەرەنسا گران کەوتەوە، کە زۆربەی پۆلۆنیو کاسۆلیکەکانی کودەتای ناوبراویان بەئایدیالێکی پارێزەرانەی خۆرئاوایی دادەنا بۆ یەکێتیو هاوبەندی خۆیانو، دەرئەنجام هەلی ڕۆڵگێڕان کۆمەکی کاریگەری بۆ دامەزراندنی سیستمێکی دیموکراسی لەپۆلۆنیا پێبەخشین، کە ئەوەش تەنها بۆ ماوەی سێ مانگ بوو.

لەنێو هەڵبژاردنە تاڵەکانی دی بۆ سەرۆکایەتی لەساڵی ١٩٨١، سەرکردە فەرەنسیەکان گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە ڕێککەوتنی وارشۆ وەك مامەڵەیەك بووە لەگەڵ ڕابەرانی سۆڤیەتیو، لەونێوانەدا (فرانسوا میتیران) بەهۆی ئەوجۆرە ڕێککەوتنەوە بواری ململانێکردنێکی گەورەی چنگ کەوت. لەهەر هەڵێکدا ئەو لەوارشۆوە بەهۆی تەلەگرافێکی بچوکەوە (ژیسکاردستن)ی ئاگادار دەکردەوەو ئاماژەی بەبابەتەکە دەدا؛ بەم پێیەو (ژیسکاردستن) لەماوەی کەمتر لەساڵێکی پاش سەردانە

سەرکەوتووەکەی بۆ وارشۆ لەکارکردن کەنارە گیرکراو، ئەم ڕووداوە بووە هەوێنی حوکمڕانیکردنی چواردە ساڵەی (فرانسوا میتران)و سۆشیالیستەکانی دوای کەوتبوون. یەکەمین کابینەی (میتران) بەگشتی بەڕێککەوتن پێکهێنرا، کە هەندێك لەهاوڕێ نزیکەکانی (دۆمنیك)ی سەر بەپارتی کۆمۆنیستی فەڕەنسای لەخۆگرتبوو. تەنانەت لەنێو نزیکترین ڕاوێژکارانی (ژیسکاردستن)یشدا، سەبارەت بەوەی نێوان ئەوو (برژنیف) کە بەماوەیەك دوای ئەوە کەنارەگیری کرد، پرسیاری بێوەلام لە گشت لایەك بڵاو ببۆوە. پاشان تامی ناخۆشی ئەو ڕووداوە تەنها لەناودەمی ڕۆشنبیرانی سەربەخۆیی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا، کەدیدێکی توندیان بەرامبەر فەڕەنساو بەتایبەتی (ژیسکاردستن) هەبوو، مایەوە.

ئەم یادەوەرییانە زووکاڵ نابنەوەو لەبیردا ناشۆرێنەوە.

ئەگەرچی گەشتەکەی ناوبراو وەك دوو هەنگاوی کۆتایی لەلایەن دوو ڕژێمی ڕوو لەناوچوونەوە دەرکەوت، بەڵام وەك نمونەیەکی زۆرباش لەڕەوشی بەڕێوەبردنی (ژیسکاردستن) لەبەدواداچوونی جەنگی سێیەمی جیهانی خستەڕوو. ئەم دیدە، زیاتر وەك سەیرکردنی ئۆردوی دوژمنە بەچاویلکەیەکی ڕەنگاوڕەنگ، تا دیدێکی کامڵو دروست بینین، کە بتوانێت باشترین جۆری سیخوڕی لەخۆبگرێت. لەم جۆرەکارە سیاسی یان جاسوسیانەی ئێمەدا، کە لەنێوان جەنگەکانی سێیەمو چوارەمدا سەرکەوتن بەدەست دەهێنین، پەسندکردنی بێ چەندوچوونی هێزی دوژمنان جێگایان نابێتەوە.

بەشی هەشتەم:

## تیرۆریست و ڕۆمانتیکەکانی دی

لەڕابردوودا چەند ناوچەیەکی کەمی ئاسایشی نەتەوەیی لەفەڕەنسا هەبوون، کە لەنزیکەوە لەلایەن خودی کۆشکی (ئەلیزێ)وە بەهۆی هێزەکانی هەوالگریو سوپاییەوە بەپێی پێویست کۆنترۆڵ دەکران. یەکێك لەوناچانە فەرمانگەی پرسەکانی ئەفریقایە. ئەمەش بەهۆی ئامادەگی دورودرێژی فەڕەنساوە بووە لەوێو، نزیکی بووە لەوکیشوەرەوە. یەکێکی دی لەوناوچانە ناوچەی پرۆسەی ئامادەکاری ئەتۆمی فەڕەنسایە؛ سێیەم تیرۆریزمە، چونکە پەیوەستە بەمانەوەی فەڕەنساو ئاسایشی هەریەك لەپەیڕەوانی. بەپێی پێویست، یان لەوانەیە بەهۆی خواستی زۆری هەر سەرکۆمارێك بوبێت لەنزیکەوە درێژەم بەخزمەتکردنی خۆم دەداو، هاوبەشیم دەکرد لەکۆنترۆڵ کردنی هەریەك لەوسێ خاڵە ستراتیژییەو، ئەم مەسەلانەم هەرلەیەکەم ڕۆژی دەست بەکاربوونمەوە لەسەرەتاکانی کارەکانم داناوە. ڕۆڵی فەڕەنسا لەئەفریقاو بەرگریکردن لەبڵاوبوونەوەی ئەتۆمی فەڕەنسا بەزوویی فێربووم، کەهەڵبەتە پێشتر هەنگاویان بۆ نرابوون. تەنها دڵنیابوون لەوەی کەمیکانیزمەکان لەوشوێنانەی کەئێمە دەمانەوێت کاری خۆیان دەکەن پێویستبوو. لەسەر ئەوانە زانیاری پێویست کۆدەکەنەوەو، بەپێی بنەمای ئەوزانیاریانەو خواستی سەرکۆماریش کاردەکەن. سێیەمین پنتی سەرەتاکانی دەوڵەتی گەیشتن بەتیرۆریزم بوو، کەبۆمن دژوارترین پرسی ستراتیژی بوو کەتائەودەمە ڕووبەڕووم ببۆوەو، پێویستی بەخستنەگەڕی گرنگترین پرۆفیشناڵی ئێمەهەبوو. ئێمە ڕێگایەکی دووورودرێژو پرپێچوپەنامان بۆفێربوونی ئەم کارەو، خولی کورتخایەن و کوشندە بۆگەیشتن بەکۆتایی کارەکەمان لەبەردەمدابوو. لەبابەت ئامادەبوونم بۆوەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی دەزگای جاسوسی فەڕەنسا، لەئۆپراسیۆنەکانی دژبەتیرۆریستان لەئاستی بەرزی خۆماندا، وانەی جۆراوجۆر فێربووم؛ کەئەم وانانە هەم لە(فەرمانگەی چاودێری گشتی)

لەڕوانگەی ناوخۆییەوەو، هەم لەڕەهەندە دەرەکیەکەیدا، واتە (دەزگای جاسوسی فەرەنسا)وە پەیدادەبوون. تیرۆریستەکان دواین شەقلێکن لەڕێگای بیروباوەڕە ئاڵۆزەکانیانەوە، کە بەشێوازێکی توندوتیژانە خزمەت بەئامانجەکانیان دەکات، کاردەکەن. ئەوانە لەژینگەیەکی ناوچونیەك وجیاوازی خۆیانەوە پێکەوە گەشت دەکەن، پێکەوەدەژین، دەخۆن‌و یەکیان خۆشدەوێت. ئەوانە لەگروپی بچوکی (پێنج تا پەنجاکەس)یدا ڕێکدەخرێن. خاوەنی قارەمان‌و ئەفسانەی خۆیانن. نابێت وابزانین خوێنڕێژی سادەن، نەزۆك وخاوەنی وەهمێکی بێبنەمان. بەمپێیە زۆریان لەڕاستیدا زیرەك وزرنگن. بەهۆی ئەوەی ساڵانێکی دوورودرێژ لێکۆڵینەوەم لەسەریان ئەنجامداوە دەتوانم ڕوونی بکەمەوە کە چۆن کاردەکەن. ئێمە کردبوومانە خووکەئەم ڕستەیە بەکاربهێنین: (گوێدرێژ، ئەسپی هەژارە. بزن، گای نەدارەو تیرۆریستیش جەنگاوەری هەژارە.)

هێزی مرۆڤ‌و کەمێك دراو پێویستە بۆ ئەوەی کارێکی تیرۆریستانە ئەنجام بدرێت. بەمپێیە ئەنجامی کارێکی لەوجۆرە دەتوانێت بەئەندازەی گەورەترین هێرشی سەربازی، کەلەلایەن یەکەیەکی شەڕکەری لەشکرێکی زرێپۆشەوە بکرێت، وێرانکارو مەترسی داربێت. تاکەڕێگەی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ تیرۆریستان، بەشێوەیەکی تاکتیکی نەك ستراتیژی، دزەکردنە بۆ ناویان. تۆ زۆر بەئاسانی دەبێت ببیتە یەکێك لەوان؛ لەگەڵیان گەشت بکەیت، بخەویت، بۆماوەیەك تەنانەت بۆچەندین ساڵ کاریان لەگەڵدا بکەیت. هەڵبەتە دەزگا جاسوسیە گەورەکانی خۆرئاوالەبارەی دزەکردنە ناوئاستە باڵاکانی کۆمۆنیستی سۆڤیەتەوە هەلی زۆرتریان لەبەردەستدابوو. ئێمە باش ڕشتەی فکریی ئەوروپای خۆرهەڵاتی دەناسین. لەگەڵ ئەوەشدا، بەهەمان شێوە کە بۆ هەریەك لەسەرکۆماری فەرەنساو ژمارەیەکی دی لەسەرانی جیهانم ڕوونکردبۆوە، ئەوانە ئەورویین، بەڵام تیرۆریستەکان، جگە لەچەند لایەنێك، هەموویان ئەورویی نین. ئەگەر ئەوانە ئەورویی بن – بۆ نمونە سوپای سوور، ئەندامانی گروپی بادرماینهۆف، تەنانەت سوپای کۆماریخوازی ئێرلەندا–

زۆربەی تاکتیکەکانیان خوازراوەو لەڕاستیدا لەهەمان ئەو کامپانەدا مەشقیان کردووەو، پەند لەبرا تیرۆریستەکانیان لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست وەردەگرن، تاکتیکە داهێنراوەکانیان بەکار دەهێنن. یان ئەو تاکتیکانەی کە لەبلۆکی کۆمۆنیستییەوە فێری بوون، لەوانەش چاککردن‌و کامڵ کردن بەکار دەهێنن. ترسناکترین تیرۆریستانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەستنێژی ڕوسیا، ئەڵمانیای خۆرهەڵات یان تایبەتمەندانی دی بلۆکی کۆمۆنیستین لەبواری چەك‌و تاکتیکەکانی دیدا، کە بەدبەختانە ئێستا پێشی مامۆستاکانیان داوەتەوە. هەتا ئێستاش زۆربەی سیاسەتمەدارانی خۆرئاوایان باکورییەکان لەهزری تیرۆریستان تێناگەن، یان ئەو شوێنانەی کە تیرۆریست تیایدا گەشە دەکات، یان چۆنیەتی جموجوڵەکانیان نازانن، یان تێناگەن.

بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ تیرۆریستان پێش هەموو شتێك پێویستە کامپەکانیان کە تیایدا پەروەردە دەبن‌و نەخشەی کاری تێدا دەکێشن جیاکەینەوە. ئەوانە پێویستیان بەچەك نییە. دەتوانیت لەهەر شوێنێك بتەوێت چەك بکڕیت. پێویستیان بەژمارەیەکی کەمی خەڵك هەیە، بەڵام دەبێت ئەو هەندە خاوەنی ئاستێکی بەرزی پەروەر دەبێت. هەر کەسێکی ئاسایی دەتوانێت کۆکتێلێکی مۆلۆتۆڤ دروست بکات، بەڵام ناتوانێت مادەیەکی تەقینەوەی ئاڵۆزی پلاستیکی زۆر بەهێزو دوو قۆناغی ساز بکات. ئەگەر ئێمە فشاربخەینە سەر ئەو دەوڵەتانەی دەیانحەوێننەوە، بۆکوێ دەچن؟ سەربازە پیادەکانیان دەتوانن دووبارە بۆ مەشق کردن بەرەو قوڵایی بیابانەکان بچن؟ بەهەرحاڵ بیابان زۆر زۆر فراوانەو بۆ دەستپێڕا گەشتن بەتایبەتی بۆ فەرماندەکانیان زۆر ئاسانە. ئەگەر لەجێگایەکی ناو بیاباندا بوەستیت، لەماوەی پێنج دەقیقەدا ڕووبەڕووی پێنج کەس‌و سێ مانگی دەستکردی جاسوسی‌و گوێڕا داشتن دەبیتەوە، کەسەرقاڵی وردبوونەوەن لەتۆ. بیابان بۆ سەرانی تیرۆریستان شوێنێکی خراپی خۆحەشاردانە، بۆیە باشترین شوێن شارێکی گەورەیە؛ لەناو خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، هەڵبەتە لەناوخودی ئەوروپاشدا خراپ نییە. ئێمە لێبڕاوانە بەدووی ئەم پرسی

تـیرۆریزمی نێودەوڵەتیـەدا دەدوێـن، کـە هەڵبەتـە تاڕادەیـەك لەڕوانگـەی گشتییەوە لەبەرامبەر گەیشتن بەگرفتی تیرۆریزمی ناوخۆیی- بۆنمونـە جودا خوازەکانی دوورگەی کریس- کەمتر ناسراوە.

خەڵکی ئەودوورگەیە لەناوخاکی فەرەنسادا بەردەوام خـەریکی چالاکین‌و، زۆربـەی ئـەو ئاژاوانـەی دەینێنـەوە، لەوانە هێرشـی چەکدارانـە زیـانی زۆر لەفەرمانگـەکانی دەوڵـەتی فەرەنسـا، دامودەزگـاو تەنانـەت بەرپرسـانی دەوڵـەتی دەگەیـەنێت. لـەماوەی سـەرۆکایەتیم لـە (دەزگـای کۆکردنـەوەی بەڵگەنامەی دەرەکی‌و دژە سیخوڕی) فەرەنسـا، جوداخوازەکـان ڕاگـەیاندنی سیاسـی توندوتیژیـان دژمـان دەردەکـرد، کـە لەئـەنجامی سەرکێشـییە ناوخۆیەکان بووە هۆی ڕووبەڕوو بوونەوەی فـراوان‌و لێدان‌و بریندارکردن دژ بەدەوڵـەتی فەرەنسا. زۆربـەی ئـەو بەیاننامانـە لەئیسـتگەیەکی ڕادیۆیـی لەبنکەیەك لە (ئیلیا)وە- ئـەو دورگەیـەی کـە لەساڵی (١٨١٤) ناپلیۆنی بۆ دوورخرایەوەو، ئێستا بەشێکە لەقەڵەمڕەوی ئیتالیا- پەخشدەکران؛ هەڵبەتە خـەڵکی (کریـس) لــەوباوەڕەدا بـوون کـە ئـەوێ لـەدەرەوەی دەسـەڵاتی فەرەنسایەو، بۆ ئەوان بەژینگەیەکی گونجاو دادەنرا. بەڵام بەهەمان شـێوەی کـە دەسـەڵاتدارانی ئیتالیا وەك جۆرێکـی جـەنگ سـەیری دەکـەن، ئێمـەش تواناکانی خۆمان تا ئەو ڕادەیە فراوان کرد. (ئیلیا) دوورگەیە کە زنجیرەیـەك چیا لەڕۆخی دایـە. شـەوێك گروپێـك کۆمـاندۆ، کـە شـارەزای هـەڵزنان بـوون بەچیاکاندا بە بەرگی تایبەتەوە لـەوێ دامانبـەزاندن. ڕۆژی دواتـر بـە بـەرگی تیرۆریستەکانەوە، دەرچونێکی سـەرەتاییان بۆ هەڵسـەنگاندنی هەلومـەرجی دوژمـن ئـەنجامدا. هـەمان شـەو مـادەی تەقینـەوەیان لەهـەر چـواردەوری تیرۆریسـتەکان چـاند، کە لـەپڕداو بەدەنگێکی بـەهێزەوە تەقینـەوە. بـایی حەوت ملیـۆن دۆلار لـەماوەی بیسـت سـانیەدا لـەناوچوو. ڕۆژی دوای ئـەوە، سەرانی تیرۆریستەکان کۆبوونەوەیـەکی نائاسـاییان لـەبارەگای فـەرماندەیی (لیڤەرنۆ) لەئیتالیا بەست. داوام لەیەکێك لەئەفسەر (کریس)یەکانی خۆمـان، کـە کۆمۆنیسـت نـەبوو کـرد بەتەلـەفۆن سـەنتەری فەرماندەییەکـەیانم بـۆ

وەرگرێت- کە خۆمان ژمارەی تەلەفۆنەکەیانمان هەبوو- بەشێوەزمانی (کریس)ی کە زۆرباش‌و ڕەوان بوو پێی ڕاگەیاندن: (ئەوەی دوێنێ شەو بەسەرتان هات بینیتان. جاری داهاتوو خۆتان دەبنە ئامانج نەك کەلوپەلەکانتان‌و، باشترین بەڵگەش بۆئەوەی کە دەتوانین کاری لەوجۆرە بکەین ئەوەتا لەهێڵێکی تەلەفۆنییەوە قسەتان لەگەڵدا دەکەین کە پەیوەستە بەوبارەگایەی کۆبوونەوەی نهێنی تێدا ئەنجام دەدەن) لەماوەی شەش مانگی دوای ئەو گفتوگۆیەوە، هیچ شتێك لەلایەن بەرگریخوازانی دوورگەی (کریس)ەوە ڕووینەدا، نەهیچ وشەیەك‌و نەهیچ بزاوتێك. ئێمە هۆکارێکی زۆر گرنگ‌و بنکەیەکی جێبەجێکردنی ئۆپەراسیۆنی گەورەیانمان لەناوبردبوو. ماوەیەکی کەم پاش ئەوە، نەخشەیەکی دیم بۆ گەیشتن بەدۆخی تیرۆریستەکانی دوورگەی (کریس) پیادەکرد. پێنج ڕابەری سەرەکیان لەلامان ناسراوبوو، پێشنیازم بۆ سەرکۆمار (ژیسکاردستن) کرد کەناوی یەکەمین کەس لەوتیرۆریستانە بخەینە لیستەوەو ئاشکرای بکەین‌و پاشان لەمەیدانەکەدا پاکتاوی بکەین؛ دوای ماوەیەکی دی ناوی دووەم ئاشکرا بکەین‌و هەمان کارئەنجام بدەینەوە. لەوکاتەی کە لەئۆفیسی سەرکۆمار لەکۆشکی (ئەلیزێ) دانیشتبووم پێیموت: (ئیتر لەوەودوا پێویستمان بەوە نابێت ناوی سێیەم ئاشکرا بکەین، ئەم کەسانە حەز بەژیان دەکەن‌و چێژی لێوەردەگرن. ئەوانە وەك خەیاڵ پلاوەکانی خۆرهەلاتی ناوەڕاست یان ژاپۆنیەکان نین، کە ئامادەن گیانیان لەپێناوی شتێکدا ببەخشن کە بڕوایان پێیەتی. ئەوانە زەنگینن‌و لەخانووی لۆکسدا لەگەڵ چەندین ژندا ژیان بەسەردەبەن. ئەوانە لەپانتاییە بچوکەکەیاندا قارەمانی گەورەن. ئەوانە شەیدای ژیانن‌و نایانەوێت بمرن.)

بەڵام سەرکۆمار مۆڵەتی ئەنجامدانی ئەمجۆرە کارە نایاساییەی نەدا. ئەم جۆرە ستراتیژە هیچ کاریگەری لەسەر (ئەبونیزال) یان (کارلۆس) یان هەر تاکێکی دی لەتیرۆریستەکانی خۆرهەلاتی ناوەڕاست یا ژاپۆنی نەدەبوو.

ئەم خەڵكانە بیر لەمردن ناكەنەوە. بۆ ئەمانە هۆكاری دی بۆ هێرشكردنە سەر هەیە. پێویستە ئێمە ڕێخستنەكانیان بسمین‌و، تێبگەین كە ئەوانە ڕۆژانەو هەفتە بەهەفتە چ جۆرە چالاكیەك دادەڕێژن. دەبێت بەئامرازی دیبلۆماتی‌و سیاسی‌و لەكۆتایشدا گەر پێویست بوو بەفشاری سەربازی بنكە بنكە پارێزراوەكانیان تێكوپێكبدەین. ئەو نەتەوانەی كە وەك دوژمنێكی سروشتی ئێمە دیارن بەرەو بێلایەنی كێشیان بكەین‌و لەماوەیەكی كورتدا بەڕاستی بچینە ناوجەنگی چوارەمی جیهانییەوە، بەهەمان شێوەی پێشدەستی كردنمان لەجەنگی سێیەمی جیهانی ئەم سەدەیەدا. ئێمەی فەرەنسی سەبارەت بەخۆخزاندنە ناوخۆی گروپە ئیسلامیەكانەوە لەئەمریكا كاری باشترمان ئەنجامداوەو، لەوڕووەوە لەوان كارامەتر بووین. لەماوەی سەدەو نیوێكی ئێستادا دەسەڵاتی ئیمپریالیزمانە بۆ ئێمە تەنها بەرپرسیارێتیەكی بێبەهای ژمارەیەك لە(لۆرانسە گچكەكانی) عەرەبی بۆ بەجێهێشتووین.

كارمەندانێك دەناسم كە بەعەرەبی دەئاخافتن‌و لەڕاستیشدا لەعەرەبەكانی دی جیانەدەكرانەوە. چەندین لەمانە پێشتر فەرماندەی دەستەی وشتر سواران بوون، لەناویەكە سەربازییەكانی وشتر سواراندا، كە زۆر بەعەرەب دەچوون. یەكێك لەوكارمەندانە دكتۆرێك بوو، كە دەیەیەك پێشتردزەی كردبووە ناوجەرگەی ڕێكخراوێكی تیرۆریستی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە. ڕۆژێكیان لەناوخۆیاندا بەم مشكەكوێرەیەیان زانیبوو، دكتۆریش زۆر بەسانایی‌و نبوو. دزەكردنە ناوڕێكخراوێك لەوانەیە دە، یان پازدە ساڵ یا زیاتر بخایەنێت. تۆ سەرچاوەكە وەك پیاوێكی چاك دەخەیتە سەرڕێ‌و ئەویش وەك كرم لەناو دڵیاندا هاتوچۆ دەكات‌و، لەناو هەناویاندا بەهۆی هەمان میكانیزمەوە گەشە دەكات. لەوانەیە ڕۆژێك دابێت ببێتە ڕابەری ڕێكخراوەكە. كارمەندەكانمان لە ئەفریقادا– كە لەشوێنگە جیاوازەكاندا بۆ بەرژەوەندی فەرەنسا لەڕاژەدان– ئێمە لەپرۆسەی تیرۆریستەكان ئاگاداردەكەنەوەو، ڕێگری لەو ڕووداوە تیرۆریستیانەدەكەن كە دەبنە هۆی

کوشتن‌و ماڵوێرانی. یەکێك لەو ئەفسەرانە لەساڵی (١٩٨٩) لە(ئابیجان) کوژرا، کە خزمەتی بە بەرژەوەندییەکانمان‌و بەرژەوەندی (فیلکس هۆفۆیت- بۆینی) سەرکۆماری (ساحل عاج) دەکرد، بەهۆی نزیکی لەبەڕێوەبردنی چالاکیەکانی هەندێ کەسانی گومان لێکراوەوە ئەو کارەی ئەنجامدەدا. لەماوەی بیست ساڵدا، بە(هۆمۆنیت)م دەووت: (ڕێگا بەخەڵکانی خۆرهەلاتی ناوەڕاست نەدەیت بێنە ناو وڵاتەکەتەوە، چونکە ئەوانە گرفتەکانیشیان لەگەڵ خۆیان دەهێنن.)

بەلام دوای بیست ساڵ لەو قسانەم، لەکۆتاییدا ئامۆژگارییەکانی منی پشتگوێ خست‌و، ئارەزووەکانی کوێری کرد. ویستی (ساحل عاج) بکاتە شوێنگەی پەناهێندەی سیاسی. هەندێ کەس دەڵێن خواست‌و مەرامەکان بۆ بەدەستهێنانی خەلاتی نۆبڵ بووە. سەرەڕای ئەوەش، سەرکۆمار (هۆفۆنیت) ئاواتە خوازبوو بەپەسندکردنی ئەم تیرۆریستانە وڵاتەکەی لەهێرشەکانیان بەدوور بێت. هەڵبەتە جگە لە (پۆلیانایش)- قارەمانی کتێبی پۆلیانای نوسینی ئەلینۆرپۆرتر- ئەوکەسانەی کە لەلایەن (هۆفۆنیت)ەوە دەحەوێنرانەوە، لەڕاستیدا دەستیاندایە کوشتوبڕی یەکدی لە(ئابیجان). بە بەکارهێنانی (ساحل عاج) وەك پەناگەیەك دەیانتوانی شتی زۆر ئەنجام بدەن. هەریەکە لەوکەسانە چەندین پاسپۆرت‌و ناوو ناونیشانی نەناسراویان هەبوو، کەوای لێدەکردن نەتوانرێت چاودێری بکرێن. بوونی تیرۆریستەکان لە(ساحل عاج) لەپرێکدا بووە جێ سەرنجی دەوڵەتی فەڕەنسی چونکە فەڕەنسا پاراستنی ئاسایشی کۆنە کۆلۆنەکانی خۆی لەئەفریقادا وەك ڕاگیری هاوسەنگیەکی سیاسی دەبینێت. لەگەڵ ئەوەشدا، بەهۆی بوونی پەیوەندی زۆرباش لەنێوان (ساحل عاج)و فەڕەنسا، گەشتکردنی هەرکامێك لەتیرۆریستەکان یان خاوەنەکانیان لەنێوان هەردوو وڵاتدا ڕاستەوخۆ ئەنجام دەدرا. بەمپێیە، ڕۆژێکیان (هۆفۆنیت) هاتە پاریس‌و وتی: (کەسم لەبەردەستدا نییە بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەوانە)، بۆیە دەمودەست کەسێکم بۆ پەیدا کرد. ئەفسەرێکی زۆر دڵسۆزم هەبوو، کە تازە دەستی لەکار

کێشـابۆوە، بـەرەو (ئابیجـان) ڕەوانـەم کـرد. زۆر ئامـادەو کارامـەبوو، بەداخەوە لەجێگایەکی کەنەدەبوو لـەوێبێت بەشداری دەکردو سەرەڕۆیی دەکرد. لـەکۆتاییدا پـاش کـەمتر لەسـاڵێك لـەوەودوا کـوژرا. ئەفسـوس ڕووداوێکی دی لـە کۆتـایی دەیـەی سـاڵی حـەفتاکاندا قـەوما. دوو ئـەندامی بـەرزی فەلەسـتینی بەڕێکـەوت چاویـان بـەدوو کچـی لاوی فەڕەنسـی لەیانەیەکی شەوانە لە(حەیفا) دەکەوێت. شـوێنی پشـوودانی ئـەو دوو کچـە لەسەر دەریاری سوور بووە، کـە ئـەو جێگایـەیان بەشـوێنێکی خـۆش بـۆ پشـوودان زانیبـوو. فەلەستینیەکان دوو خانمـە فەڕەنسیە بێگوناهەکـەیان هەڵخەڵەتاندبوو، پێیان وتبوون کە دیارییـان هەیـەو دەیانـەوێت بینـێرن بـۆ دایکیـان کـە لەفەڕەنسـا دەژیـن، کچـەکان زۆر بەسـادەیی دیارییـەکانیان وەرگرتبـوو. ئـەو دیاریانـە جۆرێـك بـوون لـەبۆمب، کـەپاش گەیشـتنە نـاو فەڕەنسـا دەتەقینـەوە. ئێمـە هـەرگیز نـەمانتوانی ئـەو دوو تیرۆریسـتە دەستگیر بکەین، بەڵام چونکە سەرچاوەمان لەناو ئـەو گروپـەدا هـەبوو کـە بۆمبەکـەیان دروسـتکردبوو، توانیمـان کارمـەندەکانی گومرگـی خۆمـان لەهاتنی ئەو دوو بۆمبە ئاگادار بکەینەوە. بۆمبەکان بـەخێرایی دۆزرانـەوەو پوچەڵ کرانەوەو، ڕێگری لـەڕوودانی کارەساتێکی گـەورە لـەناو سـەنتەری پاریسدا کرا.

بـەڵام دزەکردنـە نـاو جوغـزی تیرۆریسـتەکان لـەناو بنکـەکانی خۆیـاندا کەمێك زیاتر لەچالاکی سوپایی لەئاستی هاوبەشی دەویست. ئەم چالاکیانـە بەشێکی دانەبڕاوو تاکلایەنەی ململانێکان بوون لەمەیدانەکانی جەنگدا.

لـەکۆتاییدا بەرزکردنـەوەی پلـەکانی لێپرسـراوێتی پێویسـت بـوو، ئـەو ستراتیژە کـە لەسـەر پێوانـەی جیوگرافیـای سیاسـیو تـاکتیکی بـەندبوو کاریگـەری نـەمابوو خسـتمانە ژێـر لێکۆڵینـــەوەوە. زۆر لەدۆسـتەکانمان لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەستەواژەکەی من، کە تیۆری (کلاوزڤیتس)ە، واتە (تیرۆریزم، جەنگە بەواتایەکی دی) دەناسن. لەگەڵ ئەوەشدا لەدەیەی سـاڵی حەفتاکانداو نیـوەی سـالانی هەشـتاکانیش تـیرۆریزم هـێزی ڕیشـەیی لێدانـی

دوژمنەکامان بووە لەناو جەنگی چوارەمی جیهانیدا. بەمپێیە، لەنێوان وڵاتە میانڕەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، کە سەرکردەکانیان چەندین جار دەکەوتنە بەر گوررزی بێبەزەییانەی دراوسێکانی لە خۆیان ڕادیکاڵتربوون بەمەبەستی دەستەڵاتخوازیو دەستدرێژیو چاوچنۆکی، دووچاری هەراس ببوون. ئەم سەرە نێزەی (تیرۆریزمە) بەهۆکارێکی گرنگتر دادەنرا. لەکۆنەوە لەنێوان وڵاتە هاوپەیمانە سروشتیەکانی خۆماندا لەناو جەنگی چوارەمی جیهانیدا وڵاتانی میانەڕەوم لە(باشوور) ناسیوە، کە باشتر هەست بە بەرژەوەندییە بنەڕتیەکانی خۆیانو ئەوبارە ئەمنیەی مانەوەی خۆیان دەکەنو، لەورووەوە لەگەڵماندا گونجاو ترن. ئەو وڵاتە میانڕەوانەی کە حاڵەتەکانیان هەست بەبێزاری کردن بەرامبەر بەدراوسێکانیان دەبێت سەرەڕای ئامۆژگاری پراکتیکیانە بۆ پارێزگاریکردن لەهەندێ دەستوری جیهانی، لەگەڵ هەندێ لەسەرانی دەزگای جاسوسیە جیهانیەکان هاوکارییان دەکرد، تا ئەو شتەی کە بە(یانەی سەفەری) ناسراوە پێکبهێنن. (یانەی سەفەری) گروپێکی ئاوارتەو لەڕاستیدا نەناسراوبوو، کە لەکاتی قەیرانی نەوتی (١٩٧٣)دا، کە دژوارترین خول بوو بۆ ڕۆژئاوا، پێکهات. کەم کەس هەبوو لەوباوەڕەدا بووبێت کە ئەو خولی بێبەشکردنەی خۆرئاوا لەنەوت سەخترین خولیش بووە بۆ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، لەکاتێکدا کە بێسنوری ئابووری نێودەوڵەتی کەتیایدا بەرهەمهێنانی نەوتی جیهان پەیوەستە بەیەدەگی ئەو وڵاتانەوە، لەپێگەیەکی زۆر مەترسیداردا بوو. لەوباوەڕەدام پێویست بوو ئێمە هەندێ لەنوێنەرانی موسڵمانانی جیهانو خۆرئاوا بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی یەکگرتوو لەبەرامبەر فاکتەری نابەرپرسانە تر، کە ئەگەر هەبوو لەقەیرانی ئابورییەوە بۆ بەرپاکردنی دەرگیرییەکی دیپلۆماتی یان سوپاییانە بەپێوانەیەکی فراوانتر سوودی لێوەرگرن، کۆبکەینەوە. یەکەمین پەیوەندیگرتنم لەگەڵ شای ئێران، پادشای سعودیە، مەراکیشو سەرکۆمار (ئەنوەر سادات)ی میسر بوو. چاوپێکەوتنم لەگەڵ هەریەك لەو کەسایەتیانە ئەنجامداو، لەگەڵیاندا ئەو ئایدیایەی کە ئەگەر پێکەوە هێزێکی

هاوبەش دروست بکەین هەموومان لەوقەیرانە ڕزگار دەبین، پێشنیازکرد. لەوحاڵەتەدا هەستکردنی فراوانتر سەبارەت بەچۆنیەتی پەیوەندیو هاوکاریکردنی یەکدی لەئایندەدا بۆ دووبارە نەبوونەوەی ئەو هەلومەرجە لەنێوانماندا دەهاتە ئاراوە. لەهەمان کاتدا پێکەوە گرێدانەوەی بەشەکان دەیتوانی وەك ئامرازێکی ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری سەبارەت بەئۆپەراسیۆنی دراوسێکان ڕادیکالانە تر بەکار بخرێت. لەگفتوگۆ کردنم لەگەڵ هەریەك لەوسەرکردانەو جەخت کردنەوەم لەسەر ئەو پرسە زۆر وردبین بووم. لەکاتێکدا کە سەرکۆماری فەرەنسا ئاگاداری ئیش‌و کارەکانم بوو، بەپێی دەسەلاتە ڕەسمیەکەی خۆم وەك سەرۆکی دەزگای جاسوسی فەرەنسا هەڵسوکەوتم نەدەنواندو، لەجیاتی ئەوە وەك تاکە میانجیگەرێك کە تەگبیرە دروستەکانی لەلای هەریەك لەوسەرکردانە ئاشکرابوو، دەجولامەوە. کۆبوونەوە سەرکەوتوەکانمان بەجیا لەپایتەختە جیاوازەکانی ئەو ولاتانە ساز دەکرا. (یانەی سەفەری) کەناڵی تایبەتی ڕادیۆی خۆیو کۆدی جیاوازو دەزگای خودی خۆی هەبوو. هەریەکە لەوولاتانە بەگشتی لەلایەن سەرۆکی دەزگای جاسوسی یان ڕاوێژکارانی ئاسایشی نەتەوەییانەوە، وەك سەرۆك بۆ کۆبوونەوەکە نوێنەرایەتیان دەکرد. بۆنمونە جەنەڕاڵ (ئەحمەد دلێمی) ڕاوێژکاری سەرۆکی (شاحەسەنی دووەم) لەمەراکیشەوە هاتبوو، لەمیسرەوە سەرۆکی فەرمانگەی ئاسایشی گشتی (ئال-ئام) کە سەرۆکی دەزگای جاسوسی- ئاسایش بوو ئامادە بوو، لەئێرانەوە جەنەڕاڵی چوار ئەستێرەکە سەرۆکی ساواكو یاریدەدەری شیاو بەهەمان شێوە ڕاوێژکاری سەرۆك وەزیرانی ئێران بوو، کە (نیعمت).. نەسیری بوو، لەوێ ئامادەبوو. یەکێك لەدانیشتنەکانی (یانەی سەفەری) ئامانجی بەدەستهێنانی ڕێگایەکی یەکسانو یەکپارچە بوو لەڕێگا پڕپێچو ئاڵۆزەکانی جەنگەکانی سێیەمو چوارەم. کۆبوونەوەی مەراکیش پاش ئەوەی قەیرانی نەوتی ساڵی(١٩٧٣-١٩٧٤) پاشەکشەی کرد بەسترا.

ئێمە لە(ڕیبات) چاومان بەیەکتری دەکەوت و، بەشداربووان هەریەکە بەفڕۆکەی خودی دەهاتنە ئەوێ. داوام لە(مەراکیش)یەکان کرد کە فڕۆکەکەم لەفڕۆکەخانە نهێنیەکەی (ڕیبات)، کە لەکۆتایی فڕۆکەخانەی سەرەکیدا بوو، دابنێن. چونکە نیشانەی سێ ڕەنگی ئالاّی فەڕەنسا، کە تایبەت بوو بەفڕۆکە ڕەسمیەکان، پێوەی لکێنرابوو، واهەستم کرد کە دەبێت دووربێت لەبەرچاو. دوو ڕۆژ لە (ڕیبات) مامەوە. بەیانی ڕۆژی دووەم هێزی پۆلیسی مەراکیش لەسەر شەقامی دەرەوەی فڕۆکەخانەکە لەنزیك ئەو شوێنەی کە فڕۆکەکەی منی لێوەستابوو نزیکەی سی یاردە دوورتر پاسەوان بوون، لەسەعات شەشی بەیانیدا پۆلیس ڕووبەڕووی ئۆتۆمبیلێك ببوونەوە کە کەسێك لەپەنجەرەی ئۆتۆمبیلکەوە سەرنجی فڕۆکەکەی دەدا. پۆلیسەکان لێیان پرسیبوو: (بەڕێز.. چی دەکەیت لێرە؟)

زیرەکانە وەلاّمی دابوونەوە: (ئەمەوێت هەوای سازگاری مەراکیش هەلّبمژم)

ئەفسەری پۆلیسەکان پێیوتم، کە پێیوتووە: (دیارە سەیری ئەو فڕۆکەیە دەکەیت، ئەوە پێنج دەقیقەیە سەرنجی دەدەیت، حەزت لێیەتی؟)

پیاوەکە وتبووی: (بەلّێ، حەزم لەسەیرکردنی فڕۆکەیە، کارێکی نایاسایی نییە، وانییە؟)

ئەفسەرەکە وتبووی: (ئەتوانم بپرسم تۆ کێیت؟)

ئەو وەلاّمی دابۆوە: (من سکرتێری یەکەمی بالوێزخانەی بولگاریام لەمەراکیش).

بولگارییەکان نەك بەهۆی بلیمەتیانەوەلەبواری کاری سیخوڕی، بەلّکو بەهۆی بێبەزەییە تایبەتیەکەیانەوە ناسراوبوون. سەرەڕای ئەوەش، هیچ نایاساییەك لەکارەکانیاندا نەبوو، هیچ بەلّگەیەکیش لەبەردەستدا نەبوو بۆ دەستگیرکردنی ئەو دیپلۆماتە بولگارییە. بەلاّم دیاربوو زۆر گرنگیان دەدابەو (یانە سەفەری)یە. لەودەمەدا ئێمە بەتوندی یەخەگیری جەنگ بووین لەگەلّ ئیمپراتۆریەتی ڕوسیادا، ڕوسەکان لەهەموو شوێنێکداو بەتایبەتی لەخۆرهەلاّتی ناوەڕاستدا زۆر چالاك بوون، ئەو شوێنەی کەپێیان وابوو

دەتوانن هاوپەیمانی شیاو دروست بکەن بۆ لەچەکداماڵینی دوژمنە خۆرئاواییەکانیان. (یانەی سەفەری) بەباشی ڕوسیاو دۆستەکانیانی لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا سەغڵەت کردبوو، کە مۆسکۆ بەردەوام بوو لەسەر پەروەردەکردنیان. ڕۆژی دوایی پاش نانخواردن هەموومان بۆ پایتەختی وڵاتەکانمان گەڕاینەوە. هەروەکو لەپێشدا کردبوومانە خوو، داوامان لەهەموو بەشداربووان کرد کە بەباشی چاودێری شوێنی دانانی جانتاکانیان و ئەو کەسانە بکەن کە بەئاسانی دەستیان دەگاتە نوسراوەو کاغەزە نهێنییەکان. عەسری ئەو ڕۆژە بەرەو پاریس گەڕامەوە، کارەکانم ئەنجامداو ئنجا گەڕامەوە ماڵەوەو ڕاستەوخۆ خزامە نێوجێگاوە. نزیکەی سەعات یەکی پاش نیوەشەو زەنگی تەلەفۆن لێدرا، کە ئەفسەری ئێشکگری سەنتەری ئۆفیس بوو. وتی: (بەڕێز.. بەڕێوەبەری گشتی، داوای لێبوردن دەکەم کە سەغڵەتم کردی، بەڵام وادیارە کە ژەنەڕاڵ (نەسیری) پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ تاران شەوی لە (نیس) بەسەربردووەو، لەگەڵ خان م(نەسیری)و چەند کەسێکی دی لەدۆستەکانیان نانی ئێوارەیان لەوێ خواردووە. لەکاتێکدا کە سەرقاڵی نانخواردن بوون دزی لە ئاپارتمانەکەی کراوە، بڕێك پارەو زێڕو زیو هەبووە لەوێ کەچی دەستی بۆ نەبراوە!)

دەمودەست تێگەیشتم چی ڕوویداوەو پەیوەندیم بەژەنەڕاڵەوە کرد. ژەنەڕاڵ (نەسیری) سەرۆکی (ساواك)و هاوڕێیەکی سەردەمی منداڵیو هاوپۆلو جێگا متمانەی شابوو. زۆر حەزی دەکرد جەسوورانە بڕێك زرنگی پیشەییانەی تایبەتمەندانی سیخوڕی، کە لەکاتی جێبەجێکردنی ناهەموارترین کاردابەکاری دەهێنن، بەدەست بهێنێت. وای هەست دەکرد بەلایەنی کەمەوە شوێنگەکەی لەماڵەوە مایەی دەست درێژی کردنەسەر نییەو، ئەو حاڵەتەش مافو دەست ڕۆیشتووی دەداتێ کە بەتەواوی دوور لەچوارچێوەی کارەکەی بەکاریان بهێنێت. ئەمە یەکێك بوو لەئامارژەکانی خراپ گەندەڵبوون، کە لەوەوپێش لەئێرانی ژێر فەرمانڕەوایی (شا)دا پێی گرتبوو.

زۆر بەپەلە دوای (نەسیری)م کرد بۆ سەرتەلەفۆن‌و پێم وت: (هاوڕێی ئازیزم.. ژەنەڕاڵی بەڕێز، هیوادارم نوسراوی زانیارییەکانت لەماڵەوە دانەنابێت.)

وەڵامی دایەوە: (نا، بەهیچ شێوەیەك، دیارە وانییە. سوپاس بۆ خواکە هەر لە(مەراکیش)ەوە ڕەوانەی (تاران)م کردبوو.)

دەمزانی درۆ دەکات. بەیانی ڕۆژی دواتر گریمانەکەم ڕاست دەرچوو. پەیامێکم بۆ (مەراکیش)یەکان ناردو، داوای لیستی هەموو فڕۆکە گشتی‌و تایبەتیەکانم کرد کە ڕۆژی پێشووتر گەشتیان بۆ تاران کردبوو.

وەڵامەکە بەهەمان شێوەی کە چاوەڕوانیم دەکرد ئەمە بوو: هیچ گەشتێك بەرەو تاران نەبووە. باش دەمزانی ئەو کەسە بولگارییەی کە ئەو ڕۆژە سەرقاڵی سەیرکردنی فڕۆکەکە بوو، دەیزانی کە (نەسیری) چ کاتێك دەڕوات.؟ بولگارییەکان هاوشانە ڕوسیەکانیان ئاگادار کردبوو، کە ئاپارتمانەکەی (نەسیری) لە (نیس) لەنزیکەوە دەپشکنن، کەپاش ڕێکخستنی چوونە ژوورەوەی نهێنیانە لەهەمان شەودا کارەکەیان ئەنجامدابوو. ئەوەش تاکە شەوبوو کە دوچاری دەست درێژی کردنە سەری دووربەدوور بێت، کە هەر ئەوەش بووە هۆی شلۆق کردنی شوێنگەکەی. دەست خۆشیم لەدەزگاکەیان دەکرد، بەڵام دەبوو بەوردی بزانم ئەوشتەی بەدوویدا گەڕاون دۆزیویانەتەوە یان نا؟ بەیانی ڕۆژی دوایی، دوو ڕۆژدوای ئەوە، کۆبوونەوەی (یانەی سەفەری) بەسترابوو. هەمان ڕۆژیش کە (نەسیری) گەڕایەوە بۆ تاران، دوام لە(مەراکیش)یەکان کرد کە پەیامێك بەئاماژە نهێنیەکانی (یانەی سەفەری) بنێرن بۆ ژەنەڕاڵ (نەسیری) لەتاران، تا دان بەڕووداوەدا بنێت‌و داوای وردەکارییەکانی ڕووداوەکە بکات بۆ کردنەوەی کێشەکە. بەڵام بەهۆی ئەوەی ئاماژە نهێنیەکانی لەناو جانتاکەیدا ببوو کە لەئاپارتمانەکەدا دزرابوو، هەرگیز وەڵامی پەیامەکەی نەدایەوە، چونکە نەیتوانیبوو پەیامەکە بیخوێنێتەوە. بەمجۆرەزانیمان کەلایەنی بەرامبەر شارەزای ئاماژەکان

بوون؛ ئەو ئاماژانەی کە دواتر لەهەموو دانیشتنەکاندا دەگۆڕان. هەربەو هۆیەشەوە چونکە ماوەیەکی کەم لەجانتاکەی ژەنەڕاڵ (نەسیری)دا مایەوە فشارمان بۆهات تا دەمودەست بیگۆڕین. بەپێی زانیاری سەرچاوەکانمان، ڕوسەکان و لەڕاستیدا ئەو وڵاتانەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، کە بەئەنقەست لە (یانەی سەفەری) دوورمان پێگرتبوون، دەیانتوانی لەزۆر لەئامانجەکانیاندا سەرکەوتن بەدەست بهێنن. یەکێك لەووڵاتانەی کە ئێمە لەدەرەوەی (یانەی سەفەری) دامان نابوو عیراق بوو، هەرچەندە ئاساییکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ عیراق هەر لەساڵی (۱۹۷۰) یەکێك بووە لەپایەکانی سیاسەتی فەڕەنسا لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست. تازەکردنەوەی ئەو پەیوەندیانە بەشێکی وردی ئەو پێشنیازە بوو کە لەلایەن بەرزترین ئاستی کۆماری فەڕەنساوە بۆ کۆتایی هێنان بەنیوەی هاوکێشەی دژە تیرۆر داڕێژرا بوو (کە پشتگیریکردنی تیرۆری لەئاستی بەرزی دەوڵەت و ئیدارەدا لەنێو دەبردو، بەشێوەیەکی کاریگەرانە دەوڵەتە هەڵگەڕاوەکانی، کە لەخۆئامادە کرندابوون لەدژمان لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا، یەك لەدوای یەك زیاتر گۆشەگیر دەکرد.)

لەوسەردەمەدا ئێمە بەرنامەیەکی دیمان بەهەمان گرنگییەوە هەبوو؛ ئەوەش پەیوەست بوو بەناوچەیەکەوە، کە سەبارەت بە بەرژەوەندی هەندێ لەدراوسێکانی عیراق، کە ئاشکرابوو لەمن زیاتریش لەبەرامبەر خواستە فراوانخوازییەکانی (بەغداد)دا لەترس و هەراسدا دەژیان و، لەبارەی سەنگی جیوگراف- سیاسییەوە گرنگییەکی زۆرتریان هەبوو. بەرنامەیەکی دی ئێمە پەیوەست بوو بەیەکەمین شەڕکردن لەجەنگی سێیەمی جیهانیدا. ئامانجمان هەوڵدانێکی نائومێدانەبوو بۆ ڕزگارکردنی (سەدام حوسەین) ووڵاتەکەی لەچنگی ئابلۆقەی ڕوسیای سۆڤیەتی، کە لەوبەشەی جیهاندا زەمینەی ئامادەگی و دەست ڕۆیشتوویی خۆی لەدەستدەداو، لەلایەن هەموو دەوڵەتانی خاوەن ئەندێشەی سیاسی،

سوپایی یان مەزهەبییەوە لەژێر فشاردابوو. واتە عیراق پراکتیکانە یەکێك بوو لەدوایین ئەسپەکانی ڕاوکردنو شەڕی ڕوسەکانو، مۆسکۆ هیواداربوو کە دەستەڵاتخوازیو فراوانخوازییەکانی (بەغداد) بگاتە ئاستی تەقینەوەو، ئەویش بتوانێت سوود لەعیراق وەربگرێت بۆ هێرش کردنە سەر خۆرئاوا لەهەرساتێکی گونجاودا. وتەکانی من بۆ عیراقیەکان زۆر سادەبوو، وتم: (پێویستە دەست لەداوێنی ڕوسەکان بەردەنو ببنە باوەشی خۆرئاواوە)

ئاشکرا بوو (بەغداد) ئامۆژگاری لەوبابەتەی کە لەلایان جگە لەوەی مەترسیداربوو گاڵتە جاڕانەش بوو، پەسند نەدەکرد. لەگەڵ ئەوەش، ڕوسەکان سەرچاوەی دابینکردنی چەکەکانیان بوون. دەرئەنجامەکانی من زۆر سادەبوون: (وامەزانن کە ئێوە ناچارن سەرەڕۆییەکی گەورەو مەترسیدار ئەنجام بدەنو لەخۆرئاواش بۆ هاوەڵ بگەڕێن)

پاش وەڵامدانەوەی سەرکۆماری میسر (ئەنوەر سادات)، وایبەباش دەزانی کە ڕێگای چوونە دەرەوە پیشانی ڕوسەکان بدرێت. ڕۆژ بەڕۆژیش لەلای (سەدام) ئاشکرا تر دەبوو کە ئامۆژگارییەکانم ڕاستە. بڕیارەکانی (سەدام) لەسەربنەمای کاریگەری بەرامبەرو نیازە ئاڵۆزو ویستەکانیان بنیادنرابوو، کە لەگەڵ ترسی دێرینی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ئاوێتە ببوو. پێش هەمووشتێك چۆن لای (سادات) ڕوون ببۆوە لەلای ئەویش ئاشکرابوو کە ڕوسەکان لەبارەی دابینکردنی بەردەوامی چەكو پێداویستیەوە ناکرێت متمانەیان پێ بکرێت. جێگای دڵنیایی نەبوون. ئەوەش بەهۆی ئەو نرخە بەرزانەی بۆ تانکە ژێر ستانداردەکان یان تۆپە بیابانیە پلە سێکانو کەلوپەلێکی، کە بەهیچ جۆرێك لەئاستی بەرهەمە خۆرئاواییەکانی کە بۆ دوژمنە بەهێزەکانی عیراقو دراوسێکانی دابین دەکرا نەبوون، دەدرا سەرئەنجامی سوپای عەرەبەکان لەجەنگی ساڵانی (١٩٦٧،١٩٧٣) شکست نەهێنانی (سەدام) بوو.(سەدام) کاروانە چەکێکی کە لەلایەن خۆرئاواوە زامن کرابێت، بەتایبەتی لەلایەن

فەڕەنساوەو بەهۆی ئەو دۆلارانەی نەوتەوە کە ئازادانە لەخەزێنە جەنگیەکەیدا هەیە، کڕابێت، پێ باشترە تا ئەو کەلوپەلە سەرەتاییانەی کە بەدراوی تەواو ئایدیۆلۆژی زاخاو کراون. بەرنامە ڕێژیەکانی بۆ ئاینده تەواو ئاشکرا نەبوو، کە ئایا بەرامبەر بەکارهێنانی هەر (ڤیتۆ)یەکی داهاتوو کە لەدژ خواستە فراوانخوازییەکانی بەکار بێت ئامادەیە یان نا؟(سەدام) بەدرێژەدان بە بەڵێنەکانی بۆ خۆرهەلاتو خۆرئاوا، وایدەزانی بەکارهێنانی (ڤیتۆ)یەکی لەوجۆرە کەمتر مایەی پیادە کردنە.

لەسەرەتای دەیەکانی (١٩٧٠)دا بوو، کە من بۆ یەکەمین جار چاوپێکەوتنم لەگەڵ (سەعدون شاکر)ی دەستە ڕاستو ئەمینداری (سەدام حوسەین)دا کرد. لەوکاتەدا (سەعدون) وەك سەرۆکی دەزگای جاسوسی عیراق لەڕاژەدا بوو. ئەم فەرمانگەیە بەهەمان ئەو (ئیستخبارات)ەتۆقێنەرە دادەنرا، کەهەم چاوو گوێی (سەدام) لەناوخۆو دەرەوەو،هەم لەناو پێکهاتەی پارتی بەعس دابوو.

(سەدام) لەسەرانسەری ولاتدا بەمشتێکی پۆلاینەوە حوکمی دەکردو، ئەوانەی لەگروپی ئەوبوون سەرسەختو پڕ وزە بوونو لەڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی دەسەلاتو پاکتاوکردنی نەیارەکانی بەدرێژایی کاروانەکە بەباسکی ئەو دادەنران. (سەعدون)ی لاو، دەرکەوتوو، زرنگ، سەرنجڕاکێشو سەرسەخت بوو. ڕۆژێکیان کە زۆر بەسەر ڕاژەکەمدا تێنە پەڕیبوو،(سەعدون) بۆ چاوپێکەوتنم هاتە (پاریس). لەئۆفیسەکەمدا، کە لەبارەگای فەرماندەییو دەزگای جاسوسی فەڕەنسادا بوو، پێکەوە نانمان خوارد. بەهۆی یەکێك لەیاریدە دەرەکانیەوە هاوەڵی دەکراو، منیش یەکێك لەپسپۆڕانی خۆرهەلاتی ناوەڕاستم لەگەڵ بوو. کاتێك دوای نانخواردن قاوەمان دەخواردەوە ڕووم تێکردو، وتم: (ئەگەر بەڕێزتان ڕووخسەت بفەرموون بێپەردەو تا ڕادەیەکیش بێبەزەییانە قسەدەکەم.) درێژەم پێدا: (هەستەکانم بەرامبەر بەولاتەکەتان تاڕادەیەك جێگای ناڕەحەتین. ئەوەندە بەسە سەردانی مۆزەخانەی شوێنەوارە دێرینەکان

لـه (بغـداد) بکـەیت تـا تێبگـەیت کـە مێـژووی ڕابردووتـان لـەنێوان دەوڵەمەندترین ئەزموونە مرۆڤایەتیەکاندایـە، تەنانـەت لەمیسرییەکانیش دێرین ترە. ئەمڕۆ وڵاتەکـەتان لـەنێوان وڵاتـە عەرەبیـەکاندا تاکـەو، هـەم پەترۆڵو هەم ئاوی هەیـە. ڕێکـەوت یـان گـەر بـەڕێزتان پێتـان باشـتربێت بڵێم خوداوەنـد بـە پێچەوانـەوە وای دیاریکردووە کـە زۆربـەی وڵاتـەکان ئاوی هەبێت بـەڵام بـێ پـەترۆڵ بن. لەوانەیە ئەمـە مایـەی سەرسوڕمان بێـت، بـەڵام بەهـەرحاڵ بەوجۆرەیـە کـە ئێـوە جیـاوازن. ئێـوە خـاوەنی ئاوێکی زۆرن‌و (لەوکاتەدا کـە بەخـەندەوە ڕووم کـردە یـاریدە دەرەکـەم) وتم: بەوجۆرەی کە پسپۆڕەکانمان دڵنیایان کردوومەتەوە پاشـەکەوتێکی ئەفسانەیتان لەڕووی مادەی کانزایی‌و پەترۆڵییەوە هەیە. هەندێك لـەپێش ئـەماندا وایـان دانـاوەو خەملاندوویانــە کــە ئێــوە عەربســتانی ســعودی دووەمن. لەگەڵ ئەوەش بەتەواوی ویژدانەوە دەڵێن کـە (پروسـی)یـەکانی جیـهانی عـەرەب چـەکداری ئێـوەن؛ ئێـوە لەوشـوێنگەیەوەی کـە هەتانـە دەتانەوێت چیی بکەن؟

کاتێك مێزو ژووری خواردنمان بەجێ دەهێشــتو بـەرەو کورسییەکانی نـاو ئۆفیسـەکەم دەڕۆشـتین مۆڵـەتمدا تــا پرسـیاری شـیاو لەمێشـکیدا بخـەملێت. (سـەعدون) لەوشـوێنە دانیشـت کـە (ژیسکاردسـتن) لـەکاتی یەکەم نانخوارندنمان لێی دانیشتبوو.

دووبارەم کردەوە: (باشـە بەوهـەموو ڕابـردووە مێژوویـی‌و ئایندەیـەوە کە دەتوانن دووبـارە بـەرەو ترۆپکـی سـەرکەوتنێکی ئاوارتـەتان بـەرێت، دەتانەوێت چیی بکەن؟ خـەریکن لـەگوندە بچوك‌و شـاخاویەکاندا کـاری بچوك‌و نەفامانـە ئـەنجام دەدەن‌و دەسـتتان داوەتـە سـەرەتایترین کـاری تیرۆریستیانە. (سـەعدون) وەك نـاڕازیبوون هەسـتایە سـەرپێ‌و لـەجێگای خـۆی بـەرز بـۆوە، منیـش بـەئارامی دەسـتم درێـژ کـردو دامنیشـانەوە. بەنەفرەتەوە تفێکم لەزەوی کردو گوتم: (زیادەڕۆیی بۆ تـیرۆری گشـتییە، ئێوە خەڵکی لاو بۆ ئەم کارە هـەڵدەبژێرن؛ وەك چـۆن تورکـەکان گـاردی

پیادەی سوپاییان دروست دەکرد. ئەوان ئەم خەڵکانەیان دەبردە ناو کۆشکێکەوە کە لەڕاستیدا بەهەشتێکی زەمینی بوو باخەکانیان پیشان دەدان. ئەو شوێنە سەر زەمینێکی سەرسوڕهێنەر بوو، کە بولبول تیایدا دەخوێندو ژنانی قەشەنگی تێدابوو. ئەو گەنجانە تەنها دووڕۆژ یان سێ ڕۆژ لەوێدا دەهێڵرانەوە، پاشان دەریاندەهێنان‌و دەیانکردنە بکوژانی بەکرێگیراو. ئەم بیرکردنەوەیە پەیوەستە بەسەدەی ناوەڕاستەوە، بەڵام ئێوە ئەمڕۆ پیادەی دەکەنەوە.) درێژەم پێدا: (لەتۆ ناپرسم کە ئایا کۆمەکی تیرۆریستەکان دەکەن یان نا- لەوکاتەدا کە ڕۆژمێرێکی بچوکم لەگیرفانم دەرهێنا- وتم: من دەڵێم ئایا ئەمە ڕاست نییە کە ئێوە لەبیست‌و چواری تەممووزدا سەدهەزار دۆلارتان بۆ کەسێك لەقاهیرە ناردووە؟) پاشان ناوی کەسەکەو ژمارەی ئەژمارەکەیم وت.

(سەعدون) کە سەراسیمە ببوو، وتی: بەڵێ.

لەگەڵ ئەوەی ناوو ژمارەی کەسەکەم پیشاندا، وتم: (شەش مانگ دوای ئەوە چێکێکی ترتان بۆ ئەم ناونیشانە ناردووە؟)

بەخێرایی وەڵامی دایەوە : (بەڵێ، ڕاستە)

پرسیارم کرد: (درێژەی بدەمێ؟)

وتی: (نەخێر، پەیامەکەم پێگەیشت.)

بەئاشکرا دیاربوو چ بیرێك بەمێشکیدا گوزەر دەکات. لەوانەیە ئەم هەمان ئەو کەسە بێت کە ئێمە بتوانین قسەی لەگەڵدا بکەین! لەوانەیە بەدوورخستنەوەی تیرۆریستەکان لەعیراق کەمترین بەهای ئەو چەکە خۆرئاواییانە بێت کە(بەغداد) نائومێدانە ناچاربوو بیدات. (سەدام حوسەین) پێشتر دەستی دابووە پەچەکردار بەرامبەر بەتیرۆریستەکان: ئەوانەشی خەڵکی ئەمریکای خواروو، ئەوروپا، ئەفریقا، خۆرهەڵاتی ناوەڕاست یان ژاپۆن بووبێت، هەرچۆنێك بێت لەلای ئەو هاوپەیمانانی بێ متمانە بوون.

لەکاتێکدا بەهۆی مەبەستە تایبەتیەکانیەوە درێژەی بەکۆمەکە مـادیو مەعنەوییـەکانی بـۆ (ڕێکخـراوی ئـازادی بەخشـی فەلەسـتین) دەدا، بەئاشکرا دەیزانـی کـە ئـەو ڕێکخـراوەو باڵـە سـوپاییەکانی لـەناوخۆی وڵاتەکەیدایـەو، لەهـەمان کاتیشـدا بـەئاواکردنی دیمکراسـی خۆرئـاوایی وڵاتەکەی لاواز دەکات.

ئەمـە دروسـت هـەمان هـۆ بووکـەوای لـە(شاحوسـەین)ی ئـوردن کـرد ڕێکخـراوی ئـازادیخوازی فەلەستینی لـەئوردن بـەدەر بنێت. تـا لەسـاڵی (١٩٧٨)، کە(بەغداد) ئۆفیسەکانی (الفتـح)ی پەیوەسـت بـە بـەڕێکخراوی ئازادیخوازی فەلەستینی داخستو، کۆمەکە داراییەکانی، جگە بـۆ هـەندێ گروپیان، ڕاگرت. دەستی بەسـەر دەبـۆی چەکـەکانیان داگـرت، کـەبڕێکی باش چەکیان تێدابوو، ئەو چەکانەشی کەبڕێکی زۆریـان لەچینـەوە بـەناو عێراقدا بـۆ ڕێکخـراوی ئـازادیخوازی فەلەسـتین لـەلوبنان ترانزێت دەکـرا، ڕاگرت. زۆربەی ئەندامە سەرەکیەکانی بەرەی گەلی فەلەسـتین (کەهـەموو سازشـێکیان لەگـەڵ ئیسـرائیل ڕەت دەکـردەوە) لـەعێراق دوورخرانـەوە. لەوگروپانە (بەرەی ئـازادیخوازی فەلەسـتین)ی سـەربە (جـۆرج حەبـەش) بوو، کە فەرماندەییەکەی لەئەستۆی کەسێك بـوو بـەناوی (ئەبوعـەباس)، کە سەرکردایەتی هـێرش کردنەسـەر کەشـتی (ئاکیلـە لابـورو)ی لەئەسـتۆ بوو. باڵی ئۆپەراسیۆنی تایبەتی بەرەی ئازادی خوازی فەلەسـتینی لـەژێر فـەرماندەیی (وادی حـداد)و (الفتـح) کـە بەئەنجومـەنی شۆڕشـی ڕێکخـراو بەڕابەرایەتی (ئەبونیزاڵ) ناسرابوو. هـەموو ئەوانـە لەپاشـاندا لـەژێر بـاڵی دەوڵـەتانێك، کـە سەرسـەخترین دوژمـانی عـێراق بـوون لەدەسـت بەسـەراگرتنی ناوچەکـە، کۆبوونـەوە. کـورت کردنـەوەی دەسـتی تیرۆریستانی (بـەغداد) لەلایـەن عێراقـەوە ڕووداوێك بـوو کـە زیاد لەیـەك دەیـەی خایاند، بـەڵام بەلایـەنی کەمـەوە بـووە هـۆی گۆڕیـنی نەخشـە لەخۆرهـەڵاتی ناوەڕاسـت. بیهێنـە بـەردیدەی خـۆت ئایـا (سـەدام حوسـەین)یش لـەکاتی ئۆپەراسیۆنی (گـەردەلولی بیابـان)دا دەیتوانـی

جۆرێك داكردن ببەخشێتە تیرۆریستەكان لەناو وڵاتەكەی خۆیدا بەوجۆرەی كە ئەمڕۆ هەندێ لەوڵاتان پەنایان دەدەن، لەوحاڵەتەدا جیهان بەناچاری دەبووە واقعێكی دۆزەخ ئاسای بێبەزەیی ئانارشیستی. بەڵام تیرۆریستەكان كۆنترۆڵ كران و، دژایەتی كردنی عیراق لەلایەن هەندێ لەوڵاتانە بەو ناوەیی كە داكەری تیرۆریستانە پاشەكشەی كرد.

هەندێ لەسەركردە نەتەوەییەكانی دی، كە پەرەیان بەئەگەری شەپۆلی تیرۆریزم لە (باكور) دەدا، بەپێچەوانەوە سوودیان لەوهەلە وەرگرت و سوپا هاوپەیمانەكانیان توانیان ئەوەی كە پێشتر لەتوانیایاندانەبوو بیكەن پراكیتیك بكەن و، بەهێزترین سوپای ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، واتە سوپای عیراق، لەچەك دابماڵن. كورتەی ئەو بونیادانەی كەپێش دە ساڵ دروستمان كردبوو ئەو وزەیەی پێ بەخشین كە بتوانین ئەو هەستە توندانەی كە دوژمنەكانمان سەبارەت بەجودایی لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا دروستیان كردبوو چاك بكەینەوەو، لەجەنگی (گەردەلولی بیابان)دا بەسوودی خۆمان بیگۆڕین. هەمان ئەو شەوەی كە چاوپێكەوتنم لەگەڵ (سەعدون شاكر) لەئۆفیسەكەی خۆمدا ئەنجامدا گفتوگۆی نێوانمان كە چەندین ساڵ پێشینەكاریی هەبوو، بووە هۆی ئەوەی یەكەمین دیداری ڕەسمی عیراق بكەم و، لەساڵی (١٩٧٤)دا چاوم بەكەسێتی (سەدام حوسەین) بكەوێت. ئامانجەكانم بۆ ئەمریكیەكان ڕوون كردەوە، پێم ڕاگەیاندبوون كە دەمەوێت (سەدام حوسەین) بەرەو بەرەی خۆرئاوا كێش بكەم و، لەتیرۆریستەكانی كە بنكەیان لەوڵاتەكەیدا داكوتاوە جیا بكەمەوە. بەوهۆیەوە دەستم دایە هاتووچۆیەكی بەردەوام لەگەڵ (بەغداد)و، كۆبوونەوەی نهێنیم لەگەڵ (سەدام) ڕێكخست. لەیەكێك لەو دیدارانەدا داوای لێكردم كە لەگەڵیدا بچم بۆ یەكێك لەیاریگا گەورەكانی (بەغداد).

وتم: ( هەڵبەتە گەر ئەو كاتانە لەگۆشەیەكدا بم كە كەس نەمبینێت هاوەڵیتان دەكەم)، بەڵام خۆنەویستانە هەمووشتێك تێكچوو، لەكەناریدا

بەتەڵەوە بووم. ئەوەش لەوکاتەدا بووکە دەرووروبەری لەکاروانی ئۆتۆمیبیلەکان چۆڵ بوو، خۆشی بەتەنها بەناو کۆمەڵێك عیراقیدا چووە ناو یاریگاکەوە.

(سەعدون) جۆرێك لەپەرستنی (تاکێتی) لەعیراقدا سەپاندبوو؛ یاریگاکە لەوڕۆژە گەرمەی هاویندا دەریایەك بوو لەمرۆڤە تاك هزرەکان، واتە پەرستن‌و کڕنۆش بردن بۆ دوایین سەرکردەیان. لەوکاتەدا هەلێکی ڕەخساوبوو بۆ بەخشینی مەدالیای سوپایی بەقارەمانەکانی جەنگی دژ بەدوژمنەکەیان، واتە ئێران. ڕوسەکان لەویاریگایەدا خاوەن دەسەڵات‌و متمانە بوون، چونکە هەموویان لەویاریگایەدا یونۆفۆرمی ئەفسەرانی (KGB) یان بەنیشانەی سوورەوە پۆشی بوو. ژەنەڕاڵێك ئاماژەی بۆ کەسێکی فەڕەنسی کە لەتەنیشت (سەدام)وە وەستابوو کردو، وتی (ئەوە کێیە؟) لەپاشاندا بێگومان کە ڕوون دەبۆوە لەلای ئەو میوانە (سەرۆکی دەزگای جاسوسی فەڕەنسا)بوە، سەراسیمە دەبوو.

تەنانەت ئەو دەمانەشی لەگەڵ (سەدام حوسەین) کارمان دەکردو، فڕۆکەی جەنگی‌و کەلوپەلمان پێ دەفرۆشێت، بەشێوەیەکی بەردەوام ناردنی ئامێری جەنگیمان، بەتایبەتی موشەکەکانی (سکۆد)، کە پێدەچوو تەنهاترین‌و کاریگەرترین چەکی دژ بەئیسرائیل‌و هاوپەمانەکانی بێت، بەدرێژایی جەنگی کەنداو کۆنترۆڵ دەکرد. سەرەڕای ئەوە، بەبوونی سوکە پەیوەندییەکی دیپلۆماتی، سەربازی‌و سیاسی لەگەڵ عیراق دەمانتوانی لۆژیکانە ئاگاداری هەلومەرجە توانستیەکانی عیراق بین. ئەمجۆرە لەکاری سیخوڕی، کاتێك کە هێزە سەربازییەکان لە (گەردەلولی بیابان)دا بەسەر هێزە لەشکان نەهاتووەکەی عیراقدا سەرکەوتن، زانرا کەچەند زانیارییەکی بەبەهای هەبووە. خودی (سەدام) لەوکاتەدا کەسێکی سەرنج ڕاکێش بوو. سوڵتانێکی بێهاوتا بوو، کە دەیتوانی نائاساییترین تەلقینی چاکەو خراپە بەگوێی پەیڕەوانیدا بدات. کاتێك چاوم پێی کەوت، بەگشتی دیدارەکەمان لەئۆفیسە تایبەتەکەی

لەكۆشكێكی پـڕ بـاقوبریقی سـەرۆكایەتی كۆمـاردابوو. (سـەعدون شـاكر) هەمیشـە لەگـەڵیدابوو. كـاتێك كۆمەكـە داراییـەكانی عـیراق دەیداتـە تیرۆریستە نێو دەوڵەتیەكانم باسكرد، هیچ كامیان بەلایانەوە نامۆ نـەبوو. هـەموو جـارێك (سـەدام) هـەموو ڕوونكردنـەوەكانی مـنی بـەبێ هیـچ پێشنیارێك پەسندەكرد. بەباشی لەلایەن (سەعدون)ەوە ڕێنمـایی دەكـراو ، تەواو ئاشكرابوو كەبیری لای پرسە هەستیارو سـەرەكیەكانە⁻ لەوێنـەی پەیوەندی بەتیرۆریستەكانو ڕێنمایی كردنیان دژ بەزلهێزەكانی خۆرئاواو باكور، بەڵام بەشێوازی خۆی)

هەڵبەتە سەبارەت بەكۆتایی هێنـان بەنوێكردنـەوەی پەیوەندیـەكانیان لەگەڵ خۆرئاوا، بەتایبەتی لەگەڵ فەڕەنسـا، نیگـەرانی زۆر لـەئارادا بـوو. دیـاربوو ئەگـەری ئـەوە لەئارادایـە بـێ گەیشـتنە هیـچ ئـەنجامێك پەیوەندیـەكان هەڵپەسـێرنو هـەموو لێـك گەیشـتنە كـۆنو نوێیـەكان بەئاگری دەمی ئەژدیهایەك بسوتێنن.

لەیەكێك لـەزنجیرە كۆبوونـەوەكانم لەگـەڵ بەرپرسـە بـاڵا عیراقیـەكان، لەپشـتی مێزەكـەوە هەسـتامە سـەرپێو ئـەژنۆكانم ڕاسـتكردەوەو بـەرەو پەنجەرەیـەك ڕۆشـتمو لـەوێوە چـاوم بڕییـە گۆڕەپانەكـەی بـەردەمم. بـۆ باشتر بینین یەكێك لەپـەردەكانم لادا، لـەپڕێكدا مـایكرۆفۆنێك بەزیكـەزیك كەوتـە خـوارەوە. خانـە خوێكانم بەپەلـە هاتنـە ژوورەوەو دەسـتەپاچە وەستابوون.

پێكـەنیمو وتم: (وەرن.. سـەیركەن، لـەوباوەڕەدام دەزانـن چـۆن مایكرۆفۆن لەشوێنی شیاوی خۆیـدا چەسـپ دەكرێـت. كـارێكی لـەمجۆرە تەنها یەك واتای هەیەو ئەویش ئەوكەسەی ئەمەی لـێرە داناوە مەبەسـتی بووە لەكاتی كۆبوونەوەكەدا بكەوێتە خوارەوە.)

جگە لەعیراقیەكان كێ دەستی دەگەیشتە ژوورەكە؟ كەسێك لـەهاوڕێ ڕوسـەكانیان، هەڵبەتـە تیرۆریسـتە عەرەبـەكانیش ئـەوەیان لـەتوانادا هەبوو؛ لەسەرووی هەمووشیانەوە ئێران. (سـەدام) پێشـتر تێزەكـانی بـۆ

گەیشتن بەهەلومەرجەکانی ئێران دادەڕشت. سیمایەکی هاوپەیمانی باشتر لەشەیتانە گەورەو بچوکەکان؛ واتە دەوڵەتە خۆرئاواییەکان، کە ئامانجی سەرەکیان ئێرانیە سەر سەختەکانە، تا خودی خۆیان ئەوان بخەنە ژێر چاودێرییەوە.

پاش بەدەرنانی (ئیمام خومەینی) لەئێران لەساڵی (١٩٦٣) لەسەردەمی شا، عیراق یەکەمین وڵات بوو کەتیایدا نیشتەجێ بوو. لەوەودوا لەناوچەی خوارووی عیراق، کە ناوچەیەکی شیعە نشینەو، وەك پێغەمبەر پێشوازییان لێکرد، دانیشت. (ئایت الله) لەشاری نەجەف بەدوورخراوەیی مایەوەو ئەوەش پازدە ساڵ درێژەی کێشا. لەڕاستیدا بوونی وەك درِك بوو بۆ چاوی شای ئێران. پارێزگاریکردنی وردی بە (سەعدون شاکر) سپێردرابوو. هەر ئەویش لەوردەکاری کەسایەتیەکەی ئاگاداری کردم. وتی: خاوەنی کەسایەتیەکە، کە بۆ کەسانی دی تارادەیەك نامومکینە. (ئیمام) لەماوەی ساڵانی دوورخراوەیی لەعیراق وتارە مێژووییەکانی، کە دەبوونە هۆی نانەوەی ئاژاوە لەناو ئێراندا، لەعیراقەوە تۆمار دەکرد.

پاش یەکەم دیدارم لەگەڵ (سەدام حوسەین) بەماوەیەکی کەم زانیم کە سەرکردەی عیراق هەوڵی ڕاستەقینە دەدات لەپێناوی دامەزراندنی پەیوەندی هاوڕێیانە لەگەڵ شای ئێران.

بەشێك لەودانیشتنانە پەیوەست بوون بەخواستەکانی ئێرانەوە، کە (سەدام) بەرامبەر بەوچالاکیانەی (ئیمام خومەینی) کە ڕۆژبەڕۆژ زیادی دەکرد ڕێگری بکات. لەهەمان ئەو هەفتەیەدا کە لەودانیشتنانە ئاگادار کرامەوە، یاریدە دەرێکی سەرەکی خۆم بەپەیامێکی زارەکیو تایبەتە بۆ بەغداد، بۆلای (سەدام حوسەین) ڕەوانە کرد.

پەیامەکە بەمجۆرە بوو: (سەبارەت بەو پیاوە (ئیمام خومەینی) ئاگاداربە. هیچ شتێك لەدارستانێکی گڕ گرتوو سامناکتر نییە، چونکە (با) یاری پێدەکاتو، ئاگرەکەی دەتوانێت بگاتە سنورو شەقامەکانیش-

تەنانەت تخوبەھزرییەکانو دارستانی دراوسێکانیش بگرێتەوە.) ئەو ئاگادارکردنەوانەو، هەڵبەتە ئەو شتانەشی (سەعدون شاکر) لەنزیکەوە لەوڵاتەکەیدا بینیوونی، بەهیچ جۆرێك کاری لەوگوێیە کەڕانە نەدەکرد. کاتێك دوو ڕۆژ دوای ئەوە وەڵامەکەم لەنامەیەکدا گەیشتەوە پاریس، نوسیبووی: (بەڕێز بەڕێوەبەری گشتی! ئێوە خۆشحاڵ دەبن گەر تێبگەن کەبڕیاری کۆتایی لەلایەن عیراقیەکانەوە بۆ دەرکردنی (ئیمام خومەینی) لەناو عێراق دراوە)

ڕۆژانێك (ئیمام خومەینی) لەلایەن کەسانێکەوە کە دەسەڵاتداربوون لەعیراقدا هەڕەشەی لێکرا. ئەوجۆرە هەڕەشە کردنە خودی (سەدام) بوو. بەهەرحاڵ لەوڕۆژانەدا (سەدام) دەیتوانی چەندین جار بڕیاری سیاسی دیاریکراو بدات، کە لەڕاستیدا بەباشترین شێوە لەسوودی خودی ئەو بوون؛ بەهەمان شێوەی کە ئەمڕۆ (ئەسەد) هاندەدرێت بۆ ئەو جۆرە کارانە.

بۆنمونە، بڕیاری پشتگیری نەکردنی تیرۆریستان یەکێك بوو لەوانە. باوەڕ ناکەم هەتا ئێستا لەسەر ئەو بڕیارە جێگیر بووبێت، چونکە دوو ساڵ دوای ئەوە عیراقی (سەدام حوسەین)و ئێران کەوتنە جەنگەوە. لەودەمەدا بوو کە بڕیاری چەندین ساڵی پێش (سەدام) سەبارەت بەپەسەندی ئەو تێزە هەستیارەمانو دۆزینەوەی ڕێگای نوێ بۆ تازەکردنەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ هاوڕێ خۆرئاواییەکانی گەیشتە ئەنجام.

چەكو جبەخانەکانی خۆرئاوا تاکە دەستکەوتی (سەدام حوسەین) بوون، کە لەبەرامبەر شەپۆلی هێرشە زەمینیەکانی ئێراندا دەوەستان. لەماوەی ئەو جەنگەدا بواری ئەوەم بۆ ڕەخسا کە گەواهی باشترین جۆری ئامادەکاری سوپایی بم. بۆ دیدەنی (سەدام حوسەین) بۆ کۆشکی سەرکۆمار لەبەغداد چووم. پرسیاری کرد: (لەوماوەیەی کە لەوڵاتەکەی ئێمەدایت حەزدەکەیت چی ببینیت؟ ئایا حەزدەکەیت بەرەکانی شەڕ

ببینیت؟) وەلامم دایەوە: (بەڕێز سەرکۆمار، بەڕاستی دەبێت بڵێم کە زۆرم لەوشتانە دیوە.) ئەوەش ئاماژە بوو بۆ ئەو دیدارە چەندین بارانەی کە کەسایەتیە سوپاییەکانمان سەردانی بەرەکانی شەڕی دژ بەئێرانیان کردبوو. لەدرێژەی قسەکانمدا وتم: (بەلام گەرگرفت نابێت یەك شت هەیە. لەخۆرئاوا سەبارەت بەئێرانیە دەستگیر کراوەکانی ناو ئۆردوگاکانی دیلیی جەنگ قسە دەکرێت.) (سەدام) بەپەلە ڕووی لەیەکێك لەیاریدەدەرەکانی کردو وتی: (کەی دەتەوێت بچیتە ئەوێ؟) وتم: ( سبەینێ بەیانی ). هەربەوجۆرە کارەکەشم کرد. یەکێك لەلێکۆڵیارانی خۆمانم لەگەڵ خۆم برد. دەمزانی کە زرنگی ئەوانە بەکەڵك دێت. بەلام ئامادەیم بەرامبەر بەوەی کە دەمبینی نەبوو. لەکامپەکانی جەنگ کەسانێکم بینی کە ئامادەییان تێدابوو بۆ ئەوشتەی کە بڕوایان پێی هەبوو بمرن. ئەو دیمەنە بانگەوازبوو بۆ جەنگی چوارەمی جیهانی، کە ئێمە خوێندنەوەیەکی نادیارمان لەسەرڕووی لاپەڕەکانی هەیە. بیرکردنەوەی مەزهەبیانەی ئەم جۆرە کەسانە بۆ مۆڵدانیان بۆ ئەو کارانەی کە جێگای بڕوا نەبوون، شیاو بوو.

بەشی نۆیەم:

## ناوچە مین ڕێژکراوەکان لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست

لەماوەی هەزاران ساڵدا جیاوازی نێوان شیعەو سونی بەئەندازەی ململانێی نێوان کاتۆلیكو پرۆتستانتەکان لە (ئولستر)، مەسیحیو موسڵمانەکان لە (بەیروت)، عەرەبو جووەکان لە (ئیسرائیل) تاڵو جودا خوازانە بووە.

خراپترینی ئەم ململانێ دێرینەیە شەڕی نێوان عێراقو ئێران بوو، کە قوربانی زۆری لەگەڵ خۆی هێناو، کاتێك ڕوویدا کە (ئیمام خومەینی) لەساڵی (١٩٧٩) جڵەوی دەسەتەڵاتی لەئێران گرتە دەست. لەعیراقدا (سەدام حوسەین) وەك هەموو سەرکردەکانی پێش خۆی کەسێکی مەزهەب سونییە.

گەرچی زۆربەی دانیشتوانی ئەم وڵاتە شیعە مەزهەبن، کەچی دەستەڵاتی سونی مەزهەبەکان بەسەر دەوڵەتدا وایکردووە وڵاتە کە وەك بنکەیەکی موسڵمان نشینی ناشیعەیی دەرکەوێت. ئەگەر کودەتایەك لەعیراقدا دەوڵەتێکی شیعە مەزهەب بهێنێتە سەرحوکم، ئەو کاتە ئیمپراتۆریەتی شیعەگەری لەپاکستانەوە تا عێراقو لوبنانو کەناری دەریای ناوەڕاست درێژ دەبێتەوە. دەتوانرێت بەئاسانی تێبینی ئەوە بکرێت کەبوونی عیراقێکی شیعە مەزهەب، بەچاوپۆشی لەمیسرو عەرەبستانی سعودی، دەبێتە مەترسییەکی گەورە بۆ تورکیاو زۆربەی ئەندامانی خۆرهەڵاتی ناتۆ.

عیراقێکی شیعەیی، جگە لەوەی لەلایەن ئێرانەوە پارێزگاری دەکرێ، ئەگەری ئەوە هەیە کە پێکهاتەی سەربازی بە ئامێرە جەنگیەکەیەوە لەگەڵ مەزهەبە جیاوازەکانی تریان پێکەوە ببنە زلهێزێکی شیعەگەری لەناوچەکەدا. لەڕووی جیۆگرافیاوە دەبێتە خەنجەرێکی زەهراوی کە بەچوار ئاڕاستەیدا بەسنگی دراوسێکانیدا ڕۆدەچێت، واتە عەرەبستانی سعودی مەزهەب سونیو نیمچەدوورگەی عەرەبی لەئاڕاستەی ڕۆژهەڵاتو خواروو، تورکیا لەباکوریو ئیسرائیلو میسر لەخۆرئاوا لەئارامیدا نابن.

کرۆکی ململانێی ئەمڕۆی نێوان (باکور- باشور) لەهەمان یەکەم ڕۆژی دەستەڵات بەدەستەوەگرتنی شیعەکانەوە سەریهەڵداوە. گەردەلولی ئەم

جەنگانە لەهەزاران ساڵ لەمەو بەرەوە لەبیابانەکانی عیراق و سوریاوە هەڵیکردووە؛ واتە لەوکاتەوەی کە(سەلاحەدین) یەکەم جیهادی خۆی ڕاگەیاند. لەئێران، جەنگاوەرە موسڵمانەکان خۆبەباشتر دەرخستنی (سەدام)یان تێکشکاند، تۆوی مەزهەب گەرییان لەئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتیەوە تا دەروازەی وڵاتانی سەردەریای ناوەڕاست چاند. ئەمڕۆ ئێران نیشتمانی کەسانێکە کە هێشتا چاوەڕێی هاتنی ئیمامی دوازدەیەمینن و، هێشتا بەتوندترین شێواز بەرگری لەناوی (علی) دەکەن. ئێران یەکێکە لەزلهێزەکانی (باشور)، کەخاوەنی یەدەگێکی نەوتی زەوەندە لەقەڵەم ڕەوێکی فراوانی پڕ لەدانیشتواندا. ئیمپراتۆریەتێك بووە کە هەزاران ساڵ وەك تاکە دەستەڵاتی ناوچەکە ناسراوبوو، کەسایەی لەرزی دەخستە دڵی هاوسێ عەرەبەکانی و، سەرەڕای ئەوەشی کەپیایاندا هەڵدەدا لەناو ئەو دراوسێیانەدا ترس و ئیرەیی دەچاند. لەیەکەمین دیدارم بۆ ناوچەکە هەستم بەوەکرد کە هێشتا عەرەبەکان چەندە لەفارسەکان دەترسن، لەکاتێکدا ئەوانە تەنها موسڵمانن و هیچ ڕیشەیەکی نەتەوەی عەرەبیان نییە. دراوسێ عەرەبەکان لەدەستەڵات و دەست ڕۆیشتووی ئێران بەسەرکردایەتی (شا) دوچاری هەراس ببوون، تەنانەت لەسەردەمی (ئیمام خومەینی)شدا ئەم ترسە چەند بارەبووە. لەڕاستیدا ئەم ترسە بەرئەنجامی دەست ڕۆیشتوویی جیۆگرافییە، کە ئەویش لەسزای پیاوە ئاینیەکانی ئێرانەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەوانە کەسانی (سەرسەختی) خۆرهەڵاتی ناوەڕاستن، کاتێك دەبنە خاوەنی هەستی مەزهەبی دوو هێند سامناکتر دەبن. ئێستا شارەزابوون لێیان و لێکۆڵینەوە لەسەریان و شەڕکردنیان لەسەر ئاستی جیاواز لەهەرکات و ساتێکی تر گرنگترە.

بەپێی هەموو ئەو بەڵگانە لەدەمی ئێستادا ئێرانیەکان چەند هێند ترسناکترن. شیعە ئێرانیەکان بەباشی بۆ جەنگ، کە هەمیشە بەشێکی دانەبڕاوی مێژوو، فەرهەنگ و مەزهەبەکەیان بووە، ئامادە کراون.

(شا) مەترسییەکانی کۆمەڵگایەکی مەزهەبی دەناسیو دەرکی پێکردبوو، بەلایەنی کەمەوە تواناکانی خۆی بۆ کۆنترۆڵکردنیان لەرێگای هەنگاوە بێبەزەییەکانی (ساواك) وەگرتبووە بەر. یەکێك لەرووداوە تراژیدیەکانی لەسەردەمی (شا) لەئێراندا ڕوویدا ئەمە بوو کەئەم فەرمانڕەوایەی خاوەنی دەسەڵاتێکی ئاشکرابوو هەرگیز خوێندنەوەیەکی دروستی بۆ ئەو سەرچاوانەی لەحاڵەتی پراکتیك کردندا دەیتوانی بیانخاتە خزمەتی خۆیەوە نەبوو. (شا)ی ئێران چەندین جار ئەوەی ڕادەگەیاند کە خواستەکانی خەڵکی ئێران بۆ وەستاندنی هەوڵەکانی لەپێناو مۆدێرنیزەکردنی وڵات پشتگوێ دەخات. گوندییەکانی گۆشەو کەنارەکانی وڵات، گەر لەبازرگانانی چینی ناوەندیش بووبن، هەرگیز لەکۆکردنەوەی ساماندا بەیەك لەسەدی ئەو کاسەلێسانە نەدەگەیشتن کەخۆیان لە دەرباری (شا) نزیك دەکردەوە. ئێمە لەدەزگای جاسوسی فەرەنسادا دوو ئامانجی سەرەکیمان لەم بەشەی جیهاندا هەبوو: یەکەم، ناسینێکی دروستی ئەو هێزانەی کە لەئێراندا خاوەنی دەسەڵاتنو ،بەهۆیانەوە بەبێ بەکارهێنانیان دزەبکرێتە ناویانەوە. ئەم فراوانی ئاگاییو توانایەمان بۆ بەڕیوەبردنی ڕووداوەکانی ناوچەکە بۆ ئێمە گرنگی بنەڕەتی هەیە، ئەوەش بەهۆی شوێنگەی ستراتیژی ئێرانو، ئەو یەدەگە پەترۆڵییەی بۆ فەرەنساو خۆرئاوا زۆر پێویست دەبێت.

هاوکاریکردنمان بۆ ئێران بۆ کاری جاسوسی زیاتری خۆمان پێویستە، چونکە ئێران سنورێکی هاوبەشی هەزارو دوو سەد کیلۆمەتری لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت هەیەو، سێ سەدو پەنجاش لەگەڵ ئەفغانستان؛ لەپێگەیەکدایە کە دیمەنێکی واقیعی تایبەت بەتاك لەسەرانسەری بەشی خوارووی سنوری ڕوسیا دەخاتە ڕوو. دووەمین ئامانجمان لەهێشتنەوەی ئێران لەپاڵ خۆماندا ئەمەیە کە هەردوولایەن خاوەنی پێگەی ستراتیژیو نائارامینو کە لەخراپترین حاڵدا بێلایەنو لەباشترینیدا لەبەرەی باکوری جەنگی چوارەمی جیهانیدا بوون، کە لەوسەردەمەدا تەنها وێنایەکی لێڵیان لەئاسۆ دوورەکانی سیاسیاندا مایەی بینین بوو. ئەم هزرە کاتێك بڵاو بۆوە بوو بەهیوایەکی

پوچەڵ کەئێران هەمیشە وەك وڵاتێکی (باشوور)ی دەمێنێتەوە، کە بیرکردنەوەی هەتا ئەمڕۆش ئاڵوگۆڕێکی کەمی بەسەردا هاتووە. گەرچی (شا)ی ئێران (محمد ڕەزا پەهلەوی) سەرکردەیەك بوو کەپشتگیری زۆری خۆرئاواو باکوری دەکرد، مەبەستمان لەدۆستایەتیکردن و پارێزگاریکردنی حوکمەکەی تەنها بۆ بەرگریکردن بوو لەو ڕووداوانەی کە لەپاش ئەو خۆلێلادانیان ئاستەم بوو. لەیەکەمین ڕۆژەکانی فەرمانڕەوایەتی (شا)وە، مەستمان بەئاماژەیەکی نائارامی زۆر دەکرد. ساڵەکانی پێش یەکەم دیدارم لەگەڵ (شا)، ئەفسەرێکی پلە بەرزی هێزی دەریایی فەرەنسا بۆ ئاشنا کردنی (شا) بەپێشکەوتنە تەکنیکیەکان لەلایەن دەربارەوە پێشوازی لێکرا. لەگەڵ چوونی ئەفسەرە دەریاییەکە بۆ ناو کۆشکی سەڵتەنەتی کارەساتێکی تازە ڕووداو سەرنجی ڕاکێشابوو.

پێش ئەو ڕۆژە هەوڵێك بۆ تیرۆرکردنی (شا)ی لاو ئەنجام درابوو، یەکێك لەپاسەوانەکانی کۆشك تەقەی لە(شا) کردبوو، کە پاش ئەوە ببوە شەڕە تەقەیەکی زۆر، کاتێك بەرەو ژووری چاوپێکەوتنەکە ڕۆشتبوو بەسەر وردە شوشەی شکاوی پاشماوەی شەڕەکەدا، کە هێشتا پاك نەکرابۆوە، تێپەڕیوە. دیوارەکان بەخوێنی ئەو هەوڵە سەرنەکەوتوانەیە لەکەداربیوون و، بەوجۆرە (شا) توانیبووی ژیانی خۆی بکڕێتەوە. شا لەکۆتاییدا ئەوەی بۆ میوانەکەی ڕوونکردبۆوە کە کارێکی لەوجۆرە هەرگیز نائاسایی نییە. بەهەرحاڵ ئەم جۆرە هەوڵانە لەگەڵ هەموو ئەو جەنجاڵییەی دەینێتەوە ناتوانن ئەوە بەفەرمانڕەوای ئەودەمە تێبگەینن کە چەند لەلایەن خەڵکەوە نەفرەت لێکراوە. (شا) زۆرجار بەپێودانگێکی هەڵە لەگەڵ باوکی پێوانە دەکرا. ئەو کە ئەفسەرێکی جەنگاوەری دێرین بوو، پلەدارێکی سوارەو شەڕکەرێکی ئامادەبوو، کە بەدرێژایی جەنگی یەکەمی جیهانی شانبەشانی بەریتانیا لەشەڕدابوو. لەکاتی یەکەم دیدارمدا پێشوازکارێکی دەربار کەهەردوو کیانی دەناسی بەچرپەوە بەگوێمدا چپاندی: ( ئەو بوێرییەت نەبوو درۆ لەگەڵ باوکی بکەیت، ئێستا ناوێریت ڕاستی بەکوڕەکەی بڵێت.)

ئەمە ئاماژەیەکی ئەوەندە زیرەکانە نەبوو کەئەو پەیامنێرە هەمیشەو هەمیشە لەکار، شێوازو ژیانیدا پراکتیکی دەکرد؛ چونکە پەیام پێش ئەوەی کاتی بەسەربچێت دەبێت ڕاستەوخۆو دەمودەست ڕەوانە بکرێت. بەدبەختانە ئەوجۆرە خاسیەتانە بەشێکی تایبەتمەندی زیاتری ئەو وڵاتانەن کە نائارامیان تەنها لەکاتی جێنشینی یان هەوڵدان بۆ جێگرتنەوە لەلایەن میراتگرێکی لاوازو زۆر شارستانیەوە لەجێگای پاشایەکی بەتوانا سەرهەڵدەدەن. بەدرێژایی دەیەی سالّی حەفتاکان، کە (عقید ئالّ) سەرکردایەتی بنکەی لەئێران لەئەستۆبوو، فەرەنسا یەکەم دەزگای جاسوسی خۆرئاوایی بوو کە دەستی دایە لێکۆڵینەوەیەکی فروان سەبارەت بەوئاژاوەیەی لەناو کۆمەڵی شیعە لەئێران سەری هەڵدابوو.

لەهەمان سەروکاری سالّی (١٩٧٢)دا، زانیاری دەربارەی جۆشوخرۆشی نێو ڕەگەزە مەزهەبیەکان دەگەیشتە ئۆفیسەکەم. تۆڕی (کۆکردنەوەی بەلگەنامەو دژە سیخوڕی) فەڕەنسا زانیاری پێدایـن، کەنیشانەی (ناڕەزایەتی.. ئاماژەی لەفەرمان دەرچوونی ڕۆحانیەکان)ی دەبەخشی. ئێمە دووبارە ئەو زانیارییانەی کە باسیان لەناڕەزایەتی دەکرد بۆ (شا)مان دەناردەوە. لەماوەی زنجیرە دیدارەکان لەگەڵ (شا) ئەوەی ئاشکرا کرد کەمتمانەی بەمنە؛ چونکە ئەو نیگەرانیانەی کە کەسانی دی لێیان دەشاردەوە پێم ڕادەگەیاند. بۆ پاراستنی سیستمی (شا) گومانی تێدانەبوو، کە دەبوو لەوشتانەی لەڕوودانبوون ئاگادار بکرێتەوە. ئیتر ئەو بەپێی ئەو زانیاریانە دەست بداتە جموجۆڵ یان نا، ئەوە بابەتێکی تەواو جودابوو. جارێکیان، کاتێك ئێمە لەژووری خوێندنەوەکەی دانیشتین، بەمنی وت: (تۆ تاکە کەسێکی کە ئەم زانیارییانەم پێدە دەیت؛ ئەوانی دی پێچەوانەی ئەوانە دەڵێن.) وەلامم دایەوە: (ئەگەر خاوەن شکۆ مۆڵەت بدات ئەو بابەتانەی کەس نایان بیستێت، بەلام هەواڵی ڕاستەقینەن، پێشکەشی جەنابتانی دەکەم)

لەهەموو سەردەمی دژایەتیکردنی فەرمانڕەوایەتی (شا)دا، ئەوم لەنائارامیەکانی بازاڕ، نێو ڕۆحانیەکانو گوندە دووردەستەکانو تەنانەت ناو دڵی پایتەختیش ئاگادار دەکردەوە. ئەو هەواڵانەی لەلایەن سەرچاوەکانمانەوە دەگەیشتن باسیان لەو وردە کاریانەی ئاکامی چەند هەنگاوێکی بچوك بوون دەکرد، کە بەئاشکرا بەلاوەنانو پشتگوێ خستنی خەڵکی ئاین پەروەرو ڕۆحانیەکانی ئێرانی بەرامبەر بەحکومەت لەوپەیوەندییاندا دەردەخست. چەندین ساڵ لەوەوپێش لەوهەنگاوەدا کە (شا)بە (کودەتای سپی) ناوی دەبرد، ملیۆنەها هکتار زەوی بەسەر جوتیاراندا دابەشکرابوو.(شا) لەڕوانگە خۆرئاواییو هەستی گەرموگوڕەیەوە بۆ دەربازکردنی یەکجارەکی وڵاتەکەی لەسەدەی نوزدەوەو پەڕاندنەوی بۆ سەدەی بیستەم لەلێکدانەوەی ئەو خەمڵاندنەی دەربارەی پێشخستنی وڵاتەکەی بەرەو ئایندە هەیبوو، کە لەداهاتوو نەبینین خراپترببوو هەڵەی کردبوو. چەندین جار سەبارەت بەزیادەڕۆییەکانی دەربارو ڕژێمەکەیان ئاگادریم دەدانێ. خراپ سوود وەرگرتنیان لەسامانو شوێنەکانیان، خۆلادانیان لەپشتگیری تەنانەت سەر زارەکیانەی بیروباوەڕە مەزهەبیەکانی زۆربەی خەڵکی، شکست هێنانیان لەبنەبڕکردنی هەژاری کە سەرانسەری وڵاتی تەنیبوو لەوجۆرە ئاگادار کردنەوانە بوون. بەگشتی لەکاتی قسەکردن لەگەڵیدا بەمجۆرە دەستم پێکرد: (ئایا خاوەن شکۆ لەوباوەڕەدایە کە ئەو سامانەی لەبەرهەمە پەترۆلیەکان بەدەست دێت بەهەمان شێوەی کە پێویستە دابەش دەکرێت؟)

وەك پەسندکرنی ئەم ڕەخنەیە، کە لەزاری هیچ کام لەوانەی دەوروبەرییەوە نەیبیستبوو، سەری دەلەقاندو، هەڵبەتە هەرگیز لەم بوارەدا هەلی بۆ نەڕەخسا.

هەوڵمان دەدا بەهۆی تۆڕە سیخوڕەکانەوە تا ئەوپەڕی توانا دزە بکەینە ناو هزرو مێشکی ئەوانەی لەناو ئێراندا بەدوژمنی خۆمان دەزانین. بەدرێژایی ئەو خولە چووینە ناو (گەمەکانی جەنگەوە) کە ئێرانیش تیایدا بەشداربوو.

سەرۆکی بنکەکەمان لە(تاران) بۆ (پاریس) بانگهێشت دەکردەوە، بەرپرسە سیخوڕییەکانمان لە ئێران و خۆرهەلاتی ناوەڕاست و پسپۆڕی ئۆپەراسیۆنەکانمان لەوشوێنانە، لەئۆفیسەکەی خۆمدا کۆدەبوونەوە، ڕووم تێدەکردن و دەمووت: (باشە، دەمانەوێت بیرێك لەپرسی ئێران بکەینەوە.) هەڵدەستام و لەژوورەکەمدا پیاسەم دەکرد. پاشان دەمووت: (بەڕێزان.. هێندەی نەماوە بۆ کۆتایی سەدەی بیستەم، بەلام واگریمانە دەکەین کە ئێمە ئەوروپی یان فەرەنسیەکانی سەدەی یازدەین، ئێمە کەسانی سەردەمی خاچپەرستەکانین، باشە چۆن سەبارەت بەم سەدەیە کاردانەوە پیشان دەدەین؟ ئەگەر ڕۆحانیەکی موسڵمان بین و خاوەنی هزری ئەوان بین چۆن بیردەکەینەوە؟) بەرەو یاریدەدەرە فارسی زانەکەم ڕۆشتم و وتم: (ئێوە خاوەنی نەشەقام و نە هەلیکۆپتەرن، پەیکێك دێت و هەواڵ دەهێنێت کە یەکەمین لەشکری بەغدای کۆن هاتۆتە ناو قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆرەوە، ئێوە چی دەکەن؟) لەگەڵ بوونی تۆڕی سیخوڕی فراوانمان لەناو مزگەوتەکانی ئێران، لەبەدەستهێنانی وەلامی پڕ بەدڵدا هەرگیز سەرکەوتوو نەبووین. لەحاڵەتێکدا کەتوانا جاسوسیەکانی خۆمان گەشە پێدەدا، هاوشانە ئەمریکیەکانیشمان بەهۆی هەزاران سەرچاوەوە، کەزۆربەیان ڕاستەوخۆ بۆ (CIA) کاریان دەکرد، ئێرانیان خستبووە ژێر ویستی خۆیانەوە. هەندێك لەوان بێگومان بەهۆی پەیوەندییە شیاوەکانیانەوە لەگەڵ سەنتەرە گرنگەکانی دەسەلات لەو وڵاتەدا، لەوئەنجومەنانەی وەك هاوشانە فەرەنسەکانیان بووکاریان دەکرد. بەلام ئاگادارکردنەوەکانیان بۆ دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ ئەنجومەنەکانی دەستەلات لەواشنتن، جێگایەکی کەهەر حوکمەتێکی پاش حکومەتێکی دی جەخت لەسەر دابەشبوونی جیهان بۆ دوو بلۆکی دۆستان و دوژمنان دەکەنەوە، بەتەواوەتی شایستە نییە؛ لەوشوێنانەی کە هاوەڵە ئەمریکیەکان بوونیان هەیە ئاماژەیە کە بۆئەوەی کە هیچ شتێکی نەشیاو لەئارادا نییە. بەمپێیە، ئێران نمونەیەکی دی بوو کە ئەمریکیەکان لەناسینی ئەو هێزانەی لە کرۆکیداو لەناو

جیهانی باشوردا لەکولاندابوون، دوچاری شکست بوو. ئەوانە جۆرە هێزێك بوون کە بنەمای شکستە ئابڕو بەرەکانی ئەم دواییانەی جەنگی چوارەمی جیهانیان پێك دەهێنا، کە لەگەڵ مەرگو ئاژاوە هاوەڵ بوون.
بەلام ئاگادار کەرەوەکان ئاماژەی تەواو ئاشکرابوون، کە هەڵبەتە لەلایەن هەمووومانەوە، هەریەك لەجێگای خۆیەوە، نادیدە دەگیران. چ ئەمریکیەکانو چ فەرەنسیەکان، لەواقیعدا ئەوانەی لەخۆرئاوا ئێرانیان بەدۆستێکی بەهێزو جێی متمانە دەزانن ئەو بابەتەی سەرەوەیان بەشتێکی ناهەند دادەنا. ئامادە نەبووین هەر زانیارییەکی، کە ئەم بنکە گشتییە جیوگرافی-سیاسیە بدات بەیەکدا پەسند بکەین.
ئەفسانەی (ساواك)یش، ئەم دەزگا نهێنیو تۆقێنەرەی ئێران- کە لەوباوەڕەدا بووین هەموو بارودۆخی ئێرانی لەژێر کۆنتۆڵدایە- لەسوود وەرگرتن لەشرۆڤە کاریەکانماندا دو چاری شکست هات، چونکە کاتێك گەیشتنی شرۆڤەکاریەکانمان بۆ ئێران نۆرەی هات، بۆ گەورەترین ڕسوایی جاسوسیانەی سەدەی بیستەم گۆڕا.
(ساواك) پێشتر دەزگایەکی پۆلیسی بوو تا یەکەیەکی ئۆپەراسیۆنی- زانیاری، لەوێنەی هاوشێوەکانی کە لەولاتانی (باشور)دا، جێگایەکی کە دەستەلاتدارانیان زیاتر مەیلی سەرکوتکردنو هەڕەشە بازییان هەیە تا کۆکردنەوەی زانیاری خاو. بەزوویی بازنەیەکی گرنگی ونبووی ناو زنجیرەی دەزگای جاسوسی ئێران سەرنجی ڕاکێشام. گرنگ نەبوو کە زانیارییە کۆکراوەکانی ئێمە لەگەڵ سەرچاوەکانی دیدا تا چەند ڕاستە، شرۆڤەکارییەکان لەریشەدا کەموکورت دەبوون. ئەم شرۆڤانە بەفلتەری مێشکی خۆرئاواییەکاندا گوزەری دەکردو پاشان دەدرایە (شا)، کە لەئەوروپا خوێندبوویو مانای فەرهەنگو شێوازو لەسەرووی هەموویەوە سیاسەتەکانی خۆی لەبۆتەی خۆرئاوادا دەبینیەوە.
ئەو (شا) کەسانێکی بۆکاری ڕاوێژکاریو ئەمینداری هەڵدەبژارد کە وەك خۆی پەروەردە کرابوونو بیریان دەکردەوە. کاتێك شۆڕشو نائارامی

سەرەتا لەبازاڕو مزگەوتەکانەوە دەستی پێکرد، ئەگەر (شا) وەك خۆرهەڵاتیەك کاردانەوەی بنواندایە دەبوو بێ دوودڵی تێکی بشکاندنایە، یان بەئامێزێکی کراوەوە باوەشی بۆ بکردنایەتەوەو میهرەبانانە چارەسەری بکردایە. بەڵام ئەو دوودڵی نواندو بەوهۆیەشەوە خۆی لەدەستدا. لەمیانەی فەرمانەکانی خۆماندا برێکی زیاتر زانیاریمان لەسەر ناڕەزایەتیەکانی ناو ئیمپراتۆریەتەکەی دەدایە (شا)، سەرەڕای ئەوەش، لەگەڵ ئەوەی توانستێکی دیاریکراومان سەبارەت بەناچارکردنی یان سەلماندنی دیدەکانمان هەبوو، کۆمەکمان پێدەکرد، تا ڕقی سروشتیو فروانی خەڵکی بەرامبەر بەدەستەڵاتەکەیو تەنانەت خۆشی خامۆش بکاتەوە.

(شا) لەکاتی یەکێك لەچاوپێکەوتنەکانمدا بەجۆرێکی خەفتبارانە پرسیاری لێمکرد: (چ کارێکم هەڵەیە؟). بێ پەردەوە لامم دایەوە: (خاوەن شکۆ، وێنەت لەبەردیدەی خەڵکیدا زۆر تۆقێنەرە. زۆربەی خەڵکی پشتگیریت ناکەن، بەڵام باشە، پسپۆڕانێك هەن کە دەتوانن ئەو هەلومەرجە بگۆڕنو نوێی بکەنەوە. هەمان ئەو کەسانەی کە ئۆتۆمبیلو خۆراکی بەستوو جگەرە دەفرۆشن دەتوانن وێنەکەت لەبەردەم خەڵکیدا چاك بکەنەوە)

ڕۆڵی وێنەسازی بەوڕادەیەی لە (باشور)دا گرنگە لەدونیای (باکور)یشدا ئەو گرنگییەی هەیە، بەڵام زۆرجار نادیدە دەگیرێتو تەنانەت بەدەگمەنیش دەرکی پێدەکرێت.

(شا) پرسی: (بۆ ئەم کارە چ کەسێك لەجیهاندا باشترینە؟) وتم: (دەیڤید ئۆگلڤی، بلیمەتێکی ڕاگەیاندنو هاوڕێیەکی خۆشەویستی من.)

(شا) داوای کرد: (باشە، بیهێنە بۆ لام)

پاش چەند هەفتەیەك لەگەڵ (ئۆگلیڤی) گەڕامەوە. ڕاستەوخۆو بێ دواکەوتن چوونە ئۆفیسە تایبەتەکەی (شا)وە. پاش یەکتر ناسین، ڕاستەوخۆ بەرەو (ئۆگلیڤی) ڕۆشتو چووە سەربابەتەکە: (ئەو هەواڵەی پێمان گەیشتووە باس لەوە دەکات لەپیشەکەتدا بێ نمونەی. شتێکم پێ بڵێ، ئایا حەز دەکەیت گەشتێك بەناو ئێراندا بکەیتو پاشان بگەڕێیتەوە لای من؟)

(ئۆگلیڤی) پەسەندی کرد. چەند کەسێکم لەکارمەندەکانمان لەتاران خستنە دوای بۆ ئەوەی هاوەڵی بکەن، تا (شا) بەجۆرێکی لێبڕاوانە پیشانی (ئۆگلیڤی) بدات کە ئەم کرمە تا چ ڕادەیەك خۆی خزاندۆتە ناو سێوی وڵاتەکەیەوە.

(ئۆگلیڤی) گەڕایەوە بۆ ڤێلاکەی خۆی لە (دوردونیژ) لەسەنتەری (پاریس)و پێشنیازێکی ئامادە کرد، کە لەوەودوا پیشانی (شا)درا. بەڵام دەربارییەکان کە دەیانبینی هەر هەنگاوێك لەدەرەوەی چوارچێوەی دەستەڵاتەکەیان، هاوسەنگی شایستەیی دەستەڵاتیان کە بەڕەنجێکی لێبڕاوانە بۆ پاراستنی شوێنگەکەیان دایانڕشتووە تێکوپێك دەدات، بەتوندی دژی دەوەستانەوە.

پێشنیازەکانی (ئۆگلیڤی) هەرگیز جێبەجێ نەکرا. لەهەموو چاوپێکەوتنێکدا هەوڵم دەدا (شا) لەبەردەم دوژمنە ناوخۆییو دەرەکیەکانیدا بپارێزم. هەموجارێك کە چەندین ڕێگری دەربارەی ئەوانەی دەردەسەرییان دروست دەکرد دەهاتە ئاراوە، دووبارە بەهەمان شێوەو شێوازەوە ڕاستگۆیانە ڕووبەڕووی دەبوومەوە. دەرئەنجام لەزۆرلای ئەستێڵەکەوە کونی لەژمارە نەهاتوو دەرکەوتن. (شا)م لەخاڵێك ئاگادار کردەوە:

سەبارەت بەحکومەتی (کارتەر) هوشیاربە، سەرکۆمار (کارتەر) بڕیاری داوە جێگۆڕکێت پێ بکات)

ئەو هەواڵەی بەدەستمان گەیشتبوو، دوابەدوای سەردانەکەی (کارتەر) لەیەکەمین وەرزی ساڵی نوێی (١٩٧٨) درابوو، کاتێك (شا) هەموو ئاستەنگەکانی بەردەم دەربارییەکانی لادابوو، ئەوەش بواری بۆ (کارتەر) ڕەخساندبوو تا ببێتە گەواهی ئەو هەموو زیادە ڕۆییو تەخشانو پەخشانە لەسنور بەدەرەی دەربارییەکان. بەدووروودرێژی باسم لەئاگادار کردنەوەکان کرد، کە دەسەڵاتەکەی ڕوو لەناوچوونەو، ناوی ئەو کەسانەی کە کراوبوونە بەرپرسی لادانو جێنشینکردنیو، کاتوساتی کۆبوونەوەیەکی کە لەگەڵ پایە

بەرزانی دەزگای جاسوسی ئەمریکا ئەنجامم دابوو پێم داو، سەبارەت بەبابەتی چۆنیەتی ڕێکخستنی لادانی‌و ئەوەی کێ ببێتە جێنشینی گفتوگۆمان کرد.

(شا) بڕوای نەکرد، وتی: (لەوباوەڕەدام بەوجۆرە نییە کەتۆ باسی لێوە دەکەیت)

پرسیم: (بەڵام خاوەن شکۆ، بۆچی باوەڕ ناکەیت؟)

وتی: (چونکە گۆڕینی من گەمژەییەکی ڕووتە. من باشترین ئامڕازی بەرگریکردنم لەخۆرئاوا لەم بەشەی جیهاندا. باشترین سوپا، باشترین پێداویستی جاسوسی‌و سیخوڕیم هەیە. دەبمە پڕ هێزترین حکومەت لەوڵاتێکی سەقامگیردا. بەوجۆرە شتێکی لەوبابەتە زۆر فریو دەرانەیە، باوەڕناکەم.)

لەوەڵامدا وتم: (ئەی ئەگەر ئەمریکیەکان لەوە تێنەگەن.. چی؟)

(شا) بەماناوە خەندە گرتی‌و سەری ڕاوەشاند.

هەڵبەتە ئەمریکیە کورتبینەکان، کە گەمژەیی پەلەکردنیان لەسڕینەوەی (شا)دا ئەنجامدا، پێشبینی هاتنی (ئیمام خومەینی)یان بەبێ بوونی هیچ بنکەیەکی فراوان نەدەکرد. ئەم پرسە لەسەرەتای ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٧٨)، هاوکات لەگەڵ دەرکردنی (ئیمام خومەینی) لەلایەن عیراقەوە بەبێ هیچ پشت‌و پەنایەك ڕوویدا. لەوکاتەدابوو کە من فشارم لە(ژیسکاردستن) دەکرد تا یەکەم وڵات نەبێت پەنای دوژمنێکی سەرسەختی (شا) بدات‌و، پاشان چالاکیەکانی (ئیمام) کە(شا)ی لاواز دەکرد سنوردار بکات‌و، لەکۆتایشدا ڕێگای پێنەدات سەرکەوتوانە بگەڕێتەوە ئێران.

داواکارییەکانم چەندین جار لەلایەن (ژیسکاردستن)و ڕاوێژکارەکانیەوە بەنادیدە گیران، چونکە واهەستیان دەکرد کە دەبێت فەرەنسا لەئازادیدا سەرمەشق بێت‌و، پەنای هەرکەسێك بدات کە هەڵاتووی سیاسی بێت‌و لەمەترسیدایە. بۆ ئەو کەسانەشی کە بەڕاستی لەوباوەڕەدابوون دەتوانن ببنە جێنشینی (شا) پردێك دروست بکرێت. بەڵام (ژیسکاردستن)

لەمۆڵەتدانی بۆ ئەندازەی پەناهەندەیی هەڵەی کرد. (پاریس) لەمۆڵەتدانی (ئیمام خومەینی)و هەوادارانی لەچالاکی نواندندا لە(نۆفل شاتو)ی نزیک (پاریس)ەوە، نەزانانە ڕۆڵی گرنگی لەگەڕانەوەی سەرکەوتووانەی (ئیمام خومەینی) بۆ (تاران) گێڕا. فەرمانی چاودێریکردنی هەوادارانی (ئیمام خومەینی) خرایە ئەستۆی وەزارەتی ناوخۆ، کە ئەوانیش فرمانەکەیان خستبووە لیستی چەندەیەمینەوە. بەڵام لەلای ئێمە، پاش ئەوەی لەگەڵ ئەو کاسێتانەی دژی (شا) پڕدەکرانەوە ڕووبەڕوو بووینەوە، کە هەستێکی توندوتیژانەی بۆ (تاران) دەنارد، لەسەرەتای لیستەکەدا بوو. ئەو کاسێتانە بەئامۆژگاری، پاڕانەوەو ململانێ لەگەڵ (شا)و هەموو ئەوانەی کە لە(تاران) حکومەتیان دەکردو ئیسلامیان تێکدەدا، بەدەنگی دلێرو ورووژێنەری (ئیمام خومەینی) پڕ کرابوونەوە.

کاسێتەکان لە(پاریس) پڕ دەکرانەوە. هەزارانیان لەبەر دەگیرایەوەو بەناوسەرانسەری تۆڕێکی ئالۆز لەناوبازاڕو گەڕەکەکانی ئەسفەهان‌و شارەکانی دی‌و بۆ بچوکترین مزگەوت لەدوورترین گوند دەنێردران. لەکۆتایی ساڵی (١٩٧٨)دا، ئەم پێشکەوتنە نائاساییەم بۆ (ژیسکاردستن) کردە ڕاپۆرت‌و، داوام لێکرد (ئیمام خومەینی) بۆ وڵاتێکی دی دوور بخاتەوە. بەتایبەتی بۆیەکێك لەوچەندین وڵاتانەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست یان ئەفریقای سەروو، کە حەزیان بەدەم کوتکردنی چالاکیە مەزهەبیەکانی ئێران هەبوو؛ جێگایەك کەبتوانن بەڕاستی بیخەنە ژێر چاودێرییەوە یان بەجۆرێکی کاریگەرانە ڕکێفی بکەن.

ڕۆژی دوای ئەوە یەکێك لەیاریدەدەرە سەرەکیەکانم، (میشێل ڕۆسین)، کە دەموچاوی خەندەی لێدەباری بەپەلە خۆی کرد بەژوورەکەمداو، وتی: (بەڕێز بەڕێوەبەری گشتی، تۆ بردتەوە، بەیانی یان دووبەیانی ئاگاداری (ئیمام خومەینی) دەکرێت کە دەبێت فەڕەنسا بەجێبهێڵێت. بەئەدەبەوە، بەڵام بەدڵنیایشەوە پێی دەڵێن)

بەڵام بەداخەوە ئەو هەواڵەی ڕۆژی دوایی هێنرا ناکامانە بوو. بەیانی ئەو ڕۆژە دووبارە سەروسیمای (ڕوسین) لەبەردەگای ژوورەکەمدا قوت بۆوە؛ لەگەڵ ئەوەی کەسیمایەکی تەواو جیاواز تری لەوەی ڕۆژی پێشووتر هەبوو، بەدڵشکاوییەوە وتی: (بەڕێز بەڕێوەبەری گشتی، هەواڵی ئەمڕۆ وەکو ئەوەی دوێنێ نییە، ئەمڕۆ کۆشکی (ئەلیزێ) بۆنێکی دی لێدێت.) (ئیمام خومەینی) دەمایەوە. بڕیارمدا ددمودەست بچم بۆ (تاران) تا سەبارەت بەوبڕیارە ڕاستەوخۆ لەگەڵ (شا)دا گفتوگۆ بکەم. لەگەڵ ئەوەی سوار فڕۆکەکەم بووم زانیم کە (تاران) بەهۆی ئەو ڕوویەڕوو بوونەوە گەورەیەی لەفڕۆکەخانەی (مهرئاباد) لەدەرەوەی پایتەخت ڕوویداوە، نوقمی ئاگربووە.

هیچ کۆمەکێکی ئاسمانی لەئارادانەبوو، سوتەمەنی فڕۆکەش نەبوو. بۆیە بەناچاری گەشتێکی کورتمان کردو لە (لارناکا)ی قوبرس نیشتینەوە. کەسێکی یاریدەدەریشم لەگەڵ بوو، کەلاوێکی گەنجی ناسراوبوو، لەپرسەکانی ئێراندا شارەزا بوو.

بەیانی ئەو ڕۆژە زوو گەیشتینە تاران. لەتاوەری کۆنترۆڵەکەدا کەسی لێنەبوو، کەسانی چەکدار بێ بەرگی سوپایی ڕێگا سەرەکیەکانیان کۆنترۆڵ کردبوو. فەرمانم دا کە دەستەی خزمەتکارانی فڕۆکە کەهەرلەناو فڕۆکەکەدا بمێننەوە. چونکە پەیوەندی تەلەفۆنیم لەگەڵ یەکێك لەیاریدەدەرانی (شا) هەبوو ئۆتۆمبیلێك بۆ پێشوازیمان هات. زۆرمان پێچوو تا لەشەقامەکانی بەکەسانی نەیار تەنرابوو دەرچوین. لەئۆفیسێکی ناوکۆشکەکەدا، کەهەرگیز پێشتر نەم دیبوو چاوم بە(شا) کەوت. ژوورێکی بچوك بوو، کە ڕووناکییەکی کزی چرایەکی جوان بەسێبەرێکی فراوانەوە شکۆمەندییەکی لەبەردڵانی پێ بەخشیبوو. خانە خوێیەکەم چاویلکەیەکی تیرە گەورەی لەچاودابوو، کە نیوەی سیمای داپۆشیبوو. پێشتر هیچ کاتێك بەوچاویلکەیەوە نەمدیبوو. بۆ سەرسێ کورسی بەردەم مێزەکە پێشوازی لەمنو هاوەڵەکانم کرد. لەناوەڕاستی کورسیەکەدا ڕۆنیشتمو پێم وت: سەراسیمە بووم کەبیستم خودی خۆت داواکارییەکەمت لە (ژیسکاردستێن) بۆ دەرپەڕاندنی (ئیمام

خومەینی) لەفەرەنسا ڕەت کردۆتەوە. دەرپەڕاندنێك شیمانەی ئەوەی لێدەکرا بۆ وڵاتێك دووربخرێتەوە بەجۆرێکی کاریگەرانە کۆنترۆڵی بکەن یان بەلایەنی کەمەوە تۆڕی ڕاگەیاندنەکانی بشێوێنن. پاشان وتم: (خاوەن شکۆ، لەوانەیە بووبێتە قوربانی کەسانێکی دەوروبەرت؟ یان یەکێك لەوانەسەری لێشێواندبێت؟ یان شالیارەکەتان لەفەرەنسا ناچاری کردبێت؟)

وەڵامی دایەوە: (بەهیچ شێوەیەك، ئەمانە هەمووی لەسەر بڕیاری خودی خۆم بووە.)

بەدووچاوێکی کەخەریکبوون لەزەقبووندا دەردەپەڕین و بەسەرسوڕمان و حاڵەتێکی هوشیارییەوە چاوم تێبڕی. وتی: (ڕێگام بدەن هۆکارەکانی خۆمتان بۆ ڕوون بکەمەوە. ئەگەر ئێوە (ئیمام خومەینی) لە(فەرەنسا) بەدەربنێن دەچێتە (دیمەشق). (دیمەشق) بۆ ئێران زۆر نزیکە. بەپێی زانیارییەکانی لەبەردەستمدایە گەر نەچێتە (دیمەشق) دوایین ئامانجی (تەرابلوس)ی (لیبیا)یە، ئەمە خراپترە؛ چونکە پەیوەندییەکانم لەگەڵ فەرەنسادا باشە. داواتان لێدەکەم بۆ سەرکۆماری فەرەنسای ڕوون بکەنەوە، کە من لەناهەموارترین هەلومەرجدا حساب بۆ لایەنی هاوڕێیەتی ئەو دەکەم. بەتەواوی پێم باشە (ئایت الله.. ئیمام خومەینی) لەلای ئێوە بمێنێتەوە، شوێنێکی کە لەنزیکەوە لەژێر چاودێریدایە)

بیروڕای خودی خۆم بەمجۆرەیە، کە(شا) بەهۆی ئاشنایەتیەکی ڕووکەشانەی لەگەڵ کۆمەڵگای ئێمە ناسینێکی واقیعیانەی کەمی سەبارەت بەڕێچکەی ناوخۆیی دیمکراسی وڵاتانی باکور هەبوو، بەلایەنی کەمەوە لەوبابەتە هەستیارە سەبارەت بەدەرپەڕاندنی (ئایت الله..ئیمام خومەینی) لەودەمەدا، واتە کاتێك کە دەنگی بەجۆرێکی فراوان لەهەموو شوێنێکدا دەنگدانەوەی هەبوو، ئەوەش ئاماژەی ناشیی بوونی بوو.

سەرەڕای ئەوەش، لەموعجیزەی پەیوەندییە مۆدێرنەکان بێ ئاگابوو. گەڕاینەوە سەربابەتی ناوخۆی ئێران و باسم لەوەکرد کە لەکاتی هاتنمان

لەفڕۆکەخانەکەوە بۆ ئێرە ئاپۆڕەیەکی خەڵکی تووڕە لەسەرشەقامەکان شەپۆلیان دەدا.
(شا) وتی: (خەمت نەبێت (کانت)ی ئازیز! هەرگیز تەقە لە خەڵکی ناکەم.) چونکە بواری زۆر قسەکردن نەبوو بڕیارمدا بچمە سەرباسی ئەو گروپانەی کە لەسەرانسەری (تاران)دا هەراسیان بڵاو کردبۆوە، بەسادەیی وتم: (لەوحاڵەتەدا، خاوەن شکۆ زایە دەبیت.)
(شا) شانەکانی هەڵتەکاندو لەسەرکورسیەکەی هەستا. بەتەواوی ڕێزەوە تا بەردەرگاکە بەڕێیکردمو، بەنمایشێکی تایبەتەوە دەرگاکەی کردەوە، کە لەپڕێکدا چەپکێك ڕووناکی بەهێز لەدەرەوە خۆی کرد بەناو ئۆفیسە نیمچە تارکەکەدا. (شا) چاویلکەکەی داگرتو تەوقەی لەگەڵ کردم. پێش خودا حافیزی سەیریم کردو بۆ یەکەمجاری ئەو ساتە سیماییم لەڕووناکیدا بینی، سیمایەکی کە چەندین ساڵ بوو لەلام ئاشنابوو، بەڵام ئەوکاتە جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ ئەوەی چەند هەفتەی لەمەوبەر دیبووم هەبوو.
شێرپەنجەیەکی، کە دەیویست بیکوژێت، بەتەواوی سیمای گۆڕیبوو. سواری ئۆتۆمبیلەکەمان بووینو بەخێرایی بەرەو فڕۆکەخانە کەوتینەڕێ، بەنێو پاسەوانانێکی زۆردا، کە سەرباری ئەوەی پڕچەکبوون تورەشبوون، تێپەڕین. فڕۆکەکەمان بەشێوەیەکی موعجیزە ئاسا دەستی بۆ نەبرابوو. ڕۆژی دوایی، بۆ خۆدواخستن چوومە ئۆفیسی سەرکۆمار. (ڤالیری ژیسکاردستن) هەستایە سەرپێیو بەتاسەوە تادەم دەرگاکە بەرەو ڕووم هات.
بەپەلە پرسی: (ئێ؟) بەمەبەستەوە وتم: (لویزیانا زایە بوو.)
ئاساییانە وتی: (لەم حاڵەتەدا ئەمە کۆتایی کارەکەیە.)
ئەوە دوایین پەیوەندی نێوان (شا)و سەرکۆماربوو، چونکە زۆر ئاشکرابوو کە (شا) ئامادە نەبوو کۆمەکی خۆی بکاتو، لەوبڕوایەدا بوو گەر (فەڕەنسا) هیچ هەنگاوێك بۆ ڕێگریکردن لەچالاکیەکانی (ئیمام خومەینی) نەهاوێت، (شا) دەتوانێت وەك هێزێکی براوەی ڕووداوەکانی ئێران ڕووبەڕووی ببێتەوە.

ئێمە درێژەمان بەچاودێرییەکانمان دەداو، بوارمان دەدا مێژوو ڕێچکەی خۆی ببڕێت. لەماوەی چەند هەفتەیەکدا ئەوە(شا) بوو دووورخرایەوەو (ئایت الله ئیمام خومەینی) بووە ڕابەری ملیۆنان کەس لەهەوادارانی.

(ئایت الله ئیمام خومەینی) بەتەواوی هێزەوە گەیشتە دەسەلاتو، دەستی دایە ڕشتەیەك کاری نێودەولەتی، کە زۆربەی بەرژەوەندیەکانی خۆرئاوای لەسەرانسەری خۆرهەلاتی ناوەڕاستو جیهانی (باکور) تا سالانی پاش خۆیشی دەخستە بەرمەترسییەوە.

(جیهاد)ەکەی دەستی پێکردبوو. هەرچەندە سەرچاوە سیخوڕیو لێکۆلیارەکانمان بەشێوەیەکی بەرفراوان کاریان کردو خۆشم سالەهایە لەسەرئەوە ڕاوەستام، لەگەل ئەوەشدا هێشتا لەلام ڕوون نییە کە ئیسلام گەراکان لەچ سەردەمانێكو بەهۆی چ فاکتەرێکەوە دەستیاندایە چالاکی دژ بەفەرەنسا، یان ئامانجو بەرژەوەندییەکانی. ئاشکرابوو کەئەمە بەشێك لەوشەڕە بەرفراوانترە بوو کەڕاستەوخۆ بەخواستی ئەوانەوەو بەرمەبنای ڕێنماییەکانی ئەو جۆرە شەڕەی دژ بەولاتانی جیهانی (باکور)ەوە پەیوەست بوو.

ستراتیژەکەیان ڕوونبوو، بەلام تاکتیکەکانیان لەگەل ئەوەی لەهەمان ئەو ڕشتە تاکتیکانەبوون کە لەسێ شەڕی گەورەی ئەم سەدەیەدا بەکارهێنراوە، زۆربەیان بەلێلی مانەوە.

یەکەمین ئامانجی ئێران، فەرەنسا یان فەرەنسەکان نەبوو. بەلکو ئامانج (شا) بوو، کەتا دواین ساتەکانی بەدوای ڕاوکردنیەوە بوون. لەناهەموارترین دۆخدا کەبالی بەسەر (ئێران) داکێشابوو ئەم پیاوە بەدەسەلاتەی پێشووی ئێران (شا) لەنێوان هۆلەنداو میسردا سەرگەردان بوو؛ ئەو جێگایەی کە (ئەنوەر سادات)ی هاوڕێی لەخۆی گرت. پاشان چوو بۆ (مەراکیش) بۆلای نزیکترین هاوڕێکانی لەنێو سەرانی عەرەبدا (شا حەسەنی دووەم).(شاحەسەن) پێشوازی لەوو لەخێزانی شاژنی کردو، کۆشکێکی دێرینەی بۆ کردنە ئێرانێك لەتاراوگە.

بەوهۆیەوە کە(شاحەسەنی دووەم) دۆستێکی گەورەی فەرەنسابوو، گەلی (مەراکیش)یش لەئەفریقای باکوردا گرنگییەکی ستراتیژی هەبوو، چاوپێکەوتنەکانی (شا)مان لەنزیکەوە کۆنترۆڵ دەکرد. (حەسەن) سەرکردەیەکی نائاساییە بۆ خۆرئاوا لە(باشور)دا. یەکێکە لەوکەسانەی بەدروستکردنی پردی پەیوەندی هەمەچەشنە لەگەڵ (باکور) بڕواو خواستەکانی ئاوێتە کردووەو، ئەم بیرکردنەوەیەشی لەوەوە سەرچاوەی گرتووە گەر بیەوێت هاوسەنگییەکی نێودەوڵەتی لەهەر زەمینەیەکدا بەدەستبهێنێت دەبێت بەوجۆرە بجولێتەوە.

(حەسەنی دووەم) پیاوێکی خاوەن هەستێکی قوڵو خواستێکی گەورەیە. بەدرێژایی ئەوکاتانەی کە لایەنگرانی (شا) چوونە ئەوێ، سەرچاوەکانمان دەستیان کرد بەناردنی زانیاری لەوجۆرەی کەمایەی نارەحەتین. گروپەنەیارەکان دەستیان کردبوو بەجموجۆڵی ئاژاوەنانەوەو، وایان بڵاو دەکردەوە کە وەرگرتنی کەسێکی زۆرداری وەك (شا) مایەی ڕسواییە.

کاریکاتێریان لەسەردیوارەکانی (کازابلانکا)دا نەخشاندبوو. لەلای موسڵمانەکان بەراز ناشیرینترینو پیسترین ئاژەڵە، کە هەڵبەتە دوای ئەو سەگ دێت. لەدەربڕینی خۆرئاواییەکاندا (تولەی دێڵەسەگ) زۆر خراپترە لەوتولە سەگەی عەرەبەکان دەیلێن.

لەژێر ئەو کاریکاتێرانەی لەسەردیوارەکانی (کازابلانکا)دا کێشرابوون ئەم نوسینە دەبینران: (پادشا.. سەگی شایە) نزیکەی چل ساڵ بوو (شا حەسەنی دووەم)م دەناسی، واتە لەوکاتەوەی کە شازادەیەکی لاوبوو. هاوسەرەکەم لەمەراکیش گەورە ببوو. بەماوەیەك پاش جەنگی دووەمی جیهانی، (عقید فلیکس ئادن) ئەفسەری پیادەی سوپایی، کە چەندین ساڵ لەگروپی (حوشتر سواران) کاری کردبوو، دەیزانی من چەندە پەیوەستم بە (مەراکیش)و مەراکیشێکانەوە، بۆیە پێشنیازی کرد کە سەردانی شازادەی لاو (حەسەن) بکەم. سەرەتا پێکەوە فراوینمان کردو، پاشان دۆستایەتی

دوورودرێژمان دەستی پێکـرد. لەگـەڵ ئـەوەی بەومەترسـییەم زانـی بـەرەو (ڕیبات) گەشتم کردو، (حەسەن)م لەو هەڕەشـەیەی کـە لەئـەنجامی بوونـی (شا) لەوێ دروستببوو ، ئاگادار کردەوە. پـاش ئـەوەی ڕەهـەندەکانی ئـەو گرفتەم بۆ ڕوونکردەوە، (شاحەسەن) وتی: (دەبێت ئەوە بزانیت کە ناتوانم خـۆم لەپـەنادانی پیـاوێك، کـە قۆنـاغێکی ناهـەموارو مەترسـیدار لــەژیانیدا بەسەردەبات، بــەدووربگرم. (شـا) لێرەیـەو دەتوانێـت چـەندی بوێـت لـێرە بمێنێتەوە)

لەوەڵامدا وتم: (خاوەن شکۆ..ئەمە هــەمان ئـەو وەڵامەیـە کـە چاوەڕوانی بیستنی بووم، بەڵام من ئێستا ناچارم شتێکتان عەرز بکەم کـە زۆرناخۆشـە. سـەرانی نوێـی ئـێرانی بەرامبـەر بـەم پرسـە کاردانـەوەی خـراپ دەنوێنـــن.) (شاحەسـەن) دەسـکەکانی کورسـییەکەی تونـد لەمشـت گـرتو بەسـیمایەوە دیاربوو کە ئامادەی هــەموو هەنگاوێکـە.. دەرئـەنجام بەبڵمەبڵمێکـەوە وتــی: (کـاری لـەوجۆرە نـەخوازراوە، بـەڵام بڕیارەکەشـم پێنـاگۆڕدرێت.) بەمپێیـە، هەموو هەوڵێکم خستەگەڕ بۆ پەژیوان کردنەوەی. ئەو خاڵەشم هاتەوە یاد کە تەنها ئەو دەستەڵاتدارێکی بەبەهای مەراکیش نییە، بـەڵکو ئـەرکی گرنگـتری بەهاوکاری پادشای ئیسـپانیا لەئەستۆدایە، کـە ئـەویش پاراسـتنی تەنگـەی (چیای تاریق)ی شـاڕێی ئـاویو کلیلـی دەریـای سـپی ناوەڕاسـتە. بـەمجۆرە دەمانزانی کە بـۆ ئـەو لـەڕووی کەسـایەتیەوە مومکـین نـەبوو داوا لـە (شـا)و خێزانەکەی بکات ئەوێ بەجێبهێڵن.

من داواکارییەکی خراپم کردو (حەسەن)یش بەبێ ویستی خـۆی پەسـەندی کـرد. بـەیانی ئـەو ڕۆژە (شـا)ی لادراوی ئـێران لەوکۆشـکە بچوکــەی تیــایدا دوورخراوەبــوو، پێشـــوازی لێکـــردم، ك ەهاوسەرەکەشـــی لەگـــەڵدابوو. منداڵەکانیان ڕەوانەی شوێنی دی کردبوو. ئەمە یەکێك بوو لەپەژارە دارتریـن گفتوگۆکانم لەدرێژایی ژیانمدا. گەرچی هەموو شتەکان وتران، بەڵام کورتیـش بــوون. هەڕەشــەو مەترسـیەکانی سـنگی خانەخوێکـەی ئـەویان گرتبــوو خستنمەڕوو، ترسەکەم تەنـها بـۆ ئاسایشـی پادشـای مـەراکیش بـوو. بوونـی (شا)ی لادراوی ئێرانی لە(مەراکیش) لەدەستەڵاتی پادشای مەراکیشـی کـەم

دەکردەوەو نەیارانی دژبە (حەسەن)ی بەهێز دەکرد. بەدرێژایی ئەو قسانە، (محمد ڕەزا) بێدەنگ بوو، وەکو جاران کە بەرامبەر نەناسێك دادەنیشت، چاوەکانی لەپشتی چاویلکەیەکی تاریکەوە حەشاردابوو. لەکۆتاییدا زۆر سادەوسانا وەڵامی دایەوە: (بەپێی پێشنیارەکای تۆ دەجوڵێمەوە.) دووهەفتە دوای ئەوە ڕۆشتبوو. بەگەشتەکەی وەك (ئۆدیسە) بۆ (باهاما)، بەرەو نیۆرك‌و سەرئەنجام بۆ میسر درێژەیداو، لەوێش مرد.

کاتێك (شا)ی لادراوی ئێران گەیشتە سەنتەری شێرپەنجەناسی لەنیۆرك، ئێرانیەکان بەرەو دووەمین ئامانجی خۆیان ، واتە باڵوێزخانەی ئەمریکاو دیپلۆماتەکانی لەتاران، جوڵابوون. لە(٤/ تشرینی دووەم/١٩٧٩) گروپێکی گەورەی خوێندکارانی زانکۆی ئێران، کەهەموو موسڵمان بوون‌و ئامادەبوون لەڕێی خودادا بمرن، دەستیان گرت بەسەر باڵوێزخانەی ئەمریکا لەتاران‌و، پەنجاودوو دیپلۆماتیان بەبارمتە گرت‌و، ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی یەك ساڵەییان هێنایە ئاراوە، کە بەدژوارترین گرفتی دیپلۆماتی‌و سەربازی لەدەستپێکی خولی جەنگی (باکور- باشور) دادەنرێت.

خواستە ڕاگەیەندراوەکانی ئەو خوێندکارانە بەخێرایی بووە هاواری دەستە جەمعی دەستەڵاتدارانی کە دەوڵەتی ئێرانیان کۆنترۆڵ کردبوو. داوایان دەکرد کە (شا)ی لادراوی ئێران‌و هەموو ئەندامانی خێزانەکەی- کەنیشتەجێی نیۆرك بوون‌و سەرقاڵی چارەسەری شێرپەنجەکەی (شا)بوون، کە هەشت مانگ دوای ئەوە کوشتی- بەئێران ڕادەست بدەنەوە.

دوو ڕۆژدوای ئەوەی بارمتە ئەمریکیەکان یەخسیرکران، سێ پلە بەرزی ڕەسمی (CIA) لەبارەگای فەرماندەیی پاریس هاتنە لام. ئێمە لەسەرتواناکانی خۆمان بۆ ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆن لەتاران‌و شارەزاییمان لەئێران‌و ڕابەرەکەی‌و ئەوەی تا چەند دەتوانن ببنەمایەی خراپەکاری بۆ ڕۆژئاوا، گفتوگۆمان کرد. یەکێك لەوان کەپێدەچوو سەرۆکی لۆکاڵی (CIA) بێت، ڕاستەوخۆ چووە سەربابەتەکەو پرسی: (دەتوانین چی بکەین؟)

وەڵامم دایەوە: (دڵنیانیم کە ئێستا دەتوانین چی بکەین. ئەگەر ئەم پرسیارەتان لەهەمان پێنج دەقیقە یان پێنج سەعاتی یەکەمی ڕووداوەکەدا بپرسیایە لەوانەبوو ئەنجامدانی چالاکیەك بەهۆی هێزی ئاسمانی هەلیکۆپتەرەوە لەناوخودی باڵوێزخانەکەم بۆ پێشنیاز بکردنایە. تەنانەت گەر ئەوەش شیمانە بکرێت کە گروپێکی ڕزگارکەر پێکبهێنرێت کەبچێتە شارێکی پڕ لەئاپۆڕەی خەڵکەوەو، ئنجا لەناوباڵوێزخانەکە یان سەربانەکەی دابەزن، پاسدارانی شۆڕش بواری ئەوەیان دەبێت تا تەواوی بارمتەکان بکوژن. لەوانەیە هەندێ لەشۆڕشگێڕەکان بکوژرێن، بەڵام هەرئەوە دەبێتە تاکە دڵخۆشکەرەی ئێوە. بارمتەکان هەرگیز ڕزگار ناکرێن)

ئەمریکیەکان هەستان بڕۆنو لەهەمان کاتدا یەکێکیان وتی: (لەگەڵ ئەوەشدا، تکایە بیرێك لەبابەتەکە بکەرەوە.) پەسندم کرد. لەپێش بیرکردنەوە چەندین شتمان کرد، لەگەڵ ئەوەشی هەریەکەیانم دەخستە بەرهەڕەشەی مەترسی کەسێتی خۆیان، چەندین کەسم لەباشترین کارمەندانم ڕەوانەی ئێران کرد.

لای ئێمە ڕۆشنبوو کە ئەمریکیەکان دەستیان بەتاڵ بوو، هیچ کارتێکی براوەو بلۆفیان لەهەگبەدا نەبوو، لەگەڵ ئەوەشی کەتوانای هیچ فشار هێنانێکیان نەبوو، چونکە ئێمە بەدرێژایی ساڵەکان تاڵترین ئەزموونمان چەشتبوو، دەمانزانی وەك یەکەمین یاسای ڕووبەڕوو بوونەوەی توندوتیژانە هیچ کاتێك بەدەستی بەتاڵەوە مایەی جێبەجێکردن نەبووە. نەیارەکانمان ئەومانایە دەزانن و تەنها بەها بۆ دەستەڵات و هێز دادەنێن. لەهەرشوێنێك بتوانن دەستکەوتێك بدۆزنەوە یان بەدەستی بهێنن دەکەونە لێکۆڵینەوە. هەندێجار بەشێوەی سەرمایەودراو، وەك بارمتەیان هەڕەشە لەجۆری دی بێت، کە بتوانن لەڕێگای نێوانگەرێکی نێو دەوڵەتیەوە جێبەجێی بکەن. بەمپێیە، ئامانجمان بەدەستهێنانی کارتێکی براوەبوو بۆ ئەمریکیەکان، تابتوانن لەورێگایەوە کارێك بکەن. ئێمە پێش هەمووان ئەو شتەی کە دوایی جیهانی تێیگەیشت، زانیمان. بۆنموونە وەك ئەوەی کە(ئایت الله خومەینی)

وەکو نەریت، دەبێت بگەڕێتەوە خانوەکەی خۆی لەشاری پیرۆزی (قوم). لەنزیك ناوچەیەکی بەرفراوانەوە دەژیا، کەهەلیکۆپتەر بەئاسانی دەیتوانی تیایدا بنیشێتەوە. ئەو نەخشەیەی کە ئێمە دەستامان کرد بەدارشتنی پێویستی بەوەبوو زانیاریمان لەسەرچوونی بۆ (قوم) هەبێت، پاشان بەوردی بەدواداچوونی لەسەربکەین‌و چاوەڕوانی هەلیکۆپتەر بکەین.

دوای ئەوە لەسەرکەشتیەکی کە لەزەریای باکوری هندی لەدەریای عومان لەنگەری گرتووە چاوەڕێ بکەین. ئێمە نەخشەی ئەوێمان بەهەموو وردەکاریەکانیەوە- ماڵ بەماڵ، نەخشەی قوم، دەشتە پانوبەرینەکانی دەروروبەری شوێن نیشتەجێی (ئیمام خومەینی)، جموجۆڵی سات بەساتی هەر ڕەگەزێکی ئەوێ- بەتەواوی کێشابوو. چالاکیەکە لەزۆر ڕووەوە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەوەی (لویسی شازدە) دژ بەکاردینال (دلایالۆ) کە سەرکەوتوانە ئەنجامی دابوو، نەبوو. ئەم قەشەپایە بەرزە بەئاشکرا دەستی دابووە دانوستانی خیانەتکارانە لەگەڵ (دۆك ..یورگونی). هەڵبەتە ئەو لەشەوداو بەپێی پرۆسەیەکی زۆروردو لەکۆشکی (دلوش)ەوە؛ ئەو شوێنەی کە بۆماوەی یازدە ساڵ تیایدا زیندانی بوو، سەرپەرشتی ئەوهەنگاوانەی دەکرد.

ئەمریکیەکان دەربارەی کاردینال شتێکی خۆشیان نەبیستبوو، بەلام جیاوازی نەبوو. ئەم نەخشەیەمایەی جێبەجێکردن بوو. لەبەرزترین ئاست لە (واشنتن)ەوە توێژینەوەی لەسەر ئەنجامدراو، پاشان بەخودی سەرکۆمار (کارتەر) پێشکەش کرابوو. (کارتەر) نەخشەو تێزەکانی خوێندبۆوەو شەیدای وردەکارییەکانی ببوو، بەلام ڕەتکردنەوەی ئەم کارە لەلایەن ئەوەوە وەك شتێکی نهێنی مایەوە.

وتبووی: (ئێوە ناتوانن بەتاکە کەسێك کارێکی لەوبابەتە بکەن‌و، وردتر بڵێم بەکەسێکی سەردەمی ئەو کاری لەو جۆرە ناکرێت).

پێشنیاری سەرەوە لەئۆفیسی (ئۆراڵ) کۆتایی هات. لەجیاتی ئەوەنزیکەی پێنج مانگ دوای ئەوە ئەمریکا ئۆپراسیۆنێکی ڕزگارکردنی

ناتەواوی بێئاکامی لەژێر فەرماندەیی (عقید چارلز ـئای ـبکویت) لەهەولێکی نەزۆکا ئەنجامدا. ئەوە ئەو چالاکیە بوو کە ئەمریکیەکان دووڕۆژ دوای دیلکردنی بارمتەکان لەگەڵ مندا قسەیان لێکردو، منو هاوەڵەکانم لەڕووی سەرنەکەوتنیەوە بەهۆی نەبوونی هیچ جۆرە کۆنترۆڵێك لەڕووداوەکەو، ئەوەشی کە بەتەواوی مایەی جێبەجێکردن نەبوو ئاگادارمان کردنەوە. خۆشبەختانە ئەم چالاکیە تاخودی بالوێزخانەی ئەمریکالە تاران درێژەی هەبوو. لەوێوە شکست هێنانی پرۆسەکە، کەهەڵبەتە دەبووە مایەی کوشتنی هەندێ لەبارمتە گیراوەکانو- گەر نەڵێین هەموویان- زۆربەی هێرشبەرەکان، شتێکی چاوەڕوان کراوبوو. ئەم هێرشە لەبیابانەکانی ئێرانەوە دەستی پێکردو، هەلیکۆپتەرە هێرش بەرەکان بەهۆی گەردەلولی لمەوە بەیەکیاندا کێشا. خودی (بکویت) بەهۆی ئەو فەرماندانەوە، کە لەژوورێکی بچوکی هەزاران میل دوور لەوەوە لە (واشنتن) بوونو ڕێنمایی هەموو جۆرە جموجۆڵێکیان دەکردا، کۆتایی بەکارەکە هێنا.

* * *

ئەم ناکامیانە، دانوستانی بێکۆتایی و پڕ لەهەراو هورایا، ناڕێکوپێکی لەکارەکان، هەڕەشەکانو هەلە لەدەسچووەکان، تاقیکردنەوەی و زەپرۆکێنی بارمتە گیراوەکانی بۆ (٤٤٤) ڕۆژ درێژکردەوەو، تەنها گومانی نەیارەکانی لە (باشور) بەرمەبنای ئەوەی ئەمریکا ئارەزووی لەپراکتیك کردنی هیچ هەنگاوێك سەبارەت بەپیادەکردنی تیۆری ناسراوبە (وێرانکاری لێبڕاوانە) نییە، سەلماند. تۆڵەسەندنەوە، بەشێك لەهاوکێشەی ستراتیژی ئەوسەردەمەو ماوەی جەنگی چوارەمی جیهانی نەبوو، بەو هۆیەوە نەیارەکانمان لەبەرامبەر پشتگیری کردنیان لەڕووداوی خوێنڕێژی لەجیهاندا خۆیان بەئازاد لەهەرقەیدو کۆتێك دەبینیو، ئازایانە ئەم ئازادییەیان بۆ مەیسەر کردنی کارەکانیان بەکار دەهێنا. لەخۆرهەلاتی ناوەڕاستو لەڕاستیشدا لەهەرجێگایەکی دی جیهان کەسانێك هەن کەلەشکستهێنانی خۆرئاوا لەبەرامبەر وەلامدانەوەی ئێرانیەکان هەست خۆشی دەکەن.

بۆنمونه، پشتگیری کردنی (قـەزافی) لەنـەیارەکانمان هیـچ سـنورو کەوشـەنێك ناناسێتو، ئاشکرابوو کەتاکە مەرامی ئـەو تێکدانـی دیمکراسیەتی خۆرئاواو فراوانکردنـی بازنـەی دەسـەلاتەکانی خۆیـەتی. دەرئـەنجام، کەسـانێکی کەپشتگیریان دەکات، یان بەهۆی داراییەوە بەهێزیان دەکات، لەسەرانسەری ئەوروپادا بلاون. هێزە سیخوڕیو سەربازییەکانی لە (چـاد)ەوە تـا ئـەفریقای ناوەڕاست، کە تێزە فراوانخوازییەکانی ئەوی تێدا ناکام بووە، مۆلدراون.

(قەزافی) لەهەندێ شوێن لەلیبیادا کامپی مەشقکردنی دروست کردووە. کاتێك ئەم نەیارانەی ئێمە پێویستیان بـەدارایی دەبێـت، ئـەو بۆیان دیاری دەکـات. سـەرەڕای ئـەوەش، ماوەیـەك لەمەوبـەر پێداویسـتی بـۆ چیکۆسـلۆڤاکیا، ئـەلمانیای خۆرهـەلاتو مەشـقدادەرە فەلەسـتینیەکان لەوکامپانـەدا دەستەبەر کردبوو، تـابتوانن وەك پسپۆڕ لـەبواری هونـەری هەمەچەشـنەی مۆدێرنـی ئـەمڕۆدا کەسـانی ئامـادەکراو بەتـەکنۆلۆژیای پێشکەوتوو بەرهەم بهێنن. ئێمە ئەم شتانەمان لەڕێگای هەموو سـەرچاوەو هۆکارەکانمانەوە تێگەیشتین.

هەرچـەندە دەزگـای پۆلیسیی ئـەلمانیای خۆرهـەلات هەلوەشـاوەتەوە، بەلام ئەو مامۆستایانە ماون تا وەك گروپێکی بـەکرێگیراوی تـەواو گـەورەو، هەروەها وەك کادێرانی نەیار دەرکەون، کە بتوانن ئەو مەشقانەی سـەرەوە درێژە پێبدەن.

(قـەزافی) لـە (لیبیـا)دا سـەقامگیرەو جێگـای فەرامۆشـکردن نییـە. ئاشـکراکردنی ئەرشـیفی هـەندێك لەسـیخوڕەکانی پۆلیسـی ئـەلمانیای خۆرهـەلات لـەنیوەی یەکـەمی سـالی (١٩٩٠) زۆربـەی ئـەو چالاکیانـەی سـەلماند. پلـەدارانی پێشـوی پۆلیسـی نـهێنی چیکۆسـلۆڤاکیا، کـە سەرچاوەکانی ئێمە ئەو زانیارییەیان دەست کەوتبوو، بەتاقیکردنەوە فێری ئەوەببوون کە بـۆ تەقاندنـەوەی فڕۆکەیـەك لـەئاسماندا بـڕی چـەند مـادەی تەقینەوەی پلاستیکی پێویستە. ئەم تاقیکردنەوانە کە لەنۆڤەمبەری سـالی (١٩٨٤)دا ئـەنجامدرا، ئاشـکرای کـرد کـە تـەنـها بـڕی دووسـەد گرام، واتـە

کەمتر لەنیو پـاوەند لـەمادەی (SEMTEX-H) کـە بـەهێزترین کاردانـەوەی هەیە، دەتوانێت لایەکی فڕۆکەیەك کون بکات.

پێنج ساڵ پێش ئەوە (چیکیەکان) هەزار تەن لەومادەی تەقینەوەیـە یـان بە (قەزاف) فرۆشتبوو، کە ئـەوەش بێگومـان بـووە بەڵگـەی زۆر گرنـگ. ئـەو مادەیـە گەیشـتە دەسـتی سـوپای کۆمـاریخوازی ئێرلـەندا، کـە چـالاکی دژی بەریتانیا لەئێرلەندای باکورو جێگاکـانی دی ئـەنجامدەدا. هـەروەها گەیشـتە دەستی گروپە نەیارەکانی ئێمەش لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست– کە لـەناولیبیادا بنکـەیان هـەبوو– لەوانـەش بـۆ بـەرەی گـەلی ئـازادیخوازی فەلەسـتین (سەرکردایەتی گشـتی) نـێردرابوو. بـەرەی گـەلی ئـازادیخوازی فەلەسـتین (سەرکردایەتی گشـتی) بۆ بەکارهێنانی مـادەی تەقینـەوەی (SEMTEX-H) لەخستنە خوارەوەی فڕۆکەی پان ئەمریکان لەسەر (لۆکەربی) لەئوسکتلەندا لەسـاڵی (١٩٨٨) سـوودیان لەپسـپۆڕانی زۆر پێشـکەوتوو وەرگرتبـوو. لەکاتێکدا کە ئەنجامدانی ئەمجۆرە کارە تایبەتانـە لـەدەرەوەی ئـەڵمانیابوو، زانیارییەکان ئاماژەیان بەوەدەدا کە بەلایەنی کەمەوە هەندێك لەوانە لەکامپە پەروەردەییەکانی (لیبیا)دا مەشقیان پێکرابوو.

هـەرچۆنێك بێـت لەتشرینی دووەمـی سـاڵی (١٩٩١) دەسـتەیەکی بـاڵای دادگـایی ئـەمریکا بەڕێکخسـتنی داواکارییـەك دژ بـەدوو ئەفسـەری هـەواڵگری لیبیـایی کـە تاوانبـار کرابـوون بـە (١٩٣) بڕگـەی تـیرۆرو دەسیسـەکاری تەقاندنەوەی فڕۆکەی ژمارە فڕینی (١٠٣)ی پان ئـەمریکان، کـە لـەدەرەوەی وڵات بـوون، خرانـە بـەر بەدواداچوون. شـوێن، چـەك، دراوو پاسـپۆرت، کـە هەمووی لەڕێگای (قەزاف)یەوە دابینکرابوون، هۆکاری گرنگ بوون کـە بـواری دەرەخساند لەسەرانسەری خۆرئاوادا هاتووچۆ بکەن.

(ئیلیچ ڕامیرز سانچیز) ناسـراوبە (کـارلۆس)و زۆربـەی گروپـە سـیو پێنـج کەسییەکەی بۆ جموجۆڵ لە(نەمسا)وە بۆ ئەڵمانیای خۆرهەڵاتو لەئەورووپای خۆرهەڵاتدا پاسـپۆرتی لیبیاییـان بـەکاردەهێنا. کارمـەندەکانی باڵوێزخانـەی لیبیـا لەشـوێنەکانی وەك (بـەرلین) کۆمـەکی ئـەو کەسـانەیان دەکـرد بـۆ

ئەنجامدانی کارەکانیان‌و، تەنانەت لەنەخشە سەربازیەکانیشدا یارمەتیان دەدان. گروپێکی تیرۆریستی (لیبیا- فەلەستینی) کە سالۆنێکی سەماکردنیان لە (بەرلین)ی خۆرئاوا لە (نیسانی ١٩٨٦)دا تەقاندەوە- کەدوو خزمەتکاری ئەمریکی‌و ژنێکی تورك کوژران‌و (٢٢٩) کەسی دیش برینداربوون- لەلایەن (یاسرچریدی) کارمەندی فەلەستینی لەبالوێزخانەی (لیبیا) لەبەرلینی خۆرهەلات‌و، کەسێکی لیبی بەناوی (ابوالقاسم)ەوە سەرکردایەتی دەکران. ئێمە لەنزیکەوە گوێمان لەگفتوگۆکانی نێوان (قەزافی)و تۆرە تیرۆریستە نێودەولەتیەکەی دەگرت، چونکە زۆربەی ئەندامەکانی بەناو فەرنسادایان لەنزیکیەوە رەت دەبوون‌و، ئێمە بەهۆی کەسانی خودی خۆمانەوە یان بەهۆی کە سانێکەوە کە بەنزیکترن هاوپەیمانانی خۆمان دادەنران، ئەو کارەمان بەئەنجام دەگەیاند. لەبەرئەوەی چالاکیە چەکدارییەکانی کە لەژێر رابەرایەتی (قەزافی)دا دەکران بەبەشی بنەرەتی تیرۆریزمی نێودەولەتی دادەنران، بۆیە بەئاگابوون لەرووداوەکانی ناوخۆی لیبیا بۆ رێگری یان پوچەلّ کردنەوەی مەترسیەکانی تیرۆریزم پێویست بوون. سەرەرای ئەوەش، گومانی تێدا نەبوو کە بەدرێژایی دەیەکانی (١٩٧٠و١٩٨٠)، بەلایەنی کەمەوە تا ئەوکاتەی ئەو چەکە لەخزمەتی ئامانجەکانیدا بوو (قەزافی) یەکێك بوو لەئامێرە راپەرێنەرە گرنگەکانی هەنگاوەکانی روسیای سۆڤیەتی لەبەشی خوارووی دەریای ناوەراست. بەواتایەکی دی (لیبیا) لەبازنە لەولەبیەکانی سەردەمی نێوان جەنگی سێیەم‌و چوارەمی جیهانیدا بوو.

بەوهۆیەوە وزەیەکی بەرچاومان لەپێناوی چاودێریکردنی هاتووچۆی نیشتەجێیانی کامپەکان، جموجۆلّی سەرمایەکانی چالاکیەکانی رادەپەراندو ئەو مادانەی لەنەخشەکانیاندا بەکاریان دەهێنان بەخەرجدا. سەرچاوەی سەرەکی دەستەلاتەکەی (قەزافی) سامانەکەی بوو، سەرچاوەی سامانەکەشی یەدەگیە پەترۆلیەکان بوو. هەرچۆنێك بێت پەترۆلّ وەك خۆی هەرگیز پارێزەری دەسەلاتی سیاسی یان ئابوری لەجیهانی (باشور) یان

هەرجێگایەکی دیدا نەبووە. بەواتایەکی دی، دەبێت پەترۆڵ بۆ هاوتایەکی دی بەبرەو بگۆڕێت. ئەو هاوتایەی کە لەلای (قەزافی) گونجاوبوو، وەکو ئەوشتانەی کە لەلای کەسانی وێنەی ئەو لەجیهانی (باشور)دا پەسندکراوە، ئەوانەش چەك‌و ئاڵتون بوون.

یەکێتی سۆڤیەت لەدابینکردنی ئەم دوومادەیە، هەڵبەتە بەداشکاندێکی شیاوەوە، خۆشحاڵ‌و ئامادەبوو. بارەگەورەکانی چەك بۆ دوورترین خاڵ بۆ ناوبیابانی لیبیا دەنێردران‌و، پاشان لەشوێنە جیاجیاکاندا حەشاردەدران‌و دابەشدەکران، تا کەمتر زیانیان پێبگات‌و، لەبەرامبەر هێرشی دوژمنە زۆرەکانی (قەزافی)دا پارێزراو بن. هەڵبەتە لەودەمەدا، تەمەنی کورتی ئەو چەکانەش شتێکی گرنگ بوو، چونکە ئاوو هەوای بیابانەکانیش وەك دەریاکان بۆ چەك، کە بەتایبەتی بۆ ئەو کەشو ئاو هەوایە دروست نەکراون، مایەی زیانن.

سنورەکانی باکوری لیبیا بەدەریای ناوەڕاست‌و سنورەکانی خوارووی لەگەڵ ناهەموارترین بیاباندا هاوسێیە، کە هەردوو مادەی (سوێری‌و شێ)یان تێدا زۆرە.

هەرپاش شەش مانگ لەبیاباندا هیچ شتێك کار ناکات. (لیبیا)ییەکان لەهەڵگرتنی چەکدا زۆر شارەزاییان نییە. لەوێ پێکهاتەی هەوا، خوێ‌و شێ ژینگەیەکی زۆر خراپی بۆ چەکە ئاڵۆزەکان دروستکردووە.

دیارە ڕوسەکان لەئاڵوگۆڕی ڕۆژانەی چەك‌و ئاڵتون بەپەترۆڵ بەختەوەربوون. تیمی ئەندازیارە (چیکیەکان)، کە لەدواییدا بوونە کارمەندی چاودێریکردنی ئەو چەکدار کردنە، زۆر درەنگ وەخت‌و بەژمارەیکی کەمەوە دەست بەکاربوون. لەگەڵ ئەوەشدا، ڕوسەکان لەدابینکردنی ئاڵتون، کە (قەزافی) بۆ ئامادەکاری دارایی چالاکیەکانی خۆی‌و نزیکترین دۆستەکانی بەکاریدەهێنا، بەختەوەربوون. ئێمە بەڕێکەوت هێڵی گواستنەوەی ئاڵتونەکانمان لەنیوەی دەیەی (١٩٧٠) لەبەریتانیا دۆزییەوە. لەوێدا وا دەردەکەوت کە ئەو کارە بەدواقۆناغی گەشتێکی دوورودرێژی تایبەت گەیشتبێت. بەدەست بەسەراگرتنی زانیمان کە ئەو ئاڵتونە لەکانەکانی

سۆڤیەتەوە دەرهێنراوە، دەچێتە (لیبیا)و پاشان بۆ (کبک). ئەو شوێنەی کە بەشێکی بۆ دابینکردنی دارایی بزاوتی ئازادیخوازی (کبک) دەڕوات. لە (کبک)ەوە، ئەوەی کەماوەتەوە بۆ سوپای ئازادیخوازی ئێرلەندا دەڕوات. لەوێدابوو کە پاشماوەی ئەو ئاڵتونەی دەچووە بەریتانیاوە، لەلای گروپی جودا خوازەکانی (بریتۆن) کەهێرشی توندیان دەکردە سەرئامانجە فەرەنسیەکان، دۆزیمانەوە. بەمپێیە، هێشتا بڕێکی زۆری کە بۆ کڕینی چەکی ئەتۆمیو مادەی تەقینەوە بەسبوو، کە هەمووشیان لەچیکۆسلۆڤاکیاوە دەهێنران، مابوو. ئاڵتونەکان قاڵبی یەك کیلۆییو سکەی ئاڵتونی لیبی بوون.

کاتێك لەوهەموو شوێنانەدا لیبیەکان هەڵسوڕێنەری کارەکان بوون، دەستی ڕوسەکانیش لەورووداوانەدا ئاشکرابوو. بەندەری (تریپۆلی)کە کەنارێکی قوڵی هەبوو، بەیەکێك لەگەورەترین بەندەرەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بۆ دابینکردنی پێداویستیە گرنگەگان دادەنرا، لەلایەن (قەزافی)یەوە دروستکرابوو، بەڵام بەشێوەیەکی فراوان لەلایەن ڕوسەکانەوە بەکاردەهێنرا. لیبیەکان لەلایەن ڕوسەکانەوە دەپارێزران، بەڵام نەك هەموو دەمێك، تێگەیشتین کە کارەکانیان لەدەرەوەی وڵاتەکەیان خۆبەخۆو بەسەرگەردانیەکی تەواوە ئەنجامدەدا. لەوانەی سەرسوڕهێنەرترین ڕووداو لەم بابەتە پەلامارو هێرشەکەیان بۆ سەردورگەی (تانگۆ) بووبێت. هەموو ساڵێ جارێك بانگهێشتی سەرۆکی دەزگای نهێنی نیوزلەندام بۆ سەردانی ئەو وڵاتە پەسند دەکرد، کە ئاساییانە ئەم پێشنیارەی لەڕێگای هاوتا ئینگلیزەکانیەوە یان پاش چاوپێکەوتنی لەگەڵیان دەیکرد. جارێکیان لەسەرتای دەیەی (١٩٧٠) کە بۆ بەسەربردنی دواڕۆژی هەفتە سەردانی (پاریس)ی کردبوو، سەردانی منی لەئاپارتمانەکەمدا کرد. سەربازێکی کۆنەکارو دێرینی جەنگی دووەمی جیهانی بوو، هەردوو یادەوەری زۆری ئەو سەردەمەمان هەبوو. ڕۆژی شەمە پاش نانخواردنی ئێوارە ڕووی لەمن کردوو وتی: (دەبێت ئەوەت پێڕابگەیەنم کەساڵەها شەیدای ئەو چیرۆکانەت بووم کە سەبارەت بەپرسەکانی جیهان لەناو کاری جاسوسیدا بۆمنت پێناسەکرد بوو، بەداخەوە لەکاتێکدا کەمن لە (پاشگری جیهان)دا دەژیم بەدەگمەن دەتوانم

لەگەڵ هەردوولادا مامەڵە بکەم، بەڵام جارێك لەگەڵ شتێك ڕووبەڕوو بوومەوە کە لەوانەیە بۆ تۆ سوودی هەبێت.)

وتم: (باشە، زیاتر ڕوونی بکەرەوە.)

کەمێك هاتە پێشەوەو وتی: (تەواو پێش ئەوەی (ئۆکلەند) بەجێبهێڵم هەواڵم بۆهات کە (شا)ی (تونگا) دووپەیکی کە لەلایەن (قەزافی)یەوە نێردراوبوون، بینیوە. تەختی پادشایەتی (تونگا) دوورگەیەکی بچوکە لەخوارووی ئۆقیانووسی ئارام، کە خوارووترین دوورگەیە پێش ئەوەی بگەیتە سەرزەمینی ڕاستەقینەی کیشوەری بەستەڵەکی باشوور.

(شا)ی (تونگا) شایەکی بەهێزو بەخۆبوو، لەڕاستیدا چونکە بالآبەرزترین پیاوی نێو کەسانێك بوو کەهەموو بالآبەرزو بەخۆوەبوون، وەك (شا) هەڵبژێردرابوو. ئەوانە کەسانی شەڕکەری نێو زەریای ئارام لەباشوور بوون‌و، تەواو بێباك‌و نەترس بوون. ئەوانەهیچ کەس، وڵات یان شتێکی دییان نەبوو. هاوڕێ نیوزلەند یەکەم درێژەی پێدا: (بەوجۆرەی کە ئێمە تێیگەیشتین ئەو دووپەیامبەرە شاڵی (سامۆنت)ی قورسیان پێبووە، کە پڕبووە لەدراو. ئەوەشی (قەزافی) لە (تونگای) دەویست لەلای ئێمە وەك نهێنیەك مایەوە)

بەیانی ڕۆژی دوایی یەکێك لەئەفسەرەکانم، کە فەرماندەی هێزی دەریایی بوو ئامادەکردو، کاری لێکۆڵینەوە لەوبابەتەم پێسپارد. دوای سێ ڕۆژ گەڕایەوە. فەرماندە بەشێوەی خاڵبەندی ڕاپۆرتەکەی دارشتبوو: (هێزی دەریایش وەك ئەو لەوێ سەرگەردان ببووە. هەرچۆنێك بێت گەیشتینە دەرئەنجامێك کە گرنگییەکی ستراتیژی لەناوئەو زانیاریانەدا شاراوەیە. لەکاتی ڕوودانی جەنگ ئەو بەشەی دەریای ئارام دەتوانێت پەناگەیەکی زۆرباش بێت بۆ ژێر دەریاییەکانی ڕوسیا. پێگەیەك بۆ ژێر دەریاییەکان یان کەشتییە بارهەڵگرەکان، کە دەتوانێت زۆر سوودی هەبێت بۆیان)

ژێر دەریاییەکانی ڕوسیا لەماوەیەکدا کە ئێمە هەستی پێ بکەین، یان لەناوبەندەری (تۆنگا)دا هەرگیز قسەیان نەدەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا ئاشکرانەبوو کە ئایا ڕوسەکان بەڕاستی (قەزافی) یان لەسەرەوەی ئەو ڕووداوە دانابوو یان نا.

بــەمجۆرەگومانی تێدانــەبوو کەئەمــە باشــترین هــەنگاوەکانی بــوو لەدەسـتپێکی بەرنامـە فریودەرەکـانیدا، کــە درێــژەی بەخەیاڵــەکانی دەداو کەلوپەلە هونەرییـە ڕوسیـەکانی بـۆ دابـین دەکـرد. لـەم حاڵەتـەدا دەیتوانـی پــارێزەری بەرژەوەندییــەکانی خــۆی بێــتو چــاوبگێڕێت بــۆ پــەیداکردنی هاوپەیمانێکی گرنگو ستراتیژی نوێی دی لەوبەشە زۆر هەستیارەی جیـهان، تـا لـەوێوە شـەڕی گـەورەی نێـوان (بـاکور)و (باشـور) بخاتـە گـەڕ. (قـەزافی) نەئەوسـاو نەئێسـتابەمانا کلاسـکیەکەی نوێنــەری ڕوســیا نــەبووەو نییـە. نوێنەری ڕوسیا کەسێکی پــڕ خەرجییــە، دەبێـت لـەکۆتایی هــەموو مـانگێکدا بڕێك دراو وەربگرێتو دەست بڵاوانە خەرجی بکـات. بەپێچەوانـەوە (قـەزافی) لەپێناوی چەكو دابینکردنی لۆجستیك دراو بەڕوسیا دەدات، دیـارە نرخێکـی بێوێنەش دەدات. سوود لەڕوسەکان دەبینێت، بەهــەمان شێوەش ڕوسـەکان سوودیان لەوبینیوە. بەڵام بەپیچەوانـەوە (قـەزافی) حـەزی لەپەیوەندیکردنـە بەسەرکردە دیلەکانیشــەوە، هەڵبەتــە هــەمووی بـۆ سـوودی خۆیـەتی، تەنـها بەخــەیاڵپڵاوی خۆبەگــەورە بینیــنی خــۆی دژ بەدوژمنــە ڕاســتەقینە یــان وەهمیەکانی کاردانەوە دەنوێنێت.

بەم پێیە، پاش نەیاری سیاسی دۆســتو لایـەنگرانی (ئدریس)ی پادشـای لەسەرکار لادراو، هیچ دوودڵ نەبوو لەدۆزینەوەیان لەهەرکوێیـەك بـن. ئێسـتا هەرچەندی کە دەرئەنجامی ئەگەری ئەو جۆرە کارانە دەتوانێـت لای بینـەری سادە خراپ بێت. (قەزافی) پیاوێکی شێت نییە. ڕێوییەکی بیابانی زۆر زرنگە. کەسێکە خاوەنی دیدێکـی لێـڵو تاقانـە، بـەڵام بێمانایـە. هـەندێك لـەودیدە پەیوەستە بە بەشـێك لەکیشوەری ئـەفریقاوە، کـە بـەپێی ئـەودیدە دەبێت دابەشبکرێتو، دوایی ئەو بەسەریدا دەسڕۆشتوو بێت. بۆ ئەو مەبەستە لەناو بارەگای خۆیدا لەسەرووترین سـنوورەکانی دەریـای ناوەراسـت لێکۆڵینـەوەو توێژینــەوە ئــەنجام دەداتو، ئــەم ڕوانگەیـەی وا پێویسـت دەکـات بەشــێکی فراوانــی خــاکی ئــەفریقا– لەوانــە چــادو کۆمــاری ئــەفریقای ناوەڕاســت– لەخۆبگرێتو، لەڕاستیدا خەنجەرێکە بەرەو وڵاتی دەوڵەمەندو خاوەن کانزای

زائیر، کە بەفیلّو سەلیقەیەکی باشەوە زۆربەی ئەفریقای خۆرهەلاّت لەخۆرئاوا جیا دەکاتەوە.

لیبیاییەکان سەردەمانێك دەیانتوانی بەچڕکردنەوەی وردبینی سیاسیانەی خۆیان، گەر نەلّێین سەربازیانەیان، لەکەندوای (گینە) تا خۆرئاوا، یان لەدەریای سوورو لەناوچەی ئەفریقاوە بۆلای ڕۆژهەلاّتو باشور ببنە خاوەنی سەرکەوتنێك، ئەو کاتەش دەیانتوانی ببنە پارێزەری دەسەلاّتە کۆمۆنیستیەکەی (ئەسیوبیا). بەوجۆرە بەشێکی زۆری ئەفریقای ژێر چنگی بۆ پایەداربوونی (قەزافی) دەکەوتە فشارەوە. ئەو بەشەی ئەفریقا خاوەنی کانزایەکی ستراتیژیین کە بۆ (باکور) مایەی ژیان دەبوو. ئەوانە بەمیلەتانو دانیشتوانە جەنجالّەکەیەوە خاوەنی ڕابردوویەکی دوورودرێژو قولّی پەیوەندی سیاسیو کۆمەلاّیەتیو ئابوری لەگەلّ ئەوروپا بوون.

کۆماری ئەفریقای باکور بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ یەکێك لەبێبەشترین ولاّتە دواکەوتوەکانی سەرڕووی زەمین بووە. تاکە سەرچاوەی ڕاستەقینەی ئەلّماسی پیشەسازییە، کە سالاّنە نزیکەی چواریەکی ملیۆنێك قیراتی لێدەردەهێنرێت. لە (٣١/ دیسامبەر/١٩٦٥) ئەم ولاّتە پاش سەرۆکۆمار (دەیڤیدداکۆ) کەوتەژێر کاریگەری کەسێکی لەخۆبایی بەناوی (ژان- بدل- بۆکاسا)، کە بەهۆی کودەتایەکەوە جلّەوی دەسەلاّتی گرتە دەست.

لەسالّی (١٩٧٢) خۆی ناونا (سەرکۆمار بۆ ژیان)و لەسالّی (١٩٧٦) ناونیشانی (ئیمپراتۆری یەکەم)ی بەخۆی بەخشی و، دوای یەك سالّ لەئاهەنگێکدا کەتەنها وەك(کۆمیدییەکی سەرشەقام)بوو، تاجی نایەسەرولەسەر گالیسکەیەك دانیشت کە هەمووی ڕووکەشی ئالّتون کرابوو. بڕی تێچوونی ئەو ئاهەنگە دەیتوانی بۆ ماوەی سالّێك خەرجی ولاّتەکەی دابین بکات. بەوجۆرە، چونکە ولاّتەکەی لەنێو ولاّتە فەڕەنسی زمانەکاندا سەنگێکی گرنگی هەبوو، فەڕەنسا گرنگییەکی زۆری بە (بۆکاسا) دابوو. لەگەلّ ئەوەشدا ئەو ولاّتە بۆ ئەنجامدانی ڕاوی گەورە شوێنێکی گونجاو بوو، (بۆکاسا)و ئەوانەی دەسەلاّتداری ئەو ولاّتەبوون لەلای دەولّەتی فەڕەنسا وەك جۆرێك لەنێچیرەوانی گەورە دادەنران.

هەروەها ئەو شوێنە بۆ هێزە ئاسمانیو زەمینیەکانی فەڕەنسا، کە پارێزگارییان لەزۆربەی خاڵە سەرەکیەکانی ئەفریقای ناوەڕاست دەکرد، ناوچەیەکی بنەڕەتی جێگیربوو. هۆی ئەو پەیوەندییە زیاد لەسنورەی فەڕەنسا لەگەڵ سەرانی ئەفریقا لەپاڵ پەیوەندیو گرنگیدانی بەکاری تیرۆریزمو هەڕەشە ئەتۆمیەکان، بنچینەی یەکێك لەوسێ مەسەلە ئەمنیە بوو، کە ئێمە سەبارەت بەچاودێری وردی (بۆکاسا)و حکومەتە زۆردارانەکەی دەمانکرد. لەسەرەتای دامەزراندنمەوەو بەماوەیەکی کورت دوای ئەوە، (بۆکاسا) خۆی ناونا (سەرکۆماری ژیان)و، دەستمکرد بەئاگادار کردنەوەی (ژیسکاردستن) سەبارەت بەئەگەری هەڕەشەکانی ئەو پادشایە. ڕەفتارەکانی زیاد لەپێویست لەلای ئێمە ناپەسند دەردەکەوت.

(بۆکاسا) لەگەڵ ئەوەی تاجی نایەسەر، بووە مەترسییەکی گشتی. زیاتر پڕوپاگەندەی سەرنجڕاکێشو غەریب دەربارەی بڵاوبۆوە. لەبارەی بڵاوبوونەوەی چیرۆکێك کە زیانی پێدەگەیاند کارمەندێکمان بۆ پشکنینی بەفرگرەکەی (یەخچاڵ) ڕەوانەکرد، کە هیچ ئەندامێکی مرۆڤی تێدانەبوو. دووبارە چیرۆکێك دەربارەی ئەڵماسەکانی بڵاوبۆوە. لەسەرەتای ساڵی (١٩٧٩)و لەکاتی جەژنەکانی شەڕە قسەی هەفتانەی فەڕەنسادا، بڵاوکردنەوەی ئەو بیرۆکانەی کە گوایە ئەڵماسە گرانبەهاکانی ئەفریقای ناوەڕاست بۆ گەشتە جۆراوجۆرەکانی (ژیسکاردستن) بۆلای ئیمپراتۆریەتی (بۆکاسا) بەکارهێنرابوون، گرفتێکی دروست کرد. تەنانەت خەڵکی فەڕەنسا بەگشتی، کە لەڕووی خەرجیکارییەکانی سەرکردەکانیانەوە خاوەن دیدێکی بەرزن، لەڕاستیدا چاوەڕێی ئەوەیان لێدەکەن تا لەئاستێکی بەرزدا بژین، تا خاوەنی قورساییو میراتگری دەسەڵاتو پادشا کۆنەکانی فەڕەنسا بن. هەروەها ئەوەشیان دەزانی کە ئەم خەرجییە زۆرە بۆ هاوەڵی کردنی دیکتاتۆرێکی بچوکی بێبایەخی ئەفریقا، زۆرزۆرە. لەهەمان کاتیشدا ئەو دیارییە زۆرانە ببیووە مایەی شادی بۆ (ژیسکاردستن)، کە هەرئەمەش تاڕادەیەك بووە هۆی ڕوخاندنی دەوڵەتی فەڕەنسا. لەڕاستیدا ئەو ئیمپراتۆرە سەرقاڵی بەخشینەوەی فراوانی کانزا نەتەوەییەکەی بووبە سەر شوێنەکانی

دیدا. کۆماری ئەفریقای ناوەڕاستیش وەك زۆربەی وڵاتانی دی ئەفریقا ئەڵماسی پیشەسازییانە بەرهەم دەهێنێت، بەڵام لەکۆتاییدا مایە پوچ دەردەچن، چونکە ئەو ئەڵماسانە دەبنە ڕیزێکی بچوك لەموڵکی کەسایەتی یان مۆزەخانەی خشڵی سەڵتەنەتی بەریتانیا.

بەمجۆرە (بۆکاسا) لەبەخشینەوەو دەست بڵاویکردن هەرلەشوێنی دەرهێنانیەوە بەسەرئەو میوانانەی لەوێوە تێدەپەڕین چێژی وەردەگرت. (ژیسکاردستن)و گروپەکەی هاوەڵی لەمیوانە بێبەختەکان بوون، هەرچەندە بەوەرگری دیارییەکانی (بۆکاسا) ناودەبرا، بەڵام لەڕاستیدا پێینەگەیشتبوو.

دیارییەکانی (بۆکاسا) بەهایەکی نەبوو، هەموو ڕووداوەکە وەك لەکەیەکی نەنگی بەداوێنی سەرکۆمارەوە مایەوە، بەڵام ئەوەی کە ئێمە پێش هەموو شتێك لەلامان گرنگ بوو، هەرلەبەرئەوەش بەردەوام گوێمان بۆ زەنگ ڕاداشتبوو، ئەو گرفتە دەرەکیانەی (بۆکاسا) بوو، کە ئەگەری ئەوەی لێدەکرا زیان بە بەرژەوەندییەکانی فەرەنسا بگەیەنێت.

لەبەهاری ساڵی (١٩٧٩)دا بەڵگەمان دەربارەی ئەو گرفتانە چنگ کەوت. داوای دیداری (ژیسکاردستن)م کرد. چوونی سوپای (لیبیا) بۆ ناوپایتەختی ئەو وڵاتە کە تازە ناوی (ئیمپراتۆریەتی ئەفریقای ناوەڕاست)ی لەخۆی نابوو، بۆم ڕوونکردەوە. (ژیسکاردستن) حەزی بەدرێژەدان بەم لێکۆڵینەوەیە نەبوو. (بۆکاسا) جگە لەئەڵماسەکانی، لەلای ئەو نێچیرەوانێکی تایبەت بوو، حەزی لەڕاوشکاری فیلو شێربوو. پاش شیکردنەوەی بەش بەشی پەیوەندییەکانی (بۆکاسا) لەگەڵ (لیبیا) بەخێرایی، ڕووی تێکردمو پرسی: (تۆ هەموو ئەمانەت لەکوێوە دەستکەوتووە؟)

وتم: (بەڕێز سەرکۆمار، بەگشتی ناچارنیم هەرچی وردەکاری کارەکانمان هەیە بۆتی ڕوون بکەمەوە، بەڵام ئەمجارە باسی دەکەم بۆتان)

لەوکاتەدا چەند وێنەیەکم لەگیرفانم دەرهێنا، وتم: (بەڵگەنامەکانمان لەسەرچاوەی جۆراوجۆرەوە بەدەست دەهێنرێت. کارمەندانێکی لەدەزگاکانی فەرەنسادا کاردەکەنو، هەروەها ئەوانەشی لەناوخۆدا نیشتەجێن کە هاوکاریمان دەکەن. بەکرێ گیراوەکانیشمان لەدزینی ئەم

وێنانە لەجانتا دەستیەکانی خاوەنەکانیان، کە خەریکی مەلەکردن یان ڕاهێنانی وەرزشن، شارەزاییەکی زۆریان بەکارهێناوە.

(لیبیەکان) لەدیسپلیندا (پرۆسی) تەواو نین. ئەگەر چی لیبیەکان لەئیمپراتۆریەتی ئەفریقای ناوەڕاستدا بەرگی ناسوپاییان دەپۆشی، بەڵام وێنەکانیان لەناوجانتای دەستی باوكو دایكو کەسوکاریاندا بە بەرگی تەواوی سەربازیو نیشانەو مەدالیاکانی دەزگای نهێنی (لیبیا) وەگیرابوون. ئەوانە ڕاوێژکارانی مەدەنی نەبوون، وەك خۆیان ڕایاندەگەیاند.

درێژەم پێدا: (لیبیەکان یەك نەتەوەنو، کاتێك تێگەیشتم کە لەگەڵ ڕاوێژکارانی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتو کوبادا هاوکاری دەکەنو، ئێمە لەپڕێکدا ڕووبەڕووی دەرگیرییەکی تەواو بووینەتەوە چی ڕوو دەدات؟. بەڕێز سەرکۆمار، دەمەوێت کاتێك گەیشتمەوە ئۆفیسەکەم لەم بابەتە بکۆڵمەوە، ئەگەر شتێك ڕوویدا بێت لەڕاپۆرتەکاندا هەیە)

(ژیسکاردستن) پاش کەمێك ڕامان وتی: (زۆر باشە چیت دەوێت ئەوە بکە)

لەکۆتایی هاوینی ساڵی (١٩٧٩)دا، زانیمان کە (بۆکاسا) چاوپێکەوتنی لەگەڵ یەکێك لەهاوەڵەکانیدا هەیە، کە ئەویش (عقید قەزافی) بوو. ئاشکرابوو کە لەبەلای (بۆکاسا) ڕزگارمان ببوو، ئۆپەراسیۆنی (باراکۆدا) دەستی پێکرد. ئامانجمان لادانی (بۆکاسا) بوو بەبێ تەقاندنی تەنانەت یەك گوللەو، جێنشینکردنی کەسێکی دی کەبەرو پاراستنی ڕێسا دیمکراتیەکانی هاوپەیمانانی خۆرئاوا هەنگاو بنێت. (بۆکاسا) دوای چوار ساڵ، پێش ئەوەی قەرزەکانی بەتەمامو کەماڵەوە بداتەوە، لادرا.

(دەیڤیدداکۆ) پەنا هێندەیەکی سیاسی بوو لەفەڕەنسا. قەناعەت پێکردنی بەلەئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتیەك، کەدیاربوو هەنگاوێکی مەترسیدارو دژوارە، کارێکی ئاسان نەبوو.

(داکۆ) لەلاوێك چالاکتربوو، بەڵام لەپاشاندا گەیشتە ئەو بڕوایەی کە بەدواداچوون بۆ ئەم بابەتە لەپێناوی ڕزگارکردنی وڵاتەکەی لەنابووتی حەتمی تاکە ڕێگای پێویستو بنەڕەتییە. بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵیدا چەندین

نوێنەرمان ڕەوانەی خانووەکەی کە لەدەروەی پاریس بوو، کرد. پێیوترا کە: (ئەم ئۆپەراسیۆنە دەکەین، ئەو خاڵەش بزانە لەگەڵ چوونە ناوەوە بەیاننامەی سەربەخۆیی خۆتان ڕادەگەیەنن. ئێمە کۆلۆنیالیستێك نین کە کۆلۆنیەکانی خۆمان پاکسازی بکەینەوە، بەلام گەر لیبیەکان لەئەفریقای ناوەڕاستدا پێگەیەك بۆ خۆیان بدۆزنەوە، ئەوە خەڵکی خۆتانە کەدەیانەوێت بەرگری لەڕوودانی نەهامەتیەکانی دوای ئەوە بکەن.)

پرسیاری کرد: (کاتێك دەگەمە ئەوێ، کێ دێتە پێشوازی من؟). هەوڵەکانمان بۆ دڵنیاکردنەوەی خستەکارو لەکۆتاییدا پێمان ڕاگەیاند کە لەگەڵ نیشتنەوەی فڕۆکەکەی لە (بانگی) پایتەختی کۆماری ئەفریقای ناوەڕاست هەموو شتێك ڕێکخراوە. لەگەڵ ئەوەشدا، قەناعەتمان پێیکرد کە دووبارە دانانەوەی هیچ مەبەستێکی لەپشتەوە نییە. دوای دووهەفتە پاش ئەوە، (داکۆ) بەهاوکاری چەندکەس لەنوسەرەکانمان بەیاننامەی گەڕانەوەی ئامادەکردو، لەهەمان کاتیشدا ئێمە خۆمان بۆ ئۆپەراسیۆنەکە ئامادە دەکرد. ئۆپەراسیۆنێکی لەوجۆرە دەبوو تەواوی وردەکارییەکانی لەهەلومەرجی ئاسایشدا کامڵ کرابێتو لەتاریکیداو بە بەکارهێنانی سەد تا سەدو پەنجا کەس ئەنجام بدرێت.

لەهەموو قۆناغەکانی ئۆپەراسیۆنەکەدا، بەشەو دەچووینە ناوەوەو لەگەڵ یەکەمین کازیوەی بەیاندا شوێنەکەمان جێدەهێشت. زانیارییەکانی ڕابردوومان نمونەی باڵای هەموو ئۆپەراسیۆنێك لەهەموو جێگایەکی ئەم جیهانەدابووە. تیژەکانم لەماوەی سێ ساڵدا گەلاڵە کردبوو، لەوماوەیەدا هەرکاتێك یەکێك لەئەفسەرەکانم بۆ گەشت دەڕۆشت، بۆنمونە لەجیاتی کەنارەکانی (ئازور) یان ئیتالیا، بلیتێکی سەفەرکردن بەفڕۆکە بۆ کۆماری ئەفریقای ناوەڕاستم دەدایە. هەریەکێك لەوانە بەهاوەڵی دۆستێکی کچ یان کوڕ، ژن یان مێردو منداڵەکانیانەوە دەڕۆشتن‌و، کاتێك دەگەیشتنە ئەوێ دەستیان دەکرد بەوێنە گرتنی شوێنەکانی کە تیایدابوو؛ ڕێك وەك گەشتیارە جیهانیەکان. تەنها ئەو وێنانەی لەبەردەم فەرمانگەی پۆستە، ئیستگەی

تەلەفزیۆن، بنکە سەربازییەکان، سەنتەری تەلەفونی ئەلکترۆنییەکاندا گیرابوون گرنگ بوون و بەکەڵکی ئەوە دەهاتن کاریان لەسەربکرێت.

ئێمە لەسەردەمی کۆلۆنیالیزمیدا ئەو ئەفسەرانەی دی کە لەئەفریقای ناوەڕاستدا جێگیرببوون و لەگروپەکانی پاسەوانانی فڕۆکەخانەی (بانگی) بوون لەوێ هێشتبوومانەوە. دوو فڕۆکەی سەربەدەزگای جاسوسی فەڕەنسا بۆ هاتوچۆکردنی سوپا بۆ (بانگی) بەکاردەهێنران. پاشان چەند کەسێکمان بۆ بەکارهێنانی فڕۆکە نارده ئەوێ، تا بزانن لەچ سات و کاتێکدا دەرگاکە بکەنەوەو دایبخەن، لەکوێوە گلۆپەکان داگیرسێنن و چ کەسێك بکرێتە بەرپرسی تاوەری کۆنترۆڵەکەو شتی لەوبابەتە. لەسەرزەویش دوو گروپ لەدەستەی بەرگری ئاسمانیمان بۆ دروستکرد، کە بەهۆی گروپی پاسەوانانی فڕۆکەخانەکەوە ڕێنمایی دەکران، لەوکاتەدا بەپێویستمان نەزانی تەنها لەبری بەرکارخستنی مانگێك دراو بدرێت، لەگەڵ ئەوەشدا دوایین جار کە دراویان پێدرا بە بەهای دراوی ناوخۆیی بوو، کە هەڵئاوسانی زیاترکرد. دیارە لەهەموو شوێنێك مایەی قەرەبووکردنەوە بوو بەلاّم بێ بەهابوو. بەمپێیە تا شەوی ئۆپەراسیۆنەکە، واتە (٢٦/ کانوونی یەکەم/١٩٧٩) ئێمە بەتەواوی ئامادەبووین. دووکەس لەکارمەندانی هێزی ئاسمانی لەناوتاریکایی کۆتایی ڕێڕەوەکەدا بەچراوە ئامادەکران، کە جێگیرکران بۆ ڕێنوێنی کردنی فڕۆکەکان. فڕۆکە فەڕەنسیەکان پێشتر کاتێك وەستانێك لەکاردا ڕوویدەدا بەئاسمانی فەڕەنساوە دەخولانەوە. فڕۆکەیەکی میسری لەناو خاکی دەوڵەتێکی دراوسێوە، واتە (کۆنگۆ)وە، لەدرەنگانی شەودا داوای دەکرد لەوێ بنیشێتەوە، تا دووبارە فڕۆکەکە بپشکنن. ڕووداوێکی لەوجۆرە هەموو نەخشەو بەنامە داڕێژراوو نوسراوەکانی هەڵدەوەشاندەوە، بەلاّم ئێمە لە (کۆنگۆ)ش خەڵکی چالاك و کارامەمان هەبوو. لەهەمان چەند دەقیقەی کۆتاییدا هەڵەیەکی تەکنیکیان لەناوفڕۆکە میسرییەکەدا دروست دەکرد کەوای دەکرد ڕۆژێك دوابکەوێت. شوێنی فەرماندەییم لەبارەگای سەرەکی سەنتەری فەرماندەیی لەژێر زەمینێکی (پاریس)دا بوو. لەوێدا یاریدەدەرو کارمەندەکانم– لەوانە سەرۆکی فەرماندەیی، فەرماندەی گشتی هێزی

تایبەت، پسپۆڕان لەبواری ئەفریقای ڕەشپێست نشین و ئیمپراتۆری ئەفریقای ناوەڕاست—دەوورە درابووم. لەوکاتەی کە ئۆپەراسیۆنەکە لەساتەکانی دەسپێکردندابوو، (عقید ئام) کەسەرکردایەتی هێزە زەمینییەکانی دەکرد، لەدوا چرکەداو لەپەیامێکی بێسیمدا پرسی: (بەڕێز بەڕێوەبەری گشتی، لەوباوەڕەداین کە ئەو (بۆکاسا) ئێستا لە(تریپۆلی)یە، بەلام گەر بەڕێکەوت شەو گەڕایەوە بۆ (بانگی)، کە لەوباوەڕەداین بۆ هێرشکردنە سەرشارەکە سواری جێبێك دەبێت و شمشێر بەدەستەوە دێتە ئێرە، ئەو کاتە چی؟)

بۆ ساتێك دوودڵ بووم، بەخێرایی وتم: (دەستگیری بکەن و بەیانی زوو بیبەنە لای (داکۆ)

ئەو وتی: (ئەگەر خەلکی لەئێمە کوشت، چی بکەین؟)

وتم: (لەوحالەتەدا بیکوژن.)

پێش ئەوەی کارەکە پیادە بکرێت دەستوری ئاشکرام دابوو، کە بڕیارێکی لەمجۆرەبوو: (ئێمە پەیوەندی سەرسوڕهێن و نامۆ پێکمانەوە دەبەستێت، بەلام هیچ کاتێك تەلەفۆنتان بۆ ناکەم، هەرگیز. چونکە ئێوە گرفتارن نەك من. لەسەر کورسییەکەم لەناوبارەگای دەزگاکەم دادەنیشم، ئێوە هیچ کاتێك پێویستان بەئامۆژگاری ئێمە نییە، ئەوە ئێوەن پەیوەندی بەمنەوە دەکەن. لەم ڕووەوە نیازی هیچ هەنگاونانێکم نییە. ئێوە کەسانێکن بەرپرسن. ئەگەر پرسیارتان هەیە، بەهۆی ئەو هەموو هۆکارانەی لەبەردەستدایە بپرسە، بەلام نامانەوێت ئاگاداری ڕەوشەکەتان بین.)

لەوبڕوایەدا بووم کە ئەم ئۆپەراسیۆنە وەك هەولە نەزۆکەکەی (کارتەر) نەبوو بۆ ڕزگاکردنی بارمتە ئەمریکیەکان لەئێران، کە (عقید بکوین)ی چارەڕەش لەگەل دوازدە کەس، کە لەدووری هەزاران میلەوە دەستوریان دەدا، لەپەیوەندیدابوو. یەکەمین فڕۆکە بەبێ هیچ گرفتێك لەفڕۆکەخانەکە نیشتەوەو، لەلایەن دووکەسی خۆمانەوە ڕێنوێنی کرا. فڕۆکەخانەکە پێشتر داخرابوو، کارمەندەکانی چووبوونەوە بۆ شار. کارمەندەکانمان بەبەرگی تەواوی سەربازییەوە بەسواری جێبەکانیانەوە لەچەند دەقیقەیەکدا گوێزرانەوەو، گروپی هێرشبەر بەخێرایی بەرەو بینایەکی دەستەی گاردی

فڕۆکەخانەکە بەچەکی نیوە ئۆتۆماتیکیەوە بۆ بەردەم دەرگاو پەنجەرەکان لەجولەدابوون. ئەفسەرێکی کە بەزمانی لۆکالّی ئەوان دەدوا ڕاستەوخۆ کەوتە قسەکردن لەگەلّیانداو بەهۆی بلّندگۆیەکەوە پێیڕاگەیاندن : (نەهاتووین ولاّتەکەتان داگیربکەین، بەلّکو بۆیە لێرەین تا بەئاسانی کۆمەکتان پێبکەین، تا لەبەلاّی دکتاتۆر رزگاربن‌و، ئەگەر لەتوانادابوو دەولّەتی دیمکراتی بگێڕینەوە، ئێستا دەزانین ئەوە مانگێکە موچەتان وەرنەگرتووە، تکایە لەپالّ دیوارەکەدا ڕیزبن تا موچەتان بدەینێ.)

کاتێك پاسەوانەکان گەیشتنە بەردەم ئەو مێزەی موچەکەی لێدەدرا تێگەیشتین کە لەولاّتی خۆماندابن‌و ئازادین. کارمەندی تایبەت دانیشت‌و لیستێکی سەرفکردنی لەجانتایەك دەرهێنا. حسابەکان بەفرانکی ئەفریقایی نوسرابوون‌و، پەنجا فرانکی فەرەنسیش بۆ تەلەفۆنی نەتەوەیی ولاّتە ئەفریقیەکان وەك وردە لەلایەن بانکە سەنتەرییەکانی دییەوە دەخرایە سەرئەو موچەیە. کاتێك موچەدانەکە دەستی پێکرد ئەفسەری بەرپرسی ڕاگەیاندنەکەمان سات بەسات قسەی بۆ سەربازەکان دەکردو پێی دەووتن: (ئەفسەران؛ دەتوانن بەچەکداری بمێننەوە. دلّنیاتان دەکەینەوە ئەو هەنگاوە بنێن کە ناچارن ئەنجامی بدەن.)

لەپالّ خۆماندا هێزێکی پۆلیسی ناوخۆیمان پێویست بوو. فەرماندەکەمان ڕوویکردەکردە ئەو سەربازانەی بەرگی ناوخۆیان پۆشیبوو پێی وتبوون: (تکایە، چەکەکانتان لەپالّ بیناکەدا دابنێن.) تەنانەت یەك فیشەکیش نەتەقی. ئەفسەرەکانی گارد پێشنیازی ئەوەیان کردبوو کە ببنەچاوساغی هێزەکەی ئێمەو بیانبەن بۆشار.

چەند خالّێکی ستراتیژیمان داگیرکرد، چونکە لەوگوندە بچوکەدا، کە لەهەمان کاتدا پایتەختیش بوو، نیشتەجێبوون لەچەند خالّێکی ستراتیژیدا گرفتێك نەبوو، هەموو ئەوانەشمان باش دەزانی. بۆنمونە کۆشکی سەرکۆماری، سەنتەری ئیستگەی تەلەفزیۆن، بارەگای تەلەفزیۆن‌و چەند سەربازگەیەکی نیزامی. لەودەمەدا، دووەمین فڕۆکە، کە هەلّگری (داکۆ)و ئۆتۆمبیلە سەلّتەنیەتەکەی بوو، لەفڕۆکەخانەی بانگی نیشتەوە. لەهەمان

کاتدا، ڕۆژنامەنوسێك کە ئێمە بۆ ڕوونکردنەوی ئەو پرۆسەیە ئامادەمان کردبوو، کە بڕیاربوو بەیانی هەمان ڕۆژ مەیدانەکە بەجێبهێڵێت، دەنگو باسەکەی ڕاگەیاند، کە باسی لەوەدەکرد کودەتایەکی خشکەیی لەناوئیمپراتۆریەتی ئەفریقای ناوەڕاستدا لەئانوساتی ڕووداندایە. هیچ کەسێك، تەنانەت وەزارەتی دەرەوەی فەڕەنساش ئاگادارنەبوو. بەمجۆرە، لەلایەن وەزارەتی کاروباری دەرەی فەڕەنساوە تەلەفۆن بۆ باڵوێزەکەمان لە (بانگی) کرا، کە تازە لەخەو هەستابوو، کورتە باسێك لەوڕووداوە بەئەنجام گەیەندراو، هەواڵ گەیشت کە ئەو جگە لەشتی ئاسایی هیچی تر نازانێت. بەیانی ڕۆژی دواتر سەرکۆمار (داکۆ) لەکۆشکی سەرۆکایەتی نیشتەجێ بوو، ڕاگەیاندنی خۆی پێشکەش بەمیللەت کرد.

هێزە تایبەتەکانمان هەموو کە لوپەلەکانیان ئامادە کردبوو، بەپێی پلانی داڕێژراو، واتە لەگەڵ گزنگی بەیاندا بەشێوەیەکی قەرمیانە لەگەڵ هێزەکانمان لەوڵاتی (چاد)ی دراوسێ ئاڵوگۆڕیان پێکرا. بەپێی ئەمە، لەوکاتەدا خودی (بۆکاسا) ئاوارە ببوو، (عقید قەزافی)ی هاوەڵی پێشنیازی لەخۆگرتنی لەلیبیادا بۆکرد، بەڵام ئەو لەجیاتی ئەوە خاڵێکی دوورەدەستی لەکەنارەکانی (ئایۆری) بۆ دوورخستنەوی خۆی هەڵبژارد.

هێزە تایبەتەکانی خودی (قەزافی)، لەماوەی چەند ڕۆژێکدا (بانگی) یان چۆڵکرد، چونکە فراوانخوازییەکانی لیبیا بەتەوای پوچەڵ کرابۆوە. نالێین کە (قەزافی) لەهەموو ڕوویەکەوە نەخشەکانی خۆی بەوئیمپراتۆریەتە گەورەیەی ئەفریقاوە گرێدابوو، کە فراوانخوازییەکانی بۆ هەڵلوشینی ئەو سەرزەمینە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژی ڕۆشنبووە. چونکە دووجار لەباکورەوە هێرشی بردۆتە سەرچاد، کەیەکە سەربازییەکانی بەرەو مێرگی (فایلارژۆ)و قوڵایی بیابانی سەرووی پایتەخت (ئانجامنا) چووبوونە ژوورەوە، هێزێکی سوپای فەڕەنسا بۆ یاریدەدانی هێزەکانی (چاد) کە دژ بەلیبیەکان دەستیان بەهێرشکردن کردبوو، بەدرێژایی ئەو شەڕانە لەوێبوون. لەهەمان کاتدا، بەمەبەستی تێکشکانی یەکە سەربازییەکانی لیبیا دەستمدایە زنجیرەك هێرشی ئاسمانی، کە لەسەربنەمای (تێکشکاندنی لێبڕاوانە) ئەنجامدرا. ئەم

نەخشەیە دەبوو تا ئەو کاتە پارێزەری ئەمنیەتی (باکور) بێت دژ بەجیهانی باشور)ی (قەزافی). بەڵام بەپێچەوانەوە لەکۆتاییدا بواری دووبارە کرانەوەی هێزە پشتیوانەکانی لیبیای لەسەر سنورەکان ڕخساند. بێگومان هەنگاوێکی لێبڕاوانەی فەرەنسا دەبووە هۆی ئەوەی هێرشبەرەکانی کە لەناوسوپای لیبیادا چەندین ئەرکی قورسی ئەنجامدابوو لەناوببات و، لەوانەش بوو ئەو وڵاتەشی کە (قەزافی) هەمیشەوە وەك هەڕەشەیەك دژبە (باکور) پشتیوانی لێدەکرد لەناو بەرێت. لەڕاستیدا بەدرێژایی دەیەی حەفتاکان چەند هەوڵێك دژ بەخودی قەزافی و چەند فڕۆکەیەکی ئەو ئەنجامدرا، کە هەندێکیان بێسەمەربوون. ئەفسوس ئەو یەکێکە لەلایەنگرانی تیۆری (تێکشکاندنی لێبڕاوانە). لەسەرەتای مارس (١٩٧٨) سەرکۆمار (ئەنوەر سادات) لەمیسرەوە پەیامێکی بۆ ناردم، کە ئامادەگی خۆی بەرامبەر بەبڕینی دەستی (قەزافی) پیشاندەدا. هەرگیز بۆم ئاشکرانەبوو، (سادات) کە وڵاتەکەی چەند جارێك لەلایەن لیبیاو هێزە سەربازییەکانی دوچاری هێرش کردنەسەر ببوو، پێویستی بەئامۆژگارییەکانمان بوو یان کۆمەکی هونەری و تەکنیکی دەویست.

حەقیقەت ئەمەیە کە من فەرماندەی گروپێکی پیاوکوژی بەکرێگیراو نیم. بەمجۆرە، وەڵامی بەندە بۆ (سادات) ئەمەبوو، کە من پێکهاتەیەکم نییە کە ئەو جۆرەکارانە ئەنجام بدات. لەهەمان کاتدا ئەوەشم بەیاد هێنایەوە کە نزیکەی دووسەدو پەنجا هەزار میسری کە نزیکەی لەسەدادەی کۆی دانیشتوانی لیبیا پێکدێنن، لەوێ دژیان و کاریان دەکرد. بەدڵنیاییەوە هەڵی خۆخزاندنە ناوەوەی ئەو ژمارەیەی بڕێکی لەملیۆن کەمتربوو بۆ هەرمەبەست و خواستێکی کە بیویستایەو لەژێر پەردەی کارکردندا لەئارادابوو. بەڵام بڕوای (سادات) ئاوەژووبۆوە. لەدوای ماوەیەکی کەم سەرۆکی میسر بەدەستی کەسانێکی وڵاتەکەی، کە هەڵگری بیروڕای مەزهەبی بوون کوژرا. بەڵگەی ئاشکرا لەسەرئەوەی کە (قەزافی) یان هەوادارەکانی دەستیان لەوکوشتنەدا هەبووبێت لەئارادا نییە. بەڵام لاوازکردنی دیمکراسی (باکور) هەوڵو تەقەلای لێبڕاوانەی تاکتیکی سیاسەتی

(قـەزافى) بـوو، كەماوەيـەك لـــەوەو بەرلەهـــەوڵى دابەشـــكردنو دەســـت بەسەراگرتنى ئەفريقادابوو.
ئەو لەم بابەتـەدا هاوپـەيمانى زۆرى هـەبووە؛ لەوانـەش ئـەو سـەركردانەى دەتوانرێـت بـە (بـەڵێندەرانى تـيرۆريزمى نێودەوڵـەتى) ناوبـبرێن. بـەڵام پاكتـاوكردنى (قـەزافى) يـان كەسـانى وەك ئـەو ڕێگـاى چارەســەركردنى تـيرۆريزمى نێودەوڵـەتى نييـە. تەنانـەت گەڕانـــەوەى ديمكراســيش بــۆ ليبياكاريگەرييـەكى كـەمى ڕاستەقينەى دەبێت. هەميشــە ئاوارەيـەكى دى لەئارادا دەبێت كە بۆ ئـەنجامدانى كـارى لـەوجۆرە- كـارە تيرۆريستيەكان- بتوانێت كەسێكى وابدۆزێتـەوە، نەتـەوە پەرسـتێكيش هــەربووە بتوانێـت پێداويستيەكانى بۆ دابين بكات.
لـێرەدا پلـــەى فيداركـارى ڕاسـتەقينە لـەئارادابووە، كەيـەك لـەوى دى باشتربووە. بۆنمونە كەسـانى وەك (ئـەبونيزال)و (ابـوداود)، يـان تيرۆريسـتى نێودەوڵەتى (كارلۆس) كە ئێستا ليبياى ناوناوە بنكەى نيشتمانەكەى. هيچ كام لەمانە هەرگيز لەهێرش بردنە سەرئامانجێك، كە لەساتوكاتێكى گونجاودا ديـاريكراوە، دوودڵ نـــەبوونو زۆرجـاريش بـەبێ هيــچ ئامۆژگارييـــەكى سەرپەرشتيارەكانيان، كارێكيان ئەنجامداوە.
لەسـاڵى (١٩٧٠)وە تـا سـاڵى (١٩٨٨) چـەند پەيماننامەيـەك لـەنێوان دەوڵـەتى فەڕەنسـاو هـــەندێ لەوگروپانـــەى كـە (ئـەبونيزال) سەرپەرشـتى دەكـردن بەسـترا، كـە بەهـــەوڵێكى ســەركەوتووانە بـۆ پاراسـتنى خـاكو سەروسامانى فەڕەنسيەكان دادەنران؛ هەرچەندەش لەم خولەدا شڵەژانى زۆر لەنێوان پـاريسو تريپۆلـيدا هـەبوو. بەدرێژايى ئـەو سـاڵانە بڕوايـەكى نـهێنى لەئارادابوو كە تيرۆريستەكان با لەدەرەوەى خـاكى فەڕەنسـادا ئۆپەراسيۆن بكەنو بەسوپەركردنى ئەورووپيە هاوپەيمانەكانيشمان، كە هيچ خراپەيـەكيان تيانەدەدى، هيچ چالاكيـەك لـەناو فەڕەنسـادا ئـەنجام نـەدەن . هيچ كـاتێك پشتگيرى ئەم بڕيارەم نەكردووە، بەڵام ڕێكخستنى بەرايى كارى ئەم گروپانە بڕيـارێك بـوو لەسـەربنەماى سياسـەتى نـاوخۆ، كـە دەزگـاى جاسوسـى هيچ توانايەكى بەسـەريا نەدەشـكا. پەيماننامـــەى ســەرەوە لەگـەڵ هێرشـێكى

خوێناوی بۆ سەرکەنیسەیەك لە (ڕیکۆکپرنیك) لەپاریس دەستی پێکردو، سەرئەنجام بەسەرکەوتنی دەوڵەتی سۆشیالیستی سەرکۆمار (فرانسۆ میتران) لەساڵی (١٩٨١)، کۆتایی پێهات. لەوەودوا خاکی فەرەنسا بووە مەیدانی پێکدادانی گروپە تیرۆریستە جیاوازەکان و، لەزۆر ڕووەوە وەك هێلی یەکەمی بەرەی جەنگی چوارەمی جیهانی لێهات.

بەشی دەیەم:

## ناوچە مین ڕێژکراوەکانی ناویادەکان

تیرۆریزم بەگشتی وەك چەکی هەزاران پێناسـەکراوە. ئەمە چەکێکە کە کاریگـەری لەسـەرهەموو سیستمی ڕێکخراوەیـی سیاسیمان نـەك تەنـها لـە (باکور) بەڵکو لەسەرهەموو ئەوانی دیش دادەنێت. بەگشتی ئەو شەڕانەی کە ئەم چەکەی تێدا بەکاردێت سایە بەسەرهەموو ژانیانماندا دەکێشێت.

هەڵبەتەخودی جەنگی چوارەمی جیهانی یەکێکە لەوجەنگانـەی تا ئێستا هیچ براوەیەکی دیاریکراوی نییەو، لەواقیعدا هیچ تەلیسمێکی سەرکەوتنیشـی تێدا نییـە. بـەڵام ئـەوەی کـە لـەڕابردوودا لـەیادەوەری‌و کابوسـەکانماندا ماونەتەوە شکستەکانمانن: گەر ئێمـە سـتراتیژمان لەڕووبـەڕوو بوونـەوە لـەم شەڕە گەورەیەدا نەگۆڕین بەهەمان شێوە دوچاری هەمان شکستەیەك لەدوای یەکەکان دەبینەوە. دەبێت ئـەوە بزانـین کـە بـەهیچکام لەوهۆکارانـەی تـاکو ئێستا بـەکارمان هێنـاوە سـەرکەوتن بەدەسـت نایـەت. ژمارەیـەکی کـەمی ئەوکەسانەی کە ڕابەرێتی وڵاتی ئێمەیان کردووەو، لەواقیعدا هەندێك لەوانەی کەهەموو ڕۆژێك لەبەرەی پێشەوەی ئەو جەنگەدان، لەوەگەیشتوون کە ئێمـە گرفتاری زنجیرەك شەڕبووینەتەوە کە هیچ ئامادەگیـەکمان بـۆی نییـە. ئێمـە خـاڵی لاوازی زۆرمـــان هەیـــە، کـــە ڕێکخـــراوە تیرۆریســـتیەکان بـــەهۆی مکوڕبوونیانەوە چەندین جار توانیویانـە سوودی لێوەرگرن. یـەکێك لەخاڵـە لاوازە گرنگـەکانمان کـە تائێسـتاماوە ئەمەیـە کـە لەبنـەڕەتدا سـەبارەت بـە بەرگریکردن لەناوهەلومەرجی نەتەوەییدا وایدەبینین لەهەرشـوێنێك تـیرۆریزم لەســـەرزەمینەیەکی گرنـــگ یـــان نێودەوڵـــەتی کاردەکـــات‌و لەســـنورە ویستراوەکانی خۆی بەئاسانی دەپەڕێتەوە پێویستە ئامانجێك هەڵبژێرین کـە لـەجیاتی کۆتـایی هێنـان بـەکاری نەتـەوە پـەرستێکی تایبـەت هـەلی ترمـان لەناوئامانجەکاندا بۆ بەدیبهێنێت. تیرۆریستەکانی (باسك) بابەتێکە کـە زیاتر لەخولەکانی (١٩٧٠ و ١٩٨٠) داسەرنجی ئێمەیان بۆ خۆیان ڕاکێشابوو. پێـش ئەوکاتـە (ژولیـوس سـیزار)ی (باسك)ی، کـە خـەڵکانێکی خـاوەن عەشـقی

ئاگرینی نەتەوەیی هەبوو، پەیوەندی زۆری بەگوندە کوێستانیەکانی خۆیەوە- کە تا چیاکانی (پیرنە)ی سەرسنورەکانی فەرەنساو ئیسپانیای ئەمرۆ درێژ بوونەتەوە- هەبوو. ئەوانە شانبەشانی سوپای عەرەبەکان کە هێرشیان کربووە سەرئەورووپا جەنگابوون و، بەدرێژایی جەنگەکانی سەدەی رابردوو بەهاوەڵی هێزەکانی (شارلمانی) لەشەڕدابوون. شاعیری سەدەی ناوەڕاست، (ڕۆلان)ی فەرەنسی لەیەکێك لەناودارترین شوێنە نهێنیەکانی باسکەکان لە (ڕونسۆ) کوژرا. لەسەدەی نوێدا، لەودەمەوەی کە سنورەکانی نێوان فەرەنساو ئیسپانیا کێشران، ئەوانە مەیلی دامەزراندنی نیشتمانی (باسك)یان هەبووە، کە لەواقیعدا لەڕووی مەعنەوییەوە بەتوندی پێکەوە گرێدرابوون، بەڵام ئەو خەونە نەهاتەدی. باسکەکان، کە وەك هەر نەتەوەیەکی دی سەرڕووی زەمینن بەسەردوو دەوڵەتدا دابەشکران، کە تەنها دووسەدو پەنجا هەزار کەسیان لەفەرەنسا جێگیربوون. هەوڵی زۆری یەکخستنیان لەدەیەکانی (١٩٥٠)وە کاتێك گروپەکانی خوێندکاران چاویان لەریفۆرمە سەرەکیەکانی پارتی نەتەوەیی و یاسایی (باسك) بڕیبوو دەستی پێکردو، ڕێکخراوێکی پەرلەمانی بەناوی (I.T.I) پێکهێنا. پلەبەپلە لەدەیەکانی (١٩٦٠)و بەتایبەتی لە (١٩٧٠ و١٩٨٠) تیرۆریستەکانی (باسك) بەتەواوەتی بەرەو توندوتیژترین جۆری چالاکی نواندن چوون و، دەسیانکرد بەهەوڵدان بۆ پەیداکردنی هەلوپەیمان لەهەرشوێنێك کە بکرێت. مەشقکردن لەکامپە تیرۆریستیەکان لەشوێنە زۆردوورو چەپەکەکانی (لیبیا) و (کوبا) ئەنجام دەدراو، بەئامادەیی و پڕ چەککراوی بەتازەترین چەکی ئۆتۆماتیکی و مادەی تەقینەوەوە دەگەڕانەوە.

لەوماوەیەدا لە (بیاریتز)ە وەتا (بیلبایۆ) گرژی و ئاڵۆزی، کە زۆرجار چاوەڕوان نەکراوو خوێناوی بوو، ببووە بەشێك لەژیان. لەساڵی (١٩٧٩)دا پارتیزانە چەکدارەکانی (I.T.I) ئەفسەرێکی پۆلیسی لاویان لەگەڵ زاواکەی، کە بۆ سەیران و گەشت چووبوون بۆ گوندێکی (باسك) لەدەرەوەی شار،

کوشت. لەڕووبەڕوو بوونەوەیەکی ڕێکەوتدا بەئاشکرا شۆفێرێکی تاکسیو پشکنەرێکی پاسی ناوشار کوژران.
پاش هەر ڕووداوێکی خوێناوی تیرۆریستەکان بەرەو ئەو سنورانەی حەشاریاندەدان دەکشانەوە. پیاوکوژێك لەفەڕەنسا واتای هەڵاتن بەرو ئیسپانیاو، بۆمب دانەرو تەقینەوە کارێك لەئیسپانیا واتای پەنابردن بۆ فەڕەنسابوو. بەئاوڕدانەوە لەنەبوونی هەماهەنگی نێوان پۆلیسو دەزگا جاسوسیەکان لەهەردوو وڵاتدا لەهەردوو بەری سنوورەوە ئەو جۆرە هەلانە بۆ تیرۆریستەکان زۆربوو. بەڵام تیرۆریزمی (باسك) بەسوودوەرگرتن لەچالاکیە نەتەوەییەکانی بۆ زیادکردنی نەتەوە پەرستیو هزری ئایدیۆلۆژیانە بەهیچ شێوەیەك بێهاوتاو وێنە نەبووە. بۆنمونە لەژاپۆن هەمیشە گروپی شاراوەی نەتەوەیی هەبووە. سوپای سووری ژاپۆنی پێکهاتەیەکی بچوكو توندڕەوو تەنانەت ئانارشیستی خاوەن ئامانجێکی نەتەوەیی بوو، کە بەشێوەیەکی پەرتوبڵاو لەئەیلولی (١٩٦٩)دا لەلیژنەی کۆمۆنیستە شۆڕشگێڕەکانی (ترۆتسکی) لە (تۆکیۆ) جیابیوونەوە. ئەندامە خوێندکارەکان خۆیان بە بەشێك لەهێزی شۆڕشگێڕی جیهان دادەنا، کە ئاگری شەڕێکی پارتیزانانەی فراوانیان لەدەوروبەری شارەکان خۆش دەکردو، بەهرەی خۆیان ڕاستەوخۆ لەخوێندکارە خۆپیشاندەرەکانی (پاریس) لەمانگی ئازاری (١٩٦٨) وەرگرتبوو. یەکەمین کاریگەری سوپای سووری (ژاپۆن) لەئاسیادا، فڕاندنی فڕۆکەیەکی هێڵی ئاسمانی لەمارتی (١٩٧٠)دا بوو. لەتەواوی دەیەکانی (١٩٧٠)دا زەمینەی هەنگاوەکانی ئەو سوپایە فراوانبوو. لەئابی (١٩٧٥)دا ئەندامانێکی کە چەکی نیوە ئۆتۆماتیکیان پێ بوو ماسکیان کردبوو پەلاماری بینایەکی ئیدارەیان لە (کوالا لامپور)دا، کە ئۆفیسی کۆنسڵی ئەمریکای تێدابوو. بەمجۆرە پەنجاودوو بارمتەیان دەستگیرکردو، لەبەرامبەر ئازادکردنی پێنج کەس لەهاوەڵەکانیان لەزیندانەدا سەرکەوتوو بوون. تیرۆریستەکانیش پاش ئەو ڕووداوە بەرەو (لیبیا) ڕۆشتن، کە یەکەمین پەیوەندی ئاشکرایان لەگەڵ

تیرۆریسته نێودەوڵەتیەکان (قەزاقی) بوو. لەئەیلولی (١٩٧٢) باڵوێزی فەرەنسا لە (لاهە) فڕێنراو، ماوەی پێنج ڕۆژ لەلایەن گروپێکی پێنج کەسی سوپای سوری ژاپۆنەوە کرا بەبارمته. ئێمە زۆر سەرقاڵی هەلێکی سەرکەوتووانە بووین بۆ ئازادکردنی. لەماوەی بارمتەییدا ئازایەتیەکی زۆری پیشاندابوو. بەنیگەرانییەکی زۆری ئەم ڕووداوەوە هەرزوو زانیمان کە دەسەڵاتدارانی فەرەنسی بەهەڵە چەند هەفتەیەك لەوەوبەر سەرکردەی ئەو گروپە تیرۆریستەیان- کە ئێمە بەسامناکترین کەسمان دادەنا- ئازادکردووە. ئەو بەهۆی هەڵەیەکی تاڕادەیەك بچوکەوە لەزیندان لە (پاریس) هێڵرابۆوەو، پاشان بەهۆی ناهەماهەنگیو گروپ چێتی بیرۆکراتیانەوە ئەم تیرۆریستە بەکتوپڕیو بەبێ ئاگادار کردنەوەی دەزگا جاسوسی فەرەنسا ئازادکرابوو. ئەگەر ئێمە ئازادکردنی ئەو تیرۆریستەمان پێشبینی بکردایە، ڕاستەوخۆ بەرپرسانی ئاسایشی وڵاتانی دراوسێ، لەوانە هاوشانە هۆڵەندیەکانمان، ئاگادار دەکردەوەو، (فەرەنسا)مان لەورقوکینەیە ڕزگار دەکرد.

ئەم تیرۆریستە ژاپۆنییە وادیاربوو کە دەیتوانی ڕێگای خۆی تا (لاهە) بەکەمترین ئاستەنگ بکاتەوە؛ ئەو شوێنەی کە تیایدا دەمودەست دەستی دەدایە گرێچنیەك بۆ تۆڵەسەندنەوە، کە لەوبڕوایەدابوو فەرەنسا بۆ سوکایەتی‌پێکردنی ئەو کارەی کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا بەفڕاندنی بالوێز ئەم تیرۆریستە ئومێدەواربوو کاریگەری لەسەرڕەوتی ئازادکردنی هاوڕێیەکی دی دابنێت، کە لەزیندانی فەرەنسادا بوو.

چونکە تیرۆریستە پرۆفیشناڵەکان بەڵگەنامەو ناسنامەکانیان چۆن بوێت دەیگۆڕن، ئاساییە کە پاسپۆرتو بەڵگەنامەکانیان ڕاستەقینە نەبن، بۆ ئەوەش بەرامبەر بەناسینەوەیان و ڕێگری لەبەردەم چالاکیە تیرۆرییەکانیان سنورو تخوبەکانی بەردەمیان لەلای دەزگاکان زۆرکەم دەبنەوە. هەڵبەتە جگە لەئۆرگانەکانی زانیاری، کە بەدرێژایی شەوڕۆژ لەهەموو ڕوویەکەوە لەم کارەدا لەوانی دی لەپێشترن. یەکەم گروپی تیرۆریستی کە لەلایەن (لیبیا)وە

پشتگیری دەكران گەلاڵەی دانانی بۆمبێكیان لەگەشتی ژمارە (١٠٣)ی پان ئەمریكان- كە لەكاتی پەڕینەوەی بەئاسمانی لۆكەربی لەئسكتلەندا لە (٢١/سێپتەمبەر/١٩٨٨) تەقییەوە- داڕشتبوو. ئەم گروپە هۆكارەكەیان لەكارگەیەكی بۆمب دروستكردنەوە بەدەسهێنابوو، كە لەئاپارتمانێكی بچوكی دەروەی موینیخ دابوو. ئەم كارگەی بۆمب دروستكردنە، كە پێشتر دامەزابوو، لەلایەن پۆلیسی ئەڵمانیای خۆرئاواوە هێرشی كرایەسەر. لەوكاتەدا ئەم زانیارییە هەستیارە كاتێك لەڕێگای تۆڕی زانیاری نێودەوڵەتیەوە پەخشكرا كە بەداخەوە زۆر درەنگ بوو.

تۆڕی زانیاری دەوڵەت بۆ دەوڵەت هەیەو، ئێستاش لەزۆر روەوە هەن، بەڵام كارەكانیان تەواو نییە. لەهەموو هۆكارێكی سەركەوتن یان شكست پێهێنانی كارێكی تیرۆریستانە هیچ ڕەگەزێك گرنگتر لەڕەگەزی (زانیاری) نییە.

لەواقیعدا كۆكردنەوە، ڕاڤەو شیكاركردن، پەخشكردن و بەكارهێنانی زانیاری شتێكی چاوەڕوانكراوە. لەلایەكی دییەوە تیرۆریستە پرۆفیشناڵەكان بەوردی لەهەموو كارێك دەكۆڵنەوەو بەدووی لاوازترین خاڵی پەیوەندی لەهەر بازنەیەكی چالاكیدا دەگەڕێن. كاتێك ئامانجەكەیان قوربانیەكەیان هەڵدەبژێرن شیكردنەوەی وردو بەش بەش لەسەرژیانی و ڕەفتارەكانی دەكەن و، بەبێ ئاگاداری خۆی دەیخەنە ژێر چاودێری، تاقیكردنەوە، وێنەگرتن و، خشتەی ڕۆژانەو هەفتانەو مانگانەیان لەسەرئامادە دەكەن. لەوانەیە پزیشكێك بۆ چاودێریكردنی ئامانجێك دابنرێت، كە لەدانیشتنێكی شەوانەدا یان لەكاتی نانخواردندا سیماو شتە سەرنجڕاكێشەكان بۆ ئەوان بخاتە ژێر چاودێرییەوەو، نەخۆشیەكانی دیاری بكات تا سەرۆكی تیرۆریستەكان سوودی لێ ببینێت.

خاڵی لاوازیی لەوانەیە نەخۆشییەكی فیزكی نەبێت، یان لەوانەیە شوێنێك یان كاتێك بێت، كە تیایدا قوربانیەكان كەمتر پارێزراون. چالاكیەكی لەوجۆرەخودی خۆمی توند هەژاند، ئەوەش كوشتارگەلێك بوو كە لەلایەن

(IRI) دژبە (ئال مانت بتل) ئەنجامدرا، کە لەساڵی (١٩٧٩) فەرماندەی هێزی دەریایی بوو لەبۆرما. من (مانت بیتل)م لەسەردەمی جەنگی دووەمی جیهانییەوە دەناسی. لەمانگی (حوزەیران/١٩٤٦) بۆ بەئەنجام گەیاندنی کارێکی جەنەڕاڵ (ژوین)و بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ (چیانکایچك)ی ڕابەری (چین)، چووبوومە ئەوێ.

(مانت بتل) ئەودەمە فەرماندەی گشتی هێزە یەکگرتووەکانی ئاسیای باشوربوو. کاتێك لەڕێگای هندو چینەوە گەڕامەوە فڕۆکەکەم لەکاتی فڕیندا دوچاری کێشەیەك هات، لەدارستانێکدا نیشتینەوە، کە بەپێی زانیارییەکانم هێشتا هەرماوە. هەرچۆنێك بوو ڕزگارمان بوو؛ چونکە کەسەکانی سەربە (مانت بتل) لەڕێگای بێسیمەوە لەکێشەکەمان ئاگاداربوون و فڕۆکەیەکی بچوکیان ناردە ئەوێ کەتاکە تاکە ئێمەی ڕزگارکرد. تا دوای سیو پێنج ساڵ لەوڕووداوە هەلی سوپاسکردنیم بۆ هەڵنەکەوت.

لەوسەردەمەدا، لەکاتی نیوەڕۆخوانێکی پایزی (١٩٧٨)، لەماڵی (ترزدوسنت فاڵ)ی کچی مامم، کە نوسەربوو، ئەم هەلە هاتە پێشەوە، لەوکاتەشدا ماوەیەك بوو سەرۆکی دەزگای نهێنی فەڕەنسا بووم.

(مانت بتل)، کە کوڕی مامی شاژنە (ئەلیزابیت)ی دووەمی جوانو پڕ ئەدەبو سەرپەرشتیاری شازادە (چارلس) بوو، ببوە گەورەترین سەڵتەنخوازی ئینگلتەرا، کە دەسەڵاتو شوێنگەو شکۆمەندی تێدا کۆببوۆوە. ئەگەر سوپای کۆماریخوازی ئێرلەندا (IRI) بیتوانیایە لەناوی ببەن، زەبرێکی گەورەی دەسرەواندە دڵی سیستمی ئینگلتەراو بوونی لەئێرلەندای باکور، چونکە کۆشکە شکۆمەندەکەی (مانت بتل) لەئێرلەندەبوو. پاش سوپاسکردنی بۆ ڕزگارکردنی خۆمو ئەوانی دی لەدارستانەکەدا، کاتێك نیوەڕۆخوانەکەمان لەتەواوبووندابوو ڕووم تێکردو وتم: (دەزگا نهێنیەکەمان گەیشتۆتە ئەو دەرئەنجامەی کە هەڕەشەی ڕاستەقینە لەلایەن سوپای کۆماریخوازی ئێرلەنداو، هەروەها (قەزاف)یەوە کە کۆمەکی زۆربەی

چالاکیەکانیان دەکات، ئێوەیان خستۆتە هەلومەرجێکی هەستیارەوە. داوات لێدەکەم کە زیاتر گرنگی بەوشتەبدە کە پێشتر چاودێریت دەکرد)

پاشان بۆم روونکردەوە کە مانەوەی بۆ ماوەی مانگێك لەهاویندا لەگەڵ منداڵو نەوەکانی لەئێرلەندا بەبێ هیچ پارێزگارییەك بۆ ئەو زۆر مەترسیدارە. فەرماندەی دەریایی لۆرد (مانت بتل) بەدەنگێکی بەرزپێکەنیو، وتی: (کەسانی دەورووبەرم لە (ئیسلیگۆ) پەرۆشی منیانە؛ بەهەمان شێوەی کە من عاشقی ئەوانم. پێشتریش ئەم هەواڵانەم بیستووەو، هیچ سەرچاوەیەکی مەترسی لەئارادا نییە.) پاشان ئەو پێشنیاری کرد کە گفتوگۆکەمان سەبارەت بەگەڕانەوەی بۆ ماڵەکەی لە (برودلندن)و لە (هامپشایر) لەئینگلتەرا درێژە پێ بدەین. ڕێزێکی زۆری لێدەنام بۆیە هەرگیز توانای ڕەتکردنەوی بانگهێشتنەکەیم نەبوو، پێش ئەوەی بتوانم بانگهێشتەکەی بەجێبگەیەنم، واتە نزیکەی ساڵێك دوای ئەوە مرد.

بەوجۆرەی هەستم پێدەکردو ترسم لەوبابەتە هەبوو، لەناو ئەو بازنە ئاسایشەی بۆ خۆی دروستکردبوو دەسەڵاتی هەبوو، بەجۆرێك کە بەدرێژایی هاوینان بە بەلەمێکەوە بەپێی نەریتی ئێرلەندیانەی خۆی دەچووە دەریاوە، کە بەلەمەکە لەژێر چاودێری هەمیشەییدا نەبوو.، لەکاتێکدا کە دەبوو لەژێر چاودێریکردنی وردداا بێت. لەشەوی (٢٦ یان ٢٧)ی ساڵی (١٩٧٩) تیرۆریستەکان توانیبوویان بۆمبێك لەناوبەلەمەکەیدا بچێنن و، بەئاسانترین شێواز مەیسەریان کردبوو. تەقینەوەی بۆمبەکە فرێیدابوو بەهەواداو یەکێکیش لەنەوەکانی پارچەپارچەکردبوو. ئەندامانی دی خێزانەکەی بەتایبەتی کچەکەی خانم (برابۆرن) بەسەختی بریندار ببوون.

ئەوکاتە دەبوو کاری جاسوسی لەهەردوولاوە دەست پێبکات. دیارە تیرۆریستەکان، جگە لەوەی کە سەرانی جیهانی (باشور) ڕێنماکارو سەرچاوەی کۆمەکی مادییان بوون، بۆ خۆشیان دەیانزانی چۆن کاری سیخوڕی ئەنجام بدەن. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ هۆیەك نەبوو کە بۆچی دیموکراتیخوازەکانی خۆرئاوا نازانن بەوجۆرە ڕەفتار بکەن.

بەڵام زۆرجاران بەهۆی توانای بازووە سەربازییەکانمانەوە گەورەیی و گرنگی شوێنگەیەك پشتگوێ دەخەین. لەجیاتی ئەوە لەداپۆشینی نەهامەتیەکی لەناویدا گیرمان دەخوارد، یان هەڵسوکەوتکردن بەخواستی کەسانێك کەئامادەی بەکارهێنانی خاڵی لاوازیمانن، یان هەنگاوە ناچارییەکانمان بوون، دووچاری هەڵە دەبووین. پاش هێرشی ئەمریکا بۆ سەردورگەی (گرانادا) لە (کاریبی) بەماوەیەك، کە پەیوەندی زۆرگرنگ و مەترسیداری لەگەڵ (کوبا)و (کاسترۆ) سازکردبوو، چاوم بە (بیل کەیسی) بەڕێوەبەری (CIA) کەوت. لەودەمەدا کەم کەس دەیزانی بەزەحمەت سەرکەوتن لەدەست شکست فڕێنراوە. بەڕاشکاوانە وتم: (بیل، کارێکی باشت کرد.) ئەو وتی (بەڵێ، بەڵام گرفتمان هەیە) پرسیم: ( چ جۆرە گرفتێك؟)

سەیرە.. کاتێك گەیشتینە دورگەکە تیمێك لەئەندازیارانی (کوبا)ییمان بینی! پاشان وتی: ( لەکاتێکدا هەتا ئەوکاتە نەمان زانیبوو ئەوانە لەوێن. بەڵام دیاربوو ئەوانە جەنگاوەری تایبەت بوون. زۆر بەسادەیی زانیایمان لەسەرئەو دورگەیە نەبوو.)

لەوباوەڕەدا بووم کەمایەی تێڕامانە بەوزانیارییە کەمەوە ڕازی بوون هێرش بکەنە سەرئەو دورگەیە، کە دەیانزانی پەیوەندی نزیکی لەگەڵ کوبا و (کاسترۆ) دامەزراندووە. واتە ئەو وڵاتەی کە بەدەگمەن ڕازی دەبوو هێزە سەربازییەکەی لەخزمەتی هەردۆست و هاوپەیمانێکی بەهێزیدا دابنێت. دەزگاکەمان بەئاگابوو لەوماوەیەی (کوبا) سەرگەرمی دروستکردنی فڕۆکەخانە لە (گرانادا) بوو. (کەیسی) بەوردی سەیری دەکردم و ئاشکرابوو کە دەیتوانی هزرەکانم بخوێنێتەوە، وتی: (تۆبیت چی دەکەیت؟) وتم: (لەهەردوورگەیەکدا یەك کەس جێگیردەکەم و هەفتەیەك دەیخەمە ژێر چاودێرییەوە. یان بە بەلەمێکی بچوکەوە بەرەو دەوروبەری دورگەکەی دەنێرم تا لەنزیکیەوە لەنگەر بگرێت؛ دەزانیت لەوجێگایانەی وەك (کاریبی)ن بەلەمی بچوك وەك تەکسی ئیش دەکات؛ هاوڕەنگی لەگەڵ دەوروبەرەکەدا سروشتیانە دەبێت. ناتوانیت هەرگیز بیبینیت. ئەم بەلەمە

هاتوچۆ دەکات‌و بێسیمی تێدایەو زیاتر ئەو کارانە ئەنجام دەدات کە تۆ پێویستت پێیەتی)

بەرلەوە بەماوەیەك بۆیەکم جار (ویلیام ویستەر)م بینی. سەرکۆمار (ریگان) لەساڵی (١٩٨٦) ئەوی کردە بەڕێوەبەری سەنتەری دەزگای جاسوسی ئەمریکا. لەوکاتەدا سەرۆکی (FBI) بوو، سەبارەت بەگەشتەکەم هەندێك شتم لا درکاندبوو.

وتم: (دەزانیت لەماوەی چەندرۆژی رابردوودا سیازدەجار لەمجۆرە هاتووچۆیەم کردووەو لەوسیازدە شۆفێری تەکسییەی لەگەڵیدا سواربووم تەنها یەکێکیان ئەمریکی بوو، ئەوانیدی ئۆکرانی، پاکستانی‌و عەرەب بوون‌و، تەنها یەکێکیان خەڵکی کەناری (ئیۆدی) فەرەنسابوو. لەوباوەڕەدا نیت کە ئەوە مەترسییەکی گەورە بێت بهێڵیت کەسانی لەوجۆرە بەبێ هیچ کۆنترۆڵێك لەناوپایتەختدا شۆفێری تۆ بن؟) لەفەرەنسادا زیاتر لەهەشتا لەسەدای شۆفێری تەکسیەکان فەرەنسین. بوارێکم پێدا بۆ پرسیارەکەی کە پرسی: (بۆچی ئەمە هەرەشەیەکە لەسەرئاسایش؟) وەڵامم دایەوە: (تەکسی دروست ئۆتۆمبیلێکەو لەکەشێکی باشتردا دەتوانێت مرۆڤەکان، بەڵگەکان، برواکان، مادەی تەقینەوەو چەك هەڵبگرێت، لەگەڵ ئەوەشی کە ڕادیۆی تێدایە ئامرازێکی تەواوە. ئەگەر ناچاربم تیرۆریستەکان لەناو (واشنتن)دا ڕێك بخەم دووتەکسی بەکاردەهێنم. ئەوانە بەشێکن لەهاتووچۆی ناوشار. لەهەموو شوێنێکدا بوونیان هەیە، بەڵام بەتەواویش لەبەرچاوی هەموان نین)

ئەو پێشتر بیری لەم بابەتە نەکردبۆوە، گەرچی لەوڕۆژانەدا تەکسیەکان گەر سەرنشینەکانیان خەڵکی ناسراوبن دەیانتوانی بچنە ناو (لانگ لی)، (ڤێرجینیا)و بارەگای (CIA)وە. لەڕاستیدا لەهەمان یەکەمین دیارەکانمەوە بۆ ئەمریکا لەلام ڕۆشن بوو گەر ئێمە وردنەبین لەوانەیە ڕۆژێك ڕووداوی گەورە بقەومێت. ئەمە وڵاتێکە کە هیچ ناسنامەیەکی نەتەوەیی نییە، هەروەها سنووری فراوانی لەباکورو باشورو، هێڵی زۆری لەکەناری خۆرهەڵات‌و خۆرئاوادا هەیە. هەندەرانی چاودێرانێکن لەوێ کە هەموو

سەرچاوەیەکی گومان‌و شێتانە کۆنترۆڵ دەکەن‌و، هەندێك لەوانە چاودێری داهێزراوترین نەخۆشییە ناسراوەکانی مرۆڤ دەکەن. ڕۆژێکیان چووم بۆ (کۆشکی سپی) تا دووبارە چاوم بەسەرکۆمار بکەوێتەوە. لەگەڵیدا بەتەواوی سەرگەرم ببووم‌و پرسیم: (بەڕێز سەرکۆمار، لەوڵاتەکەتاندا گرفتێکی ئەمنیتان هەیە!) درێژەم پێدا: (تۆ کەوتوویتە نێوان دە تا پازدە ملیۆن کەسی پشتگوێ خراوەوەو، لەوباوەڕەدام گەر بەوجۆرە بڕوات ئیتر دەرەنگ وەخت دەبێت.)

سەرکۆمار پرسی: (کانت، هاوڕێی ئازیزم، کەمێك زیادەڕۆیی ناکەیت؟)

وەڵامم دایەوە: (نەخێر، بەڕێز سەرکۆمار، لەوباوەڕەدام ئەمانە خەڵکی محافیزەکارن، تۆ نازانی ئەم بێگانە ناودێر نەکراوان خەڵکی کوێن، چی دەکەن‌و بەچییەوە خەریکن؟ بەڕێز سەرکۆمار، ئایا دەتوانیت ئەوە بهێنیتە بەرچاوی خۆت کە دەتوانیت لەناوئەوانەدا تابوری پێنجەم دروست بکەیت، ئێوە تەنانەت ناسنامەکانیشیانتان نەدیون، ئەوانە خەڵکی هەموو وڵاتەکانن)

سەرکۆمار ئحمێکی کردو، وتی: (باشە، ئەو ژمارە زۆرانە خراپن. بواربدە لە (کلارک)ی دادوەر بپرسم) پاشان تەلەفۆنەکەی هەڵگرت‌و داوای کرد، پێیان ڕاگەیاندکە (ویلیام کلارک) لە (کۆشکی سپی) دایە. بۆیە فەرمانیدا: (باشە، بینێرن بۆ ئۆفیسەکەم). بەوهۆیەوەی کە دادوەر لەکەنارەکانی کالیفۆرنیابووە بەڕێز (ڕیگان) بەوقسانە دەستی پێکردو، پێی وت: (بەهاوڕێ فەڕەنسیەکەمان بڵێ کە ئەو نایاساییانەی بەدە تا پازدە ملیۆن کەس مەزەندە کراون ئایا لەوباوەڕەدا نیت کە زیادەڕۆییان تێداکراوە؟)

دادوەر (کلارک) وتی: (بەڕێز سەرکۆمار، ڕاست دەکات، بەڵام ژمارەکان زیاتر لەپازدە ملیۆنەوە نزیکن تا دە ملیۆن)

لەوڵاتێکی وەك ئەمریکا، کە جێگایەکە لەماوەی پێنج ساڵدا دەتوانیت ببیتە هاوڵاتی، زانیارییەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە ژمارەی زۆری خەڵکی ڕوسیاو کۆچبەرانی خەڵکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست‌و باکوری ئەفریقا ئیمتیازی یاساییان وەرگرتووە. هەندێك لەوانە جۆرە کارمەندێکن کە چاوەڕێی

چالاکین. کاتێك دەخرێنە ژێر چاودێرییەوە چاودێرەکە وێڵ دەکەن‌و بەمیلاکی دەبەن.

چاودێری یاسایش لێرەدا کۆتایی دێت. تەنانەت (FBI)یش بۆ بەدواداچوونی هەلومەرجی ئەو کەسانە خاوەنی هۆکاری پێویست نییە. بەدرێژایی ماوەی کارکردنم‌و، لەماوەی دوای ئەویشدا وەك هاوڵاتییەك، هەوڵمداوە لەگەڵ دەوڵەتانی دەرەکی سەبارەت بەدیدی سیاسی، ئیداری، سیستمەکانی جاسوسی کە خاوەنی دەلاقەیەکی ئەمنیەو تیرۆریستان دەتوانن بەئاسانی سوودی لێببینن ڕاوێژ بکەم؛ دەبێت ئێمە لەیەك جێگاوە دەست پێ بکەین. بەندە لەماوەی خولی بەرپرسیارێتیم لەپۆستی سەرۆکایەتی دەزگای جاسوسی فەرەنسادا زۆرجاران ڕاوێژم دەکرد. چەندین جار لەبەرامبەر ئەمریکییەکان دانیشتووم، کە ئەگەری هەڵبژاردنی ئەوان بەهۆی ئاشنابوونی ناوخۆییان‌و دەستی باڵایان لەناساندنی چالاکی تیرۆریستەکاندا بووە. ئەم هەنگاوانە وەك هەنگاوێکی لێکۆڵینەوەی پێشەکیانە سەبارەت بەو قەیرانانەی لەخاڵە جیاوازەکانی جیهاندا سەریان هەڵدەدا بەئەنجام دەگەیەنرا. یەکێك لەوهەوڵانە گفتوگۆکردن بوو سەبارەت بە (کەعبە)ی پیرۆز لە (مەککە) لەگەڵ هەندێ لەموسڵمانان لەتشرینی دووەم (١٩٧٩) بینایەکی بچوکی شێوە چوارگۆشەبوو، کە تەنها یەك ژووری تێدابوو، نزیك لەسەنتەری شاری (مەککە)و مزگەوتێکی گەورەبوو، کە هەروەها کەوتبووە نزیك سەنتەری عەرەبستانی سعودیەوە. کاتێك موسڵمانان لەبەجێهێنانی فەریزەی نوێژکردندا ڕوودەکەنە (مەککە)، لەڕاستیدا ڕوویان لە (کەعبە) کردووە. بەپێی ئاینی موسڵمانەکان (بەردەڕەش)ە کە لەلایەن جوبرەئیلەوە پێشکەش بەحەزرەتی ئیبراهیم کراوەو، ئیبراهیم‌و ئیسماعیل (کەعبە)یان دروستکردووە تا تیایدا بحەوێنەوە. لەسەردەمی (محمد)دا کافرەکان هێرشیان کردۆتە سەرئەم پەرستگایەو، ئیبراهیم پێغەمبەریش ئەو بتانەی ئەو ناوەیان پڕ کردبوو تێکی شکاندوون. لەوەودوا بۆتە پیرۆزترین پیرۆزی مەزهەبی ئیسلام. (حەج) یان سەردانی

بەکۆمەڵی (مەککە) دەبێت هەموو موسڵمانێك بەلایەنی کەمەوە جارێك سەردانی بکات. پێش پەیدابوونی فڕۆکە کاتێك موسڵمانە بەوەفاکان بۆ ئاینی ئیسلام بیابان‌و دەریاکانیان بەگرفتێکی زۆرەوە دەبڕی، ئەم گەشت کردنە شتێکی پڕ مەترسی بوو. کەسانێکی لەوگەشتەدا سەرکەوتوو دەبوون تا دواڕۆژی ژیانیان نازناوی (حاجی)یان بە بەرخۆیان دەبڕی. کاتێك دەگەیشتنە (مەککە) بە بەشداریکردنێکی دڵسۆزانە لەڕێوڕەسمی حەجکردندا بەپێی پەتی حەوت جار بەدەوری (کەعبە)دا دەسوڕانەوەو، بەیەك دەنگ ئایەتی قورئانیان دەخوێند. گەر لەوکاتەدا بمرن بەپێی بنەماکانی ئیمانی واقیعی دەیانخنە ناو تابوتەوەو حەوت جار بەدەوری (کەعبە)دا دەیسوڕێننەوە، لەهەمان کاتدا کەسوکارەکەی لەپشتەوە شین دەکەن. مزگەوتێکی گەورەو زەمینەیەکی کە (کەعبە)ی تێدایە، ئەشکەوت‌و شوێنی تایبەتی هاتوچۆی هەیە. گەرچی مزگەوتەکە لەدەرەوەیەو تەنها ئەوانەی نوێژ دەکەن هاتوچۆی دەکەن، بەڵام ئێمە زانیاری وردمان دەربارەی شوێنگەو دەوروبەرەکەی هەبوو. عەرەبستانی سعودی بۆ ئێمەو، لەڕاستیشدا بۆ زۆربەی وڵاتە خۆرئاواییەکان خاوەنی گرنگییەکی بەئەندازەی ئێران بوو. ئەفسەری باڵای جاسوسیمان لەعەرەبستانی سعودی، (عقید سی) ئەفسەرێکی ئاوارتەی بەرجەستەبوو، کەببووە عەرەبێکی تەواو، ساڵانێکی زۆری لەبیاباندا بەسەربردوبوو. زانیارییەکانی دەربارەی ئەوێ فراوانکردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر عاشقی سەرکردەکانی ئەوێ ببوو، کە لەعەرەبە دەوارنشینەکان بوون. ناسینی ئەم لۆردەبیابان نشینانە لەپشتی مێزی هیچ قوتابخانەو زانکۆیەکەوە بەدەسنایەن؛ مەگەر بەدرێژایی دوای نیوەڕۆ درێژەکان سواری حوشتری تیژڕەو ببین‌و لەناو دەوارەکاندا، لەدەوری ئاگری تەپاڵەی کۆکراوەی حوشتر چا بخۆینەوەو، کەمکەمە زانیاری پێویست کۆبکەینەوە.

ئەم بەشە لەجیهان سەردەمانێك شوێنی ڕاوگەی (ئەنگلۆ- ئەمریکی) بووە. هەڵبەتە بەهیمەتی کۆمپانیای نەوتی (ئارامکۆ)، کە کارێکی

هاوبەشی عەرەبستانی سعودیو ئەمریکایە. لەڕاستیدا لەیەکەمین سەردانمەوە بۆ ئەم وڵاتە پەیامی پادشایانە بەبۆنەی چوونم بۆ پایتەختو دیدار لەگەڵ خاوەن شکۆو دەسەڵاتدارانی پایە بەرزی سعودی ئامادەکرابوو، کەدەبوو لەلایەن ئەفسەرانی (ئارامکۆ)وە بۆ دەوڵەتی سعودیە ڕەوانە بکرێت. ئەوان هەموو هۆکارێکی پەیوەندی ناوخۆییو دەرەکیان کۆنترۆڵ کردبوو.

دەرئەنجام کەناڵی خۆمان لێداو پەیوەندی نزیکمان لەگەڵ سەرکردە پایەبەرزەکانی دەوڵەتو پێکهاتەی جاسوسیان لەتەختی پاشایەتی سعودیەدا سازکرد.

ماوەیەك بوو لەبەرزترین ئاستی سەرچاوەکانەوە زانیاریمان دەربارەی چوونی سوپای سۆڤیەت بەڕێگای قاچاغ لەیەمەنی خوارووەوە- کەوڵاتێك بوو لەباشورو لەژێر چنگی کۆمۆنیستەکاندابوو- بۆ ناوعەرەبستانی سعودی دەدایە دەوڵەتی سعودی.

دوورگەی (سوکوترا)، کە دەکەوێتە ئەوبەری کەناری وڵاتی کۆمۆنیستیی یەمەنی خواروو، گەورەترین بنکەی سۆڤیەتی بوو لەدەرەوەی سنورەکانی ئیمپراتۆریەتی عەرەبستان. ڕوسەکان لەلاوازبوونی عەرەبستانی سعودی بەهۆی بوونی سامانی نەوتیی زۆرو پەیوەستیی خۆرئاواییەکان بەونەوتەوەو، ئامادەیی فراوانی ئەمریکا لەوشانشینەدا، سوودی لەڕادەبەدەریان دەبینی. وڵاتانی دی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیش بەهۆی کۆنترۆڵکردنی بازاڕی نەوتی نێودەوڵەتی لەلایەن سعودیەوەو توانستی لەدیاریکردنی بەهاکەی بەهۆی قۆرغ کردنی بەرهەمەکانیەوە، پەیوەندیەکی تاڕادەیەك ساردیان هەبوو لەگەڵیدا.

ئیرەییو حەسادەت لەبزوێنەرە بەهێزەکانی ناوچەیەکی ناسەقامگیری وەك خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە. لەگەڵ ئەوەشدا سعودیەکان بەهۆی خانەخوێیی کردنی شوێنێکی پیرۆزی موسڵمانەکانەوە سەردەمانێکی درێژدووربوون لەودوژمنایەتی کردنەوە. یەکەمین زەنگی سەرهەڵدانی دەردیسەری لەکەعبە

لەتشرینی دووەمی ساڵی (١٩٧٩) لەلایەن میوانێکی (مەراکیش)ییەوە ئاشکرا کرا، کە لەکاتی بەجێگەیاندنی فەریزەی ئاینی خۆیدا گوێی لەدەنگی تەقاندنی گوللەیەك ببوو لەلایەن ژمارەیەك لەنەیارانی ڕژێمی عەرەبستانی سعودی، لەوتوندڕەوانەی لەلایەن موسڵمانەکانی دییەوە هاندەدران. کەسانێکی کە مەیلیان لەخراپەکاریو شەڕوشۆڕە، ئەوشتەی ئەوان بەدونیا پەرستیو گەندەڵی ڕۆژبەڕۆژ فراوانتربوونی سەرانی سعودی دادەنێن بووە هۆی ئەوەی دەست بدەنە چالاکی لەئاستی بەرزداو، هەوڵبدەن بەزەبری چەك دەسبەسەر کەعبەدا بگرن. میوانە (مەراکیش)ییەکە بەهۆی نزیکترین تەلەفۆنەوە باڵوێزخانەی مەراکیش ئاگادار دەکاتەوە، کە ئەفسەری ئێشکگریش یەکێك بوو لەئەندامانی دەزگای جاسوسی مەراکیش.

ئەم ئەفسەرە خێرا هەستی بەگرنگی شوێنەکە کردووەو ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە (ڕیبات)ەوە کردووە. لەماوەی چەند دەقیقەیەکدا (شاحەسەنی دووەم)، کە خۆی موسڵمانو نازناوی فەرماندەی ئیمانداری لەخۆی نابوو، بەخێرایی لەپەیامەکەی دەربارەی گرفتی شوێنە پیرۆزەکەیە تێگەیشتووە. بەڕێکەوت لەگەڵ (شازادە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدول عەزیزی ئالی سعود) سەرکردەی گاردی نیشتمانیی عەرەبستان، کە هەردوو هێزی پۆلیسو سوپایە، پێکەوە بوونو، پشتگیری خۆی بۆ پادشایەتی سعودیە دەربڕی بوو. ئەفسەرێکی ئەزموون دیدەو کارامە لەویەکەیە هێنرایە دەرەوە تا ببێتە فەرماندەی جێبەجێکردنی نەخشەکە. بە بەکارهێنانی کەسانی شارەزا پێداویستی بۆ حەشاردانی ڕەگەزەکان لەپێچو پەناکانی مزگەوتی گەورەی مەککەدا سازکرد. چەکە ئۆتۆماتیکیەکان لەناوتابوتەکاندا حەشاردران ، ئەمجارە میوانی مردوویان لەگیانەلای تێدانەبوو کە لەلایەن کەسوکاریانەوە بەدەوری کەعبەدا دەسوڕێنرانەوە، بەڵکو لەلایەن هێزەکەی ئەوەوە بەرەو گردەکەی (کەعبە) هەلگیرانو شاردرانەوە. ئەمە یەکێك بوو لەگەورەترین چالاکیەکانی کە تا ئەودەمە لەخۆرهەلاتی ناوەڕاستدا ڕوویدەدا.

سعودیەکان بەپێی پرنسیپی سروشتی خۆیان هەواداری ئێمە بوون. دەیانزانی کە ئێمە بەوردی چاودێری باری ئاسایشی ئەوانمان کۆنترۆڵ دەکردو، گەرچی هەندێك جار فەرامۆشمان دەکرد، بەلاّم زۆرجار ئەو زانیارییە بەکەڵکانەی کە لەسەرچاوە باوەڕپێکراوەکانەوە دەگەیشتە دەستمان پێشکەشمان دەکردن.

گەرچی سعودیەکان بەشێوەیەکی‌و خۆپارێزانەو زیرەك‌و ورد دەیانزانی ئەم چالاکیە گرنگە، بەلاّم لەڕووی بەشداریکردنی سەربازییەوە بەئەندازەی (گەردەلوولی بیابان) نەبوو.

لەواقیعدا یەکەمین ئامۆژگاریمان ئەوەبوو کە هیچ سەربازێکی پلە بەرزی فەڕەنسی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەشداری لەڕیشەکێش کردنی نەیارەکاندا نەکات. دەبوو لەبەر پیرۆزی شوێنەکەو مزگەوتی گەورەو مەککە هێزێکی تەواو ئیسلامی بچێتە ئەوێ. گەرچی دەبوو ڕۆڵی ئێمە بەشاراوەیی بمێنێتەوە، بەلاّم دەمانتوانی پێشنیازی کامڵ بەوردەکارییەوە ئامادەبکەیت تا توانستی بەئەنجام گەیاندنی سەرکەوتووانە لەوچالاکیەدا بداتە سعودیەکان. بۆمبی کاتدارو هۆکارەتایبەتیەکانی دیلەلایەن دەزگا ئەمنیەکانی فەڕەنساوە دابینکرا. چەند ڕۆژێکی خایاند تا توانرا پێچ‌و پەناکانی ئەوێ لەهەموو هێزە نەیارەکان پاك بکەینەوە؛ سەرئەنجام سەقامگیرمان گەڕاندەوە بۆ ئەوشوێنە. بەمپێیە، سعودیەکان ئەو وانانەی لەوکاتەوە فێری بوون لەیادیان ماوە. لەهەمان کاتدا هەوڵیان دەدا لەهەرشوێنێکدا شیاوبێت پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ دراوسێکیانیان دروستبکەن. بەلاّم دوای ئەوە هیچ کاتێك پشتیان بەهیچ هێزێکی دەرەکی بۆ دابینکردنی ئاسایش نەدەبەست‌و، پەیوەندییان لەگەڵ خۆرئاوا بەشێوەیەکی بەرفراوان لەکڕینی پێشکەوتووترین جۆری چەك بۆ بەرگریکردن درێژەی هەبوو. تەنانەت ئۆپەراسۆنی (گەردەلولی بابان)یش لەهەمان ڕووەوە بەئەنجام گەیەنرا. هێزە سەربازییە ئەمریکیەکان، کە بۆ بەرپەرچدانەوەی هەڕەشە سەربازییەکانی (سەدام حوسەین) ڕەوانەی ناوچەکە کران، کاریگەری لەسەرتێکدان‌و لاوازکردنی پلەبەپلەی سعودیەکان هەبوو. هەندێ

لەدوژمنەکانی سعودیە لەسەرپێشنیاری من بەناردنی کۆمەك کاردانەوەیان پیشاندا. لەکاتی چاوپێکەوتنم لەگەڵ (شافەهد) کەمێك پاش ئۆپەراسیۆنی کەعبە ئەم پێشنیارەم خستەڕوو. لەودەمەدا لەوەگەیشتبوو کە لەلای تیرۆریستەکان ئەوە زۆر ئاسانترە کە پازدە هەزار شازادەی خانەدانی سعودی بەیەك لێدان بەهۆی ئەتك کردنی پیرۆزی شوێنە پیرۆزەکانەوە بێبڕوا بکەن تا ئەوەی بتوانن یەك بەیەك بیانکوژن؛ وەك ئەوەی کە چوار ساڵ لەوەوبەرو لەمانگی ( مارس/١٩٧٢) لەگەڵ (شافەیسەڵ) کردیان. هەموو ئەو کۆبوونەوانەی لەگەڵ (شافەیسەڵ)و شازادە (فەهد) شای داهاتوومیراتگری تاج و تەختی پاشایەتی کردم لەنهێنیترین هەلومەرجدا بەڕێوە دەچوون. منو (شافەیسەڵ) گفتوگۆکانمان لەئۆفیسەکەیدا، کەلەناو کۆشکی پاشایەتیدابوو لە (ریان)ی پایتەختدا، دەستپێکرد. پۆشاکێکی ڕەنگ قاوەیی سادەی دەپۆشی‌و شەقلێکی بێرپایی هەبوو، لەگەڵ ئەوەش تەزبیحی بەدەستەوە بوو زکری دەکرد، زۆر بێفیز دەینواند. بەم پێیە گەشتیارێکی کۆڵنەدەری جیهان‌و کەسێك بوو دەیتوانی نائاساییانە پێداویستیەکانی سەردەم بخوێنێتەوە. کاتێك دەستمان بەگفتوگۆ کرد پرسیارێکی ئاڕاستە کردم، کە دیاربوو ماوەیەك بوو مێشکی خۆی پێوە جەنجاڵ کردبوو: (ئایندەی ولاتەکەی ئێمە چۆن دەبینیت؟) وتم: (بەیارمەتی خاوەن شکۆ، لەمبارەیەوە زانیاریم هەیە. هەست دەکەم ئێوە لەقۆناغی گواستنەوەدان لەوەچەیەکەوە، کە پەیوەست بوون بەپیاوانی عەرەبو دەوارنشینییەوە بۆ وەچەیەکی شارنشینی پیشەسازی کە ئێستا هەن. گرفتی گەورەو جۆراوجۆرتان دەبێت. گەورەترین مەترسی ئەمەیە، کە لەوانەیە ئێوە نەریتی بیابان نشینی لەدەست بدەن، بەبێ ئەوەی ڕەوشەکانی جیهانی پیشەسازیی دوای ئەوەتان بەدەسهێنابێت. ئەم بارە بۆ ئێوە زۆرمایەی لاوازیی‌و دژوارییە، بەتایبەتی لەگەڵ بوونی ئەو جۆرە دراوسێیانەی دەوروبەرتان، کە خاوەنی فۆرمی جیاوازن‌و بەتەواوی خاوەنی خشتەیەکی زەمەنی براوتنی خودی خۆیانن. واتە ئەمە سەردەمێکە کە لەوانەیە زیاتر لەڕۆح‌و گیانت لەدەست بدەیت.) خاوەن شکۆ زۆربەوردی سەیری دەکردم‌و

وتی: (تۆ لەکێشەکە گەیشتویت. سامناکترین شت کە بەسەر نەتەوەیەکدا بێت ئەوەیە کەڕۆحی لەدەست بدات. ئەمە گرنگترین گرفتی منە)
چەند ساڵ دوای ئەوە لەگەڵ (شازادە فەهد)، حاکمی ئایندەی پادشایەتی سعودیە چاوپێکەوتن‌و گفتوگۆم ئەنجامدا. لەودەمەدا وتی: (دەزانیت ئێمە هەموو دراوو پەترۆڵی جیهانمان لەبەردەسدایە، بە بەرمیلێ پەترۆڵ سی‌و هەشت دۆلارو گەر بمانەوێت زیاتریش بەدەست دەهێنین، بەڵام بەهیچ جۆرێك خەڵك یان سەربازی تەواومان نییە بۆ بەرگریکردن لەسەرزەمینی پانو بەرینمان)
چەند مانگ دوای ئەوە، من‌و (شازادە فەهد) دووبارە چووینەوە سەرهەمان پرس، کە ئەو بەمنی وتبوو- دراوو هزرمان هەیە، بەڵام هێزی مرۆیمان نییە- دەسمان کردەوە بەگفتوگۆ. ئەمەم باسکرد: (باشە خاوەن شکۆ، ئێمەش دەربارەی ئەو پرسە بیرمان کردەوە؛ بەڵام تەنها یەك ڕێگا چارەمان بۆ گرفتەکە دۆزیوەتەوە. ئینگلتەرا ئێستا خەریکی هەڵوەشاندنەوی چەند تیمێکی (گورخا)یە. هێزەکانی تیمی (گورخا) کەسانێکن لەبەرزترین ئاستی شەڕکەرانی جیهانیدا. لەڕووی فیزیکیەوە زۆر بەرگەگرن‌و سەربەخەڵکانی ناوچە شاخاوییەکانی هیمالایەن؛ لەگەڵ ئەو سەرسەختیەدا دیسپلینی ئینگلیزیشیان تێدا جێگیرەو ڕێکخراون. ئەوانەخەڵکی ئەفسانەیین. لەوخەڵکانەم لەئەفریقا لەکاتی جێبەجێکردنی ئۆپەراسیۆنەکان‌و هەروەها لەشەڕی (کاسینۆ) لەکاتی هێرشی هاوپەیمانەکان بۆ سەرئیتالیا لەجەنگی دووەمی جیهانیدا بینیوە. ئەوانە تایبەتمەندی دژ بەتیرۆریزم نین، بەڵام جەنگاوەری بەرزو بەرگریکان. خاوەن شکۆ گەر من بوومایە لەجیاتی تۆ یەکەیەکم لەوبەکرێگیراوە هەرزان بەهایانە بەکاردەهێنا. ئەوانە نەگرفتی سیاسییان هەیەو نەگرفتی مەزهەبی‌و، دەتوانین بەئاگاداری بەحرەین لەناوەڕاستی دەریای سوور نیشتەجێیان بکەین‌و، بەهۆی ژمارەیەکی کەم لەهێلیکۆپتەرو بەلەمی تیژڕەوەوە جێگۆڕکێیان پێبکەین. من ناڵێم گەر سوپای سۆڤیەتی ڕوسیا بیر لەپێشڕەویکردن بۆ باشورو گەیشتن بەدەریای لەهزردا بێت لەڕێگای خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە ئەمجۆرە کارانە دەبنە

بەربەستی تەواو لەبەردەمیدا، بەلام بەلێکۆڵینەوە لەهەڕەشەکانی دی گرنتی دە ساڵ سەقامگیری ئاشتیت پێ دەدەم.)

(شازادە فەهد)لەسەرخۆ خەنیەوەو، وتی: ( حەزم لەوجۆرە ئاشتییەیە. ئەمە بیرێکی زۆرباشە.) پاشان بۆ ماوەیەك مت بوو وتی: (بەلام ، (کانت) ئەزیزم، ئەمە نابەجێیە ! دەزانیت ئەم مەسەلەیە بۆ ئابڕوی عەرەب دەگەڕێتەوە ! ئەوانە لەئێمە نین)

شکست هێنان بەدەستی ئەو ولاتانەی کە تیرۆریزم دەکەنە ئامراز لەکاردانەوەی دوژمنایەتیاندا، بەلام بێدەنگو ماتن لەبەکارهێنانی چەكو هێزی خۆیان کە باشتر کارەکانیان مەیسەر دەکات، زۆر وردو ناهەموار ترە، ئەوەش هۆیەکە کە هەمیشە تیرۆریستان زۆر سەرکەوتوو بوون. ئامرازی گرنگ لەڕووبەڕووی تیرۆریستاندا تەنها هاوکاریو خێراییە.

سەرکەوتنی ئۆپەراسیۆنی کەعبە بووە هۆی لێکۆڵینەوەی بەرفراوان دەربارەی سەقامگیریو دامەزراندنی تەشکیلەیەکی هێزی پۆلیسی نێودەوڵەتی، کە بتوانێت خێراو لەکاتی پێویستدا دەسبەکار بێت. ئەم پێکهاتەیە چ لەجۆری ڕاوێژکارانە بێت، یان بەشێوەی هاوبەشیکردن بێت، بەچاوپۆشی لەوکەسەی بۆتە ئامانجی هێرش کردنەسەر، بۆ سەرکوت کردنی جموجۆڵی تیرۆریزمی مۆدێرنی ئەمڕۆ، ئەوانەشی کۆنترۆڵیان دەکەن هەنگاوێکی پێویستە. کۆمەلگا جاسوسیو سیخوڕییەکانی خۆرئاوا هەوڵیانداوە ئەم پێداویستییە بخەنەڕوو، کە دەبێت وەلامێکی بەهێزو خێراو کاریگەری ئەو تیرۆریستانەی کە بەدرێژایی دەیەکانی (١٩٧٠و١٩٨٠) لەئارادا بوون بدرێتەوەو، ئێمەش ئەمڕۆ ئەو مەسەلەیە دووبارە دەکەینەوە؛ گەرچی هێزێکی زۆریش لەدژمان دەکەونە گەڕ. یەکەمین هۆکارێك کە هەوڵەکانمان سەبارەت بەوەلام دانەوەیەکی گورجك بڕو کاریگەر مایەپوچ دەکات، نەبوونی ئۆپەراسیۆنی هاوبەشە لەلایەن دووولاتی خۆرئاواوە، کە دەبێتە هۆی ئەوەی هەنگاوە ناوخۆییەکانی هەریەك لەوولاتانە بەگرنگتر دابنرێت. لەڕاستیدا لەوهەوڵە ڕێکخراو تر، کە بەپێوەرێکی فراوانتر لەساڵانەی دواییدا بە (گەردەلولی بیابان) ناسرا، ئەو چالاکیە سەربازییە هاوبەشەی فەڕەنساو

بەلجیکاو مەراکیش بوو دژ بەهێرشێکی تیرۆریستانە، کە لەدەیەی (١٩٧٠) لە (زائیر) ئەنجامدرا.
ولاّتی فراوانی (زائیر)ی ئەفریقا، کە (کۆنگۆ)ی پێشووی ولاّتی بەلجیکایە، چوارجار لەفەرەنسا گەورەتر دەبێت. ئەم ولاّتە لەڕووی سەرچاوەی سروشتییەوە بەدەولّەمەندترین ولاّتانی ئەفریقای ڕەش دادەنرێت. ڕوباری کۆنگۆ، کەوزەی کارەبا بەرهەم دێنێت، لەگەلّ ڕوبارەکانی دی ئەورووپا ئەندازەگیری ناکرێت. بەلاّم ولاّتەکە بەهۆی ململانێی نەتەوەیی‌و خێلّەکییەوە لەحالّەتی تەقینەوەدایە. تەنها سەرکردەیەکی بەهێزی وەك جەنەڕالّ (مۆبۆتۆ سەسەسکۆ) توانای پاراستنی ئەو ولاّتەی هەیە لەنێوان هەموو ئەو ململانێ بێبەزەییانەدا. پارێزگای (شابا)، کە لەژێر ناوی (کاتانگا) دروستکراوە، کانزای مس، ئەلّماس، کۆبالّت، مەنگەنیز، فلزی کادینیوم، قورقوشم‌و پەترۆلّی هەیەو، بەسەرچاوەی دابینکردنی چوارمادەی سەرەکی لەهەشت مادە بنەڕەتیەکە بۆ بەرگریکردن بۆ خۆرئاوا دادەنرێت. ئەوێ یەکێکە لەپارێزگا دەولّەمەندەکانی ئەو ولاّتە پڕ سامانە. لەماوەی سالاّنی ڕابردوودا هێزە جیاوازەکان هەولّیانداوە ئەوێ لە(زائیر) جودا بکەنەوە، کە لەڕوانگەی ئێمەوە دەبوە کارەسات، چونکە پارێزگای ئەفسانەیی‌و دەولّەمەندی (شابا) بەپێی شوێنگەی ستراتیژییەکەی (زائیر) پارچە پارچەدەبوو. ئەو جۆرە (زائیر)ە دەچووە بەرقەرەولّی هێزە ئامادەکانی ڕوسیای سۆڤیەتی‌و (قەزافی) لیبیاو، دەبووە ئەمری واقیع. لەمانگی (مەی/١٩٧٨)دا چوار هەزار پۆلیسی (کاتانگا)ی کۆن، کە چووبوونە (ئەنگۆلا)وەو، وەکو هێزی بەکرێگیراو بۆ دەولّەتی ئەنگۆلا، کە لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە پشتگیری دەکرا، کاریان دەکرد، گەڕانەوە. ئەوانە فەرمانیان لەخودی خاوەنەکانیانەوە لە (ئەنگۆلا)وە وەردەگرت، تا ئابلّوقەی کانە ئەفسانەییەکانی (کول وزی) بدەن‌و، لەهەلێکی هەلّگەڕانەوەی دیدا لەوانەبوو (شابا) داببڕێت‌و خودی سەرۆك (مۆبۆتۆ)ش بکوژرێت. نزیکەی سەدو بیست ئەورووپایی کوژران‌و، لەگەلّ ئەوانیشدا سەدەها کەس لەخەلّکی ناوچەکە لەناوبران. ئێمە لەڕێگای سەرچاوەکانمانەوە لەناوچەکە پێش ئەنجامدانی هەرکارێك ئاگادار کراینەوە.

لەفراوانی ئۆپەراسیۆنەکەوە دەردەکەوت کەوڵاتێکی دەرەکیش دەستی لەڕووداوەکەدا هەیە. هەڵبەتە دەوڵەتی کۆمۆنیستی (ئەنگۆلا)، پاڵپشتانی کوبایی‌و لەبوارێکی فراوانتریشدا سۆڤیەتیش لەفاکتەرەکانی پشتپەردەی ڕووداوەکە بوون. سەرەڕای ئەوەش هێرشە داڕێژراوەکەش لەلایەن (قەزافی)یەوە پشتیوانی مەعنەوی لێدەکرا، کە بەجۆرێك لەدڵگەرمی دادەنرا، چونکە مەیلی لەوناسەقامگیرییە لەوبەشەی جیهاندا هەبوو، کەیاریدە دەیدەدا بۆ هەلێکی گەورە تر لەفراوانخوازییەکانی. لەپاڵ ئەو هەموو هێزە کۆکراوەیەی باڵی هێرشبەراندا زۆر ڕوونبوو کە دووفاکتەر لەپوچەڵ کردنەوی ئۆپەراسیۆنەکەدا گرنگ‌و سەرەکین. یەکەم سەرکوتکردنی پۆلیسەکان‌و گێڕانەوەی نەزمو یاسا، کە بۆ جێبەجێکردنی ئەوەش دەبوو هێزێکی چەند نەتەوەیی ئەورووپاو ئەفریقا کۆبکرێتەوە. دووەم هەنگاوێکی پەرلەمانیانە بەپێوەرێکی وردو کامڵ، کە بەدوای ئەویشدا کاری سیخوڕی ڕێکخراو زۆر بەسوود دەبوو. بەکۆکردنەوەی هێزی مرۆیی ئێمە پێش هەموو شتێك بۆ سۆراغی چالاکی پێشەکیانەی بەلیژیکا چوون. لەگەڵ ئەوەشی (زائیر) کە (کۆنگۆ)ی پێشووی بەلجیکابوو، بە بەردی بناغەی ئیمپراتۆریەتی فرە دەریایی بەلژیکا دادەنرا. بەم پێیە ناچاربووین تکایان لێبکەین لەوێ ئامادەبن؛ لەگەڵ ئەوەشدا ڕکی فەرەنسا لەگێڕانی ڕۆڵی سەرەکی بەلژیکا لەوێ ئاشکراو ڕوون بوو. ئنجا بڕیاری بەلژیکا بۆ بەشداریکردن ئەوەندە درەنگ وەرگیرا کە بەبێ کۆمەکی هێزەکانی فەرەنساو مەراکیش دەبوە هۆی لەناوچوونی ژیانی گەلێك لەسەربازەکان.

بێچەندو چوون پێش ئەوەی هێزی فرە نەتەوەییەکان کۆببنەوە ئێمە جاسوسانی خۆمان ڕەوانەی (شابا) کردو، ئەوانە یەکەمین کەسانێك بوون کەچوونە ئەوێ. هەندێك وەك چێشت لێنەرو ڕێکخەرو، هەندێکی دی بەیونۆفۆرمی فەرمیی ترەوە، کە سەربەیەکە دەرەکیەکانی فەڕەنسابوون‌و کڵاوی ئەرخەوانیان دەکردەسەریان ڕەوانەکران. کاتێك هەموو پێشەکیەکانی ئۆپەراسۆنەکەمان ئەنجامدرا، لەکاتی شەودا بەفڕۆکە دابەزین‌و، لەناو (کول دوزی)دا هێواش هێواش پەروانەی فڕۆکەکان لەجوڵەوەستان. هەرزوو زانیمان

کەسێ ڕاوێژکاری (کوبا)یی هاوەڵی پۆلیسەکانی (کاتانگا)یان دەکرد، کە لەپشتو لایەکی دی سنوری (کاتانگا)و پارێزگای (شابا)وە نیشتەجێ ببوون.
لەوکاتەدا کە جاسوسەکانمان خۆیان بۆ سازکردنی زەمینەی هێرشێکی چڕوپڕی هێزە سەربازییەکانی خۆمان ئامادە دەکرد، من بەرەو (مەراکیش) ڕۆشتم، تا قەناعەت بە (شا حەسەن) کە وەك (گورخا) بەهێزی پیادەی (مەراکیش)ی پشتیوانی لەهێزەکانمان بکات. لەوبڕوایەدا بووم هەستکردن بەوخاڵە، کە ئەو هەنگاوە هەنگاوێکی ئەفریقیانەیەو هەماهەنگییەکی چەند نەتەوەیی نێوان هاوپەیمانانی خۆرئاوایە، زۆر پێویست بوو. پەیوەندیکردنم لەگەڵ (شا حەسەن) بەجۆرێك بوو کە پێویستی بەوە نەدەکرد داوای چاوپێکەوتن بکەم. لەگەڵ گەیشتنم، کە یەکێك لەیاریدەدەرو جەنەڕاڵێکم لەگەڵ بوو، چووینە (کیدا)وە. ئەو چادرەی کە زۆربەیجار (شا حەسەن) لەناو کێڵگەیەکی دەرەوەی کۆشکدا تیایدا دادەنیشت. تاکە پەیامێکی نهێنی کە (شا حەسەن) سەبارەت بەچوونەکەم پێیگەیشتبوو، ئەوەندەبوو کە پێیڕاگەیەنرا بوو کە هاتووم.

کاتێك نزیکەی پەنجا یاردەیەك لە (کیدا) نزیك ببووینەوە، لەچادرەکەی هاتە دەرەوەو چاوی لەهەرسێکمان بڕی؛ لەوساتەدا ڕووداوێکی زۆرسەیر ڕوویدا، کە ئەمڕۆ ڕوونکردنەوەی بۆ من زۆر دژوارە. دەستی ڕاستی بەرزکردەوەو هەنگاوێکی چاوەڕوان نەکراوی ناو، وتی: (نا، من دێم). پێشتر ئامانجی چاوپێکەوتنەکەیان دەزانی، نازانم لەکوێوە ئەم بابەتەی زانیبوو. هۆی چاوپێکەوتنیو باسکردنی تێزەکانم لای هیچ کەسێك هیچم نەدرکاندبوو.
گومان لەوەدا نەبوو کە دەزگا جاسوسییەکەی لەزۆر ڕووەوە لەگەڵ دەزگاکەی ئێمە هاوشان دەبۆوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەستی شەشەم یان چاوی سێیەمی هەبوو، کە جۆرێك هەستکردنی پێش ڕووداوو ناسینی کەسانی بەشێوەیەکی ئاوارتە بۆ مەیسەر دەکرد. ئەو هەستانە دەیانتوانی مامۆستایەکی باش بن بۆ ئەو، لەهەمان کاتدا من پێویستم بەوەهەبوو، چونکە کەسێکی کە بتوانێت لەگەڵماندا بێتو لەماوەی چەند سەعاتێکدا هێزەکانی بۆ ئۆپەراسیۆنێکی لەوبابەتە بنێرێت لەئارادا نەبوو.

بەم پێیە، ئەو پەنجا یاردەیە بەرەو دەوارەکە ڕۆشتمو وتم: (خاوەن شکۆ، ئێمە پێویستمان بەتۆیە) بیستو پێنج دەقیقە دوای ئەوە، شوێنگەی ستراتیژی خۆمم خستەڕوو، پێداویستی پارێزگاریکردن لە (شابا)و (زائیر) بۆ خۆرئاواو داهاتووی کیشوەری ئەفریقاش، کە پاش کەوتنی بەدڵنیاییەوە بەرەو نەمان دەچوو، بۆ ڕوونکردەوە. دەمودەست (شا) هەستی بەوە کرد کە لەڕووی جیوگرافییەوە بەرپرسیارێتی لەسەرشانەو، بەوهۆیەوە دوودڵی نەنواند.

دەستی هەڵبڕیو هەموو ئەوانەی لەناو دەوارەکەدا بوون چوونە دەرەوە، پاشان دەستووریدا: (تەلەفۆنەکەم بدەرێ، پەسندم کرد) چونکە بەدڵنیاییەوە قسەی کردبوو لەجێگاکەم هەستام کە بڕۆم، بەلام وتی: (نەخێر، ئەمە ئۆپەراسیۆنی تۆیە، تۆلێی بەرپرسیاریت، لێرە بمێنەرەوە)

لەماوەی چەند دەقیقەیەکدا پێشنیاری لەلایەن سەرکردەی چوار وڵاتی ئەفریقاوە- گابۆن، سەنیغال، کەناری عاج، تۆگۆ-وە بۆ هات. هەریەك لەوانە پێشنیازی کردبوو کە ئامادەیە ببێتە هێزی بچوك بەرابەری مەراکیشیەکان کە لەکۆتاییدا بەپشتیوانی فەرەنسا بەلژیکا پێکبهێنرێت.

لەپاشاند ڕوویکردە یاریدەدەرە سەرەکیەکەی جەنەڕاڵ (دلیم)و پرسی: (ئامادەکردنی سەربازەکان چەند دەخایەنێت؟) وەلامەکەی لەدەوروبەری سەعاتێکدابوو. هیچ ترافیکێکی سوربەمانای ڕێگریکردن لەسەرڕێگای ئەنجامدانی ئەم ئۆپەراسیۆنە یان سنووردارییەك لەلایەن فەرماندەکان یان بیرۆکراتەکانەوە لەئارادانەبوو. ئەمە هەنگاوێك بوو کە لەلایەن سەرکردەیەکی ئەفریقاوە دژ بەچالاکیەك دەنرا، کە بەجۆرێکی کاریگەرانە بەشێك بوو لەبزاوتی گەورەی تیرۆریستیانەی فروانو، لەگەڵ هەرساتێکی کە تێدەپەڕی پوچەڵکردنەی دژوارتر دەبوو.

ئێمە ئەرکی هەڵگرتنو گواستنەوەی ئاسمانی یازدە هەزار نەفەر سەربازی جێگیر لە (شابا)مان لەئەستۆبوو؛ کە چەندین سەعاتی دەخایاند. ئێمە فڕۆکەی جۆری (ترانسالڵ)مان بەکارهێنا، کەدوایین جۆری فڕۆکە بۆ ئەو جۆرە پرۆسانەبوو، چونکە هەمیشە وەك فڕۆکەی دەزگای جاسوسی فەڕەنسا

ناسرابوون. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانە فڕۆکەی پەروانەدار بوون‌و، گەر سەربازەکان بەدووی بکەوتنایە کوشتنیان بەهۆی پەروانەکانیە وەشتێکی دڵنیابوو، بەڵام لەگەڵ ئەو سەرنجەشدا کە ئەمانە تاکە فڕۆکەی بەردەسبوون.

گەرچی یەکەکانی (لیژیون)ی هێزە دەرەکیەکانی فەڕەنسا پەڕەشوتدارانی هەبوو کە پێشتر بەکاری نەهێنابوون، لەگەڵ ڕوودانی ئەم ئۆپەراسیونەدا بەخێرایی هەڵوەشێنرانەوە. لەسەرەتاوە تا کۆتایی کارەکە وەك سەرکەوتنێکی گەورە دەرکەوت. پیاوانی ئاسایشی (کاتانگا)یی گەڕێنرانەوە بەرەو (ئەنگۆلا). کانزاکانی (کولوزی) ڕزگاریان بوو، ژیانی سەدەها کەسی خۆرئاوایی‌و زائیریش ڕزگارکران. سەرکەوتنی ئەم دواین ئۆپەراسۆنی (زائیر)ە؛ ڕێگای لەبەردەم ئایندەی ڕزگاربوونی کارمەندان‌و دابینکردنی ئاشتی لەم گۆشە زیندووەی ئەفریقادا کردەوە. ئەو جۆرە ئۆپەراسیۆنە ئەو هەلەی پێ بەخشین تا ئاسایشی خودی خۆمان‌و دەوڵەتە خۆرئاواییەکانی دی پارێزراو بن. دواین شت لەم ڕووەوە دەگەڕێتەوە بۆ (ئەیلولی/١٩٩١)، ئەو دەمەبوو کە هێزەکانی (زائیر) کە چەند مانگ بوو موچەیان وەرنەگرتبوو دەسیاندایە هەڵگەڕانەوەو (کینشاسا)ی پایتەختی ئەو وڵاتەو شارەکانی دی‌و پارێزگاکان بوو نەمەیدانی دزی‌و جەردەیی‌و ئاودیوکردن. ئۆپەراسیۆنێکی هاوبەشی فەڕەنسی‌و بەلژیکی توانی دەربازکردنی هەزارکەسی نەتەوەکانی دی، لەوانە هەزاران ئەمریکایی بەسەرکەوتووی ئەنجام بدات. ئەم کارمەندانە کاریان زانیاری گەیاندن بوو بەهێزە دەرەکیەکان، کە بەهۆی چاو تێبڕینیان لەسامانەکانی ئەو وڵاتەوایان دانابوو کە هەرجۆرە بەشداریکردنێك لەکاروباری ناوخۆیی (زائیر) بەئاسانی‌و سانایییەوە سەربگرێت، بەڵام چالاکییەکی ئاڵۆزی لەوجۆرە کەپشت بەزانیاری هاوبەش‌و کاری سیخوڕیی دوولایەنەو هەروەها ڕاپەڕاندنی هاوبەش دەبەستێت، بەوجۆرەو لەوحاڵەتەدا بەدەگمەن ڕوویدەدا، گەرچی هەموو ڕۆژێك هەستکردنی زۆرمان بەرامبەر بەبنەڕەتی‌و ڕیشەیی هاوکاریکردن زیاد دەبێت.

ئێمە ئێستاو هیچ کـاتێك ئامـادەی شـەڕی دژ بـەچالاکی تیرۆریسـتان، کـە ئەگەری ڕوودانی لەهەرگۆشەو کەنارێکدا هەیە، نین، ئەم هەلومەرجـە دەبێـت بگۆڕێت.

بەشی یازدە:

## ڕێکخستن لەبەرامبەر بەھرەدا

لەڕۆژانی پێش جەنگی چوارەمی جیھانیدا ڕوسیای سۆڤیەتی سوودێکی زۆری لەکەمتواناییمان لەبواری ھەماھەنگیکردنی کاریگەرانەی چالاکیەجاسوسیو کاردانەوە سیخوڕییەکان کردبوو. ئەمڕۆ تیرۆریستانو پشتیوانەکانیان درێژە بەسوودوەرگرتن لەوخاڵەلاوازە دەدەن. ئەرکی دەزگایەکی جاسوسی گەورە تەنھا ھەبوونی ھزری باشکردنی ڕەوشەکانی دی ڕاپەڕاندن لەلاتەکەی خۆیدایان ھەرجێگایەکی دی لەجیھاندا نییە، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی بوونی ئاگایىو ھەستیارییە بەرامبەر بە ولاتە خۆرئاواییەکان، بەتایبەتی لەڕووی ڕێکخستنو شرۆڤەکردنیانەوە؛ ھەمان ئەو شتەش ئەو توانایەیان پێدەبەخشێت کە لەپشتی دوژمنێکی گەورەوە بەدەنگێکی دلێرانەوە بێنە پێشەوە، کە مەیدانی ئەو جۆرە شەڕانە لەسەرگۆی زەوىو ناوخاکی خۆمان دەبێت. ئێمە زۆرجار بڕوا بەدیدێکی ناوخۆیی، ناوچەیىو تاکتیکانە دەھێنین، دیدێکی کە سەنتەرەکەی فەڕەنسایە. یان جۆرێك تێڕوانینە کەڕەنگدانەوەی ئارەزووەکانە، نەك واقیعەکان. ئێمە نائومێدانە لەگۆشەیەکی بچوکی جیھانی خۆمانەوە دەمانەوێت ببینە پارێزەری ھەموو جیھان. لەپێناوی ئەم دیدەشدا پێویستە فێری دیدی ستراتیژی گەورە بین. لەوشوێنانەی کە ئێمە سەرچاوەی تەواوی زانیاریو مەعریفەمان نییە، دەبێت ئامادەبین کە ئاسایشی خۆمان بەھاوپەیمانێك بسپێرین لەڕووی کەمتواناییەوە لە ئێمە بەتواناتربن. چەندین جارشتی لەجۆری شکستھێنانو کارەسات یان نزیك لەکارەسات ڕوویانداوە، کە ھۆکەی دوودڵی ،بێباوەڕی، درەنگ بڕوا ھێنان یان سادەتر لەوانە بەھۆی سەرنەکەوتووی لەدروستکردنی پەیوەندی لەنێوان دەزگا جاسوسیەکاندا بووە، کەدەبوو لەڕووی ئایدیۆلۆژیو ھاوسێیەتیەوە ھەماھەنگی نزیکمان ھەبێت. بۆنمونە، لەمانگی (مایس/١٩٨١) (پاپا جان پۆلی دووەم) کە بەئاستەم لەچنگ گوللەکانی (علی ئاگجا) ڕزگاری بوو، تەنھا (ڤاتیکان)ی بۆ

پەناگرتن هەبوو. لێپرسراوانی دەزگای ئیتالیا بەمامەڵەیەکی سیخوڕانەو بەهۆی زانیاری لەدەزگای جاسوسی فەرەنساوە ئەویان ڕەتکردەوە. ماوەیەك لەوەوبەر زانیارییەکی دروستمان دەربارەی هەوڵی تیرۆرێکی ڕاستەقینە بەدەست گەیشت. ئێمە لەنزیکەوە بەهای تیرۆرکردنی کەشیشێکی (پۆلۆنی)مان بۆ ڕوسەکان خستە بەرتوێژینەوە. پاش خوێندنەوەی سیناریۆو لێکۆڵینەوە جیاوازەکان و بەکارهێنانی باشترین نمونەی بەرزمان، لەناوئەو کارانەشدا زێڕکردنە ناوپێڵاوی سەرانی ئەوروپای خۆرهەڵات، گەیشتینە ئەو دەرئەنجامەی کە چوار هۆی بنەڕەتی و گرنگ بۆ تیرۆرکردنی ئەم (پاپا)یە دەکرێت لەئارادا بن. یەکەم: لەبەرئەوەی خۆرهەڵاتی بوو، کەشیشێکی لەوجۆرە مەعریفەیەکی قوڵی سەبارەت بەچۆنیەتی هەڵسوڕانی هێزی کۆمۆنیستەکان هەیە؛ لێرەدا لەلای کۆمۆنیستەکان ئەوکەسەی ئاگاداری نەزمی بیرو چالاکیەکانیانە لەهەموو کەس زیاتر مایەی بێزراندنە. فریشتەکان ناتوانن وێنای دۆزەخ بکێشن کە چ جۆرە جێگایەکە، تەنها شەیتانەکانی لەوێن توانای ئەو جۆرە وێناکردنەیان هەیە. ئەم (پاپا)یە دەرکی بەهەموو ئەو شتانە دەکرد کە وەچەکانی ڕابردووی لەخۆرئاوا نەیانتوانیوە تێیبگەن. جیاوازی و لێکچوونە وردەکانی کە بەیەکسانی لەمەزهەبی (کاتۆلیك)و کۆمۆنیزمیشدا هەبوو، لەوشتانەبوون. هۆکاری دووەم بۆ هێرش کردنەسەر (جان پۆلی دووەم)ئەمەیە کە ئەم (پاپا)یە لەگەڵ دانانیدا بەئاشکرا ڕایگەیاند: کەهەموو ڕەگەزەکانی سەربەکڵێسای کاتۆلیکی دەگەڕێنرێنەوە بۆ بارەگاکانی خۆیان، کە ئەوانە بریتی بوون لەئەسقەف و کەشیشە خۆرهەڵاتیەکانی لەلایەن ڕژێمە کۆمۆنیستیەکانەوە لکێنرابوون بەکۆمەڵەی کۆمۆنیستەکانەوەو، وەك ئامرازێکی بەدیهێنانی ئامانجەکانیان بەکاریان دەهێنان. سێیەمین هۆکاری دەستنیشانمان کرد ئەمەبوو کە، ئەگەری جێنشینی پاش کوشتنی ئەم کەشیشە کەسێکی ئیتالی بێت. بۆنمونە ئەسقەفێك کەمتر سەروکاری لەگەڵ (سیاسەتی ڕوانین لەخۆرهەڵات)ی هەبێت و، باشتر لەگەڵ کێشەکانی ناوڤاتیکان یەکانگیربووبێت و، پەیوەندی

کەمی بەگەشەکردنی مەزهەبی کاتۆلیك لە خاڵەکانی جیهاندا هەبێت، کە لەوشوێنانەدا ڕوسەکان خەریکی سەپاندنی مەزهەبە گشتگیرییەکەی خۆیانن لەسەربنەمای دۆگما کۆمۆنیستیەکان. هۆکاری چوارەمو کۆتایی، کە سەرەکیترینو ڕیشەیی ترین هۆکارە، ئەمەبوو کە (پاپا) تەنها نوێنەری بەرگریکردن لەپۆلۆنیاو دژ بەکۆمۆنیزمی سۆڤیەتی نەبوو، نوێنەری ئاڵا، باوكو ڕۆحی نەتەوەگەرایی پۆلۆنیابوو. پۆلۆنیا بۆ ڕوسیا وڵاتێکی فرە گرنگو ستراتیژی بوو. لەپاڵ خاڵی پەیوەندی ڕاستەقینەو هێڵی ئاسنی نێوان ئەوێو ڕوسیاو ئەڵمانیا، سێ سەنتەری گرنگی کۆبوونەوەی خەڵکی ئیمانداریش هەبوون، کە پەیوەستبوون بەنەریتە مەزهەبیەکانەوەو گرێدراوی بوون. ئەوانە بەرامبەر بەبیروڕاکانیان زۆر وردبوون؛ چونکە ببووە نوێنەری بەریگریکردن بەرامبەر بەهێزە داگیرکارەکان، واتە کۆمۆنیستەکان. تەنانەت ڕابەرانی پارتی کۆمۆنیستی پۆلۆنیاش بەنهێنی دەچوون بۆ ئەو گوندانە، کە سەدەها میل لەشوێنی خۆیانەوە دووربوو. منداڵەکانیان بەپێچەوانەی هەموو دەستووره کۆمۆنیزمیەکانەوە بەداشۆرین پیرۆز (تعمید) دەکرد. ئەو (پاپا)یە بە بەڵگەی لاوازکردنی کۆمۆنیزم بوو چونکە دەیتوانی سەرانی کرملین بەهرزەکانی لەوسەردەمەدا گەندەڵ بکات، بۆیە دەیانویست تیرۆری بکەن.

بەمجۆرە ئێمە لە (کانوونی دووەمی/١٩٨٠) هەواڵی دروستمان لەلابوو کە سەرۆکی سۆڤیەت بڕیاری دابوو (پاپا) لەناوببات. هەواڵەکە لەسەرچاوەیەکی نهێنی لەئەوروپای خۆرهەڵاتەوە گەیشتە من. لەبەرئەوەی بەهەمان شێوە سەرچاوە نهێنیەکەمان پشتگیری توێژینەوەکانی ئەو دواییەی ئێمەی کردبوو، هەواڵەکە بێگومان ڕاستبوو. دووکەس لەجێباوەڕەکانم ڕەوانەی (ڤاتیکان) کرد، یەکێك لەوانە جەنەڕاڵ (مۆریس بیکو)ی ڕاوێژکارو پزیشکی خودی خۆم بوو. هەروەها ئەوی دی ئەندامێکی مەدەنی پێشەنگی دەزگای دژە سیخوڕی فەڕەنسا بوو. چاوپێکەوتنەکانیان لەگەڵ سەرانی ڤاتیکان لەلایەن ئەسقەفێکی پایە بەرزی فەڕەنسییەوە ڕێکخرابوو، کە ئەفسەرێکی دێرینی سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانی بوو.

گەرچی بەپێی نەریتی دیبلۆماسیانە پێویست بوو (پاپا)، کە وەك سەرۆکی دەوڵەتێك بوو، لەلایەن خودی خۆمەوە لەو هەڕەشەیە ئاگادار بکرێتەوە، بەڵام گەر من بچوومایە بەدڵنیاییەوە ئەو تیرۆریستانەی کە سەرقاڵی ڕێکخستنی چالاکیەکە بوون و، بێگومانیش بەوریاییەوە کاریان دەکرد، ئاگادار دەبوونەوەو پلانەکانیان دەگۆڕی. دوو کارمەندی نهێنی من چوونە ڤاتیکان و زانیارییەکانیان گەیاندە دەستی جێباوەڕترین هاوکارانی (پاپا). ئەوانە ئەو گوزارشانە بەوجۆرەی پێیان ڕاگەیەندرابوو بەبێ لەدەسدانی کات و هەل گەیاندبووە باوکی پیرۆز.

ئەو وتبووی کە ژیانی بەدەست خودایە. ڕێز لەوجۆرە باوەڕانە دەگرم. بڕوام وایە هەندێ کات هەیە ڕاست نییە کۆمەکی زەمینی بەخواوەند بکرێت. بەمجۆرە ئێمە جارێکی دی ئەو بابەتەمان دووبارە نەکردەوە. زۆر ئاشکرایە کە پەیوەندی نزیك لەنێوان ئیتالیاو (پاپا)دا هەبوەو، سەرانی پاراستنی ئاسایشی ڤاتیکان لەگەڵ سەرانی ڕۆمادا لەسەرئاگادار کردنەوەکانی ئێمە گفتوگۆو لێکۆڵینەوەیان کردووە. هەرگیز هەتا ئێستاش وازم لەوپرسیارە نەهێنا کە ئایا ئیتالیا هەنگاوی گرنگ و سەرەکیان بۆ پارێزگاریکردن و پاراستنی باوکی پیرۆز نابوو؟

لەوساڵانەدا زۆر چاوپێکەوتنم لەگەڵدا دەکرا، کە لەناویاندا چەندین لێکۆڵیار هەبوون بەدوای کێشەی دەسدرێژی کردنەسەر گیانی (پاپا جان پۆلی دووەمد)دا دەگەڕان. دواهەمینیان بەرپرسێکی باڵای پۆلیسی تاوانکاری فەرەنسا سەردانی کردم تا پێم ڕابگەینێت کە لێکۆڵینەوکان هەتا ئەمڕۆش بەردەوامە.

بەڵام یەکەمین دیدارم لەلایەن سەرۆك و لێکۆڵیاری بەشی دادگاوە (ئایلادیومارتلا)، کە لێکۆلینەوەی لەتیرۆرو دەسدرێژی کردنە سەری لەئەستۆی بوو، ئەنجامدارا. ئەم دەسدرێژی کردنە سەرەماوەیەکی درێژی خایاند، واتە لەسیازدەی مانگی پێنجی (١٩٨١)دا ڕوویدا. بەلیستێکی درێژەوە کەسێ پرسیاری لەخۆگرتبوو منی بەسەرکردەوە، بەڵام بەهۆی

سوێند خواردنی ڕەسمی خودی خۆمەوە لەمەڕ پاراستنی نهێنیەکانی دەوڵەتی فەڕەنسا، نەمتوانی وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە بدەمەوە. لەسەرئاستی گەلێك بابەت گفتوگۆمان کرد، لەوانە بڕوای من کە (ئاگچا) تاوانبارێکی تەنها نەبووەو، تەنانەت ئەندامو هاوکاری تۆڕێکی قاچاخچێتیو تاوانکاری نەبووە.

دوای دە ساڵ لەدەست درێژیکردنە سەرگیانی (پاپا جان پۆلی دووەم)، لەئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٩١) (مارتلا) لەپاریس دووبارە سەردانی کردمەوە. بەڵگەنامەیەکی کە من پیشانی (مارتلا)م دائەوەی دەخستەڕوو کە بولگارییەکان چەندین جار بەکاریان هێناوە بۆ ئەنجامدانی کاری خراپو، لەوانەش کاری چەپەڵانەو تیرۆرکردن. هاوسێ ڕوسەکانیان وەك وەفاو هاونەژادی نزیکترین فەرهەنگی نەتەوەییان، لەڕێگای (KGB) بۆ ئەنجامدانی کاری زۆر وردو گرفتاویش زۆرجار بولگارییەکان بەشیاو دەزانران. هۆی ئەوەشی کە بۆچی لەپاریسو شوێنەکانی دیدا بەردەوام چاودێری بولگاریەکان بوون، هەرهەمان هۆبوو.

سەرەڕای ئەوەش بولگاریا بەناوچەیەکی سەرەکی گواستنەوەی چەکو تەقەمەنی نێوان بلۆکی خۆرهەڵاتو ڕێکخراوە گرنگە تیرۆریستەکان دادەنرا، چونکە کەوتبووە سەررێگای سەرەکی هاتوچۆی کامیونەکانی نێوان ئەوروپای خۆرهەڵاتیو خۆرهەڵاتی ناوەڕاست. ئەم ڕێگایە بەناو تورکیاو تەنگەی بۆسفۆڕدا تێدەپەڕی. بەکرێگیراوە تیرۆریستەکان زۆرجار لە (وارنا)ی بولگاریا دەمانەوە تا چەکو تەقەمەنیو پێداویستی لەڕێگای ئەو بنکەیەوە بەدەست بهێنن، کە بەدرێژایی زۆری ساڵەکانی (١٩٧٠ و١٩٨٠) بارەگای سەرکیان بوو لەئەوروپادا، واتە پاریس.

بەمجۆرە بەدرێژایی دەیەکانی (١٩٧٠–١٩٨٠) ئێمە لەنزیکەوە چاودێری وردی هاوپەیمانەکانی ئەوروپای خۆرهەڵاتیمان دەکرد، کە بەزۆری لەناوخودی دەزگا جاسوسیەکانیاندا لەژێر فشاردابوون بۆ ئەنجامدانی جۆرێك لەچالاکی نواندنی تیرۆریستیانەو سیخوڕیانە لەسەرخواستی (KGB)، کە

نەیاندەویست ئەنجامی بدەن. بەنهێنی هاوکاری نێوان سۆڤیەت‌و دەزگا جاسوسیەکانی ئەورووپای خۆرهەڵاتی ڕاستەوخۆ لەلایەن فەرماندەیی (KGB)ی‌و لەمەیدانی (دزرژنسکی) لە (مۆسکۆ)وە کۆنترۆڵ دەکران، کە بەگشتی ئەم جڵەوکردنە لەخوارەوە بۆ سەروەبوو. کۆکردنەوەی زانیاری خاو، توێژینەوەو هەڵبەتە ئۆپەراسیۆنیشی لەخۆ گرتبوو. هاوکاری نێوانیان لەگەڵ هاوکاری ئێمە لەخۆرئاوا زۆر جیاوازبوو، کەلای ئێمە زۆرجار لەئەنجامی ڕکەبەرایەتی نێوانمان دەزگاکان دوچاری دابڕان دەبوون‌و، لەحاڵەتی سەنتراڵی‌و یەکپارچەیی دەردەچوون. هاوکاریکردنەکانمان لێکدابڕاو بوون‌و لەباشترین هەلومەرجدا لەسەربنەمای دۆستایەتی‌و پەیوەندی خودی وەستابوو. بەم پێیە لەلایەکەوە بۆ لایەکی دی بنەمای جیاواز هەبوو. دوژمنەکانمان پشتیان بەخواستی بونیادی‌و ڕێسای دابەشبوونی کاردەبەست، کە توندوتۆڵ بوو. ڕۆمانیەکان بۆ کاری جاسوسی لەو وڵاتانەی بەرهەم هێنەری پەترۆڵ بوون بەکاردەهێنران، چونکە شارەزاییەکی باشیان لەپیشەسازی پەترۆڵدا بەدەسهێنابوو، کە یاریدەی دەدان تا بەهۆی ئەو پیشەیەوە وردە وردە دزەبکەنە ناو وڵاتانی دی. هەروەها لەو وڵاتانەشدا کە بەزانی ڕۆمانی دەئاخافتن زۆر بەسوود بوون، چونکە زمانی ڕۆمانیایی تاکە شێوە زمانی ئەورووپای خۆرهەڵاتیە کەخاونی ڕیشەیەکی لاتینیە. سەرەڕای ئەوەش ئەفسەرانی ئاسایشی ڕۆمانی لەناوچە زمان فەڕەنسیەکانی ئەفریقاشدا بینرابوون. کارمەندانی پۆلۆنی بەزۆری لەباکوری فەڕەنسادا دەبوون، چونکە چەند سەد هەزار کانزاچییەکی کۆن‌و بەردە خەڵوزی پۆلۆنی لەماوەی چەندین ساڵدا ڕێگای خۆیان لەناوکانە کانزاکانی فەڕەنسادا دۆزیبۆوە. بەهۆی نزیکی مەزهەبی پۆلۆنیەکان لەگەڵ مەزهەبی کاتۆلیکی فەڕەنسا لەبەرباری ئەمنی پۆلۆنیا ڕازی بوو بێنە کلێساکانی فەڕەنساوە. ئەم سەرچاوانە کە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری ورد لەسەرسەرچاوە کانزاییەکان‌و بەردی خەلوزی‌و ئامانجە ستراتیژییەکانی پشتی بەرەی جەنگ ئامادەکرابوون، دەهاتن. لەگەڵ

ئەوەشدا بۆ چاودێریکردنی نەیارە دوورخراوەکان بەکاردەهێنران، کە ئەگەری ئەوە هەبوو پەیوەندی نزیك لەگەڵ وڵاتەکەیان دروست بکەن. لەوەش زیاتر وەك سەرچاوەیەکی بەهێزی دارایی دەرەکی بۆ نواندنی چالاکی تێکدەرانە بەهاوکاریکردنی بلۆکی خۆرهەڵاتی بۆ سەرەونگونکردنی ڕژێمە ناوخۆییەکانیان دەست بەکاربن.

خەڵکانی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی بێهەڵاویردکردن لەبەرزترین ئاستدا کاریان پێدەدرا، چونکە زۆر زەحمەت بوو ئەڵمانیەك لەئەڵمانی زاکانی دی جودا بکەیتەوە. سەرۆك وەزیرانی ئەڵمانیای خۆرئاوایی (ویلی برانت) پەیوەندی نزیكو خودی لەگەڵ (گنشرگیوم)دا هەبوو، کە دەرکەوت ئەفسەری ئەڵمانیای خۆرهەڵاتیەو، دەستی گەیشتۆتە هەموو زانیارییە نهێنیەکانی کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵی.

ساڵەهای گوزەراند تا هەلی بۆ ڕەخسا دزە بکاتە ناودەرووونی بیروکراتیەتی ئەڵمانیای خۆرئاواییەوەو، لەگەڵ (برانت) ئەو پیاوەی کەبۆ یەکەمجار ببووە پارێزگاری شاری (بەرلین)و پاشان گەیشتە پلەی سەرۆك وەزیری، دۆستایەتی گیانی بەگیانی دروست بکات. پاش ئەوەی (گیوم) لەوسنورەی کە پاشان لەنێوان ئەڵمانیای خۆرهەڵاتیو خۆرئاواییدا کێشرا، پەڕیبۆوە، بەهۆی ئەو خزمەتە باشەی بۆ ئەڵمانیای خۆرهەڵاتو (کرملین)ی نواندبوو، پلەکەی بەرزکرایەوە. هەڵبەتە ئێمە تاکە دەروازە نەبووین کە ژمارەیەك لەنەیارانی سەربەئەورووپای خۆرهەڵاتی یان بەکرێگیراوە تیرۆریستەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کە لەخۆرئاوادا چالاکیان دەنواند ئاشکرا دەکرد. بۆ دەزگا سیخوڕییەکانی خۆرئاوا بوونی پەیوەندی لەگەڵ (مۆساد) گرنگییەکی تایبەتی هەبوو. دەزگای جاسوسی (ئیسرائیل)یش بەهۆی ئەزموونی نائاساییەوە لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستو ڕەگەزە چالاکەکانی لەوێو لەدەرەوەی ئەو ناوچەیە بەهایەکی گرنگی هەبوو. بەپێی زۆر بەڵگەی جۆراوجۆر دەزگای نهێنی ئیسرائیل خاوەنی کارامەییەکی زۆربوو. یەکەم بەهۆی ئەو ژمارە بێشمارەی جووە کۆچبەرەکانەوە کە لەهەموو پنتەکانی

جیهانـەوە چووبوونـە ئـەویّو ببوونـە خـاوەنی سـەرچاوەیەکی زمـانو مەعریفەیـەکی قولّـی ولاّتـە جیاوازەکـان، کـە تێکەڵەیـەك بـوون لەهـەموو کیشوەرو هەموو ئایدیۆلۆژیایـەك. دووەم لەبەرئـەوەی نزیکـەی نیوسـەدەیان لەجـەنگدا بەسـەربردبوو، بـەوجۆرەش بـەردەوام هوشـیاربوون. ولاّتـی ئیسرائیلو خەڵکەکەی ببوونە گرنگترین ئامـانجی ڕێکخـراوە نـەیارەکان. ئـەو هەستەی کـە بـەردەوام ئیسـرائیلیەکان لـەژێر چـاودێریو کۆنـترۆڵدان ببـووە بەربەست لەبەردەم هاوکاری سیاسیو سوپایی قولّ لەگـەڵ سـوپای ولاّتـانی دەرەکـی، یـان دەزگـا جاسوسـیەکان، بـەلاّم لەلایـەکی دییـەوە ئـەو چاودێریکردنـە ببـووە هـۆی ئـەوەی کـەولاّتانی دی لـەوباوەڕەدابن کـە ئیسرائیلیەکان بەردەوام دەکەونە بەرهێرشی تیرۆریستەکان. لەگەڵ ئەوەشدا نادروستی ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە لەزۆر شوێندا سەلمێنراوە.

دەزگای نهێنی ئیسرائیل لەیەکـەمین ئـەو دەزگایانـە بـووە کـە زانیویـەتی لەلایەن چەند گروپێکی تیرۆریستییەوە (پـاریس) وەك بارەگـای فـەرماندەیی تیرۆریستان لەئەوروپا هەڵبژێردراوە. لـە(جـۆرج حەبـەش)ەوە، کـە هەمیشـە ڕێگـای( تریپـۆلی- پـاریس)ی وەك بازرگـانێکی ئـەمریکی لـەنێوان واشـنتنو نیۆرك بەفڕۆکە تەیدەکرد، بگرە تا سوپای ئازادیخوازی گـەلی تـورك، بـەرەی نەتـەوەیی ئـێرانو سوپای سوری ژاپـۆن هـەموویان خـەڵکیان لـەپاریسو دەوروبـەریدا هـەبوو. تەنانـەت پێش شۆڕشـی ئیسلامی ئـێران، تیرۆریسـتە تورکەکان (گورگە بۆرە تۆقێنەرەکان)و ئێرانیـەکانو تیرۆریستێکی بـەدناوی وەك (کارلۆس- ئیلیچ ڕامیرز سانچیز)یش لەپاریس سەرقاڵی چالاکی بـوون. سـوپای سـووری ئـەڵمانیا، بریگـاردی سـوری ئیتالیـا، سـوپای ئـازادیخوازی ئێرلـەنداو هەڵبـەت باسـکەکانی ئیسـپانیاش لـەناوخۆو دەرەوەی (پـاریس)دا بەڕێکوپێکی چالاکیان دەنواند.

کارمـەندانی ئاسایشـی خۆمـان هـەموو ئـەو کەسـانەیان خسـتبووە ژێـر چاودێرییـەوە. سـەرەڕای ئـەوەش (مۆسـاد)یـش بەشـێك بـوو لـەوان. لەگـەڵ ئەوەشدا (مۆساد) بەباشی دەیزانی چەند گرنگە پـەیوەندی لەگـەڵ کەسـانی

تیرۆریست لەسەرخاکی خۆیان یان لەهەرشوێنێکی دی شیاوبێت دروست بکەیت. کارمەندەکانیان لەهەموو شوێنێکدا بڵاوببوون. ئەندامانی باڵای دەزگای سیخوڕی ئیسرائیل، جگە لەپەیامنێرەکانیان، لەپاریس نیشتەجێ بوون‌و، لەگەڵ هاوشانەکانیان لەنیۆرك تایمز، (CBC)، واشنتن پۆست‌و هەروەها ئێکسپرێس، فیگارۆو پاریماچ ئاڵوگۆڕکردن هەبوو. ئەو زانیارییەی کە لەگەڵ هاوشانە خۆرئاواییەکاندا ئاڵوگۆڕیان پێدەکرد تەواو ڕاست بوون‌و، بۆ کاردانەوە دژ بەهەنگاوە توندوتیژەکانی تیرۆریستەکان، کە بۆ گۆڕینی هزری هەموو جیهان ئەنجام دەدرا، بەکەڵك بوون. لەلای تیرۆریستەکان گرنگ بوەو گرنگە کە بزانن لەبەرچاوی خەڵکیدا چۆنن؟ نەك وەك جەنگاوەرانی دلێری ئازادیخواز، بەڵکو زۆرسادە ترو سامناکتریش. داکۆکیکارن، یان ئامرازی دەستی دیکتاتۆرە بێبەزەیەکانن؟ ئەگەرچی پەیوەندییەکانمان لەگەڵ (مۆساد) پەیوەندییەکی گەرم‌و دۆستانەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی زانیاریانەی خودی خۆشمان لەڕەوتی دەرەکیدا لەگەڵ (I.S)و (M 16)و دەزگای گوێڕاداشی ئەلکترۆنی لە(شلتنهام)ی ئینگلتەرامان پاراستبوو. پەیوەندییەکانمان سەبارەت بەجیهانی باشور پەیوەندییەکی نزیك بوو؛ شوێنێکی کە ڕۆژێك لەڕۆژان کۆلۆنی بووەو خاوەنی بەرژەوەندییەك بووین تیایدا. لەگەڵ ئەوەشدا تا ماوەیەکی زۆردوای هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتەکەمان درێژەمان بە هاوکاریکردنەکانمان دەدا. جارێکیان لەکاتی نیوەڕۆخوانێکی خولەکانمان سەرۆکی دەزگای نهێنی بەریتانیا، بەڕێز (مۆریس ئۆڵدفیلد) وتی: (سەیرکە، دەمەوێت لەیەکێك لەبەندەرەکانی ئەفریقادا جاسوسێکم هەبێت. لەوێدا ڕەگەزت هەیە، وانییە؟) مەبەستی یەکێك لەوڵاتانی ئەفریقای خۆرئاوایی بوو، کە لەڕاستیدا کۆلۆنییەکی پێشووی فەرەنسابوو. وەڵامم دایەوە: (بەڵێ، هەرلەوڕۆژانەوەی کۆلۆنی فەرەنسا بوو ڕەگەزمان لەوێدا هەبووە. ئێستا ئەوێ شوێنێکە ڕوسەکان تیایدا زۆر حەساوەن‌و دەسیان داوەتە ئەنجامدانی چالاکی نوێ. زۆربەی کات تۆڕی ماسی گرتنەکانیان لەگەڵ خۆیان دەبەن؛ چونکە خولیای شوێنێك

بوون کە تیایدا گەڕیدە جیهانیەکانی فەڕەنسا لەچالاکیدا بوون) هەردووکمان خەنینەوە، چونکە هەردووکمان دەمانزانی هەموو ئەو ماسیگرانە لەڕاستیدا لەلایەن هێزی دەریایی سۆڤیەتەوە ئامادەکرابوون‌و، ماسیگرەکانیش ئەفسەرانی هێزی دەریایی سۆڤیەت بوون. بەڕێز (مۆریس) لێیپرسیم: (چۆنە گەر ئێمە یەکێك لەکەسەکانی خۆمان لەپاڵ ئەو کارمەندانەی ئێوەدا نیشتەجێ بکەین؟)

وەلامدایەوە: (بۆچی نا؟ بەتایبەتی گەر جاسوسێکت هەبێت کە زمانی ڕوسی بزانێت، تا بتوانێت بەباشی لەئەفریقادا کار بکات، چونکە ئێمە کەسی لەوجۆرەمان نییە)

پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەسەیری پێشینەی سێ ئەفسەری ئینگلیزیمان کرد، کە لەگەڵ خۆی هێنابوونی. لەکۆتاییدا بەڕێککەوتنی هەموولایەکمان ئەفسەری شیاومان هەڵبژارد. کەسێك بوو کە لەخۆرئاوادا کەس هیچی دەربارەی نەبیستبوو، هەتا ئەمڕۆش کەس هیچی دەربارەی نەبیستووە. بەپێی ئەو وەسفانە هەمان ئەو شێوازەمان هەڵبژارد کە هەمیشە لەسەری دەڕۆشتین. ئەو گوزارشتە کەسیانە زۆر گرنگ بوو. هەموو شەش مانگ جارێك بەشێك بوو لەبەرنامەی من، کە لەنیوەڕۆخوانێکی بەکۆمەڵ کە لەلەندەن، پاریس یان میونیخ ڕێك دەخرا، بەشداری بکەم. لەوێدا سەرانی سێ دەزگای جاسوسی سەرەکی ئەوروپا، واتە (MI6)ی بەریتانی‌و (BND)ی ئەڵمانیانی خۆرئاواو دەزگای کۆکردنەوەی بەڵگەنامەی دەرەکی‌و دژە سیخوڕی فەڕەنسا کە بەکاروباری (فەرماندەی چاودێری گشتی)یش ناودەبرێت، ئامادە دەبوون. زانیارییە کۆکراوە هاوبەشەکانمان لەئەمریکا پەنهان نەدەمایەوە. ئەمریکیەکان بەتەواوی جیاکرابوونەوە. هەریەك لەدەزگا جاسوسیەکانی ئەوروپا لەبوارێکدا تایبەتمەندبوون. لەهەرشوێنێکدا کە بمانتوانیایە ئاڵوگۆڕی زانیاریمان دەکرد. ئیتر چ بەپێی ئەوە هەنگاو بنرایەیان نا، یان زانیاری وەرگیراو جێگای متمانەی لایەنی بەرامبەر دەبوویان نەدەبوو، لەهەموو حاڵەتەکاندا ئاڵوگۆڕەکە ئەنجامدەدرا.

تایبەتمەندی ئێمە لەبواری گوێڕا داشتن لەپەیوەندییەکانی ئەفریقای فەڕەنسیدابوو- ئەو وڵاتانەی کە لەکۆندا بەکۆلۆنی فەڕەنسا دادەنران- ئەفریقای سەروو، خۆرهەڵاتی ناوەڕاستو هەڵبەتە خۆرهەڵاتی باشووری ئاسیاش، کە ڕۆژانێك لەوێدا بەرژەوەندی کۆلۆنیالیزمیمان هەبووە.
تایبەتمەندی بەریتانیەکان لەناوچەکانی ئەفریقاو خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدابوو. ئامێری جاسوسیە ئەلکترۆنیەکەیان لەئەوروپای خۆرهەڵاتدا وێنەی نەبوو. ئەڵمانیە خۆرئاواییەکان بەتایبەتی لەئەڵمانیای خۆرهەڵاتیدا چالاك بوون. لەهەمان کاتیشدا چاودێری چالاکیەکانی جاسوسەکانی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتیان لەزۆربەی پنتەکانی جیهاندا دەکرد؛ هەمووشمان پێکەوە حسابمان بۆ وڵاتێك دەکرد، کە پاشان بووە گەورەترین دوژمنی هەریەکەمان، واتە ڕوسیای سۆڤیەتی.

وڵاتە گچکەکانی تری ئەوروپاش خاوەنی تایبەتمەندی ناوچەیی خۆیان بوون، کە زۆرجار دەیانسەلماند لەهەندێ بابەتی دیاریکراودا کاریگەری تەواویان هەیە. بەلژیکیەکان بەهۆی دەزگایەکی بچوکی زانیارییەوە، بەسەرۆکایەتی سەرۆکی دادگا، تایبەتمەندی خۆیان لەبەشە کۆلۆنیەکانی پێشووی ئەفریقادا، جگە لە (کۆنگۆ) کە ئێستا بە (زائیر) ناسراوە، هەبوو. لەنێوان ئەسکەندە ناڤیەکانو نەرویژیەکاندا، بەهۆی ئەو سەرچاوانەی لەدەریای باکوردا هەیانبوو، لەبواری پەترۆڵو ئۆپیکدا تایبەتمەندبوون. هەروەها بەهۆی ژمارەیکی زۆر لەپۆستی گوێڕا داشتنەوە، کە نزیکترین پۆستی دزەبیستن بوون لەبنکەی ئاسمانی باکووری سۆڤیەت لە (مۆرمانسك)یەوە، لەگەڵ بەریتانیادا لەڕێگای وەرگرەکانیانەوە ئاڵوگۆڕی ڕێکوپێکی زانیارییان ئەنجامدەدا.

چالاکی جاسوسی لە (لۆکسمبۆرگ) زۆر سنورداربوو، بەلام بەپێچەوانەوە زۆر کاریگەربوو، کە لەلایەن ئەفسەرێکی پەروەردەکراوی فەڕەنسیەوە ئەنجامدەدرا. (دۆك) نشینی سنوردار پڕە لەبێگانەو، وڵاتێکی بەئەندازە بچوکەو، تیایدا ژمارەی دیبلۆماتە ئەوروپیە خۆرهەڵاتیەکان زۆر زۆرە.

کارمەندانی (KGB) لەپاریس زۆرجار بۆماوەی یەك سەعات بەئۆتۆمبیل بەرەو (لۆکسمبۆرگ) دەچن، تا بنکە گەورەکەی پێشوویان فراوان بکەن، شوێنێك بوو کە تاکە کانیان چاویان بەیەکدی دەکەوت‌و فڕۆکەکانیان تیایدا دەنیشتنەوە. ئیتاڵیەکان پەیوەندی نزیکیان لەگەڵ لیبیەکان هەبوو، بەڵام زۆر جێگای بڕوا نەبوون؛ چونکە سەرمایە گوزراییە فراوانەکانی (قەزاف) لەئیتالیا دراوێك بوو کە هەمیشە لەلیبیاوە بەرەو ئەو وڵاتە دەچوو.(قەزاف سەرمایە گوزارێکی گەورەی نێو سەرمایە گوزارانی دیکەی کۆمپانیای فیات بوو) لەماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا ناوچەی (پانتەرلریا) توانستی توندوتۆڵی زۆری (مۆسۆلینی) دابین دەکرد، (قەزاف) هەرچەند لەتوانایدا بوو لەوێوە هاوردەی دەکرد (لەوانە بزن). لە (ماڵتا) ماوەی هەزاران ساڵ بوو کەدوورگەیەکی ستراتیژی گرنگی ناودەریای ناوەڕاست‌و بەشێك لەبنکەی سوپایی بەریتانیا بوو، لەنێوان ئیتالیاو لیبیەکاندا سەرچاوەی کێشمەکێش بوو، (قەزاف) بەهەموو داراییەکی کە لەدەستیابوو کڕی، بەمجۆرەش (ماڵتا) بووە بنکەیەکی گەورەی حەوانەوەی تیرۆریستەکان.

لەتشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٥)، فڕۆکەیەکی (بۆینگ ٧٢٧) میسری لەکاتی فڕینی لە (ئاتن)ەوە بۆ (قاهرە) فڕێنراو ناچار بەنیشتنەوە لە(یاڵتا) کرا. فڕێنەرەکان پەناهێندەییان دەویست. سەرانی ماڵتا هیچ بوارێکیان لەبەردەمدا نەمایەوە، هەرچەندە ئەم هەنگاوە گەلێك بێشەرمانەبوو، بەڵام ڕێگایان دابەهێزەکانی ئاسایشی میسری تا بەهێرشکردن دەست بگرن بەسەر فڕۆکەکەدا. سەرکۆماری میسر (حوسنی موبارەك) خودی (قەزاف) بەداڕێژەری ئەو پلانە تاوانبارکرد. ئەو کارە ساتە یەکێك بوو لەچەندین ئەو ڕووداوانەی لەنێوان ئەو دوو وڵاتەدا ڕوویانداوە. (قەزاف)یش ژمارەیەك لەسیخوڕەکانی لەئیتالیادا جێگیرکردووە، کە ئێمە ئاگادارین لەگەڵ دەزگای جاسوسی ئیتالیادا زانیاری‌و هەواڵ ئاڵوگۆڕ دەکەن. ئیتالیا یەکێکە لەووڵاتە ئەوروپیانەی کە خاوەنی چەندین تۆڕی پەیوەندییە. ئەو پەیوەندییەی باسکرا دەبێتە پنتی سەرەکی پێکگەیشتنی زانیاری نێوان دەزگا جاسوسیەکانی (باکور)و (باشور). دەزگای جاسوسی ئیسپانیاش بەتایبەتی

لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا چالاکەو لەڕێگای بەدەسهێنانی هەواڵو زانیاری لەڕێچکەی پەرەسەندنی ئابوری لەجیهانی (باشور)دا زۆر سوودمەند دەبێت. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەشی کە تاکە وڵاتێکی ئەوروپای خۆرئاوایە حەوت سەد ساڵ بەرلەئێستا لەلایەن هێزە موسڵمانەکانەوە داگیرکراوە، ئیسپانیا وەك زلهێزێکی دەریای ناوەڕاست هەمیشە چاوی لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستو ئەفریقای سەروو بڕیوە. هێشتا پەیامەکانی کە پەیوەستە بەنیازەکانیەوە لەئارادایە، کە باس لەوە دەکات بۆ ماوەی چەندین ساڵ هەندێ کەسیان لەبەربەریە کۆنەکان لەجەزایرو بەتایبەتی لەمەراکیش بەکارهێناوە. هۆڵەندا لەپەیوەندیدا لەگەڵ پیاوانی جدیو تێکۆشەر لەکۆلۆنەکۆنەکانیدا لەئاسیای خۆرهەڵاتی باشور- ئەندۆنیزیای ئەمڕۆ- خاوەنی بەهای تایبەتی بووە. ئەمڕۆ ئەندۆنیزیا ئەندامێکی (ئۆپیك)و یەکێکە لەهەرە ناسراوترین وڵاتانی موسڵمانیی جیهان. هۆڵەندا لەپێش هەموو دەزگا جاسوسیەکانی دییەوە زانیاری لەسەر کارو چالاکی کۆمپانیای (ڕۆیال داچشل)، کە یەکێکە لەکۆمپانیا چەند نەتەوەییەکانی جیهان، هەبووە. ئێمە وەك یەکێك لەدامەزرێنەرانی کۆمپانیای ناوبراو بەئەندازەی ئەوان سوودمەند نەبووین. بەڵام کاتێك لەوشوێنەدا بوو نە خاوەن سوودی بنەڕەتی کودەتا ڕوویدا. وەك ئەوەی لەساڵی (١٩٦٥) لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە بۆ وەرگرتنی دەسەڵاتی ئەندۆنیزیا ڕوویدا. ئەو کۆمپانیایە بەهۆی گوزارشدەرانی زۆرو دەزگای جاسوسی هۆڵەنداوە لەنزیکەوە چاودێری ئاڵوگۆڕەکانیان دەکرد.

(سورینام) وڵاتێکی دیکەیە کە فەڕەنساو هۆڵەندا بۆ ماوەی چەندین ساڵ بەرژەوەندییان تیایدا هەبووە. موشەکەکانی (ئارین)ی فەڕەنسی لەناوچەیەکی نزیکی (ڤینە)وە دەهاویژران. بەدرێژایی سەردەمی کۆلۆنیالیزمی (سۆرینام) لەساڵی (١٩٧٣)وە تا دەمی کۆتایی بەدەسهێنانی ئازادی لەتشرینی دووەمی (١٩٧٥)، ئێمە دەمانزانی کە گوێزانەوەی دەسەلات بۆ دەوڵەتێکی ناوخۆیی شلەژان دەهێنێت؛ بەتایبەتی گەر بەپێی بەشداریکردنی دەوڵەتی کوبی بەسەرۆکایەتی (ڤیدل کاسترۆ) بێت. هاوشانە

شەپۆلی ڕادیۆیی بیروکراتەکانی خۆرئاوا ئەو گرنگییەی جارانی نەماوە؛ چونکە ئێستا لەناو بازاڕی ئازادو کراوی ڕوسیدان، کە چەمکی سیاسیو ئابوری خۆرئاوایی بێ ئاستەنگ هاتۆتە ناوەوەو، ئەم دۆخەش هەلێکی گونجاوە ئەو توانایە بەخەڵکیو ڕابەرانی سۆڤیەتی دەبەخشێت تا تێبگەن شۆڕشی ئەیلوولی (١٩٩١) کە تاڕادەیەك کۆتایی بەپرۆسترۆیکا هێنا، چەند ڕووکەشانە بوو.

پازدە ساڵ لەوەوپێش زۆرم لەسەرکۆماری فەڕەنسا کردبوو کە دەست بکات بەپەخشی شەپۆلی ڕادیۆی فەڕەنسای نێودەوڵەتی بەرەو کۆمارەکانی ئاسیای یەکێتی سۆڤیەت، بەوهیوایەی ئێمە ڕادەیەکی کەمتر لەوهەڕەشانەی ڕادیۆی (ئازادی) سەر بە (CIA) کردبوویە ئامانج بڵاوبکەینەوەو، بەوجۆرەش لەوڕێگایەوە بواری گونجاو ترمان دەسکەوێت بۆکێشکردنی گوێگرانێکی مەبەستمانە. ئێمە لەوناوچەیەدا پێش هێرش کردنەسەر ئەفغانستان ئاڵوگۆڕەکانی چەندین ساڵ لەوەوبەرمان دەبیستو شرۆڤە دەکردو تێگەیشتبووین کە دەسەڵاتی شۆڕش لەوشوێنانەدا فۆرمۆڵە دەبن کە زۆر دوورن لە (کرملین)ەوە.

ئێستا بیرۆکراتەکانی فەڕەنسا لەپاڵ هاوبیرە ئەمریکی، ئنگلیز، ئەڵمانیەکانی خۆیاندا دەنگی بڵندو ئاشکرای ڕادیۆی ناوبراو دەبیستن، کە دوورترین گوندەکانی ئاسیای سۆڤیەتی ڕێگایەکی کراوەیە بەڕووی خۆرئاوادا. ئەمە تەنها یەکەم هەنگاوە لەکاروانی دوورو درێژ ووزە بەدەری پەروەردەی نوێی شارستانییە بۆ فۆرمێکی تازەو سەرسوڕهێنەری ژیان. هەمیشە کاری جاسوسی هاوشانی هەر ئامانجێکی دی بووبێت لەناواخنی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتیدا کارێکی دژوار بووە.

ئێستا ئەو ناهەموارییانەی سەرەوە لەناوچە ئاسیاییەکاندا دوو بەرامبەرە. لەگەڵ ئەوەشی کە ئێمە لەمۆسکۆ باڵوێزخانەی گەورە بەکارمەندی زۆرو زەوەندو، ئۆفیسێکی بچوکی کۆنسڵیمان لەلینینگراد هەیە، گەشتکردن بۆ ئەو شوێنانەو دامەزراندنی پەیوەندی دۆستانە، تەنانەت تێکەڵیکردنی خەڵکی

سۆڤیەتیش زۆر گرفتاوییەو، تەنها پەیوەستە بەوەرگرتنی مۆڵەت لەبەرپرسەکان. ئەم هەلومەرجانە بەتەواوی نەگونجاو دەبن.

لەخۆرئاوا، ڕوسەکان دەسەڵاتی پلەداری هەندێ لەکارمەندەکانیان لەهەندێ ناوچەی فەرەنسادا، کە هەرگیز لەوشوێنانەدا هیچ نوێنەرێکی دیپلۆماتیشیان تێیدانەبوو، بەجۆرێکی وارێکخستبوو، هەروەها لەبەشە جیاوازەکانی (پاریس)یشدا سەرگەرمی چالاکی بوون، کە ئەگەر نەڵێم کۆنترۆڵ کردنیان نەگونجاوبوو بەلایەنی کەمەوە زۆر سەخت بوو.

بنکەی سەرۆکایەتی جیهانی (یۆنسکۆ) لەپاریس خۆی لەخۆیدا جۆرێك لەخوێندنەوەی کلاسیکیانەی پێویست بوو. چونکە (یۆنسکۆ) بنکەیەکی گونجاو داشتنی نائاساییە. لەوێدا، دیپلۆماتو سیخوڕەکان بەتێکەڵی لەگەڵ خەڵکیو پسپۆڕانی خۆیان لەسەرئاستە جیاوازەکانی کۆمەڵایەتی، پەروەردەییو فەرهەنگی لەهەموو کیشوەرەکانەوە کۆبوونەتەوە. هەریەك لەدەزگا نهێنیەکانیان زیاد لەبەشی خۆیان خاوەنی کارمەندی ڕوسین کە ساڵەهای ساڵە بەپاسپۆرتی دیپلۆماتانەی ڕێکخراوی نێودەوڵەتییەوە هاتوچۆ دەکەنو، بەپارێزراوییەوە لەفەرەنساو لەهەر شوێنێك کە چالاکییان هەبێت، جموجۆڵ دەکەن. لەماوەی دە ساڵدا بەڕێوەبەری پێرسناڵی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی لە (جنێڤ) ڕوسییەکی پلەداری (KGB) بوو، کە دەستی بەسەرهەموو فایلە پێرسناڵیەکانی گشت کارمەندانی ڕێکخراوی نێودەوڵەتیدا رادەگەیشت. تۆ پێویستت بەژمارەیکی زۆری لەوجۆرە کارمەندانە نییە.

لەئۆفیسی (یۆنسکۆ) لەپاریس ئەندامێکی باڵای بەشی ڕاگەیاندنیش کەسێکی ڕوسی کارمەندێکی (KGB) بوو. لەماوەی دەیەکانی (١٩٨٠)دا وەك وتەبێژێکی پەرمی ڕێنمای ڕۆژنامەنووسانی خۆرئاواییو کارمەندی تەلەفزیۆنیی لەبارەگای سەرۆکایەتی (یۆنسکۆ) دیداری دەکردو، دووربینانە لەهەموو ڕوویەکی ئەوێی دەڕوانیو گوێی بۆ گشت پرسیارەکان ڕادەگرت. دەسەڵاتە فەرەنسیەکان هیچ جۆرە کۆنترۆڵێکیان بەسەرکەسانی لەوجۆرەوە نەبوو. شتێکی کە لەکۆتاییدا دەمانتوانی بیلێین ئەمەبوو کە: (ئیتر نامانەوێت

ئەمە لەوڵاتەکەماندا بێت.) بەڵام ئەم وتانە بەقورسی دەوتران، چونکە ئێمە هەموو ئەوانە دەرپەڕێنین ئەوانیش لەئێمە دەردەپەڕێنن. لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی قورسمان لەبەردەم بوو تا تێدەبگەین ئەو کەسە تازەیە کێیە کە کاری ئەو ڕوسانەی ئێمە دەرمان کردبوون پەسندکردووە.

پاش سەردەمی (پیتەری گەورە)و لەکاتی فەرمانڕەوایەتی (رۆمانۆڤەکان)و ماوەیەك پێش بەدەسەڵات گەیشتنی کۆمۆنیستەکان، ڕوسەکان توانایەکی باشیان لەپێناوی ناسینی خۆرئاوادا بەگەڕخستبوو. ئێمەی ئەورووپیش هەوڵمانداوە هەمان شت بەرامبەر بەخۆرهەڵات بکەین. ئێمە لەسەرزۆر ئاستو بەتێگەیشتنێکی قووڵەوە لەورووەوە سەرکەوتوو بووین. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە لەسەرهەمان کیشوەرینو لەسەرزۆر ئاستی نەتەوەیی– ئەگەر نەڵێم سیاسی یان فەرهەنگی– هاوبەشی ئەوانین.

لەماوەی چەندینساڵدا کاتێك (لیۆید برجنیف) لەمەیدانی سیاسیدابوو، کە گیانی کەوتە مەترسییەوە، زۆر خۆمان هیلاك کرد تا بزانین تا چ ڕادەیەك نەخۆش بووە. ڕۆژێکیان (برجنیف) سەردانی (دانیمارك)ی هەبوو، ئێمەش هاوکارییەکی سەرنج ڕاکێشمان لەگەڵ دەزگای نهێنی ئەواندا ڕێکخست. زانیمان بەهاوکاری ئەوان دەتوانین ئەپارتمانێك دروست لەژێر شوێنەکەی (برجنیف)ی تێدا نیشتەجێ دەبوو، بەدەست بهێنین.

بەهۆی ئەو لولانەی لەگەرماوەکەوە بۆ خوارەوە هاتبوو دەمانتوانی ئەو ئاوەی کە خۆی پێ دەشوات بگرینو پاشان شیتەڵی بکەین. لەمەشەوە زانیمان کە مەیخۆرەو هەڵبەتە مەیخۆرێکی لەسەداسەدیش بوو، کە ئەوەش هیچ مایەی سەرسوڕمان نەبوو.

بەسەرنجدان لەزانینی ئەم بابەتە، ئۆفیسی پرۆتۆکۆڵی فەرەنسا لەکاتی سەردانەکەی ئەودا بۆ (پاریس) ئەوەی دڵنیاکردەوە کە بوتڵی مەی لەسویتەکەیدا لە (تریانۆن)و (کۆشکی ڤێرسای)، واتە ئەو جێگایەی زۆرجار تیایدا دەمایەوەو، هەروەها لەکۆشکی (ئەلیزێ)ش شوێنی چاوپێکەوتنە پەرمیەکانی بە بەتاڵی دۆزراونەتەوە. بەهەرحاڵ، ئەوە دواین سەردانی

(برجنيف) بوو بۆ فەرەنسا، کە یەکەمین دیداری لەسەعات چواری پاش نیوەڕۆدا ئەنجامدرا. سەرەتا کۆشکی (ئەلیزێ) گەیشتە ئەو بڕوایەی کە هەموو جۆرە (مەی)یەکان لەبەردەستدایە، نزیکەی سێ جۆری جیاوازی ویسکی، سکۆچ لەهەموو جۆرێك، ویسکی کەنەدیو ئێرلەندیو هەموو ئەوانە لەوێدا هەبوون.

ئەگەر بیووتایە (بەخۆشیتان) ئێمە دەمان پرسی ئەوە کام جۆری مەیە، بەڵام تەنها خواردنەوەیەکی داواکرد کە لەلامان نەبوو، قاوە!. داوای کوپێك قاوەی کرد بەشیرەوە. بەڵام چێشتخانەکەی کۆشکی (ئەلیزێ) ئەوەی تێدانەمابوو، داخرابوو. چێشت لێنەرەکان نانی نیوەڕۆ ژەیان ئامادە کردبوو بۆ پیاسەکردن چووبوونە دەرەوەو هێشتا بۆ ئامادەکردنی خواردنی ئێوارە نەگەڕابونەوە. سەرئەنجام بەپەلە دروستمان کرد. لەکاتی سەردانی (برجنیف) دەزگای جاسوسی فەرەنسا هەموو جموجۆڵێکی خستبووە ژێر چاودێرییەوە. واتە ئەوشتەی دەیخوارد، چۆن ڕەفتاری دەنواند، لەکاتی نیوەڕۆدا کەسیمای سوور هەڵدەگەڕا هەستی بەچی دەکرد. پسپۆڕانمان هەبوون کە بەوردی سەرنجیان لێی دەدا، کامێراکانیش بەهەمان شێوە. پاش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژی دیدارەکە بوو پێشتر ئێمە سەرقاڵی گوێڕا داشتنو چاودێری ڕەفتارو گوفتارەکانی بووین. ئەو پیاوێکی قەڵەوو کەموزۆر حاڵەتی سەکتەی هەبوو، بەهۆی گۆچانەوە دەیتوانی ڕاست بوەستێت. پاش کۆبوونەوەکە بەرەو (تریانۆن) گەڕایەوە، لەئۆتۆمبیلەکە دابەزیو لەسەرخۆ چووە ژوورەوە، لەگەڵ پێنانە ژوورەوە پڕی بەبوتڵێکدا کرد، دەتوانیت بڵێیت بەڕاکردن ڕایکردو پێکێکی پڕ ڤۆدگای کوشندە- ڤۆدکای تیژ- ی فڕکرد. جگە لەڕوسییەك هەموو کەسێك بەخواردنەوەی ئەوە ناوجەرگی دەهاتە دەرەوە.

ئێمە لەپێناوی ئەمجۆرە جاسوسیکردنو ناسینی دوژمنو کۆکردنەوەی زانیاری لەوبابەتە هەوڵێکی زۆر مانداوەو، ناسینی بەرامبەر شارەزییەکە کە بەسەنتەری شەڕی سیخوڕی دادەنرێت. بۆیە جێگای سەرسوڕمان نییە کە

کاتێك سەرکردەی سیاسی کە ئاوڕێکی کەم لەوزانیاریانەی ئێمە توانیومانە کۆیان بکەینەوە دەداتەوە هەموو کارەکەمان بێ ئەنجام دەبێت. کاتێك سەرکۆمار (ژیسکاردستن) بەئامادەبوونی (برجنیف) بەشداری لەکۆبوونەوەی (وارشۆ)ی کرد بەبێ ئاگاداری دەزگا نهێنیەکەی، ئەم سەراسیمە بوونەمان چەند بەرامبەربوو. ئەمجۆرە هەڵانە لەکارەکانی ئێمەدا نەك تەنها پوچەڵ کەرەوەی کارەکانمانە، بەڵکو مەترسیداریشە. لەڕووی ئەمجۆرە هەڵکەوتانەوە ئێمەش هاوڕێی هاوەڵە ئەمریکیەکانمانین؛ لەکاتێکدا کە هاوشانە ڕوسەکانمان هەرگیز نەزۆکی ئۆپەراسیۆنەکانیان ئەزموون نەکردووە، چونکە دەیانزانی کە زانیارییەکانیان هەمیشەو لەکۆتاییدا بەجدییەوە بەدەست هێنراون. دیارە دوای ئەوە لەهەرهەلێکی ڕەخساودا بەرزترین ئاست بۆتە بابەتی جاسوسی کردن. بەم پێیە تەنها کاتێك لەم خواستە تێگەیشتینو بەوردی سەرنجمان لێیدا کە ئامۆژگاریەکانمانیان خستە ژێر لێکۆڵینەوەوە.

لەنێوان ژمارەیەکی زۆری هاوپەیمانە ئەمرکیەکانماندا، سەرکردەی سیاسیو تەنانەت سەرۆکی دەزگا نهێنیەکانیان بەچاوپۆشی کردن لەهاوپەیمانەکانیان، بوارێکی زۆریان بۆ کەنارگیری لەبەرپرسیارێتی لەبەردەمدا نییە. دەبێت ئەمریکیەکان هەست بەهەڵەی شێوازی کۆنی خودی خۆیان بکەن. ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکانیش بەشێوەیەکی جدیانە بیسەلمێنێت کە وەك ئێمە پێش کۆنبوونی بابەتەکە ئاوڕی لەبابەتە زۆر ئاڵۆزەکانی جەنگی (باکور– باشور) داوەتەوە، سەرکردەی سیاسی ئەمریکاش خۆی لەناو ئەو هونەرە زیرەکانەیەی کە دوژمنە تازەکانمان دەستیان داوەتێ ڕۆڵی خۆی بگێڕێت. لەیەکەمین ڕۆژەکانی کارکردنمەوە لەگەڵ پێکهاتەی جاسوسی ئەمریکادا بەپەژارەوە زانیم کە لەناوفەرمانگەی جاسوسیو ئاسایشی ئەمریکادا ڕوداوێکی گرنگو سیستماتیکانە لەناو ڕێکخراوی کۆکردنەوەی زانیاری، کە شیکردنەوەو پراکتیك لەسەربەدەست هاتووەکانی دەکرێت، لەئارادایە.

ئەم کەموکورپیانە کاریگەری لەسەرتوانای کارکردنی ئەمریکیەکان دژ بەئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی‌و هاوپەیمانە خۆرهەڵاتیەکانی لەجەنگی سێیەمی جیهانیدا دادەناو، دەبووە ڕێگر لەبەردەم هەنگاونانی کاریگەرانەی لەلایەن دەزگای جاسوسی ئەمریکاوە بەرامبەر بەدونیای (باشور). لەسەنتەری ئەم شکستەدا، لاوازی تێگەیشتنی سەرۆکی ئەمریکا ئەمەیە کە چ کۆمەڵگایەك لە حاڵەتی ئامادەکردن‌و خستنەڕووی زانیارییدایەو، بەگشتی چ ئامانجێکی هەیە؟

ئامانجی سەرەکی پێش هەمووشتێك دەرککردنەبەم خاڵە کە دەبێت هیوای سەرکەوتن بۆ هەموومان دەستەبەر بکرێت. تەنانەت لەوپرسەش مەترسیدارتر، بەکارهێنانە دووبارەبووەکانی کاری جاسوسییە بۆ بەرژەوەندییە سیاسیەکان‌و، بەرنامە دیپلۆماتی‌و سیاسیەکان لەگەڵ دیدێکی تایبەت‌و بەهۆی لایەنگرییەوە لەباڵێك ئاراستەکەی دەگۆڕێت. لەڕاستیدا ئەو بەها ئامانج‌و لایەندارانەی سەرانی جیهان دەیدەن بەشوێنگە جیهانیەکان هەرگیز ناتوانن لەوهەلومەرج‌و کەشە نێودەوڵەتیانەدا بخرێنەڕوو.

لەکاتی چاوپێکەوتنمدا لەگەڵ سەرۆك (ڕیگان) لەکالیفۆرنیا، لەساتێکدا سەرکۆماری هەڵبژێردراو لێمی پرسی: ( بەڕاستی کەسانی وەك ئایت الله خومەینی بەتەواوی چۆن بیر دەکەنەوە؟)

دەمودەست بەخۆمم وت باشترە نەچمە قوڵایی مێژووەوە. ئنجا وتم: (بەڕێز ڕیگان، دەتەوێت بە بەرگی ئاسایی دیپلۆماتیەوە دەرکەون. ئەوان بەوجۆرەی کە ئێمە دەبینین نابینن، سیستمی ناوخۆییان، هزریان وەك ئێمە نییە) سەرکۆمار خاڵێکی دانا: ئەویش ئەوەبوو کە زۆرینەی دوژمنە نوێیەکانمان هەمان ئەو مەزهبیە ئسولگەرایانەن کە وەك سەربازانی خودا لەڕاژەدان‌و بەم پێیە مرۆڤ واتایەکی تەواو جیاوازی هەیە لەوەی لای ئێمە هەیەتی.

بەڵام من هەرگیز بڕوام بەوە نەهێنا کە ئەو هەرشەش بەڕێوەبەری دەزگای نهێنی ئەمریکا کە من لەماوەی دەسبەرکار بوونمدا وەك سەرۆکی دەزگای

هەناسەکانی جەنگی سێیەمی جیهان دادەنرێت، کـە بـەکۆتایی توانستەکانی سۆڤیەت لەفۆرمی کۆنـی جـەنگی سـارد لـەکاتی ڕووبـەڕوو بوونـەوەی نێوان خۆرهـەڵاتو خۆرئـاواش دادەنرێـت. لەئەفغانسـتاندا دووفاکتـەری گرنـگو بنەڕەتی بوەهۆی دەرکردنی ڕاگـەیاندنی گشتی پاشەکشـەکردنی ڕوسـەکان، یەکەم: ڕەوشی مەترسیداریی داواکاری گشتی خەڵك سـەبارەت بەگەڕانـەوەی سەربازە ڕوسەکان بۆ وڵاتەکەیان، کە پێشتر لەو وڵاتەدا بەشداریکردنی دیدی خەڵکیو کاریگەریی لەسەر هیچ کام لەبڕیارە سیاسیو ستراتیژییەکان بوونی نەبووەو، بەوهۆیەشەوە هەموو گرفتێکی سەرڕێگایان بەلاوە دەنا.

زۆر لـەلاوەکان، کـە گوڵـی سەرسـنگی مەردانـەی ڕوسـەکان بـوون، لەناوکیسەدا بۆ نیشتمان برانەوە. فاکتـەری دووەم: بەتـەواوی ئابوریانـەبوو. ئەو جەنگە خەریك بوو ئارام ئارام سەرچاوەی ئابوری سۆڤیەتی، کـە پێشـتر ئاڵۆزببووە، وشك دەکرد. (گورباچۆف) ئامادەبوو کە پەیوەندییە نزیکـەکانی لەگەڵ هاوپەیمانەکانی بپچڕێنێتو، چاوپۆشی لەوتۆڕی پەیوەندیانە بکات کە پێشینەکانی لەسەر ئاستی زەمینەیەکی دارایـیو هـێزی مرۆیـی لەسـەردەمی جـەنگی دووەمـی جیهانیـەوە بـەجۆرێکی نەخەملێنانـە لەگـەڵ وڵاتـانی خۆرهەڵاتدا بەرقـەراریان کردبـوو، بکـات. بـەم پێیـە چۆن دەیتوانـی خـۆیو هاوشانەکانی خانەنشین بکات، ئەو کەسانەی کە بـەهای جـەنگیان لـەپێناوی کۆنترۆڵکردنی پنتێکی زۆردوور لەنیشتمانەکەیانەوە دابوو– بۆنمونە وڵاتێکـی موسـڵمان نشـین کـە لەڕێساکانی بنکـەی کۆمۆنیزمـەوە زۆر دوورە– لەگـەڵ ئەوەی کە هێشتا (گورباچۆف) پشتگیری دارایـی (کـابوڵ)ی لەئەسـتۆ دابـوو ئەم کارە لە (حوزەیرانی/١٩٩٢) کۆتایی پێـهات. لەسەرەتای دەیـەی ساڵی (١٩٩٠) بـۆ سیاسـەتی نـاوخۆو دەرەوەی سـۆڤیەت دراو پێوانـەی سـەرەکی بـوو. کاریگـەری بـەها وەك دوایـن ئەزموونگـەری ڕوسـیا، کـە لەڕاسـتید ستانداردێکی بنەڕەتی بوو، دەرکەوت.

دەبێت لەوە تێ بگـەین کـە چۆن دەکرێـت (KGB) لەمەیدانـە نوێیـەکانی جەنگی چوارەمی جیـهاندا بـۆ کـارکردن ئامـادە بکرێت. بەهـەمان شێوەش

پێویسته ستراتیژو خاڵه لاوازەکانی هاوپەیمانە ئەمریکیەکەشمان بناسین. بۆنمونە، هیچ بەڵگەنامەیەك لەئارادا نییە ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە دەزگای جاسوسی یان پێکهاتەی سوپایی سۆڤیەت ڕاستەوخۆ بێکار بمێنێتەوە.
هەرکام لەکۆمارە جیابووەکان ئەوەیان دەرخستووە کە توانای کۆنترۆڵکردنی پێکهاتەی ئاسایشی خودی خۆیان هەیە؛ ئەمانەش هەمان ئەو پێکهاتانەن کە بەخێرایی لە (KGB) جوودابوونەتەوەو، (KGB)یش لەژێر کۆنترۆڵی خۆماندایە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوانە ئەوەیان پیشانداوە کە لە (KGB) سەنتەرو شوێنگە بەڕێوەبەرایەتیەکانی ئاسایشی ناوخۆی سۆڤیەت (GRU)دا بەهەمان فروانیو ئاسایی لەسەرئاستی زانیاریو ئۆپەراسیۆنی دەرەکی چالاکی ئەنجام دەدرێت. دەبێت ئامادەی دروستبوونی ئاژانسی سیخوڕی کۆمارە تازە ئۆتۆنۆمەکان لەناو پایتەختی وڵاتە خۆرئاواییەکانماندا بین، کە پاش پێکهێنانەوەی نوێی وڵاتەکانیان دروست دەبن. لەنێو ئەو هەلومەرجانەدا لەڕاستیدا (KGB)و (GRU) لەهەموو شوێنێکدا لەفۆرمی دیدا دەمێننەوە. دەسەلاتو دەستڕا گەیشتنیان بۆ دەرەوەی وڵاتەکەیان هەرگیز مایەی بڕین نییە. گەرچی لەپشتی پەنجەرەی جێگای نوێنەرانی ڕوسەکان لەناو ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەرشەقامی ژمارە شەستو هەشتی خۆرهەلاتی (نیوۆرك) پەردەکان دا درابوونەوە، لەخاڵە قەیراناویو مایەی گڕ گرتنەکانی جیهاندا هێشتا شوێنی کارمەندەکان ماوە، کە ساڵەها لەوەپێش لەوڵاتە خانەخوێیەکانیاندا تونێلو بێرازی ژێر زەمینی خۆیان ئامادە کردووەو، هەرکاتێك داوایان لێ بکرێت لەوڕێگایانەوە هاوسەنگیو ئارامی لەوڵاتەی تێیدا نیشتەجێن سازدەکەن. هێشتا ئەو کارمەندانە لەپۆستی سەرەکی لەجیهانی ڕوو بەفراوانی (باشور)و لەناو دیمکراسیەتی باکورو خۆرئاوادا ماونەتەوە. ئۆپەراسیونەکانی (KGB)و پێکهاتەی سوپایی- سیخوڕی (GRU) لەژێر فەرماندەیی نوێو بەتایبەتی لەویلایەتە یەکگرتووەکاندا دووساڵ پاش ئەوەی ڕابەرانی کۆمۆنیستی لەوڵاتەکانی پۆلۆنیا، هەنگاریا، چیکۆسلۆڤاکیاو ئەڵمانیای خۆرهەلاتی یەك لەدوای یەكو

پاشانیش خودی یەکێتی سۆڤیەت لەسەرکار لابران بەخێرایی کەمێك بەرەوپێشەوە چوون. لەڕاستیدا بەڵگە هەیە کە لەژێر چاودێری (KGB)دا پۆلیسی نهێنی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی (ئەشتازی) بەنهێنییەکی تەواوە لەناوخودی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتیدا پێش یەکگرتنەوەی دووبارەی لەگەڵ ئەڵمانیای خۆرئاوایی، سەرقاڵی چالاکی بوون. سەدەها خەڵکی لەئەندامانی پێکهاتەی ئاسایش کە فەرمانیان ڕاستەوخۆیان ناڕاستەوخۆ لە (KGB)وە وەردەگرت و تەنها ڕاپۆرتیان دەدا بەکامەندانی کۆنترۆڵی سەربە (KGB) خۆیان لەناو قولایی چالاکی نهێنیدا لەسەرانسەری ئەورووپای خۆرهەڵاتیدا حەشاردا. ئەوانیدی بۆ وڵاتی خۆیان گەڕانەوە تا دووبارە درێژە بەڕاژەکردنیان بۆ کرملین بدەن. بەرژەوەندییەکانی (KGB)، کە سیفەتێکی هاوبەشی لەگەڵ هاوتا دەزگا جاسوسیەکانی دی لەجیهاندا هەیە، بەردەوام کۆمەکی هەندێ لەخەڵکەکانی خۆی دەکات، کە هێشتا وەفادارن بەرمبەریان تا لەدەزگای جاسوسیو هەروەها لەناوخودی دەوڵەتەکانیاندا لەئاستی دەستەڵاتدا بهێڵنەوە.

ئێمە ئەوان بەخەڵکی ئاسایی، لایەنگران یان پەیڕەوانی گەشتیاری ناودەبەین، بەڵام بەشێك لەوانە ئەو کارمەندانەن کە پەروەدەیی گشت لایەنەیان بینیوەو دراوی باشیان وەرگرتووەو زۆریش ڕۆشنبیرن. ئەو تاکانە لەزۆر شوێنگەدا ڕەوشێك درێژە پێ دەدەن کە ڕوسەکان لەدەرەوەی وڵاتەکەیانەوە لەناوئەو فۆرمەدا بەرنامەڕیزی بۆ دەسەڵاتەکەیان دەکەن. ئەم هەنگاوە لەدەرەوەی سنورەکانیان و لەناودڵی دیمکراسییەك دادەنرێت کە بەدرێژایی جەنگی سارد بەدوژمنانی ئەوان دادەنران. ئەم گەمەیە تا ئەوکاتەی کە (سیخوڕیکردن) لەئارادا بێت درێژەی دەبێت. سەیرکە لەگەڵ کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانیشدا چی بەسەرنازییەکاندا هات. سەدەها کەس لەوانە بەخۆ گۆڕینەوە لەوێ مانەوەو بوونە ئەندامی (ئەشتازی)، کە ئەوەش بۆ درێژەدان بە (تێزی دەسەڵاتی نازی) ڕێگایەکی

نمونەییە. بەداخەوە بەهۆی بوونی ئەوانەوە جەنگی دووەمی جیهان بەخێرایی کاروانی خۆی بەرەو جەنگی سێیەمی جیهان بڕی.

لەجیاتی گەڕانەوەی (ڕایشی هیتلەر) ئەوانە خۆیان لەناوتەڵەی کاردندا بۆ هەمان ئەو دوژمنەی کە ڕۆژانێك دوژمنی سەرسەختیان بوون بینییەوە. سیستمی کۆمۆنیستی لەونازییانەی کە تەنها کڵاوە خاکیەکانیان بەکڵاوێکی سوور گۆڕی بوو، بەخێرایی‌و بەکەماڵی ڕاحەتەوە ئەو واقیعە نوێیەیان پەسندکردبوو، سوودێکی زۆری وەرگرت.

خۆرئاوا لەکرانەوەیدا کەمتر سوود لەشارەزاییەکانی خۆی وەردەگرێت. چونکە ئێمە لەلای جەنگی سێیەمی جیهانەوە بەرەو جەنگی چوارەمی جیهان هەنگاو دەنێین بەناچاری گۆڕانکاری لەوجۆرە لەدۆستایەتیەکاندا دێتە ئاراوە.

چ ئەوە بە (هەلپەرستی) ناوبەرین‌و چ بە (ململانێ لەپێناوی مانەوەدا)، هەرچۆنێك بێت دەبێت دڵنیابین کە دەزگا جاسوسیەکانی خۆرئاوامان یان (باکور) سەردەستەی بەهرە دارانن لەم گروپەدا. هێشتا دەبێت بەئاگادرییەکی زۆرەوە مامەڵە لەگەڵ دەزگا نهێنیەکانی سۆڤیەتی بکرێت، چونکە ئەوەی نزیك دەبێتەوە، بەدڵنیلییەوە بریندار دەبێت؛ چونکە (ورچی بەهێز) هێشتا تەندروستە. دەزگا جاسوسیەکانی خۆرئاوایی پێویستە درێژە بەچاودێری کردنی چالاکیەکانی سیخوڕانی سۆڤیەتی بدەن. ڕوسەکان لەوجێگایانەدا چالاکی ئەنجام دەدەن کە دۆستەکانیانی تێدایەو، ئەوانیش لەحاڵەتی ئەنجامدانی چالاکیدان‌و، ئەو هەنگاوانەشی دەینێن هێشتا خاوەنی وریاییەکی گرنگ‌و سەرنج ڕاکێشە.

ئەمڕۆ دارمانی ئابوری سۆڤیەت لەخۆیدا ڕووداوێکی ئاگادار کەرەوەیە؛ سەبارەت بەپێدانی بڕێکی زۆری سەرمایەو دراو بۆ ناو سیستمێکی ئابوری ناتەندروست‌و نائومێد، کە لەلایەن هێزەکانی بازاڕەوە کۆنترۆڵ ناکرێت، بەڵکو لەلایەن بیرۆکراتە بێ دەسەڵاتە کورت بینە دەوڵەتیەکانەوە ڕێنمایی دەکرێن‌و، دەوڵەتی سۆڤیەتی بڕیاری داوە کە ئیتر بەربەستدانان لەبەردەم

خرۆشۆف)وە کە لەهەوڵی زیادکردنی ژمارەیانی دابوو. زۆرباش کاریان نەکردووە. بەڵام دەوترێت بەپێدانی ئەو خاکانە بەژنە (ئۆزبەکیەکان) زۆرباش کاریان تێداکردووە. ئەو جێگایانە لەڕووەوەی کە بۆ خەڵکی ناوخۆ شوێنێکی شیاوو پارچەیەك لەقەڵەمڕەوی قەدەغە نەبێت، زۆر پێشکەوتنیان بەخۆیانەوە دیوە. بەڵام ژمارەی خەڵکی نائەوروپی لەخاڵێکی پڕ مەترسیدا لەحاڵەتی زیادبوونە. دانیشتوانێکی کە ڕێژەی زیادبوونیان لەخاڵەکانی دی (ئۆراڵ) زیاد ترە، هیچ جێگایەکی ڕاستەقینەیان نییە بۆی بچن. ناتوانن ڕووبکەنە خۆرهەڵات، چونکە ئۆقیانوسی ئارام و ژاپۆن لەوبەرەیە. جگە لەوەش ناتوانن بەرەو باشوریش بجولێن، چونکە ئیمپراتۆریەتەکانی چین و هندستان قەڵەمڕەوی ئیسلام لەوئاڕاستەیەدان. بەشی خۆرئاواش بەدانیشتوانی چڕی ڕوسەکان پڕ کراوەتەوە. گرفتی سەرەکیمان لەئایندەدا ئەگەری لەئەستۆگرتنی بەڕێوەبردنی ئەم هێزە دەسەڵاتدارە ڕوو لەپەرەسندنەیە. بیست ساڵ لەوپیش من بە (پیتەر ئابراسیمۆف)م وت، کە ئەو کاتە باڵوێزی یەکێتی سۆڤیەت لەفەڕەنساو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیست بوو، (ئێوە جارێکی دیش جەنگاوەرانێکی دلێرن بەشمشێرو نێزەی زەبەلاح و کەلوپەلی جەنگی زۆرەوە لەبەرامبەر گروپی مەغۆلەکاندا بەرگری لە ئەوروپا دەکەن)

لەناوچەیەکی فراوانی ئاسیا، کە بەشێك لەئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی بووە، لەپاش ساڵی (١٩١٧)وە نەتەوەی جۆراوجۆر، کە هەڵبەتە بەشێك لەئەوروپای خۆرئاواش نەبوون، دەژین. لەنێوان ئەوانەو لەباشووری ئەم خاکە پانوبەرینەدا شەست ملیۆن موسڵمان دەژین، کە ئێستا لەکۆتی کۆمۆنیزم ئازادبوون و بەخێرایی بەرەو مەزهەب و فەرهەنگی خۆیان دەگەڕێنەوە. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەجێگایەکدا لەڤێتنام، کە دەکرێت بووترێت جۆرێك لەیەخەگیری نێوان (باکور– باشور) بووە، دوچاری شەڕ هاتوو شکستی خوارد. ڤێتنامی باکور، کە پارێزگایەکی هندو چینی دێرینی فەڕەنسابووە، تووشی ڕابەرایەتیەکی ڕادیکالی کۆمۆنیستی ببوو، کە

لەلایەن ڕوسەکانو کەموزۆر کۆمۆنیستەکانی چینەوە پشتیوانیان لێدەکرا. دەرئەنجام دەوڵەتێك بوو چ لەڕووی ڕۆحیو چ لەڕووی ئایدیۆلۆژییەوە ڕووبەڕووی جەنگی سارد یان جەنگی سێیەمی جیهانی ببوەوە. مەزهەبەکە کۆمۆنیزمو دەسەڵات بوو، نەك خوداو مەسیح.

ئەمە جەنگێك بوو بەسنورە جیوگرافیە دیاریکراوەکانو ناسراوەکانەوە، کە بەتاکتیکەکانی تیرۆر، واتە تاکتیکەکانی شەڕی پارتیزانی، دەجەنگا. ناچاربووین ئەم جەنگاوەرو چەکانەی کەموزۆر لەلای خۆرئاوا ئاشنانەبوون، بناسین؛ کە هەڵبەتە کەموزۆر لەم کارەدا سەرکەوتوو بووین.

گەرچی هەرگیز فێرنەبووین کە چۆن لەبەرامبەریاندا بەرگری بکەین، بەڵام جەنگی ڤێتنام بەها گەلێکی بۆ ئەمریکا هەبوو. ئەو جەنگە گەلی ئەمریکا فێرکرد، کە لەوانەیە بچنە جەنگی کە سانێکەوە کە ئەگەری شکست بەدەست ئەوانە، واتە هێزیکی کە ڕووکەشانە دەسەڵاتێکی کەمتری هەیە. ئەمریکیەکان دەبێت ئامادەی ئەم سەرکێشیە بن؛ لەوکاتەوەی کەزانیان ئەم کارە لەڕووی ڕۆحییەوە هیچ بزوێنەر نییە بیروڕاکانی خۆیان پاراست.

سەرەنجام بۆ ئەوان ئاسانتربوو کە سۆراغی تاکتیکێکی دی بکەن، کە نمونەکەی لەوکۆتاییانەدا لەکەنداوی فارسیدا دژ بەعێراق بەکارهێنرا، کە شەڕێکی زۆر وێرانکار ترو کێشمەکێشتری خستەڕوو.

جەنگی ئەفغانستان بۆ ڕوسەکانیش هەمان دەرئەنجامی دا بەدەستەوە، کە ڤێتنام بۆ ئەمریکای بەدیاری هاورد. ئەوەش تاکە جەنگێك بوو کەتا ئەودەمە ڕوسەکان تیایدا دوچاری شکست ببوون.

بەڵام خاڵی گرنگ ئەمە بوو کە ڕێگای ڕەوەندی دارزانی کۆلۆنیالیزمی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی کراوەبوو، کە لەکۆتاییدا بووەهۆی سڕینەوەی مۆرکی زۆربەی سیستمەکانی ئەوروپای خۆرهەڵاتی، کە لەسەردەمی جەنگی دووەمی جیهانی بەدواوە درووستکرابوون.

ئەم بابەتە، یان هەمان کۆتایی پێهاتنی ئیمپراتۆریەتی ئەوروپای خۆرهەڵاتی سۆڤیەتو لەڕاستیشدا خودی یەکێتی سۆڤیەت، بەدواین

تەنانـەت یۆگسـلاڤیا کـە بـەنزمترین پێودانـگ لـەچاو دەوڵەتـە کۆمۆنیستیەکانی پێش ڕۆژانـی (گلاسنۆسـت) کۆمۆنیسـتی بـوو، دوورنـەبوو لەبەشداریکردن لەچالاکیـە تیرۆریسـتیەکان، یـان پـەنادانی تیرۆریسـتان. یۆگسـلاڤیا خـۆی لـەدەرەوەی ڕیـزی کۆمۆنیسـتەکان دادەنـاو، لەهەوڵداندابوولەنێوان هەردوو بلۆکدا پەیوەندی دروست بکـات. زۆربـەی ئـەو وڵاتانـەی کـە ئاسـتی پەیوەندییـەکانیان لەگـەڵ یۆگسـلاڤیادا بـەرزکردەوە، لەودەمـەوە بەتـەواوی کەوتنـە بـەرەی دژ بەهاوسـێکانی یۆگسـلاڤیاوە لەئـەروپای خۆرئـاوادا. شـوێنگەی بێلایەنانـەو جێگیری یۆگسـلاڤیا زۆرجـار بەداڵدەدەریو کۆمەك بەڕەگەزانی کەم مەترسیدارتر لێك دەدرایەوە. ئەگەر لەئەروپای خۆرهەڵات وڵاتێك هەبێت کە لەوساڵانەی دواییدا میکانیزمی کۆنـی کۆمۆنیزمی ڕەها کردبێتو لەگرتنە باوەشـی ئـەو جۆرە چالاکیانـەدا کـەمێك جیاوازی لەگەڵ وڵاتانی دیدا هەبووبێت، ئەوە یۆگسلاڤیایە. یەکەم ئەم وڵاتـە بەتەواوی گیرۆدەی گرفتو پرسی نـاوخۆی بـوو، کـە بووەهـۆی هەڵگیرسـانی شەڕی ناوخۆ. دووەمین وابەستەیی توندی لەگەڵ ڕیشەی بێلایەنی وایکردووە بەجێگیری بمێنێتەوە. براوتێکی کە خودی خۆی درێژەیی پێدەدات بۆتەهۆی لەخۆگرتنی تیرۆریستانێك کە بەتاسەی پەناگەو پشتگیرییەوەن.

بەدرێژایی دوودەیەی کۆتایی، ڕێکخراوی ئازادیخوازی فەلەستینی هـەندێ لەنوێنـەرانی خـۆی نـاردە بـەلگراد، بەهـەمان شێوەی کـە لـەباقی وڵاتـانی ئـەروپای خۆرهەڵاتیو (پاریس)شدا هەبوو.

بەمجۆرە هیـچ جێگـای سەرسوڕمان نییـە کەپاش ئـەوەی (ابـو عـەباس) سەرپەرشتی چالاکی خوێنـاوی فڕاندنـی کەشتی (ئاکیلـە لائـور)ی ئیتالیـایی کرد، خۆی لەیۆگسـلاڤیا پەسـتا. ئەمـە نمونـەی وڵاتێکی کلاسیکی بـوو کـە خاوەنی خودی خۆی بوو. یەکـەمین ویسـتگەی تیرۆریسـتەکان لـەئیتالیابوو، ئـەو جێگایـەی کەشـالیاری ویلایەتـە یـەکگرتووەکان شـێتانە داوای لەدەسـەڵاتدارانی ئیتالیـا کـرد (ابوعـەباس) دەسـتگیر بکـەن تـا ڕادەسـتی دەسـەڵاتدارانی ئـەمریکایی بکرێتـەوە. بـەڵام لـەجیاتی ئـەوە دەسـەڵاتدارانی ئیتالیـا داواکارییەکـەی ئـەمریکایان نـادیدە گرتو ڕاسـتەوخۆ بەفڕۆکەیـەك

ڕەوانەی یۆگسلاڤیایان کرد؛ لەوشوێنەی بەباوەشی گەرمەوە پێشوازییان لێکردو، لەماوەی چەند سەعاتێکدا لەخانوویەکی ئارامی سەربەڕێکخراوی ئازادیخوازی فەلەستینی لەبەلگراد نیشتەجێ بوو. بەکەمالی ڕاحەتەوە بەشداری لەگفتوگۆیەکی تەلەفۆنی لەگەڵ ڕۆژنامەنووسانی خۆرئاوایی لە پاریس‌و تونس کرد– ئەو شوێنانەی کە ڕێکخراوی ئازادیخوازی فەلەستینی بنکەی فەرماندەیی خۆی تێدا پاراستبوو– سەرئەنجام کاتێك هەراوهوریای دیبلۆماتانە هێندە بەرزبۆوە، کە تەنانەت خودی یۆگسلاڤیاشی گرتەوە، (ئەبوعەباس) دووبارە ونبۆوەو بەفڕۆکەیەکی سەربەهێڵی ئاسمانی یۆگسلاڤیا بەرۆربەرەو (دیمەشق) ڕۆشت تا بگەڕێتەوە بۆ بنکەکەی خۆی؛ ئەو شوێنەی کە تا ئەمڕۆش وەك ئەستێرەیەك تیایدا ماوەتەوە.

لەماوەی چل سالْدا، هەموو وزەی خودی خۆمان لەپێناوی بیستن‌و بەدەسهێنانی زانیاری سەبارەت بەچالاکی جاسوسەکانی ئەورووپای خۆرهەلات بەخەرجدا. سەرئەنجام تێگەیشتین چۆن کاردەکەن‌و، وەك تاکیش ئەوانمان ناسی‌و، کاتێك لەبنکەیەکەوە بۆ یەکێکی دی دەجولان چاودێریمان دەکردن، ئاگاداری پەیوندییەکانیان بووین. کاتێکیش چالاکیەکانیان بەتەواوی ئاشکرادەبوو، یان تۆڕەکانیان تەواو ترسناك دەبوو، لەهەرشوێنێك کەمومکین بوایە گردمان دەکردنەوە، لەولاتەکانمان بەدەرمان دەنان. ئەو هاولاتیانەشمان کە پەیوەندی نزیکیان پێیانەوە هەبوو دەستگیرمان دەکردن.

بەم پێیە، ئێمە چۆن لەپڕێکدا تەرزی هزری خۆمان گۆڕی‌و هەمان ئەو دەولەتانەی ئەورووپای خۆرهەلاتی کە تا ئەو دەمە نزیکانە بەدوژمنی خۆمان دادەنان بەدۆست وەرمانگرتن‌و، دیدە ئاشکراکانمان لەمەڕ تیرۆریستان‌و قاچاخچیانی مادەی سڕکەر، کە لەچل سالّی داهاتووشدا دوژمنمان دەبن، گۆڕی؟ تەنها بەکۆمەکی دۆست‌و هاوپەیمانەکانمان.

## دوژمن وەك دۆستو دۆست وەك هاوپەیمان

تاکە هەوڵی گەورەی ئەوروپا لەناو وەچەی داهاتووداو، دوای ئەویش ئەمەیە کە ئێمە دوژمنە سەرەکیەکەی سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانیو دواتریشی بکەینە دۆستێكو، دۆستی سەرەکیمان بەهاوپەیمانێکی واقیعی بگۆڕین، تا لەجەنگدا لەپاڵ ئامانجی سەرکەوتندا لەگەڵماندا بێت. لەڕاستیدا بۆئەوەی ئەو سەرکەوتنە لەبەرەی ئێمەدا بێت پێویست بەمانەوەی ئەو دوولایەنە دەکات لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا.

ناوەڕۆکی ئەم هەوڵە ئەمەیە کەئایا ئێمە دەتوانین دەرك بەماهیەتی بنەڕەتی هەردوو کۆمەڵگاکە بکەین؟- واتە کۆمەڵگای ناجۆرو پارچەپارچە بووی یەکێتی سۆڤیەتو ویلایەتە یەککگرتووەکان، کە ڕۆژانێك بەیەکێتی سۆڤیەتو ئەمریکا ناسرابوون- یان دەتوانین تێبگەین چۆن بیردەکەنەوەو کاردەکەن، قۆناغەکانی پەرەسەندنی کارەکانیان چۆنەو چ جۆرە هێزێك تێکەڵ بە شۆڕشەکانیان بووە؟

هۆی ئەم هەنگاوە گەورەیە ئەو ئاڵۆزیەیە کە دەرئەنجامی هەڵوەشاندنەوەی سۆڤیەتە، ئەو وڵاتەی کە ڕۆژانێك بەیەکێتی سۆڤیەت ناودەبراو ئیتربوونی نەماوە. ئەم کارەش پلەبەپلە گرنگترو سەرەکی تربووە.

حاڵەتی شلەژاوی دوازدە یان لەوانەیە زیاتری نەتەوەکانی سۆڤیەتی، کە هەندێکیان لەڕیزەی زلهێزە خودیەکان دادەنرێن، هەریەکەیان بەزمان، فەرهەنگ، مێژوو، ناسنانەی تایبەتی خودی خۆیانەوە دەبنە ئەرکێکی گرانو، ڕەهەندێکی قورس دەخەنە سەردەزگاکانی ئاسایشو جاسوسی خۆرئاواو دیپلۆماتو سیاسەتمەدارەکان.

پاش جەنگی دووەمی جیهان، لەماوەی دەیەکانی ئێمەدا کاتو وزەو هێزێکی مرۆڤی زۆرمان لەپێناو ناسینو لێکۆڵینەوەی ئەو هێزانەدا بەخەرجدا، کە ئەو دوو زلهێزەیان بەرەوپێشەوە دەبرد. بەم پێیە، بەدرێژایی ئەم خولە بەدبەختانە لەدوولایەنی سەرەکیو گرنگەوە

ڕووبەڕووی شکست بووینـەوە. یەکـەم: تێگەیشتن‌و دەرککردن بـەهێزێکی ناوخۆیی دەسەڵاتدار کـە ئـەمڕۆ هێزە دەرهاویژراوەکان لـەناودڵی یەکێتی سۆڤیەتەوە ڕێنمایی دەکات. دووەم: بێگومان لەلێکۆڵینـەوەو ناسـاندنی یەکێتی سۆڤیەتی جاران‌و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك دوو زلهـێز دوچـاری شکسـت بوویـن؛ چونکـە ئێمـە بـەدرێژایی ئـەو کاتانـەی لەجەنگدابووین دژ بەئیمپراتۆریەتی سۆڤیەت، زیاد لەسنور حسابمان بۆ ڕووی پشـتگیری ئـەمریکا دەکرد. هیچ کام لەوانە پەیوەندییەکی سـاغ‌و بنـەڕەتیان لەگـەڵ ئـەورووپادا پێـك نـەهێنا. ئێمـە هـەرگیز لـەهیچ کـام لـەزلهێزەکان نزیـك نەبووینـەوە؛ چ وەك دۆست‌و چ وەك دوژمن‌و، بـەدیدو بڕوابوون بەخود توانیمان لەسەرپێی خۆمـان ڕابوەستین. ئـەورووپا لەگـەڵ هەریەك لەوانە لـەناو لەناوبەشێك لەخاکەکەیدا جیاوازی بەئازاری هـەبوو. دەبێت فێرببین کەچۆن گەورەی خۆمان بین، پێـش ئـەوەی پەیوەندییـەکی تەندروست لەگەڵ وڵاتێکی دیدا دابمەزرێنین.

بۆ ئەورووپیەکان زانین‌و بەدەسهێنانی ئـەم هوشیارییە قوڵـە دەربارەی دوو زلهـێز یـان ئـەو دەسـەڵاتانەی لـەناوخاك‌و خۆڵـی ئیمپراتۆریـەتی سۆڤیەتیەوە هاتوونەتـە دەرێ، زۆر گرنـگ‌و پێویستە. بەتایبـەتی دەبێـت جارێکی دی ئاڕاستەی سیستمە ئاڵۆزەکـانی زانیارییـەکانمان بگۆڕیـن، کـە سەردەمانێکی دوورودرێـژ لەهـەردوو بلۆکـی زلهێزەکانـەوە فـێردەکراین کـە دوژمنەکانمان چواردەوریان تەنیوین. ئەم دوژمانانە لەڕاستیدا لەنێو خـودی خۆماندابوون. کۆمۆنیزم لەگەڵ دەستپێکی سەدەی هاوچەرخدا لـەدایکبوو، لەگەڵ کۆتایی هەمان سەدەشدا لەناوچوو.

ئەمـە بەومانایـە نییـە کـە هـەموو کۆمۆنیسـتەکانی سـاڵی (١٩٩٩) دیمکراسیخوازی باشن. ئـەو نەریتانـەی لـەتاقی وەچەیـەکدا بـەچنگ هێنراون بەگران دەتوانرێت بتۆرێنرێن. بەشی کەرتی تایبەت چ بەهایەکی هەیە کـاتێك ناچـارین چـەمکی هـزری سوود، وەك ئـەوەی کـە ڕێزمـانی زمـانێك فـێری خوێندکارێکی پلەدوو دەکەین، بڵێنەوە؟ ئەوانـەی کـە خوێندکـاری تیۆری‌و

پراکتیکی کۆمۆنیزم بوون پێویستە سەرەتاترین چەمکی ئابورییەکانی بازاڕو دیمکراسی فێربن‌و، لەوکارەشدا ئێمە چێژ وەردەگرین‌و ئەوان بەتەواوی ئەم بابەتە نازانن.

بەمجۆرە خەڵکی هەمان ولاتی کە ڕۆژانێك بەیەکێتی سۆڤیەت دەناسرا دەبێت بۆ هەمان ئەو بەها ڕەسەنانەی کە لەکۆمەڵگای ڕوسیادا ڕیشەی قووڵیان داکوتابوو بگەڕێنەوە، بەها گەلێکی کە لەڕوسیا نەك سۆڤیەتدابوونی هەبووە. لەوجۆرانەی کە لەناوڕۆحی (لتونی، لیتوانی، ئەستۆنی‌و مۆڵداڤی)یەکان‌و، هەروەها لەناوڕۆحی (ئۆکرانی)یەکاندا هەبووە. ئەو بەهایانەی کەدەبنە جێنشینی کۆمۆنیزم لەڕاستیدا پەیوەندی ڕوسیایە بەدیمۆکراسییەوە، کە پەیوەستبوون‌و پەیوەندی گرتنیش بەکڵێساوە لەخۆدەگرێت.

ماوەیەکە لەناوڕوسیادا گەواهی گەڕانەوەین بەرەو کڵێسای کۆنی ئارتدۆکسی. لەزۆربەی خولەکانی سەدەی ئێستادا هاوشان لەگەڵ دەسەڵاتی خوێناوی کۆمۆنیزمدا کلێسای ئەرتەدۆکسی ڕوسی پارێزگاری لەشاراوەترین نهێنی خۆی کردووە، واتە ئەوشتەی کە دەتوانرێت بەسمبولی کڵێسا دابنرێت‌و، ژنان‌و پیاوانی ڕوسیا وەك ڕێچکەیەك بۆ ئارامگرتنی هزری بەدوویەوە بوون. ئەم ڕێچکەیە چەندین ساڵ کاروانی کەشیش‌و باوەڕدارە ڕاستەقینەکان بووە. کۆمۆنیستەکان هەستیان بەنیازی سیمبول‌و ئامازەکان دەکرد. هەمیشە لەوباوەڕەدا بووم کە هەڵەی سەرەکیان ئەوەبوو کە بەڵێنیان دەدا پاداشتی کۆتایی بۆ ئیمانداران لەم جیهانەو لەسەرخاکی گۆی ئەم زەوییەدا ئامادە دەکرێت. ئەم بەڵێنە بۆ ماوەیەکی کورت حاڵەتی سیمبولی لەناوبرد. کۆمۆنیزمیش ڕوخا، بەڵێنەکانی کۆمۆنیزم لێرەدا سەبارەت بەخۆشبەختی لەم دونیایەدا دوچاری شکست بوو، جیهان توانی ببێتە گەواهی ئەو شکستهێنانەو بەگاڵتەجاڕییەوە سەیری بکات.

کەشیش‌و ئەسقەفە گەورەکانی ئەرتدۆکس دەیانزانی کە ناتوانیت هەرگیز ئاین‌و سروتە ئاینیەکانی کڵێسا لەناوبەریت، چونکە چیدی هیچتان بۆ

نامێنێتەوە. بەسەرنجدان لەوەی کە کڵێسا هەرگیز وەك خولگەیەکی نەیار دژ بەحکومەتی کۆمۆنیستی کاری نەکردووە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی پارچە پارچەیی سروتە مەزهەبیو بەڵێنەکانی، کە لەسەربنەمای ئاشتیو ئارام گرتنە لەسەرگرفتو نەهامەتیەکانی ئەمڕۆی جیهان.

خەڵکی ڕوسا بەشێوەی دەستەجەمعی بەرەو مەزهەبەکانیان دەگەڕێنەوە. بەلێکدانەوەیەکی عەقڵانیانە دەتوانرێت بوترێت؛ ئەو مەسیحیانەی کە لەڕوسیا بەجۆرێکی ڕاستەقینەو ڕێکوپێك خودا پەرستی دەکەن ڕێژەیان لەمەسیحیەکانی فەرەنسا زیاترە.

دەبێت شتێکی دی لەتایبەتمەندییەکانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران هەست پێبکەین، کە یاریدەمان دەدات تا بەرەو پێکەوە ژیانێکی ئاشتیخوازانەو کارا هەنگاو بنێین. روسەکانی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی (١٣٧٩ملیۆن کەس لەکۆی گشتی دانیشتوانی (٢٨٨) ملیۆن کەسی ئەو وڵاتە پێك دەهێنن. ئەگەر سلاڤیو ئەوروپییەکانی دی لەوێنەی (بیلۆروسی)و (ئۆکرانی)نیەکان، ئەو وڵاتانەی بەکرداری سەربەخۆنو لەڕابردوودا بەرژەوەندیان لەلایەن هەمان ئەو ڕوسانەوە دابین دەکرا، زیاد بکەین بەلایەنی کەمەوە بەڕێژەی (٢٠٠) ملیۆن دەگەین، چونکە زۆربەی دانیشتوانی یەکێتی سۆڤیەت، لەئێستادا لەخۆرئاوای (ئۆرال)، واتە لەبەشی ئەوروپایی ڕوسیادا کۆبوونەتەوە.

بەڵام بەشێکی گەورەی ئەو سەرزەمینەی کە خێراترین ڕێژەی زیادبوونی دانیشتوانی هەیە دەکەوێتە دەرەوەی ئەوروپاوە. لەودەمەدا کە ڕوسەکان لەکاتی هێرشیان بۆ سەرئەفغانستان سەرنجیان لەوترسە قوڵەی ناوسنورەکانی خۆیاندا، لەئاسیای ناوەڕاست شێوەیەکی نوێی جەنگ لەنێوان وڵاتێکی ئەوروپی، واتە ڕوسیاو جەنگاوەرانی ئازادیخوازی ئەفغانستان، کە بەرگرییان لەخاکی پیرۆزی خۆیان دەکرد، لەڕووداندابوو. ئێمە دەتوانین سەرپاکی هەموو ئەو فشارو حەزانە بەباشترین شێوەی گونجاو دەرك پێ بکەین. هاوڵاتیە ڕوسەکان هیچ کاتێك لەهەلومەرجی ئەو خاکە پەراوێزیانەدا- یان لەوەڕگا فراوانە چۆڵەکانی ئاسیای ڕوسیا- لەسەردەمی (نیکیتا

ئینگلیزییەکەم، کە وڵاتەکەی سەرقاڵی دوورگەکانی کاریبی بوو لە (لەندن)ەوە بۆ سەردانم هاتە (پاریس)و، باسی لەناسەقامگیری ئەو گۆشەیەی جیهان کرد، کە بەباشی هەستی پێدەکرا. لەکاتی گفتوگۆکانماندا لێیم پرسی: (ئایا لەگەڵ هۆڵەندیەکاندا ڕاستەوخۆ لەم بابەتە دواویت؟) وتی کە ئەوەی کردووە. ئێمەی فەرەنسی لە (گینە)و هۆڵەندیەکان لەناوخودی (سۆرینام)و ئینگلیزەکان لە هەمان گۆشەی دوورگەکانی کاریبییەوە، بەهەمووومان لەنزیکەوە گوێزانەوەی دەسەڵاتمان لە (سۆرینام) کۆنترۆڵ دەکرد.

کاروانی درێژ لەپاسەوانان بەدرێژایی یەکێك لەسنورەکانی ئەوێ ڕێکخرابوو، تا ڕێگا لەدزەکردنی هێزی نەیارەکان و تێکدەرانی ڕووداوی سەربەخۆیی بگرین. دەرئەنجام (سورینام) لەهەلومەرجێکی ئاسایی و ئاشتیدا بوو بەوڵاتێکی سەربەخۆ. لەڕووی فیزیکییەوە هەموو دەزگا جاسوسیەکانی ئەوروپا نوێنەری هەمیشەییان لەناو پایتەختەکانی دی هەموو جیهاندا هەبوو. دەزگاکانی گوێڕا داشتن و جاسوسی بەریتانیا بەتایبەتی لەتێپەڕکردنی زانیاری لەڕێگای ئۆتۆمبیلی بزۆزی ئامادەکراو بەوەرگری ماوە درێژ، کە ئیستگەیەکی نهێنییە وەك جاسوسی و سیخوڕی کردنی ئەلکترۆنی زۆر کارامە بوون، بەجۆرێك کارەکانیان ڕێك دەخست کە ئەگەر زانیارییەك لەڕێگای تورکیاوە بۆ (کیپ نۆرس) ڕووبەڕووی بەربەستێك ببوایەتەوە بەئاسانی لەڕێگای وێستگەکانی تۆڕی جاسوسییەوە بەربەستەکەیان لادەدا. لەتشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨١)دا، کاتێك دەوڵەتی کۆمۆنیستی پۆڵەندا بەهێز ڕووبەڕووی خۆپیشاندەرانی فراوانی کارگەی کەشتی سازی لە (گدانسك)- هەمان ئەو شوێنەی کە سەقامگیری سەرەتا لەوێوە دەستپێکرد- بۆوە، بەریتانیا پێشنیازی کرد کە دەبێت من هەمان شەو بەرەو وێستگەیەکی جاسوسی لەپنتێکی ئەوروپادا سەفەر بکەم. پەسەندم کردو دەمودەست کەوتمە ڕێ. کاتێك گەیشتمە شوێنەکە بەرپرسی چالاکی ئەو بنکەیە منی بەشالیارێك ناساند. لەلای ڕاستمەوە پۆڵەندییەك و لەلای چەپمەوە بەرپرسی

بنکەکە دانیشتبوون. چەندین سەعات گوێگری گفتوگۆی فەرماندەی ئەو تانکانەبووم کە ئەو شەوە لەسەرشەقامەکان بوون. لەوێدا سەرسام بووم کە یەکێك ئاگاداری دەکردنەوە (..ئاگاداربە، لەوێدا لەدوای کەشتی دووەمەوە لای دەستی ڕاستەوە کەشتییەکی پەترۆڵ هەیە دەخزێت، ئاگاداربە..) لەسەرئەو نەخشەیەی کە بەپێوەری گەورە کرابوو، لەبەردەماندابوو، هەروەك ئەوەی ئێمەش لەوێبین چاودێری بەرەوپێشەوە چوونی تانکەکانمان بەرەو کارگەی کەشتی سازییەکە دەکرد. ئەم نمونە بەرزە لەگوێڕا داشتن لەگفتوگۆکانی (سوپای سوور) هۆکاریکی گرنگ بوو بۆ شارەزابوون و ناسینی ڕۆحیەتی ئەندامانی سوپاکەش. لەخۆرئاوای ڕۆژی ئۆپەراسیۆنی (دەست بەسەرگرتن)ە کەدا، کاتێك ئەفسەرکان پشویان بەخەڵکەکانی خۆیان دەدا، کەسایەتیە پلەدارەکان لەنێوان خۆیاندا سەرقاڵی گفتوگۆی خۆش بوون، بەهۆی بێسیمەوەو دەربارەی کەشوهەواو هەلومەرجی ژیان و کارو نەبوونی خۆراك، هەروەها گرفتی خێزانیان گرێی دڵیان بۆیەکدی دەکردەوە.

ئەوانە سەربازانێکی هەڵبژاردەی نێو یەکە فەرماندەیەکان بوون کە لەحاڵەتی هێرش کردندا بۆ سەرهێڵی پێشەوەی ئەوروپای خۆرئاوا بەکاردەهێنران. لەدوایین ساڵەکاندا لێکۆڵینەوەی زۆرم دەربارەی ئەو شتەی کە چۆن دەکرێت سوود لەو توانستە جاسوسیانە وەربگیرێت دژ بەچەکەکانی تیرۆریزم لەجەنگی چوارەمی جیهانی، یان قاچاخچێتی مادەی سڕکەر ئەنجامداوە. ئاشکرایە جیاوازییەکی زۆر لەنێوان دەسەڵاتەکانی ناو جەنگەکانی سێیەم و چوارەمدا هەیە، بەتایبەتی سەبارەت بەئامڕازەکانی فەرماندەیی کردن، کۆنترۆڵ و پەیوەندییەکان و، ئەم بابەتە دەبێتە دیارترین ستراتیژی سێ دەزگای نهێنی کۆن.

تیرۆریستەکان لەزۆربەی شوێنەکاندا هەمان جۆری وردەکاری پەیوەست بەمەیدانی شەڕەوە بۆ نەخشەدانان بۆ ئەم هێرشانە بەکار ناهێنن. بەڵام ئێمە ئەوەمان دۆزیوەتەوە کە پەیوەندی گرتنی بێسم لەباڵوێزخانەکانی وڵاتانی (باشور)ەوە، کە سەرپەرشتی چالاکیە تیرۆریستیەکان دەکەن، بووە بەهۆی

کۆمەك کردن بەهێرشەکانیان. سەرپەرشتیارە هزریەکانی دانەرانی بۆمب لە (دیسکۆتك لابل) لەبەرلین لەشەوی پێنجەمی حوزەیرانی (١٩٨٦)، کەبووە هۆی کوشتنی ژنێکی تورك‌و سەربازێکی ئەمریکی‌و برینداربوونی زیاتر لەدووسەد کەس، کە لەوانە ژمارەیەکی زۆریان سەربازی ئەمریکی بوون، پەیوەندیکردنی بێسیمیان بەکارهێنابوو. ترافیکی بێسیم‌و وەرگری ئەلکترۆنی نێوان تریپۆلی‌و ئۆفیسی لیبیا، یان بالوێزخانەی لیبیا لەبەرلینی خۆرهەلات لەم تاوانکارییەدا هاودەستی یەکدی بوون. گوێڕا داشتن شوێنی بۆمبە چێنراوەکانی بەئێمە ناساند، بەلام بەداخەوە زانیارییەکە دەمودەست‌و لەکاتی خۆیدا وەرنەگیرابوو تا بتوانین ڕێگری لەڕوودانی کارەساتەکە بکەین. لەنێو شریتی ئەو گوێڕا داشتانە کەزۆرجار زانیاری گرنگ بەدەستەوە دەدات ئاساییە کە ناتوانرێت پشتگوێ بخرێت، چونکە تۆمار دەکرێت تا لەهەندێ ڕووەوە لێکۆلیارەکان شیبکەنەوە. زۆرجار کەمێك چانس دەبێتە هۆی سەرکەوتنێکی دیاریکراو، چونکە پسپۆڕەکان لەکاری شیکردنەوەدا دەبێت بەکارێگی گرانی لەجۆری خوێندنەوەی دەست نووسی ڕاهیبەکانی سەدەکانی ناوەڕاست هەستن. لەگەلّ ئەوەشی ئەمڕۆ ئامڕازەکانی گوێڕا داشتن ئالۆزتربووە دەتوانرێت لەڕێگای بەرگرییە زمانەوانیەکان‌و دەربڕینەوەکانەوە چەمکی نامۆی وەك ئەوەی لەگفتوگۆی سەردەمە سەرەتاییەکانی سەرهەلّدانی مەسیحەوە بەکارهێنراوە شیتەلّ بکرێت. بەلام جگە لەم کارە تاقە تپرۆکێنەی جاسوس، ئێمەی سەرانی دەزگا جاسوسیەکانی ئەوروپای خورئاوا لەدانیشتنەکانی خۆماندا سەبارەت بەچەندین تێزی پیادەکراو، پێش ئەوەی بگاتە نێوەندی سیاسی‌و نێو سەرۆکی دەولەتەکان لێکۆلینەوەو ئالوگۆڕی دیدمان دەکرد. لەیەکێك لەودانیشتنە نهێنیانەداو لەکاتی نیوەڕۆخوانێکی کە بۆ هاوشانە ئینگلیزەکانم ڕێکخستبوو پێشنیازم کرد: (دەتوانین هێزی سەربازی لیبیا تەفروتونا بکەین‌و تەنانەت کودەتایەکی سەربازیش دژ بەقەزافی ئەنجام بدەین، بەلام بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەم کارە پێویستمان بەهاوکاری میسریەکان‌و هێزی ئاسمانی ئیسرائیل هەیە. لەم

پێشنیازەدا میسرییەکان بە بەکارهێنانی چەکی سوك لەسەرسنورەکانیان لەگەڵ لیبیادا دەست پێشخەری چالاکیەکە دەکەن، پاشان لیبیەکان بەهۆی جوڵاندنی ژمارەیەکی زۆری هێزی ئاسمانیو لەشکرەکانی زرێپۆش بەرەو ناوچە سنوریەکان وەڵامی ئەو هێرشە دەدەنەوە. ئنجا هێزی ئاسمانی ئیسرائیلو سەربازەکانیان کە هەڵگری نیشانەی میسرین لەسپێدەدا بەشداریدەکەنو.. ! ئەگەر ئێوە نیگەرانی ڕای گشتی جیهانبن، دەتوانین چەند تانکێکی تێکشکاوی لیبیا هەڵگرینو بەرەو قوڵایی خاکی میسری بگوێزینەوە. پاشان سەدان جەستەی لیبیاییو (کلاشنکۆفەکان) بگەیەنینە ناوخاکی میسر. بەکورتی هەمووی لەناوخاکی میسردا بەژێر خاکەوە بکرێن)

دیارە ئەم ئۆپەراسیۆنە هەرگیز پیادە نەکرا، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ڕۆژێك لەسەرسنوری نێوان میسرو لیبیادا گرفتی زیاتر دێتە پێشەوە کە دەکرێت هەنجەتێکی باش بێت بۆ ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنێکی لەوجۆرە، بەڵام هاوکارە ئەوروپیەکانم خولیای خەیاڵ پڵاوی بوونو لەپیادەکردن دەترسان.

کاتێك ئەوروپا لەساڵی (١٩٩٣)دا بەرەو کیشوەرێکی دامالڕاو لەبەربەرییەکان بۆ پێشەوە دەچوو، ئاشکرایە کە بۆ داهێنانی جۆرێك هاوکاری کە بەڕاستی بتوانێت تیرۆریستەکانو قاچاخچی مادە سڕکەرەکانو پیاوکوژەکان لەدەست بەسەراگرتنی تازیارەکانی ئەم ئەوروپا نوێیە دووربخاتەوە، پێویستمان بەشتێکی زیاد لەیۆتۆپیا، دەرخستنی پیاوەتی تەواوو جۆرە خواردنەوەیەك هەیە کە بتوانێت تەنها خرۆشانو هەوکردنەکان لەناوببات. سەرانی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا کە لەتشرینی دووەمی (١٩٩٠) کە پەیماننامەیان لەسەرخامەی سوور ئیمزاکردو خۆیان ناچار بەچاودێریکردنی پەیاننامەی پاریس لەئەوروپای نوێدا کردو لەسەرئەو بنچینەیەی کە (ئەوروپا خۆی لەپەیوەندی ڕێسا کۆنەکان ڕەها دەکات) ڕاست گۆبوون؛ بەشێوەیەکی تەواو دروستو بەپێی ئەم بەڵێنو پەیماننامەیە ئامارژە بەهێزە پەیوەندیدارەکانی ئەوروپا دراوە کە دەبێت لەڕیشەوە ئاستی ڕووبەڕوو بوونەوەی نێوان هێزە چەکدارەکانی ئەوروپا کەم بکەنەوە، تا ڕووداوێکی

لەجۆری دابەشبوونی ئەڵمانیا بۆ دوونیـوەی خۆرهـەڵاتی کۆمۆنیستیو نیـوەی خۆرئـاوایی دیمکراسـی ڕوو نەداتـەوە. بـەڵام حەقیقـەت ئەمەیە کەسـیو چوار دەوڵـەت بـەدرێژایی (سـان مـارینۆ)و (لیخـتن ئەشـتاین) تـا ویلایەتـە یەکگرتووەکانو یـەکێتی سۆڤیەت بەیاننامـەی (پـاریس)یان ئیمزا کـردووە، بـەڵام هیچ کـام لەوئیمزایانـە نـەیان توانیـوە هاوکارییـەکی پلەیـەك لـەبواری جاسوسـیدا بهێننـەدی، کـە دەیتوانـی ئـەوروپا دووربخاتـەوە لـەوەی بکرێتـە مەیدانی شەڕی تیرۆریستانو قاچاخچیانی مادە سڕکەرەکان، تـا کـاری پیسو جەنگە بچوکە پـڕ توندوتیژییـەکانی خۆیـان لەسـەرخاکەکەمان ئـەنجام بـدەن. هـەموو ڕۆژێـك خاڵـە لاوازەکانمـان دەپشـکنن، کۆمەڵگاکـەمان لاوازو شارستانیەتەکەمان لەکەدار دەکەن. لەڕاستیدا کـاتێك ئەوروپایـەکی یـەکگرتوو بـووە خـەونی سیاسـەتمەدارانو ئابورینـاسـەکان، لـەلای کارمـەندانی دەزگـا جاسوسـیەکان ئـەم بابەتـە بـووە مێردزمـە. سـەرۆکی پێشـووی (ئینتـەرپۆل-پۆلیسی نێونەتەوەیی) کـە ئەفسـەرێکی پۆلیسـی بەرجەسـتەی ئینگلـیزی بـوو بـەناوی (ڕیمۆنـد. ئـای. کـەندال)، ڕووداوی گرنگـی ناوچـە سـنوریەکانی دەگێڕایـەوە، کـە جێگـای پەڕینـەوەی هاوبـەش بـوو. پەڕینـەوەی ئازادانـە بەسـنورەکاندا جموجوڵـی تیرۆریسـتانو قاچاخچیـانی مـادە سـڕکەرەکانو تاوانبارانی ئاسانتر دەکرد. بەڵام ڕاستیش ئەمەیە کە سنورەکان جێگایەك نین بـەزۆری تیرۆریسـتانی تێدا گـیربخۆن. تەنـها هەوەسبازە گێلـەکان کـە چـەکو تەقەمـەنیان هـەڵگرتووە بەڕێکـەوت لەبازگەیـەکدا سندوقی ئۆتۆمبیلەکـە یـان پێدەکەنـەو بـەداوەوە دەبـن. تیرۆریسـتان بـەهۆی کـاری بـەردەوامو تاقـە تێڕوکێنی پۆلیسو بەشێوازێکی تایبەتی وەك دزەکردنـە ناوشـانەیەکی بچوکـی تۆڕەکانیانەوە بۆ ماوەی چەندین ساڵ، لەوانەشە بەڕێکەوت بـەهۆی درکـاندنی زانیـاریی لـەلای کەسـانی نـاڕازی، دەسـتگیر بکرێـن. بـەڵام ئـەوروپاو دەزگـا جاسوسیەکانی بـۆ بـەکارهێنانی ڕاسـتەقینەی ئـەم هەوڵانـە دەبێـت بـاش ڕێـك بخرێن.

لەیەکێك لەسەردانەکانمدا لەئێوارەخوانێکدا لەگەڵ سەرکۆمار (مۆبۆتۆ) لەکۆشکی کۆماری لە (کینشازا)ی پایتەختی (زایر) کە لەباڵە کۆنەکەی شوێنەکەی خۆیدا لەژێر تریفەی مانگە شەودا نیشتبووین، پاش بێدەنگییەکی دوورودرێژ، لەپڕێکدا قاقایەکی بەرزی کێشا کە تایبەت بووبە خۆی، وتی: (کانت–ی ئازیزم، دەزانیت ئێوەی ئەوروپایی دەتوانن زۆر گرنگ بن، هەڵبەتە ئەگەر تەنها سیستمی نەتەویی خۆتان فەرامۆش بکردایە)

ئەمە هەمان ئەو جێگایەیە کە ئەمڕۆ ئەوروپای تێدایەو، هێشتا بەدەست سیستمی ناوچەگەری‌و خێڵەکیەوە دەناڵێنێتو، نائومێدانە هەوڵ دەدات لێی دەرباز بێت. ئێمە دەستمان بەکارێك کرد کە دەتوانرێت بەیەکەمین قۆناغی واقیعیانەی (بە ئەوروپایی کردن) دابنرێت، هەڵبەتە بەهوشیارییەوە. ئێمە وەرگرتنی ئەندامی نوێ بۆ ناوبازنەی خودی خۆمان تەنها بەلێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلی لەورەیان پەسندمان دەکرد. زۆر لەفەڕەنسیەکان لەولاتانی وەك یۆنان یان پرتۆگالو ئەو دوژمانەی لەپشتیانەوەن‌و ئەگەری ئەوەیان لێدەکرێت ئەندامانی دی کۆمەڵگای ئەوروپی بەرەو خوارکێش بکەن، دەترسن. ئەگەر کرێکارە هەژارەکانیان کارگەکانمان پڕ بکەن‌و هاولاتیەکانمان فڕێدرانە دەرەوە، چی ڕوو دەدات؟ هەڵبەتە هیچ کام لەم پێشبینیانە ڕوویان نەدا.

ئەو گروپانەی بەتەوای هاتنە ناوئەوروپای ناوەڕاستو باکورەوە لەولاتانی تازە وەرگیراوی ئەوروپای خۆرهەلاتەوە نەهاتبوون، بەڵکو زۆرتر لەکۆلۆنیەکانی ئەفریقاو خۆرهەلاتی ناوەڕاستەوە هاتبوونە ئێرە. ئەوروپای ئەمڕۆ شتێکە کەبەشێکی گەورەی بەهۆی بوونی کەسێکەوە بەناوی (جەنەڕاڵ جۆرج مارشاڵ)و هەروەها سنگ فراوانی چاودێری ئەمریکیەکانەوە دروست بووە. تێزی (مارشاڵ)پاش جەنگی دووەمی جیهانی فراوان بوو، بەدەرهێنانی دڕکی جەنگ لەچاوی ئەروپاو بۆ تیمارکردنی ماکەکەی کۆمەکێکی زۆری کردو بەوەش دەوڵەت بەدەوڵەت بوونە سوێندخواری.

کاتێك دەوڵەتی فەڕەنسا داوای لێکردم ببمە یاوەری جەنەڕاڵ (ئایزنهاوەر) لەگەشتەکەیدا بەفەڕەنسادا، کە لەسەرەتای پیادەکردنی تێزەکەی (مارشاڵ) دابوو، (ئایك) توانی گەواهی ئەوەبێت کە ئەو تێزە لەگەڵ بۆچونێکی فەڕەنسیدا دەکرێت پیادە بکرێت. وێناکردنە خێراکانی (ئایزنهاوەر) سەبارەت بەهەریەك لەووڵاتانەی دی کە گەشتی بۆ کردبوون– وەك بەریتانیا، بەلژیکا، ئەڵمانیاو ئیتالیا– لەگەڵ بۆچوونی نەژادی هەریەك لەو وڵاتانە بەجۆرێکی ناشیرین لەلای بەرجەستەببوون. ئەو سەرقاڵی بینینی دەرئەنجامەکانی دواهەمینی ئەو جەنگی کلاسیکیانە بوو کە ڕوویاندابوو. بەڵام ئەو جەنگەی کە ئێستا دوچارمان بووە جەنگێکی پارتیزانانەیەو زۆر جیاوازە دەبێت لەوانەی ڕابردوو.

هەردوو ڕێکخراوی کۆنی ئەوروپایی (ناتۆ)و پێکهاتەی نوێی ئەوروپی ژێر چاودێری کۆمەڵی ئەوروپا لەیەکەمین ئامازە هاوبەشەکانی ئەو شتەی بەسەرەتای دەستپێکردنی قۆناغی ئەوروپای نوێ دادەنرێت، بەشدارن. ئەوەی کە چۆن ئێمە دووەمین قۆناغ، کە گرنگترین قۆناغە دەسپێبکەین جوانترین بەشی پرسیارەکەیەو، لەگەڵ ئەوەشی کە نامەوێت وەك فاڵچییەك دەرکەوم لەدانی بڕیاری دروست دەترسم؛ چونکە دەزانم هەمان ئەو بڕیارەیە کە دەبێتە هۆی سەرکەوتن یان نوشستی ژیاری ڕۆژئاوا. گەر قۆناغی دووەم ڕووبەڕووی شکست ببێتەوە حاڵەتی هاوسەنگی لەسنوری جیوگرافی ژیاریمانەوە بەرەو ناوەوە پاشەکشە دەکات. ئەو تیرۆریستانەی کە بەدترین سەرانی جیهانی (باشور)ن لەوێنای یاریدەدەرانی خودی خۆماندا پێشەوان.

دووەمین قۆناغی گەشەکردنی ئەوروپا دەبێت دوو سەنتەری دوو بلۆکی سەرەکی لەخۆبگرێت، کە هەرلەسەردەمی جەنگی دووەمی جیهانییەوە بوونیان هەیەو، کەوتوونەتە خۆرهەڵات و خۆرئاوای ئەوروپاوە. واتە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەخۆرئاوای ئەتلانتیك و، وڵاتانێکی کە بەشێك بوون لەبلۆکی کۆنی یەکێتی سۆڤیەت لەلای خۆرهەڵاتەوە. لەهەندێ ڕووەوە ئەم پرسی بوونی سەنتەری خۆرهەڵات و خۆرئاوایە لەئەوروپادا لەڕابردوودا

دەستی پێ کردووە، کە ئێستا هەردوو ئەڵمانیا پاش چل‌و پێنج ساڵ یەکیان گرتۆتەوە. ئەم ئاوەژووبوونەوەیە جیاوازی مێژووی دوونیوە ئەروپایە کە ماوەیەکە دەستی پێ کردووە، کە دەکرێت وەك بەڵگەیەکی سەرەکی دەستپێکردنی قۆناغی دووەم پێناس بکرێت. (گورباچۆف) نائومێدانە هەوڵی دەدا ئابوری دارماوی ناوخۆی وڵاتەکەی چارەسەر بکات، بۆ ئەوەش ناچاربوو وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵات، کە پێشتر پارچەیەك بوون لەقەڵەم ڕەوی کۆمۆنیزم‌و، ئنجا وڵاتانی ناوخودی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی لەڕیشەوە ئازاد بکات. ئەمە هەنگاوێکی سەرسوڕهێنەربوو؛ لەگەڵ ئەوەشدا هەریەك لەم وڵاتانەی خاوەنی تایبەتمەندی جیاوازو ئامانجی تەواو جودابوون، هەریەکەیان جموجۆلێکی تەواو جیاواز، هەڵبەتە لەڕووی سیاسی‌و ئابوری‌و هەروەهادیدی جاسوسیشەوە، لەیەکدی دەنواند. ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی یان هەمان کۆماری دیمکراسی ئەڵمانیا پێویستی بەکۆمەکی هەموو وڵاتانی خۆرئاوابوو، بەتایبەتی بەکۆمەکی ئەڵمانیای خۆرئاوایی؛ چونکە ئەڵمانیاخۆی بەتەنها کە یەك وڵاتە بەیەك زمان‌و فەرهەنگەوەو خاوەنی هەشتا ملیۆن کەسە، لەئەورووپای ناوەڕاستدا بلۆکێکی مەزن پێك دەهێنێت. لەواقیعدا گەرچی ستانداردی دەرامەتی ئابورییان کەمێك نزمە، بەڵام جێرمەنیەکان برەویان بەتوانای کاری سەخت‌و توانا سەربازییەکانیان داوە. خەڵکی ئەڵمانیای خۆرئاوا لەناخی خۆیاندا بۆ بەدەسهێنانەوەی دووبارەی ئەو توانستانە خۆشحاڵن. هیچ کام لەدەوڵەتە ئەورووپیەکانی دی درێغی ناکەن لەدانی کۆمەکی دارایی‌و هۆکاری دی بۆ ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی تا ئەو وڵاتەش بتوانێت دووبارە تەندروستی ئابوری خۆی بپارێزێت. هیچ کام لەو وڵاتانەی دی ئەروپای خۆرهەڵاتی بە هیچ شێوەیەك لەم توانستە ئابوری، کۆمەڵایەتی‌و سیاسیەدا نابنە هاوبەشی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی. لەو وڵاتانەدا گرفتی زۆرتر لەکایە دایە. هەنگاریاو چیکۆسلۆڤاکیا لەئامادەییاندا بۆ کێشکردن بەرەو ناوەوەی سیستمی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی ئەورووپای خۆرئاوا لەدوای ئەڵمانیای خۆرهەڵاتیەوە دێن. ئەوانە وڵاتانێکی بچوکن کە بەپێوەر لەگەڵ هەنگاریاو لەسەرروو هەمووشیانەوە چیکۆسلۆڤاکیا گەشەی باشیان کردووە. بەم

پێیەڕەوەندی بەتایبەتمەندی بوون لەچیکۆسلۆڤاکیادا خێرایی بەهەڵئاوسانی گەورە دەدات؛ لەهەنگاریا بزاوتێکی لەوجۆرە بووە هۆی ئەوەی کە هەڵئاوسانێکی لەسەداسی خستەوە، بەرهەم هێنەر دوچاری ژیانێکی ئیستانداری وابوو کە کۆگاکان پڕ بوون لەبەرهەمو کەس نەبوو بیانکڕێت. هەنگاریا لەگەڵ نەمسا وەك بەشێك لەئیمپراتۆریەتی گەورەی (نەمسا- هەنگاریا) ببوونە یەکێك لەپێشکەوتووترین وڵاتان لەڕووی ئابوورییەوە لەئەورووپای خۆرئاوادا، کەپاش جەنگی یەکەمی جیهانی لەبەریەك هەڵوەشان. بەمجۆرە دەبێت هەنگارییەکان بەلایەنی کەمەوە لەڕووی دەروونییەوە ئامادەبن تا جارێکی دی ببنەوە ئەندامێکی بەرزی سیستمی ئەورووپا. پێویستە قبوڵی بکەین و لەڕێگای ڕیفۆرمکردنی ئەم وڵاتەداو، هاوشانکردنەوەی ئابوورییەکەی لەگەڵ وڵاتانی دیدا کۆمەکی پێ بکەین، تا گونجاوبێت لەگەڵ هەمان شێوەی واقیعیەتی سیاسیو کۆمەڵایەتیەکان. هەڵبەتە پۆڵەندا پێگەیەکی تەواو جیاوازی هەیە، ئەم وڵاتە بەوبنەما ئابوورییەوە ئەوە پیشان دەدات کە بەتاسەوەیە بێپەروا خۆی بهاوێژێتە ناو ئەزموونگەلێکی دیمکراسی سیاسیانەوە، ئێمە لەوڕووەوە تەنها دەتوانین ئومێدەواربین کە سەرکەوتوو بێت. ئاشکراشە کە هزری پۆڵەندیەکان ئەم شتە دژوارتر دەکات. پۆڵەندیەکان کەسانی سەرسەختو کۆنە پارێزن، ژمارەیەکی کەمیان دەتوانن نوێنەری بڕواو بیروڕای جیاوازی چۆنیەتی فەرمانڕەوایەتی وڵاتەکەیان بنو، بەوهۆیەوە لەسەرانسەری وڵاتدا زەمینەیەکی بێنەزمی لەئارادا دەبێت. یەکەم جار ڕێژەی بێکاری گەیشتە پێنجو نیو لەسەدا، یان گەیشتە زیاتر لەیەك ملیۆن کەس لەپۆڵەندا. ئێمە تەنها دەتوانین ئومێدەواربین ئەم ژمارەی نزم بێتەوەو، کە ئەمەش پەیوەستە بەسیاسەتی دەسەڵاتدارانی دواتری وڵاتەکەوە. بەڵام بەلایەنی کەمەوە گەر بۆ ساتێکیش بووە ئێمە لەئەورووپای خۆرئاواوە دەتوانین کارێکی بچوك بۆ پەلەکردن لەگەشەکردنی ئابوری پۆڵەندادا بکەین.

ڕۆمانیا دەبێت سەرچاوەیەکی ئاسانتر بێت. لەڕاستیدا ئەم وڵاتە لەچاوپۆڵەندادا لەگرفتی زیاترەوە ئاڵاوە. ڕۆمانیای ژێر دەسەڵاتی

(چاوچیسکۆ)- پۆلپۆتی ئەوروپا- لەگەڵ بوونی سەرچاوە پەترۆلیەکەی و میللەتێکی کارامەو زرنگ، کە بەخۆنازینەوە خۆی بە (دورگەی لاتین)ی ناو (دەریایەکی سلاڤی) ناو دەبات، لەڕووی ئابوریيەوە بۆتە وڵاتێکی بێ بەها.

خەڵکی ڕۆمانیا لەوهەلومەرجانەدا، لەماوەی ساڵانی دیکتاتۆری و شۆڕشی تاڵدا، کە (چاوچیسکۆ) بەسەریاندا سەپاندی، لەبەریەك هەڵوەشاون و یەکێتێکەیان تێکشکاوە. بەهای زۆربەی کاڵاکان لەیەکەمین ساڵەکانی ڕژێمی نوێدا بەرەو سێ سەد لەسەدا هەڵکشا. لە (بوخارست) خەڵکی چەندین سەعات لەڕیزدابوون بۆ کڕینی گۆشت، بەنزین و پێداویستیە گشتیەکانی دی. ئاو بەسەردەدرا. لەڕاستیدا ماوەیەکی گەلێك درێژ دەکێشێت تا ڕۆمانیەکان دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ باری هاوتایی، تا هەموو جۆرە چڕ بوونەوەیەك لەئەروپادا مومکین بێت. بەداخەوە هەمان شتیش سەبارەت بەیوگسلاڤیا ڕاستە، کە لەسەردەمی مەرگی (تیتۆ)وە- ڕابەری دەسەڵاتداری بەهێز، کە ئەم وڵاتە پارچە پارچەیەی لەوێنەیەکی تازەو دامەزراودا پێکەوە گرێدابوو- ئەو وڵاتەی کە لەئەنجامی جیابوونەوەی ئیمپراتۆریەتی (نەمسا- هەنگاریا)وە دروستببوو، بەهۆی زەبرو زەنگێکی لەڕادە بەدەرەوە پێکەوە گرێدرابوون. ئەمرۆ یوگۆسلاڤیا خۆی لەهەلومەرجێکدا دەبینێتەوە کە بەڕۆمانیەکان ناچوێت و، بەهۆی شەڕی توندو تاڵی نەتەوەییەوە، کە تەنها بەهۆی گرنگیدان بەململانێکانی نێوان نەتەوە دەوڵەمەندەکانی (سلاڤ)و (کروات) لەباکوری خۆرئاواو (سربەکان)ی باشور دژ بە (مەکدۆنی)و (بۆسنیە) هەژارەکان هاتۆتە ئاراوە، خۆی بەرەو لەناوچوون کێش دەکات. ئەم فیدراڵیزمە تێکشکاوە لەسەرو کاری پارچە پارچەبووندایە. هەوڵی (یەکێتی ئەوروپا) بۆ یۆگسلاڤیای پارچە پارچەبوو، بەپێوەری ئەو هەوڵانەی کە بۆ ئەوانی دی لەئەروپای خۆرهەڵاتی هەڵوەشاوەو خودی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی خستۆتە گەڕ ئەوەندە جیاوازییان نییە. پرۆسەی لێکهەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت، کە بەخوێن یەکپارچەییەکەی پارێزراو بوو بەتۆقاندن و تیرۆر بۆ ماوەی زیاتر لەسێ چارەکە سەدە پێکەوە گرێدرابوون ڕووبەڕووی فشاری سەختی ئابوری ڕۆژئاوا ببۆوە، کە ئامادەبوون

لەهەر هەلێکی گونجاودا کرملین لەمەیدانەکە بکەنە دەرەوە. سۆڤیەت کە ڕۆژێك لەڕۆژان سەرزەمینێکی یەکپارچەیی (مارکس‌و لینین) بووە، لەوڕەوتەدا بەڕێچکەیەکدا تێدەپەڕی دیاربوو (گوربا چۆڤ) لەحاڵێکدا دەستی بەرەهاکردنی وڵاتانی خولگەکەی کردووە کە جارێکی دی هەرگیز درێژە بەخەیاڵپڵاویەکانی ڕابردووی نەدات.

لەوانەیە ئەمە ئامۆژگاری ڕژێمی نەخۆشی سۆڤیەتی‌و ئابورییەکەی بووبێت، کە پیشانی دەدا کرملین بەچ ئامادەییەکەوە مۆڵەتیدا ئەو وڵاتانەی کە ڕۆژێك دەستی بەسەرداگرتبوون– بەتایبەتی ئەڵمانی خۆرهەڵاتی تۆقیو– لەبلۆکی سۆڤیەتی بچنە دەرەوەو، لەڕاستیدا چەند سانا ئەم بلۆکەو لەکۆتاییدا خودی سۆڤیەت هەڵوەشان. ئاشکرایە کە زۆر خاڵی بەهێزی تریش لەم کارەدا بەشداربوون، کەبریتی بوون لە: (دوژمنایەتی‌و بێزاری کە لەکەبوونی نێوخەڵکی، کە بۆ ماوەی سێ یان چوار وەچە بەکۆیلە کراون، تێکشکاندنی دوایین ئامێری جەنگی سۆڤیەت لەهاوشانکردنیدا لەگەڵ باڵی سەربازی (ناتۆ)دا، هەلومەرجی تەکنۆلۆژیا یان ئابوری کە لەگەشەکردنی دوایین وەچەی خۆپڕچەك کردنی سەرومۆدێرنە، لەوانە سیستمی مەترسیداری بەرگری گەردوونی (جەنگی ئەستێرەکان) کاریگەری تەواو دیارییان هەبوو.) ئەم هێزانە لەسەرخۆو هێواش هێواش‌و بەشێوەیەکی بەرفراوان پارچە بچوکەکانی ئەو یەکێتییەی، کە ڕۆژانێك وادەردەکەوت مایەی سمین‌و کارتێکردن نییە، یەکپارچەو لکێندراوە، لەبەریەك هەڵوەشاند. بەدرێژایی سەرۆکایەتیم لەدەزگای نهێنی فەرەنساداو لەخولی ئاژاوەکانی ئەوروپای ڕۆژهەڵاتدا، لەنزیکەوە چاودێری بارودۆخی ئەو وڵاتانەم دەکرد. کاتێك دووەمین قۆناغی بەسەنتراڵی بوونی ئەوروپا دەستی پێکرد هەریەك لەو وڵاتانە وەك دادوەرێکی گەورە لەدیدی جاسوسی‌و هەروەها سیاسی، کۆمەڵایەتی‌و ئابورییەوە دەخرانە ڕوو. بۆ ئەوان گەیشتن بەئەوروپایەکی خۆرهەڵاتی دیمکراسی پێویستی بە بەدەستهێنانی بەرژەوەندی فراوانە.

ئیتر تیرۆریستەکان لەئەروپادا پێویستیان بەوەنییە تەنانەت لەدوای خۆیان بڕوانن‌و دەرگاکانی پشتەوەیان بکەنەوە؛ چونکە ئەوێ بوارێکە هەم چاودێریکردون‌و هەم بۆ هەر دوژمنێکیش حوکمی خۆی هەیە. لەکاتێکدا لەکۆمەڵگا داخراوەکانی خودی خۆیاندا ئەنجامدانی کاری گوێڕا داشتن‌و سیخوڕی زۆر سەختە. ئیتر تیرۆریستەکان نایانەوێت چەکو جبەخانە پلەیەکەکانی ڕۆژگار، کە لەلایەن هەندێ لەوڵاتانی ئەورویای بلۆکی خۆرهەڵاتەوە بەرهەم دەهێنران، بەدەستبهێنن. ئیتر حەزناکەن لەلایەن کارمەندانی پۆلیسی ڕەسمی دەوڵەتەوە مەشقیان پێ بکرێت‌و، دوایین تەکنیکەکانی توندوتیژی‌و ئاژاوەچێتی فێربن. باڵوێزخانەی هەندێك لەوڵاتەکان لەپایتەختەکانی وەك (بەرلینی خۆرهەڵات) پشتگیری یاسایی تیرۆریستانیان دەکردو لەژێر چاودێری‌و پشتیوانی دەوڵەتی کۆمۆنیستی ئەڵمانیای خۆهەڵاتی‌و پۆلیسی نهێنی‌و تۆقێنەری بەهێزیان (ئشتازی)دا پەیوەندی توندوتۆڵ‌و فراوانیان لەگەڵیاندا دەبەست. ئەو پەیوەندییە باشەی کە لەنێوان دوو ئەڵمانیادا هەبوو، بەتایبەتی بۆ تیرۆریستەکان زۆر بەسوودبوو. زمان‌و فەرهەنگی هاوبەش باشترین توانای هاتووچۆی نێوان ئەڵمانیای خۆهەڵاتی کۆمۆنیست‌و ئەڵمانیای خۆرئاوایی دیمکراسی فەراهەم دەکرد، لەحاڵێکدا کە بازگەی کۆمۆنیستەکان لەودیو دیواری (بەرلین)ەوە ڕێگایەکی چاك‌و پاکی بۆ نووسەران ئامادە دەکرد تا پیرۆز کردنی کۆمۆنیزم، کە خەریکی بنکۆڵکردنی بوون، ببینن. گەشتیارانی بەرلینی خۆرهەڵات دوابەدوای پەڕینەوەیان لەودیوارە زانییان کە بەڵگەنامەکانیان تەنها لەونیوە ڕۆژهەڵاتیەدا لێ پێچینەوەی لەسەردەکرێت‌و، لەکاتێکدا بەڵگەنامەی ڕاستەقینەیان پێبێت دەتوانن تەواو ئازادانە تێپەڕن. لەبەرلینی خۆرئاوادا جموجۆڵی فڕۆکەیان شەمەندەفەر بۆ دەوروبەرو هەرجێگایەکی دی ئەورویا زۆرئاسان بوو. دەرئەنجام ڕشتەیەك لەگروپە تیرۆریستەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، بەتایبەتی ئەو تیرۆریستانەی کە لەناو خودی ئەڵمانیای خۆرئاوادا گەورەبوون، وەك گروپی (بادەرماینهۆف)و لەئەڵمانیای خۆرهەڵات وەك (لانەکانی کەروێشك)ی (ئەلیس)، لەناوجیهانێکی دیدا بەکار دەهێنرێن. ماڵە

ئارامەکانیان سەرەڕای شوێنی بەڵگەنامە نادروستەکان، دراوو ڕێگا باش پارێزراوەکان هاتوچۆیان لەخۆرهەڵاتەوە بوو. کاتێك لەساڵی (١٩٨٠)دا پێنج تیرۆریستی ئەڵمانیای خۆرئاوایی لەپاریس دەستگیرکران ئەو بەڵگانەی پێیان بوو ئەوەی پیشاندەدا کە دەبۆیەکی گەورەی چەکو تەقەمەنی، چەکی ئۆتۆماتیکی، بۆمبی دەستیو مادەی تەقینەوەیان لەئەڵمانیای خۆرهەڵاتدا لەبەردەستابووە. هەڵبەتە پۆلیسی نهێنی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی وەك میوانە تیرۆریستەکانی خۆیان کە بەدەست هێنانی تازیاری زۆری پاش جەنگی دووەمی جیهانی زۆر خۆشحاڵ بوون، لەبەدەستهێنانی ژمارەیەك لەوتازیارە لێکچووانە شادمان بوون. هەم زمانو هەم فەرهەنگی براکانیان لەئەڵمانیای خۆرئاوای ئەودیو سنورەوە ئەو توانستەی دەبەخشییە (ئاشتازی) تۆقێنەر تا بەدڵنیایی تەواوەوە دزەبکەنە ناو بەرزترین ئاستی دەوڵەتو پیشەسازی ئەڵمانیاوە. لەڕاستیدا کەلوپەلە زۆرەکانی جاسوسی کردن بەشێوەیەکی کاریگەرانە لەلایەن هەردوولای دیواری بەرلینەوە بەکار دەهات. زۆرترینی ئەم چالاکیانە کاتێك کۆتایی پێهات کە دیوارەکە لادراو بەرلین بووە پایتەختی یەك ئەڵمانیای یەکگرتوو. باڵوێزخانەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کەقووتی چالاکی ڕێکخراوە تیرۆریستیەکانی ناو وڵاتەکانیان دابین دەکرد، داخرانو، نەك تەنها کاری کورت کردنەوەی دەستی دەزگای جاسوسی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتیو لەچەك داماڵینی پۆلیسی نهێنی خرایە ئەستۆی وەزارەتی ناوخۆی ئەڵمانیای خۆرئاوایی، بەڵکو کاری بەدواداچوونو دەستگیرکردنی ئەفسەرو سەربازەکانی (ئاشتازی)و ئاشکراکردنی تاوانکارییە ناشیرینەکانیشیانی پێ سپێردرا. بەم پێیە زۆرینەی ئەم ئەفسەرانەو تایبەتمەندانی بواری تیرۆریزم، بەتایبەتی ئەوانەی کە لەهەندێ لەوڵاتە دەوڵەمەندەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا پۆستیان هەبوو، بەسانایی پلەیان لێ سەندرایەوەو درانە دەست ڕاوێژکارانی بێلایەن. ئەمڕۆ ئەوانە لەجێگایەکدانو هێزی زرنگی خۆیان دەکەنە قوربانی مشتێ دراوی بەهاقورس لەسەرئاستی جیهانی. خانەخوێکانیان هەمان ئەوکەسانەن کە بەهۆی پەترۆڵەوە دراوێکی زۆر بەدەست دەهێنن. حسابەکانیان بەپێچەوانەی دەستاودەست کردن

لەبیروکراسیەتی بەرلینی خۆرهەلاتیدا ڕاستەوخۆ لەلایەن دەولەتەکانیانەوە لەناو بانکەکانی سویسرادا دادەنرێن.

بزاوتێکی لەوجۆرەش بۆ لەکارخستنی پاشماوەی (ئامێری جاسوسیو زانیاری) لەسەرانسەری ئەوروپای خۆرهەلاتیدا کە تازە بوونەتە دیمکراسی ئەنجام دراوە. لەچیکۆسلۆڤاکیادا هەلبژاردنی سەرۆکۆمار (واتسلاڤ هاول) کە سەردەمانێك شانۆگەری نووسو شاعیری نەیاربوو، بەخێرایی بووەهۆی ئاشکرابوونی کەرەستەکانی پۆلیسی نهێنی، بەتایبەتی ئەو بالەی کە لەگەل گروپە تیرۆریستەکانی خۆرهەلاتی ناوەڕاستو ئەوروپای خۆرهەلاتیدا کاری دەکرد. پەیوەندی کردن لەگەل ئەو دەولەتانەی کە پشتیوانی ئەوانەیان دەکرد زۆر ناهەمواربوو. گەرچی زۆر لەوولاتانەی (باشور) بۆ بەدەستهێنانی چەکی پێشکەوتوو کەلوپەلی پێویست، کە بە بەردەوامی لەکارگەکانی چیکۆسلۆڤاکیاوە بۆیان دابین دەکرا، بەهای قازانجەکانیان بەرز دەکردەوە. سەرچاوە کانزاییە دوورە دەستەکانی دۆلی (کارلوڤی) سەردەمانێك زۆر ناسراوبوو. لەسەرگردەکانی چواردەوری ئەم سەرچاوە نائاساییەدا بارونە دەولەمەندەکانو خاوەن کێلگەکانی شەکر، بازرگانو خاوەن کارگەکانی ئیمپراتۆریەتی (نەمسا- هەنگاریا) بینای جوانیان بۆ خۆیان دروستکردبوو.

پاش خۆسەپاندنی کۆمۆنیزم لەسالی (١٩٤٨) هەموو ئەو سامانانە بوونە بەشێك لەدارایی دەولەت. هەندێك لەوشوێنانە وەك گۆشەی خەلوەتگاو پەناگەیەکی خۆش بۆ دەستەبژێرانی پارتی کۆمۆنیستی بەکاردەهێنران. ئەوانی دی کرابوونە دامەزراوە بۆ مەشقی تیرۆریستان، هەر لەسوپای سوری ئیتالیاوە تا سەربازە فەلەستینیەکان. ڕێگاوبانەکانی ئەوێ بەوردی لەژێر چاودێری پۆلیسی نهێنی چیکۆسلۆڤاکیادابوو. ئەم تیرۆریستانە لەناوخۆدا لەسەرشێوازی خۆرئاواییو بەکارهێنانی ئالۆزترین چەكو مادەی تەقینەوەی دروستکراوی چیکۆسلۆڤاکیا، کە لەچالاکیەکانی خۆیاندا بەکاریان دەهێنا، مەشقیان دەبینی.

نهێنی فەڕەنسا لەگەڵیاندا سەروکارم هەبوو، بەتەواوی دەرکیان بەوە کردبێت کە موسڵمانەکان چۆن بیر دەکەنەوە، یان سیستمی هزری ڕوسەکان چۆنە؟ بەدەستهێنانی ئەو جۆرە مەعریفەیە لەماوەی دوو یان سێ ساڵی کە بەڕێوەبەرانی دەزگای نهێنی ئەمریکا لەسەرکار دەبوون کارێکی ئاسان نەبوو. تەنانەت هەڵە گەورەکان لەبیرکردنەوەی سەرانی پرۆفیشناڵی کۆمەڵگای جاسوسیدا بەجێی خۆی تیژترو ئاڵۆزتربوون لەهەڵەی سەرکردە ناسوپاییەکانی ویلایەتە یەکرگرتووەکان. لەدرێژەی یەکێك لەدیارەکاندا بۆ (واشنتن) سەردانی سەرۆکی دەستەی هاوبەشی زانیاریی کۆنگرێسم کرد. ئەوەش بۆ مەبەستی بەخشینی زانیاری کورت بوو بەسەرۆکی کۆنگریس‌و هەندێ کارمەندی باڵا دەست سەبارەت بەوپێشڕەوییەکانمان، بەتایبەتی لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا. داوای نەخشەیەکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستم لێکرد، بۆ ئەوەی ئەو شتانەی ڕوونم کردۆتەوە باشتر دەستنیشان بکەم. لە (پاریس) ڕاست لەپاڵ ئۆفیسەکەمدا نەخشەکێشێك نیشتەجێکرابوو، کە کاری تەنها نەخشەبوو بەس. بەڵام لە (واشنتن) بیست دەقیقەی ویست تا ئەم سەرۆکی کۆمیتەیە، کە ئەرکی چاودێرکردنی هەموو پێکهاتەکانی جاسوسی-ئاسایشی ئەمریکای لەسەر شان بوو، توانی نەخشەیەکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست پەیدا بکات‌و سەرئەنجام یاریدەدەرێکی کە یەکێك بوو لەوسەدو هەشت ئەندامەی کۆمیتەکە بەنەخشەیەکی بنەڕەتییەوە کە بەئەندازەی پەڕەی کتێبێکی بچوك دەبوو گەڕایەوە. بەنەخشەیەکی لەوجۆرەوە، تەنانەت گەر شێوەی جیهانت نەدیبێت چۆن دەتوانیت بیناسیت؟ لەماوەی ساڵانی تێکەڵاویم لەگەڵ هاوشانە سوپایی‌و ناسوپاییەکان لەویلایەتە یەککگرتووەکاندا دەست نیشانکردنی باشترین پشتگیری لەکەنداوێکی فراواندا، کە بەپێوانە لەگەڵ ناوچە جیاوازەکانی لەئەوروپاو ئەمریکا کەخاوەنی توێژینەوەی زانیاری‌و ستراتیژی یان سوپایین بەتایبەتی لەجیهانی سێدا، کارێکی زۆردژوارە.

لەگەرمەی جەنگی ڤێتنامدا لەساڵی (١٩٦٨)، بەیەك گەیشتنێكی لەیاد نەكراوم لەگەڵ جەنەڕاڵ (ویلیام وست مورلند) كرد. ئێمە لەژووری نەخشەسازی ئەپارتمانی (پیرداملۆن)، لەگەڵ ئەفسەرێكی پلە بەرزی سەربازی فەرەنسی كە یەكێك بوو لەهاوڕێ نزیكەكانم دانیشتین. جەنەڕاڵ، كە پۆستێكی وەك فەرماندەی گشتی هێزەكانی ئەمریكای لەڤێتنام پێدرابوو دەیویست بۆ (سایگۆن) بگەڕێتەوە. ئێمە ئەو شەوە پێكەوە گفتوگۆمان كرد.

بەمجۆرە دەستم پێكرد: كارەكان چۆن بەرەو پێشەوە دەچن؟

زیرەكانە وەڵامی دایەوە: زۆر بەباشی.

خەندەیەكم كردو، وتم: زۆرباشە. چونكە لەڕوانگەی خودی خۆمەوە، لەڕاستیدا تا ئێستا فشاری دەرەكی لەوجۆرەم لەسەرنەبووە.

ڕاستەوخۆ وەڵامی دامەوە: پیشانت دەدەم كە چۆن كارەكان بەڕێكوپێكی بەرەوپێشەوە دەچن. سێ یان پێنج كارتی دەرهێنا كە بەهێڵێكی جوان ناویان لەسەرتۆمار كرابوو، ئنجا درێژەی پێدا: لەكوێ ئەمانە پێنج سەد هەزار كەسی كوژراویان دەستگیركراومان دەرهێناوە. ئێستا زانیت ئەمكارە چۆن مەیسەربووە.

لەنێو قسەكانی ئەودا وتم: ببەخشە جەنەڕاڵ، كارم تێ ناكات. مۆڵەتم دەدەیتێ ڕونی بكەمەوە؟ تۆ فەرماندەی گشتیت، تۆش پێنج سەد هەزار چەكدارت لەدەستداوە، باشە چیت كرد؟. سیمای جەنڕاڵ تێك چوو، وتی: پەیامێكی داواكارییم ڕووبەڕووی واشنتن كردۆتەوە؛ تا پێنج سەد هەزار چەكدار بنێرێتە ئەوێ. وتم : بەمجۆرە.

بەڵام هەرگیز دڵنیا نەبووم كە ئەوكارەی ئەنجام دابێت. جەنەڕاڵ (ویست مۆرلند) وەك هاوشانەكانی دی، لەڕاستیدا پیاوێكە هەوڵی نەداوە هزری دوژمنەكەی بخوێنێتەوە. لەڤێتنامی باكور پێنج سەد هەزاركەس هیچ نین‌و دەتوانرێت بەچەك جێگاكانیان پڕ بكرێتەوە. زۆربەیان دەستگیركراون. بەمجۆرە لەپشتی ئەو تەلەفاتەوە ژمارەیەكی زیاتریش هەبوون‌و، لەوانیش

باشتربوون. لەوکاتەدا دڵنیابووم جەنەڕاڵ بەخۆی دەگوت: ئەم کەسە زرنگە لەپاریس داشی سوارەو منیش لەحاڵەتی جەنگدام.

لەکۆتاییدا بەشێوە تورەییەکەوە بەرامبەر قیژاندی : باشە لەوکاتەدا تۆ چیت دەکرد؟

وتم: پێویستە هەمیشە لەسەربنچینەی هێزەکانی خۆتان بچنە شەڕەوە، نەك لەسەربنەمای هێزەکانی دوژمن. یەکێك لەگەورەترین باڵا دەستیەکانتان لەهێزی ئاسمانیو دەریاییدا فەرمانگەی کەشناسیتانە، بەڵێ کەشناسی.

بەدەستە پاچەییەوە پرسی : چۆن کەشناسی؟

وەلامم دایەوە: بەبڕوای من هەمیشە چاوەڕوانی ڕۆژێك بووم کە بارانی لێزمەی ساڵ دەبارێت، ئێوە ئامرازی هونەری دیاریکردنی ئەم بابەتان هەیە، هەر لەوڕۆژەشدا هەموو بەنداوەکانی سەرڕووبارەکانی ڤێتنامم بۆمبباران دەکرد.

دەمودەست وتی: بەلام لەوحاڵەتەدا تۆ دوو تا سێ ملیۆن کەس دەکوژیت.

من پرسیم: جەنەڕاڵ، جەنگ چییە؟ ڕزگارکردنی گیانی سڤیلەکانی هێرو شیماو ناکازاکی شتێك نەبوو کەبیری لێ بکەنەوە، ئایا ئەو وانەیەت لەیاد چۆتەوە؟

(وست مۆرلند) پشتی لێمکردو لەسەرخۆ کەوتە پیاسەکردن. یەکێك لەگەورە فەرماندە سەربازییەکانی ئەمریکا لەفێربوونی دوو وانەی بنەڕەتی جەنگدا ناکام بوو، کە ئەوانە یەکێك بوون لەبەدەگمەنترین وانەکانی کە ڕاستەوخۆ لەڕووداوەکانی جەنگی چوارەمی جیهاندا بەدەردەکەوتن. لەسەرەتاوە تا کۆتایی لەتێگەیشتنی بیری دوژمنەکەی دوچاری شکست بوو؛ لەدەرکردن بەوشتەی کەمایەی قەرەبووکردنەوە نەبوو بۆ ئەو مایەی قەرەبووکردنەوە بوو بۆ ئەو کەسەی لەگەلێدا دەجەنگی. دوچاری دڵنیایی ببوو. هێزی مرۆڤ مایەی قەرەبوو کردنەوەو هەروەها مایەی جێگرتنەوەش بوو. خاكو دامەزراوەکانی ژێرخان کە دەیان پاراست مایەی قەرەبوو

کردنەوەو جێگرتنەوە نەبوون. لەزۆر ڕووەوە (وست مۆرلند)یش وەکو زۆربەی سەرکردە سەربازییەکانی هاو وەچەی خۆی لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو بەهەمان شێوەش هاوشانەکانیان لەیەکێتی سۆڤیەت کە لەحاڵەتی ڕووبەڕوو بوونەوەدا بوون لەجەنگی سێیەمی جیهاندا، جەنگێکی کەتیایدا دوژمن عەقڵێکی تایبەت بەخۆی هەبوو، جۆرە بەهایەکیان بەگەڕ دەخست کە جیاوازبوو لەکەسایەتی خۆیان. لەڕوانگەی هاوسەنگی هەردوولایەنی جەنگەوە بەهەمان ئەو تاکتیکانەوە دەجەنگان کە هەم لەبەرگریکردن و هەم لەکاری جاسوسیشدا خۆم گەواهی بەکارهێنانیان بووم لەجەنگی دووەمی جیهانیدا.

دیاربوو ڤێتنام پێگەیەکی نمونەیی بوو بۆ ئەزمونکردنی تاکتیك و چەمکە نوێیەکان، کە بێچەندو چوون بەرامبەر دوژمنێکی کە هیچکام لەئێمە بەباشی نەماننناسی کاریگەری نەبوو. لەوحاڵەتەدا ئەوە تەنها بێ نمونەترین هزرو شێوازی جاسوسی یان سوپایی بوو، کە دوژمنی کامڵترانە لەوەی کە تۆ دەتناسی، دەناساند.

بەم پێیە بۆ چەندین ساڵ ئەو ئەمریکیانەی هەستیان بەپێویستیبوونی دزەکردنە ناو هزری دوژمنیان کردبوو گۆشە گیرکرابوون. لەکۆتاییەکانی ساڵی (١٩٥٣)دا، بەماوەیەکی کورت پاش دامەزراندنی (ئەدمیراڵ ئارتۆر ڕادفۆرد) لەپۆستی سەرۆکی سەنتەری هاوبەشی سوپا، سەبارەت بەگفتوگۆکردن لەمەڕ هندو چین ئێمە کۆبووینەوە، واتە ئەو جێگایەی کە ئێمەی فەڕەنسی لەحاڵەتی پیادەکردنی هەمان ئەو هەڵانەی ئەمریکیەکاندابووین، کە ئەوان چەندین ساڵ دوای ئەوەکردیان. پرسیاری لێمکرد: ئەگەر سوپا لەڤێتنامدا تووشی جەنگ بوو پێویستە چی بزانێت؟

وەڵامم دایەوە: هەموو وڵاتێك گرفتی تایبەتی خۆی هەیە. لەڕوانگەی مێژووەوە ئەمریکا هەمیشە نیگەرانی هێزی مرۆیی خودی خۆیەتی. بەڵگەش ئەمەیە کە ئێوە کمپاینی میکانیکیتان بۆ دروێنەی بەرهەمەکانی خودی خۆتان داهێناوە، کە هەرواشە. ئێمەی فەڕەنسی دەتوانین دووسەد کەس

لەدەست بدەین‌و ئەمەش شتێکی گرنگ نییە. بەڵام ئێوەی ئەمریکی نەخێر. ئەگەر تاقە سەربازێکی ئەمریکی بکوژرێت دەبێتە تراژیدیایەکی نەتەوەیی. ئەوشتەی کەمن فێری بووم ئەمەیە کە هەرگیز بەسوپاوە نەچمە ناوئاسیاوە. دوژمن دەتوانێت بەبڕێك کوژراوی لەژمارە نەهاتووە بەرەنگاری بکات؛ بەڵام ئێمە ناتوانین. لەسەرئاستی دەریاکان‌و لەئاسماندا بمێنەرەوە، چونکە لەوجێگایانەدا بەهێزتری. ئەوان پرد دروست دەکەن تۆتێکی بشکێنە. ئەوان پردێکی دی دروست دەکەن، دووبارە تێکی بشکێنە. ئەگەر پەنجاجار دروستیان کردەوە هەرلەناوی بەرەوە. وانەی بنەڕەتی ئەمەیە: هەمیشە بەشێوازی خودی خۆتان بجەنگن، نەك لەسەرشێوازی دوژمنەکەتان)

ڕاستی ئەمەیە کە هیچکام لەزلهێزەکان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی لێبڕاوانە لەجەنگی چوارەمی جیهاندابەو جۆرەی کە ئێمە دەیزانین ئامادە نەکراون‌و، لەڕوانگەی منەوە لایەنی کەمی ئامادەییان تێدایە. هەندێکی کەم لەسەرانی دەزگا جاسوسیەکان، کە من لەماوەی دەست بەکاریمدا سەروکارم لەگەڵیاندا هەبووە، لەهەندێ لەوبنەڕەتیترین پرنسیپانەی جەنگ یان سیخوڕی یان جیوگرافیای سیاسی لەسەردەمی دەرگیری (باکور-باشور) گەیشتبوون. لەوانەیە کەسێکی کە لەهەموان تێگەیشتنی باشتری هەبووبێت (جۆرج بوش) بووبێت، کە بەڕێوەبەرایەتیە دوازدە مانگیەکەی وەك سەرۆکی (CIA) لەسالانی (١٩٧٦ و١٩٧٧)دا کارەکانی لەوماوەیەدا دووبارە ڕێکخستنەوەی کۆمەڵی جاسوسی ئەمریکاو بەهێزکردنی لەهەندێ ڕووەوەبوو، کە سەرئەنجام لەناوچوونی ڕشتەیەك لەناکامیەکان‌و دووبارە ژیاندنەوەی هەندێ لەکاریگەرییە خودیەکانی بوو وەك لایەنێکی ڕیشەیی جەنگ. هەڵبەتە هەرسەرکەوتنێك لەبواری توانای ئەمریکیەکان بۆ گێڕانی ڕۆڵی جاسوسی خاوەنی خاڵی زۆرو ماوە درێژبوو. بەڕێز (بوش) بەهۆی نامەیەکەوە لەڕێگای نوێنەرێکی فەڕەنسی لەڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بەمن ناسێنرا. بۆ منی نووسیبوو: ئەو جەنتلمانێکی واقیع بینە. لەخێزانێکی دێرینی نیواگلەند لەدایك بووە، کە بنەچەیەکی مۆراڵی لەوجۆرەی کە ئێمە هەمانە بۆ

ماوەتەوە. بەماوەیەکی کورت پاش گەیشتنی ئەم نامەیە، سەروسەکوتی (بوش) لەپاریس بەدەرکەوت. ئەوکاتە مارتی ساڵی (١٩٧٦) بوو. لەهەمان ساتی یەکەمەوە پەوەندی هاوڕێیانەمان پێکەوە گرێدا. یەکەمین چاوپێکەوتنمان لەئۆفیسەکەم لەبارەگای فەرماندەییەکەمان لەنیوەڕۆخوانێکی سەرسوڕهێنەرەوە، کە لەلایەن فەرماندەی هێزی دەریایی فەڕەنساوە ئامادەکرابوو، بەئەنجام گەیشت. هێشتا ئەو خواردنەم لەیادماوە. (بوش) هاوەڵی یەکێك لەسەرەکیترین یاریدەدەرەکانی بەناوی (جەنەڕاڵ ڤرنون والتزن) بوو، کە یەکێك بوو لەئاوارتەترین دیپلۆمات‌و شرۆڤەکارانی جاسوسی خۆرئاواو ئێستاشی لەگەڵ بێت. بەداخەوە دەستیان بەشکستی سیستماتیکانەو گەندەڵی سیستمی جاسوسی ئەمریکا ئالۆدە ببوو. گفتوگۆکەمان لەویەکەمین دانیشتنەدا گەشتێکی هەمەگی‌و فراوانی پێگەکانی جیهانی لەخۆگرتبوو، بەتایبەتی سەبارەت بەشکستی ئاشکرای ئەمریکا لەڤێتنام‌و هاتنەسەرکاری کۆمۆنیستەکان، کە تەنها ساڵێك لەوەوپێش ڕوویدابوو. بەتایبەتی بەتاسەوە بووم پێکهاتەیەکی هاوبەشی هاریکاریکردن لەگەڵ ئەمریکیەکان لەوێنەی پێکهاتەی کارکردن لەگەڵ هاوپەیمانە ئەوروپیەکان دابمەزرێنین. بەڵام (بوش) پارێزەرانە بوو. لەودواییانەدا ئەو حاڵەتە نوێیەی پەسندکردبوو، بەئاشکرا سەبارەت بە دەسەڵاتی واقیعی لەواشنتن زۆر هەستیاربوو. لەکاتی هەوڵدانم بۆ هێنانە ژێر باری کەسێك کە ڕێزی زۆرم بۆی هەبوو، وتم: سەیرکە، هیچ کام لەئێمە ناتوانین بەهێزبین، ئەگەر ئێمە بەتەنهاو تاکەتاکەو پلەبەپلە درێژە بەئۆپەراسیۆنەکانمان بدەین. هەرگیز بەوجۆرەی دەخوازین بەهێز نابین، بەڵام پێکەوە ئەوە چیرۆکێکی دییە. هەموو پێکەوە زۆر بەهێزین. (بوش) هێشتا سووربوو لەسەربڕواکەی خۆی. دووڕۆژدوای چاوپێکەوتنەکەمان درێژەیدا بەگەشتەکەی خۆی بۆ وڵاتانی دی ئەوروپا

(میونخ، برۆکسل، لەندەن). کاتێك گەڕایەوە واشنتن ڕاستەوخۆ نامەیەکی دڵخۆشکارانەیم پێگەیشت:

هاوڕێی ئازیزم.

لەوانەیە ئەم نامە زۆر پەرمیانە بێت. بەڵام شتێکەو هەستی پێ دەکەم. زۆر سوپاست دەکەم بۆ ئەو میواندارییە جوانەت. گەڕاومەتەوە وڵاتەکەم. لەهەمان کاتدا هەستێکی قوڵم بەرامبەر گرنگی پەیوەندیو ئامانجە هاوبەشەکانمان هەیە. نیوەڕۆ خوانەکە زۆر سەرسوڕهێنەرو عەجیب بوو، بەڵام گفتوگۆو کاریگەری دیدەکانت سەبارەت بەوجیهانەی کە تێیدەپەڕێنین و تەنانەت ئەو نیوەڕۆخوانەش نائاسایی بوون. بەهرەیەکی دیش هەبوو، ئەویش هەستی گەرمو ناسکی هاوسەرە شادمانەکەت بوو. تکایە زوو وەرە بۆ وڵاتەکەمان تا بتوانین ئومێدی پەیوەندییەکی بەرزمان هەبێت. سڵاوو ڕێزم بۆ تۆو هەموو نەتەوەکەتان. ویستدارتان (جۆرج. بی).

بەداخەوە بۆ شاییەکی گەورە لەنێوان هەستی قووڵ سەبارەت بەئامانجی هاوبەش و هەنگاونان بەرەو ئۆپەراسیۆنی هاوبەش لەئارادایە. لەڕاستیدا (بوش) سەبارەت بەپێشنیازەکانم لەوپێوەرەدا تا مانگی (تەممون)، واتە تا ئەوکاتەی دووەمین نوسراوی ئەوم پێگەیشت، وەڵامی نەدایەوە.

دووەمین نوسراوەکەی بەمجۆرەبوو:

پێشنیازەکانت کە سەرنج ڕاکێشترین جۆری مومکین بوو بەدەستم گەیشت و، دەستخۆشی لەوڕۆحیەتەی کە تۆی تا ئەم ئاستە بەرزکردۆتەوە دەکەم. بەهەمان شێوەی کە دەیزانیت پێشنیازەکانی کە باسیان لێوەکراوە چەند گرفتێکی سیاسی دەخوڵقێنن، کە دەبێت پشتگوێ نەخرێن. بەهەرحاڵ، تکایە دڵنیابە کەدیدەکانت دەربارەی هاریکاییەکانی ئایندەی نێوانمان بەوردی دەخرێنە ژێر باسو لێکۆڵینەوە.

ئاشکرابوو (جۆرج بوش) ناتوانێت بەیەکجار هەموو پرسەکان بخاتە ژێر لێکۆڵینەوەوە. یەکەم، ناچاربوو چارەسەری ئەو کێشانە بکات کە خۆی

لەگەڵ (CIA) هەیبوو، پێش ئەوەی بچێتە سەرلێکۆڵینەوە لەوبابەتەی هەماهەنگی لەگەڵ هەریەك لەهاوپەیمانەکانی ئەمریکا. ئاشکرایە لەئەستۆگرتنی ئەو پۆستە بۆ ماوەی یەك ساڵ بواری نەدەدا هەنگاوبەرەو چارەسەرکردنی کێشەکانی لەگەڵ (CIA) بهاوێت. زۆری ئەو پرسانە لەراپەوی رێکخستن‌و چاودێریکردنی (CIA)و گرفتی شوێنگەو ناوچەیی بوون. لەگەڵ ئەوانەشدا لەناویاندا گرفتی نهێنیانەش هەبوون. چالاکی سیخوڕیانەی نهێنی ئەنجامدەدراو بەجۆرێکی نهێنیانەش فراوان دەبوو. ڕای گشتی خەڵکی هەرگیز برەو بەوهەنگاوانە نادەن کە هاوەڵی سەراسیمەبوون ، بەراوردکاری، یان ئەفراندنێکی ئاوێتەی خیانەت بێت. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك وڵاتێك دوچاری گرفتێك دەبێت زۆرجار شاردنەوەی زۆری ئاستی کارە نهێنییەکۆنەکان دەبنە پێداویستی، تا ڕێگری لەئاڵۆزی ناوخۆیی‌و نێودەوڵەتی لەئەنجامی ئاشکرابوونی بێ پێگەیی چالاکیەکان بکرێت. گرفتی (CIA)ش بەخستنەڕووی نەخشەیەك دەست پێ دەکات. ژمارەیەك لەکۆمیتەناوخۆیی ودەرەکیەکان لەپرۆسەی دەنگدانی دەسپێکردنی هەر ئۆپەراسیۆنێکدا بەشداری دەکەن. بەلایەنی کەمەوە نزیکەی سەد کەس لەگەڵ ئامادەبوونی هەرپرۆژەیەکدا ئامادە دەبن، ئەمەش مانای ئاگاداربوونی ڕاگەیاندن‌و تارادەیەك خەڵکی بەگشتی دێت لەهەرهەنگاوێك تەنانەت پێش ئەوەی نەخشەکەش تەواو بکرێت. چاودێریکردنی ئەوەش ئاشکرایە کە زۆرتاڵ دەبێت. لەبەرئەوەی کۆمیتەی چاودێری جاسوسی کۆنگرێس ئەندام‌و کارمەندانی هەردوو پارتی کۆماریخوازان‌و دیمکراسیخوازان لەخۆدەگرێت، دوور نییە کە لایەنێك یان لایەنی بەرامبەر ئەوی دی هەرتێزێکی پراکتیکانەی خراوەتە ڕوو ڕەتکاتەوەو، بەوهۆیەشەوە پێش ئەوەی هەرنەخشەیەك زەمینەی پیادەکردنی سازبکرێت دەکرێتە ئامانج. بەپێی ئەم وەسفکردنە، بەڕێوەبەری (CIA) یەکەمجار خودی خۆی لەناوی نابات. جەنەڕاڵ (ئیستنسفیلد ترنەر) بەڕێوەبەری سەنتەری ئاژانسی جاسوسی لەژێر چاودێری خودی سەرکۆمار (جیمی کارتەر)دا بوو، کە لەوانەیە توندترین

کاریگـەری لەسـەرئەم چاودێریکردنـە هـەبووبێتو هـەرگیز دەسـتی لەسەراسیمەکردنی من هەڵنەگرت. لەگەرمەی جەنگی ساردو لـەکاتی هێرشی ڕوسەکان بۆ سەرئەفغانستانو هێرشی چەکدارانە بۆسەر (پاپا)و دابینکردنـی دارایی زۆر لەهێرشە وێرانکاریە تیرۆریستیەکان، ئـەدمیراڵ (ترنـەر) یەکـەمین چاوپێکەوتنی خـۆی لەگـەڵ مـن لـەپاریس ڕێکخست. گفتوگۆکـەی بـەمجۆرە دەسپێکرد: بە (ئاستن) بانگم بکە. لەجیهانی ئەمڕۆدا هێشـتا لـەوباوەڕەدایت کە کۆمۆنیزم شتێکی تۆقێنـەرە؟. گـەورەیی‌و ڕێـزم بۆنوانـد. ئەگـەری ئـەوە هەبوو دەربارەی مەترسیە ڕاستەقینەو ێرانکارییەکانی گروپـی (ئەبوعـەباس) پرسیارم لیٚ بکات، بۆیـە خەندەیـەکی سـادەو زرنگانـەم بۆکـرد، بـەڵام ئـەو بەجدی بـوو. تـا ئـەو شـوێنەی کـە مـن بـیزانم قسـەکانمان لەهـەمان شـوێندا دەستپێکردو کۆتایشـی هـات. بـیرم کـردەوە: ئـەی مەسـیحی پـیرۆز، ئەمـە کەسێکە لەئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەییدا ڕاژە دەکاتو، کەسێکە یاریدەی سـەرکۆماری ویلایەتـە یـەکگرتووەکان دەدات لەداڕشـتنی دیدەکـانی لەمـەڕ پرسە جیهانیەکان، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانێت پرسیار لەسەرۆکی دەزگایەکی جاسوسی هاوپەیمانی خۆیان بکات کە ئایا کۆمۆنیزمی حکومەتی (برجنێڤ ، چرنینکۆ یان ئەندرۆپۆڤ) هەڕەشەیە لەسەر خۆرئاوا؟

ئەگـەر سـەرۆکی (CIA) بەپرسـیارێك دەربـارەی دەسـەڵاتو سەرسـەختی دوژمنی سەرەکی وڵاتەکەی بۆ ماوەی بیسـتو پێنـج سـاڵی ڕابـردوو دەسـتی بەقسەکردن کـرد، بەپێچەوانـەی بەرنامـەی فراوانـی پشـت پـەردەی ئـەمریکا لەدەیـەی (١٩٧٠)دا کـەبووەهۆی نائـارامی گشـتی کۆمـەڵگای جاسوسـی، ئومێدێکی کەم لەڕاستیو دروستی دەزگا. هەنگاوەکانی یان شرۆڤەکاریەکانی دەکرا. کاتێك سـەبارەت بـە (ئـەدمیراڵ ئیستنسفیلد ترنـەر) سـەرۆکی نوێـی (CIA) پرسیارم لێکرا وەڵامم دایەوە: (باشە، واهەست دەکەم کە شتیوانێکی باشە!). جێگای سەرسوڕمان نەبوو کە پێکهاتەی دەستەی ڕاپەڕاندنەکـەی (کارتـەر) هـەموویان لـەنابوتکردنی ئامادەکارییـە زانیارییـە مرۆییـەکاندا سەرکەوتوو بـوون. لەلایەکـەوە کاردانـەوە بەرامبـەر بـەتێوەگلانی چـەندین

سەرچاوەی سیخوڕی (CIA) لەڕیسوایی (واتەرگێت)ەوە سەریهەڵدا، کە لەڕاستیدا ئەو ڕووداوە هەوڵێکی ناکامانەبوو لەسەردەمی سەرۆکایەتی (نیکسۆن) بۆ لەڕیز دەرکردنی سیستمی سیاسی ئەمریکا بەهۆی فێڵو تەڵەکە بازییەوە.

لەلایەکی دییەوە پاش ئاشکرابوونی (واتەرگێت)و دەسەڵات وەرگرتنی (جیمی کارتەر) قەیرانی دەزگای جاسوسی ئەمریکا قوڵترو توندتربوو. گومانی تێدا نییە کە هەندێ لایەنی نەتەوەیی ئەمریکا کەوتنە پرسیارکردن سەبارەت بەوەی کە ئایا دەزگای جاسوسی لێرە تەنها لەدەرەوەی وڵاتەکەی چالاکی دەنوێنێتو لەکاروباری ناوخۆییدا بەشداری ناکات؟ لەڕاستیدا ماوەیەکی دووروودرێژە لەوبڕوایەدام کە بەکارهێنانی سەرچاوەی دەرەکی بۆ ئامانجی سیاسی ناوخۆیی تەنها دەتوانێت دڵنیایی فراوانو قووڵ بکاتەوەو، لەکۆتاییدا سیستمی ئاسایشی نەتەوەیی لەبەریەك هەڵدەوەشێنێت. ئەو ڕووداوانەی کە لەناوەڕاستو کۆتایی دەیەکانی (١٩٧٠) لەئەمریکا ڕوویاندا، تەنها جەخت کردنەوەبوون لەسەربڕواکان.

زانیاری دوولقی سەرەکی هەیە، یەکێکیان زانیاری مرۆییو ئەویدییان ئاماژەی زانیاری ئەلکترۆنییە. لەڕاستیدا هەریەك لەودوانە گرنگن. بەبێ لقی دووەم ئێمە کوێرو کەڕو بەبێ یەکەمیش لاڵ دەبین. حکومەتەکەی (کارتەر) بڵاوەی بەپرسناڵەکانی دەزگاکرد، بەڵام ئامێرە ئەلکترۆنیو تەکنۆلۆژییەکانی هێشتەوە. لەودەمەدا مانگی دەسکردی جاسوسیو دەزگاکانی گوێرا داشتنی ئەلکترۆنی لەدەزگای ئاسایشی نەتەوەییدا هەبوون. ئەمریکیەکان هەمیشە توانایەکی بێ نمونەیان هەبووە.

بەهەرحاڵ، بەلاوازبوونی سەرچاوە مرۆییەکان ئەمریکا لەبەدەستەوە دانو شیکارکردنی ڕاستەقینانەی ئەو شتانەی لەڕێگای بیستنەوە کۆی دەکردەوەو هاوکات لەسەرئەو بنەمایانە کاری دەکرد، بەرەو لاوازی دەچوو.

(کارتەر) کە تەکنۆکراتێکی تەواو عەیاربوو هەمیشە لەبەکارهێنانی ئامێرە ئەلکترۆنیەکان زیاتر خۆشحاڵ دەبوو تا سەرچاوە مرۆییەکان.

ئەم جەختکردنە سەرکۆدنەوەی زانیاری بەهۆی ئامێری ئەلکترۆنییەوە لەبواری سەربازیو زانیاری جەنگی سێیەمی جیهانیو دەرگیری خۆرهەلاتو خۆرئاوا بەها گەلێکی زۆری هەبووە. بەلام لەجەنگی نێوان (باکور- باشور) زانیاریو سیخوڕی مرۆیی تاکە کەسی ڕۆڵی گەلێك گرنگتر دەگێڕن.

دوژمنە نوێیەکانمان دەکەونە پشتی میللەتەکانەوە. پەبوەندیەکانیشیان زۆربەی سەرەتایین. ڕەوەندی هزریان پێچراوەو ئاوێتەی دەسەلاتێکی دیاریکراوە کە دەرککردنو سمینیان کارێکی بنەڕەتیانەیە. بڕیارو دەستوری ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنەکان بەفەرمانێکی کۆتاییانەوە ڕەوانە دەکرێن. جاسوسی ئەلکترۆنی تا ئەو دەمەی کە کارلەکارنە ترازێت ڕۆڵ ناگێڕێت. واتە لەڕاستیدا تا ئەوکاتەی کە هێزەکانی سوپا نەجولێن یان بەلایەنی کەمەوە شاراوە بن یان کاتێك کە تیرۆریست بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکەی ڕەوانە کرابێتو بواری گەڕانەوەی نەبێتو لەپێشدا پەیکی نێوانیان مادەی تەقینەوەکانی بۆ ئامانجە نادیارەکە نەبردبێت، ئەو ئامێرانە سوودیان نابێت.

سیخوڕی تاکە کەسی دەتوانێت لەڕووی مەبەستەکەیەوە بیهێنێتە گیروگاز، سیخوڕی ئەلکترۆنی دەتوانێت تەنها ئامازەیەکی هوشیار کەرەوە بێت، کە زۆربەی جاریش درەنگ سوودی لێوەر دەگیرێت. (کارتەر) لەدەرککردن بەوەی کە سیخوڕی نێودەولەتی بەتەنها ئامڕازی کۆکردنەوەی زانیاری نییەو هەروەها لەتێگەیشتنیشی لەبابەتی سەرچاوە توندەکانی دی جاسوسی کردن کە نەیاری ڕای گشتیشن، کاری جاسوسی بەتەنها درۆکردن لەهەموو کاتەکان، نهێنی کاریو دەسیسەبازی خائینانەو بلۆفلێدانی ناشیرین نییە، ناکام بوو.

ئـەم بابەتـە بەتـەواوی هـەمان پرسـی (گـوزارش لێـدان)ی نێـوان خەڵکییە.، تۆ چ جێگای بڕوایان بیت یان نەبیت، گەرچی ڕوونە کـە پەیوەندی لەوجۆرە لەگەڵ بوونی بڕوایەکی زیاتر لـەگومانو ڕاڕایی کاتی ئاسـانتر دەبێـت. ئومێـدم بەرامبـەر بەئاسـۆ ڕۆشـنەکانی ئـەمریکا لـەداهاتوودا لـەدوو فاکتـەروە دێت: یەکـەم، لـەوە دڵنیـام کە تـیرۆریزم لەکۆتاییدا ڕێگای سنورەکانی خۆی دەدۆزێتەوە. ئەمەش شتێك نییـە کـە بۆ خراپترین دوژمنەکانمی بخوازم، بەڵکو شتێکە بـۆ وڵاتـە دۆستەکانیشـم هەمان شت دەخوازم.

بـەلام گـەر هەڕەشـەکانی تـیرۆریزم کاریگـەری بێدارکردنـەوەو شـۆکی خـەڵکی ئـەمریکاو بەتایبـەتی سـەرانی ئـەوانی لـەخۆگرتبێت لەوحاڵەتـەدا لەوانەیە بەهایەکی هـەبێت. ئەمریکیـەکان تـا ئێسـتا ژیـانێکی تاڕادەیـەك شادمانانەی پڕ ئاسایش ژیاون.

ئـەو ڕووداوە تیرۆریسـتیانەی کـە ئەمرکیـەکان یـان دارایـیـەکانیانی یەخـەگیرکردووە، هـەموویان دوور لەسـنوری قەڵـەمڕەوی ئـەمریکاوە ڕوویانداوە. ئەو لێکدانەوەیە دەکرێت ئەمە بێـت کە هوشـیاری نائاسـایی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیدراڵی، جگە لەوترسەی کە (FBI)ی ئەفسانەیی لەسەرانسەری جیـهاندا خسـتوویەتیە دڵـی تیرۆریسـتانەوە، هۆکـاری ئـەو هەلومەرجـە بێـت. ڕوونکردنەوەیـەکی دی دەکرێـت دژواری فیزیکیانـەی ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنەکان بێت لەناو ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، چونکـە تیرۆریسـتەکان بنکـەی گـەلێك دوور لـەوێوەیان هەیـەو، ئاسـانکاری ئەنجامدانی چالاکی لەناوئەوروپادا کە بەهـەمان بـڕی کـاری توندوتیژانـەو بۆ ئامانجی بەسوود تر بەمەترسـییەکی کـەمترەوە ئـەنجام بدرێـت، بۆتـە هۆکاری ئەم حاڵەتە؛ هەرچەندە زۆرلـەم هەلومەرجانـە ئەگـەری گۆڕانیـان هەیە.

بەسـەرنجدان لـەوەی کـە نزیکـەی دووسـەدە بەسـەر سـەرهەڵدانی تـیرۆریزمی جیـهانیدا تـێ دەپـەڕێت، سـەرانیان تاڕادەیـەك دیـارن‌و لەئـەنجامدانی چالاکیـەکانیان لەهـەرجۆرە ژینگەیـەکدا دەسـتکراوەن.

(FBI) دەستیداوەتە چاودێریکردن، کە بەئەندازەی بەدواداچوونەکانی (فەرمانگەی چاودێری گشتی) فەڕەنسا یان (M15)ی بەریتانیا هەڕەشە ئامێز نییە. لەوانەیە ئەمریکا بەخێرایی تاقیکردنەوەیەکی سادە ئەنجام بدات؛ بەڵام تەنها ئۆپەراسیۆنێکی تیرۆریستانەی سەرکەوتوو دەتوانێت تیرۆریزمی جیهانی لەناوببات، کەویلایەتە یەکگرتووەکان ئەو بەڵێنو شێوازە نویو تازەیەی بەرامبەر بەئامانجە توندوتیژەکەیان لەهەگبەدایە. دووەمین هۆکاری گەشبینیەکانم کە لەوانەیە ئەمریکیەکان ببنە هاوپەیمانی جاسوسی واقیعبینانە تر فراونبوونی بەردەوامو بەنێودەوڵەتی بوونی بازرگانی مادە سڕکەرەکانە. مادەسڕکەرەکان - بەتایبەتی زۆربەی بەرهەمی جیهانی سێیە کە باکوری کردۆتە بازاڕ- تەنها فۆرمێکی دییە لەتیرۆریزمو چەکێکی دییە لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا. لەڕاستیدا بازرگانیکردنی مادە سڕکەرەکان مومکینە بۆ مانەوەی کۆمەڵگای خۆرئاواییمان بەکێشانە لەگەڵ چالاکیە تیرۆریستیەکان زۆر زیاترو یرانکارترو لەماوەیەکی درێژدا زیان بارتربێت.

لەکاتێکدا کە لەوانەیە تیرۆریستان لەڕووداوێکدا سەدەها کەس بکوژن یان لەکاربخەن، بەمادە سڕکەرەکان دەچنە ناودەروونی ملیۆنەها کەسەوەو، هەریەك لەوانەش کەسێکی دی ئالودە دەکاتو لەئەنجامدانی هەرجۆرە چالاکییەك بێکاریگەریان دەکات.

ماوەیەکە بەڵێندەرە گەورەکانی مادە سڕکەرەکان ئەمریکایان وەك زەمینەیەکی بنەڕەتی جەنگی خۆیان دەبینن. لەکاتێکدا کە ئەوروپا لەزۆر ڕووەوە زەمینەیەکی لەبارو تەواوی بۆ تیرۆریستان لەخۆرئاوا ئامادەکردووە، ئەمریکا بەژینگەیەکی گونجاوی چالاکی بازرگانی مادە سڕکەرەکان دادەنرێت. ویلایەتە یەکگرتووەکان سامانی تەواوی بۆ دابینکردنی دارایی بەرهەمهێنانو دابەشکردنی مادە سڕکەرەکان هەیەو، لەوڕووەوە دوچاری دەردیسەری بۆتەوەو، لەچینەکانی خوارەوەدا

دوچاری توندوتیژییەك بووە كە لایەنەكانی هیچ شتێكیان نییە لەدەستی بدەن‌و، ئەمریكا پێویستی بەهەڵتنە لەدەست ئەو بەڵای ڕۆژانەیە.
لەوانەش زیاتر، خاوەندارانی بەڵندەرانی مادە سڕكەرەكان دەزانن كە ڕێگایان بەرەو دەوڵەمەندبوون بەهەنگاوێكی بچوك دەسپێدەكات، بەئەگەری هەڵاتن لەسەرگۆشەی هەرشەقامێكی ئەمریكاوە مەیسەر دەبێت.
ئەمریكیەكان گەیشتنە ئەو بڕوایەی كە مادە سڕكەرەكان دەتوانێت لەڕێگای كە نارەكانیانەوەو، بەوردی لەهەموو ئاڕاستەیەكەوە بێتە ناوەوەو ئەمەش هەوڵێكی سیخوڕانەی فراوانی دەوێت. كە لەڕاستیدا هەموو ڕۆژێك بنەمایەكی جدیتر لەپرسی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی پەیدا دەكات. هاوكاری ڕاستەقینەی چەند لایەنە- سەبارەت بەكۆكردنەوە، شیكردنەوە، لەسەرو هەمووشیانەوە هەنگاونانی پراكتیكانە لەسەربنەمای زانیاری- لەوانەیە تاكە ئامڕازی مانەوەو گونجاو بێت بۆ ململانێ كردن لەگەڵ بەڵێندەرە گەورە نێودەوڵتیەكانی مادە سڕكەرەكان.
سەرانی ئەو بەڵێندەرانە لەهەموو ڕوویەكەوە وەك فێڵاویترین‌و سەرسەخترین تیرۆریستان لەمەیدانەكانی بەرزترین هونەری گەندەڵی ، باری قاچاخ‌و نامە شروع ، گۆرینی ئاڕاستەی باروگواستنەوەكان‌و بەكارهێنانی توندوتیژی ناسراون.
هەموو كارمەندێكی جێبەجێكاری بواری مادە سڕكەرەكان وەك لایەنێكی دژ بەتیرۆریستی خۆی یان دەزگا نهێنیەكان لەڕووبەڕوو بوونەوەكاندا بەچاكیی دەزانن كە گرنگترین دەسگیركردنەكان‌و هێشتنەوەكان جدیترین پوچەڵكردنەوەی چالاكی ئەو بەڵندەرانە، دەرئەنجامی سیخوڕی بەڕێكەوتی سەرسنورەكان یان فڕۆكەخانەكان نەبووە. ڕۆچوونە ناو ئەو چالاكیانە پێویستی بەكۆكردنەوەی زانیاری زۆر، سمینی هێواشی نهێنیانە، ئارامگرتن، شارەزایی‌و پەیوەندی

جۆراوجۆر دەبێت. ئەمریکیەکان ئێستا گەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی کە ڕووبەڕوو بوونەوەی چەندین ساڵەیان لەگەڵ مامەڵەچیانی مادە سڕکەرەکان تیرۆریستان دووچاری هەڵەی زۆربوون. هەندێك لەوهەڵانە دەرئەنجامی بێ ئارامیانە- کە ماوەیەکی زۆر لەچالاکیە سیخوڕیەکانیاندا وەك گرفتێك لەئارادابووە- هەروەها هەڵەکانی سەرەوەش پەیوەست دەبوو بەچانسی خراپی دۆستو هاوپەیمانەکانیشیانەوە.

هەوڵە دووبارە بووەکان لەسەر بنچینەی هەڵە، تا واشنتن بەرەو ڕۆچوونە ناو نهێنیەکانی جیهانی سێ لەڕێگایەکی لابەلاوە ڕابەرایەتی بکات، دەتوانرێت لەناولیستێکی لەوجۆرەی هاوپەیمانە نەشیاوو خیانەتکارەکاندا ناوی (مانوێل نۆریگا) بنوسرێت.

ئەگەر سەلمێنرا کە (نۆریگا) لەسەرلیستی موچە خۆرانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بووە، بەم پێیە ئەوە هەڵەیەکی شەرم ئامێزانە دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا چ کەسێك چالاکیەکانی مامەڵەچیانی نێودەوڵەتی مادە سڕکەرەکان وەك کەسێکی گەشتیار باشتر مەیسەر دەکات؟ لەڕاستیدا ئەمە وەك ئەوەیە کە داوا لەڕێوی بکەیت ببێتە پاسەوانی قەفەسێکی جوجەڵە.

چ جۆرە دۆخێکی سەرنج ڕاکێش دێتە ئاراوە کە ئەو ڕێوییە قەڵەوترینو نایابترین جۆری جوجك بۆ خواردنی ئێوارەی خۆی هەڵبژێرێتو، ئەم کارەشی لەڕاستیدا بەچاوپۆشیو دەست لەپشدانی خاوەن کێڵگەوە ئەنجام بدات.

هەرگیز خەڵکی بومەلێڵ مەخەبەر کار. ئێمە دەبێت هەمیشە وردبین کەکێ بەکاردەگرین، چۆن ئەو بڕیارانە ڕاستەوخۆو بەجۆرێکی بێچەندوچوون بەسەرئەو کەسەی کە کاری بەکرێگیراوەیی ئەنجام دەدات ڕەنگدانەوەی دەبێت.

فەلسەفەی پێرسناڵی خودی خۆم هەمیشە ئەمەبووە کە کاتێك کارێکت هەیەو کارێکی پیسیشە دەبێت کەسێکی جەنتلمان بۆ ئەو کارە

بکەیتە کرێگرتە. ئەگەر جەنتلمانێك بڕوای کرد کە ئەو کارەی ئێمە مەبەستمانە کارێکی جەنگییەیان هەنگاوێکی نیشتمان پەروەرانەیە، لەوحاڵەتەدا ئێمە کەسانێکی زۆر باشمان پەیدا کردووەکارمان بۆ بکات. لەبەرامبەر ئەوەشدا ئەگەر ئێمە پیاوکوژێك یان کەسێکی بێسەروپێ بکەینە کرێگرتە لەوحاڵەتە بەهەرجۆرێك بێت ناچار بەتیرۆرکردنی دەبین، چونکە دەبێت سەرانەی بدەینێ. هەڵبەتە ئەم بنەمایە سەبارەت بەهەز هەنگاوێك لەناوچالاکیە سیخوڕیەکانی (باکور- باشور)و، ئەو جێگایانەی کە دەسەڵاتی فەرهەنگەکانو سیستەمە بێگانەکان زۆر ئاڵۆزترو هەستیارترن لەوهەنگاوانەی کە ئێمە لەماوەی سێ جەنگی جیهانی ڕابردوودا ئەنجامان داوە، ڕاستە.

لەکاتی یەکێك لەدیدارەکانماندا ئەم فەلسەفەیەم بۆ (جۆرج بوش) ڕوونکردەوە، بەبێ ئەوەی هیچ ئاماژەیەك بە بەکرێگرتەیی (نۆریگا) بدەم. ئێستا کە چەندین ساڵ بەسەرئەوە تێپەڕیوە خراپترین کابوسەکان یەخەی ئەمریکیەکانی گرتووە؛ واتە دادگاییەکی دوورودرێژو ئاڵۆز، کە دوابەدوای ئەوە پەلاماری سوپاییانەی مەترسیدار لەکەناڵی پەناما ڕوویداوە.

ئەو هەنگاوە بەتەواوی بۆ ڕزگاربوون لەبەلای (مشکێك) داڕێژراوە، کە هەرگیز نابێت جارێکی دی لەبواری ئەو کارەدا بکرێتەوە بە کرێگرتە. هەموو هەنگاوەکانی (نۆریگا) شکست بەدوای شکستبووە. لەگەڵ ئەوەشدا گەر تۆ کارێکی دووبارەی ئەوجۆرە بکەیتەوەو (مشکێك) بەکرێ بگریتو دواجار ناچاربەوە ببیت خۆت ڕزگار بکەیت لەدەستی، لەوحاڵتەدا بەهەموو هۆکارێکی شیاوەوەو بەخێراییو بۆ هەمیشە خۆت لەکۆتەکانی ڕزگار بکە.

دووبارە هێنانەوەی (نۆریگا) بۆ بەردەم مەحزەری دادپەروەریی لەویلایەتە یەکگرتووەکان ئایدیایەکی ئاڵۆزو تەنهای ئەمریکایە.

لەزۆربەی پنتەکانی جیهانی سێیەمدا دادپەروەرییەکی لەوجۆرەبوونی نییە. ئۆپەراسیۆنی پاناما لەکاتی بڵاوبوونەوەی هەواڵی هەڵاتنی (نۆریگا)و چوونە ناوەوەی هێزەکان ئەمریکا بۆ ناو ئەو وڵاتەو، هاوکات دیاریکردنی خەڵاتێکی یەك ملیۆن دۆلاری بۆ دەستگیرکردنی، ونبوو. دیاریکردنی بڕی یەك ملیۆن دۆلار بۆ دەستگیرکردنی بەمردوویی یان زیندوویی (نۆریگا)- هەمان ئەو کەسەی کە هاوەڵی نیوە ڕێگای ئەمریکا بووەو لەهەموان زیاتر بەسوودتر بوەو، ناشیرینترین کاری ئەنجامداوە- ئەوی خستە ناوکیسەیەکی گەورەی پاکوتە میزی پشت دەرگای ئەوانەی بەدەستیانەوەدا. لەڕووی ئەم بابەتانەوە بە (ڕێکەوتێکی بەرنامە بۆ داڕێژراو) هەرزانتر تەواو دەبوو.

گەرچی لەزۆر رووەوە، ڕووداوە فیکریەکانی کە بۆ بەرژەوەندی (نۆریگا) دەهۆنرانەوە، لەوانە بوون کە لەخودی خۆی مەترسیدارتر بوون. لەماوەی ئەو ساڵانەدان ئەمریکیەکان زۆر حەزیان دەکردو نائومێدانە دەیانویست کە دادگاییەکەیان تەواو بێتو ببێتەهۆی یەکێتیەك لەگەڵ ئەو کەسانەی کە وەفادارانەو بەڕاستی دەربارەی کاروباری ناوخۆیی کاریان کردبوو، بەڵام هۆکارەکانیان هەندێك دژوارتربوو. یەکێك لەگەورەترین خاڵە لاوازەکانی دەزگای جاسوسی ئەمریکا- کە لەوانەیە بەرئەنجامی کەسایەتیە ئەمریکیەکان بێت- ئەو لایەنگرییە خراپەیە کە دەیانەوێت هەمیشە لەدەوریان بێت. کاتێك ئەمریکیەك دووجار چاوپێکەوتنت لەگەڵدا دەکات بەتەواوی ئامادەیە کە بە (هاوڕێی خۆشەویستی دێرین)ەم، یان تەنانەت (هاوڕێی باش)م بانگت بکات، لەکاتێکدا کە لەوانەیە ئەم هاوڕێیە شتێکی جگە لەناوبودکردنی ئەو زیاتر نەوێت.

لەبەرامبەر ئەو جۆرە کەسانەدا دەبوایە هوشیار بوایە. بەنیوەڕۆخوانێکی باش یان بەجگەرەیەکەوە دێتو بەبێ بەکارهێنانی هیچ هۆکارێك دەتکاتە هاوەڵی نزیك یان هاوپەیمانێکی بەهێزی خۆی.

لەڕاستیدا هاوڕێیەکی لەوجۆرە دەتوانێت زۆر بەئاسانی ناجێگیربێت. ڕوسەکان‌و بەتایبەتی کارمەندەکانیان هاوبەشی ئەوجۆرە مامەڵە ئەمریکیە نین. یەکێك لەتایبەتمەندیەکانی کارمەندانی جاسوسی ڕوسیا ئەوەیە کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان هەیە بەنیشتمانی دایك، ڕوسیاوە. کارمەندێکی سیخوڕی سۆڤیەتی وەك یەکێك لەنەتەوە پەرستە ڕوسەکان هەستێکی قوڵی بەرامبەر دەسەڵات‌و بۆ توانای وڵاتەکەی هەیە؛ ئەو هەستەی کە نەتەوەی ڕوسیا بەدرێژایی کات بەردەوام دەبێت‌و، بەتایبەتی زۆر لەخۆرئاواییەکان زیاتر جەخت لەسەرئەوە دەکەنەوەو، لەوەش زیاتر ئەوە ئەو هەستەیە کەدواین بەرپرسیارێتی ئەو دیاری دەکات، کە هەمان ناسینی دوژمنە پێش ئەوەی بەسەریدا زاڵ ببێت. پێویست ناکات کە عاشقی دوژمنێکی لەوجۆرە بێت یان دوژمنێکی لەوبابەتە عەشقێکی لەوجۆرەی بۆی هەبێت، هەموو ئەوشتانەی کە پێویست‌و داواکراوە ناسینی لایەنی بەرامبەرە.

هەموو کارمەندە ڕوسەکان دەیانەوێت ترسناك‌و تۆقێنەر بن؛ بەهەمان شێوەی کە تیرۆریستەکانی جیهانی سێیەم‌و دۆستە عاقڵەکانیان دەیانەوێت وابن. بەدرێژایی ئەو کاتانەی کە من سەروکارم لەگەڵیاندا هەبووە، ڕوسەکانیش وەك تیرۆریستەکان تەنها ئارەووی گەرمی سەرکەوتن یان باڵا دەستی لەبەرامبەر دوژمنە خۆرئاواییەکەیان لەناو جەنگی سێیەمی جیهانی، یان دژ بەهێزەکانی تیرۆریزم‌و مادەی سڕکەرو ئسولگەرایانی مەزهەبی، کە ئێستا لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا بەدوژمنی ئێمە دادەنرێن، خولیای سەریان بووە.

ڕوسەکان سەبارەت بەمادەی سڕکەر لەناو وڵاتەکەیاندا دەستیان داوەتە ئەنجامدانی تاقیکردنەوە، هەرچەندە هێشتا لەگەڵ هەراسەکانی دەرئەنجامی تیرۆریزم لەناو قەڵەمڕەوەکەیاندا ڕووبەڕوو نەبوونەتەوە. جۆرێکی (مافیای سوور) خزابووە ناوهەموو ئاستەکانی ژیانی ناویەکێتی سۆڤیەتی پێشووەوە، کە هێزو وزەیەکی زۆری بەهەدەردا.

هەر بەربەستێکی کە بتوانێت ئازادی کارکردنی ئەم وڵاتە بپارێزێت، هەمان ئەو بەربەستەیە کەدەبێتە هۆی ئاستەنگ لەبەردەم تیرۆریستەکاندا بۆ ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت بکەنە ئامانجی خۆیان.

دروست وەك ئەو دەمەی ئەوان ئەوروپای خۆرئاوایان کردبووە ئامانجی خۆیان. هێشتا ڕوسەکان لاف ئەوەیان لێنەداوە کە کراوەیی سنورەکانیان ببێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی تیرۆریستەکان دەستیان بەناو وڵاتەکەیان ڕابگات، وەك ئەوەی ئێمەی ئەوروپی لەناو دانیشتوانە پڕ جەنجاڵەکانی خۆماندا ناچاربووین بیکەین. هێشتا بەهێزترین بەدەسەڵاترین، کاریگەرترین کارمەندانی (KGB) بوونیان ماوە، کە هەموو بێگانەیەك دەناسێنن ، تەنانەت گەر لەژێر چاودێری کەسانی وڵاتەکەی خۆشیاندا بێت.

بەڵام ئەمە لەلای هەموان ئاشکرابووە کە کۆمۆنیستە هوشیارەکان ملیاردەها دۆلاریان یەدەگ کردووە بۆ درێژەدان بەشەڕی شاراوەی خۆیان لەسەرانسەری جیهاندا، بەهەمان شێوەی کە لەنێوان جەنگەکانی یەکەمو دووەمی جیهانیدا کردیان. بەسەرنجدان لەپرسی تیرۆریستەکان ئاستەنگێکی دی لەئارادایە، کە ئەویش بوونی میراتیەکی چەندین ساڵەی پەروەردەکردنی ژینگەیەکی تیرۆریستانەیە. هێشتنەوەی دەوڵەتە تیرۆریستیەکانو پەروەردەکردنی سەرانی تیرۆریست بەشێکی کەمی پارێزگاریکردن لەبەرژوەندیەکانی ڕوسیا دابین دەکات.

بەڵام تیرۆریستە کۆنەکانی دی، ئەوان بەتەواوی دەزانن تاچەند خاوەنی هاودەردیو پشتگیری ڕوسەکانن– چ لەڕووی دارایی، مادەی سەرەتایی، پەروەردەو چ لەڕووی مۆڕاڵییەوە– کە لەدواییدا لەمەیدانەکە بەدەرنران. جێنشینە تازەو دروستکراوەکانیان هیچ کامیان هەستی لەوجۆرەیان نابێت.

ئەوانە هیچ هەستێکی وەفادارییان بۆ خاوەنێکی دوورە دەستی لەبەرلینی خۆرهەڵاتی یان لەمۆسکۆ نییە. ئێستا دەبێت ئەم هەستی

وەفادارییە بۆ سەرمایەداران‌و زەنگینە دەست بڵاوەکان دەربڕن. دەوڵەمەندێکی سەرمایەدار ئێستا لەوڵاتێکی دیدا خانەخوێی هەڵبژاردووە. چیدی کۆمۆنیزم بەوانەیەکی گرنگی دەرچووان دانانرێت. مامەڵەچیانی مادە سڕکەرەکان لەویەکەمین کە سانەبوون کە سەبارەت بەپڕ سوودترین پاشماوەکانی جەنگی سۆڤیەت سەرمایە گوزارییان کرد. میراتیی واقیعیانەی ئەفغانستان لەلایەك بەجانتای پڕ دراوو لەلایەکی دییەوە بەدەلاقەی ماتەمینی پڕ کرابۆوە.

بۆ یەکەمین جار جەوهەری جەسارەتی ڕوسەکان بووە هۆی ئەزموون کردنی ئیمزای دەستپێکی بێ پەروای کۆکاین‌و هیرۆین. وەك ئەمریکیەکانی پێش ئەوان کە لەڤێتنام بوون، هەزاران سەربازانی ڕوسی لەنێوان کڕیارانی مادە سڕکەرەکاندابوون. هەڵبەتە ئەم شتە فاکتەرێکی گرنگی پێشنیازەکەی من بوو بۆ سەرکەوتن لەجەنگی ئەفغانستان، کە پێشتر پێشکەش بەسەرۆك (ڕیگان)م کردبوو. ئەو مەسەلەیەش لەناو پێکهاتەی ئاسایشی ئەمریکادا بووە قوربانی بیرۆکراسیەت. هێرشی بەلێشاوی سەربازانی ڕوسی بەرەو مادە سڕکەرەکان بەمەبەستی سستکردنی هێواشی وزەی ڕۆحی‌و جەستەییان لەشەڕدا لەناو خاکی ئەفغانستاندا نەخشەکێشی بۆ کرابوو. بازرگانانی مادە سڕکەرەکان کە کاریان بۆ ئامانجەکانی خۆیان دەکرد، لەڕاستیدا کاریگەرانە کاریان بۆ ئێمە دەکرد! کاتێکیش سەربازەکان دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوەیان لە (مۆسکۆ، کیف‌و لینینگراد) هەزاران کەسیان بەخۆیانەوە ئالودە دەکرد، کە ئەمەش هەمان بەڵگەی فیزیکیان بوو، بۆیە سەرەڕای هەموو ئەو هەوڵانەی دەدرا بۆ هێشتنەوەیان لەناو چیاو دۆڵەکانی ئەفغنستان، هەڵدەهاتن. کاتێك ئەوانە گەڕانەوە بۆ نیشتمان مادە سڕکەرەکان دەبوونە ئامێرێکی قەدەغە کراو، کە ئەوانە ئالودەی ببوون. لەهەمان کاتدا مادە سڕکەرەکان ئەو توانستەی دەدانێ تا ئەو کارە بێبەزەییانەی کە لەناو ئەفغانستاندا ئەنجامیان دابوو لەمێشیاندا پاك بکەنەوە.

کاتێك کۆمەڵگای سۆڤیەتی زیاتر کرایەوە، دەسڕا گەیشتن بەمادەی سڕکەر وەڵامی خواستەکانی پڕ دەکردەوەو تا دواخاڵی باڵای بەرهەمهێنانی بەرز بۆوە. (KGB) لەودەمەدا زانیاری تەواوی لەسەرمامەڵەچیانی مادە سڕکەرەکان هەبوو. لەبەرامبەریشدا دەکرێت بوترێت کە مامەڵەچیانی مادە سڕکەرەکان تەنها لەچالاکیە جیاوازو فراوانەکانیاندا لەناوخاکی ڕوسیادا پێی ئالۆدەبوویان تێدەهاویشتو، ناساندنی بوومەلێڵی کارمەندێکی جێبەجێکاری مادە سڕکەرەکان لەم جیهانە ئالۆزەدا کارێکی درێژ خایەنە. سەرەڕای ئەوەش، تواناکانی (KGB) بۆ ئەنجامدانی چالاکی لەوبوارەدا بەهۆی ئاشوبو لەبەریەك ترازاندن لەناوخودی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتیدا، بەتایبەتی مۆڵداڤیا، گورجستانو وڵاتانی حەوزی بالتیكو کۆمارەکانی ئاسیا واتە ئەو جێگایەی کە هەمیشە چالاکیە وردەکان هاوشانی دژوارییەکی سەخت بووە، لاوازبووە.

بەم پێیە، ڕوسەکان گەیشتنە ئەو ڕاستیە بنەڕەتیەی کە سەرکردەی سیاسی لەخۆرئاوا تەنها لەودواییانەدا بۆتە جێگای متمانەی گشتی خەڵك. تاکە ئامرازی ڕاستەقینەی لەناوبردنو لەکارخستنی مامەڵەچیە گەورەکانی مادە سڕکەرەکان، ترسناکترین گروپە تیرۆریستیەکان تەنها ڕێگا بەجیهانی کردنی جەنگە لەدژیان. هەڵبەتە بەچاوپۆشیکردن لەچالاکیە سیخوڕیو کۆکردنەوەی زانیارییەکان کە سەرخانی کۆنترۆڵکردنی هەنگاوەکانن. پێویستە شەڕی دژبەو دەوڵەتانەی پەنایان دەدەن، ئەو دەوڵەتانەی جیهانی سێ کە هۆکاری چەکدار کردنیانن‌و، چ لەئێستاو چ لەئایندەدا بەدرێژایی جەنگی (باکور- باشور) پێداویستیەکانیان بۆ دابین دەکەن ، جەنگ بەجیهانی بکرێت.

یەکەم هەنگاون کە جیاوازتر نییە لەهەنگاوە جاسوسیەکانی دی، ناسینی دوژمنە. خاوەن دەسەڵاتانی مادە سڕکەرەکان لەجۆری تیرۆریستانی دەست لەخۆبەردراو نین. ئەوانە وەك مامەڵەچیانی

سەربەخۆ، ژیانێکی تەواو بەختەوەر بەسەردەبەن‌و، زۆر سوپاسی تۆ دەکەن. ئەوانە سەرمەستی دراوو هەموو ئەو شتانەن کە دەکرێت بەدراو بکڕێت. لەبەرامبەر وازهێنان لەوشێوازی ژیانەهیچ قازانجێك ناکەن. لەڕاستیدا ئامانجیان لاوازکردنی دیمکراسیەتی خۆرئاوایی یان سیستمی سۆڤیەتی بۆ بەرژەوەندی بڕوایەك یان نەتەوەیەك نییە. ئامانجیان زۆر ڕۆشن‌و سادەیەو ئەویش دراو بەدەسهێنانە. دراو بەڕێژەیەکی زۆرو خەرجکردنی بەجۆرێکی دەست بڵاوانە بۆ خودی خۆیان. ئەگەر ئەمانەش لەڕاژەی مەبەستی سیاسی دەوڵەتان یان پشتگیری کارەکانیاندا بوونایە، یان تەنانەت ئەوانەشی دەیان حەوێننەوە، کارەکەیان تەنها دەبووە تەلزگەیەکی بچوك دژ بەسیستمەکانمان. کاتێك ئامانجەکانیان بزانین کاریگەرترین تاکتیکەکانی شەڕو لەکارخستنیان ئاشکرا دەبێت. دروست بەوهۆیەوە پێشنیازم بۆ سەرکۆمار (ژیسکاردستن) کرد تا تیرۆریستانی دورگەی (کریس) بەپشکێکی باش‌و گونجاوەوە یەکەیەکە بیانکەینە ئامانج تا ئەوان لەپەیامەکەمان تێبگەن؛ چونکە دەبوو سەرانی مامەڵەچیانی مادە سڕکەرەکان بکەینە ئامانج. ئۆپەراسیۆنەکە بەتەواوی‌و سادە بووەمایەی نوشست هێنان نەبوو. یەکەم : وا دەردەوت کە پێکهاتەیەکە لەهوشیاری نائاسایی‌و خاوەن سەرمایەیەکی بێکۆتایی. ئەمە ڕێکخراوێکی چەند نەتەوەیی بوو، کە بەنهێنی لەلایەن سەرانی مامەڵەچیانی مادە سڕکەرەکانەوە پشتیوانیان لێدەکرا کە وڵاتە بەرخۆرەکانیان دەسنیشان دەکردو، لەژێر ناوێکی پەسەندکراودا کاریان دەکرد. دیارە هاوکاری پۆلیسی نێونەتەوەیی‌و کاری نائاسایی سیخوڕی بۆ دەسەبەرکردنی سەرکەوتن لەئۆپەراسیۆنێکی لەوجۆرەدا زۆر پێویست بوو. حەشارگە سەرکیەکانی ناو گروپەکان، زانیاری ورد لەسەرجموجۆڵەکانیان، خاڵی لاوازی بەرپرسەکانیان سات بەسات، بنەمای گرنگی سەرکەوتنمانە. لەگەڵ ئەوەش، هەموو شکست هێنانێکیش دەبێتەهۆی بەهێزکردنی حاڵەتی لەشکان نەهاتووی ئەم

سەرکردانە لەنێو خەڵکانی خۆیان و لەنێو ئەوانەی کە پشتیان بەکارەکانیان بەستووە. ئەگەر بمانەوێت ئومێدێکمان بەسەرکەوتن لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا هەبێت، دەبێت ئەوە بزانین کە هاریکاریکردن مەرگ هێنەرترین و ئاڵۆزترین چەکە لەدژیان.

دوا وتە:

## یانەیەك بۆ كەسانی شایستە

ئەوشتەی ئێمە بەجەنگی چوارەمی جیهان ناوزەدی دەكەین لەزۆر رووەوە ئاماژەیەكە بۆ گەڕانەوە بۆ سەرەتایترین ڕیشەمان. هزری هەندێك لەنەیارەكانمان لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەتەواوی ڕۆشنكەرەوەی چەمكە ستراتیژیەكانی سەدەی بیستو یەكە. دەبێت ئێمە بەتەواوی ئامادە باشی ڕێساكانی ئەم شەڕو پێكدانانە بین، تا هاوسەنگی لەدەسەڵاتو وەحشەتدا بەدەسبهێنینو، سەرئەنجام بتوانین ئاشتی زامن بكەین. چەمكی داڕمانی (بێچەندو چوون) سەقامگیرییەكی نوێ لەسەردەمی داهاتووی ئەتۆمیدا ئاشكرا دەكاتو، دەبێت بەخێرایی جێگا بۆ (داڕمانی بێچەندو چوونی دوولایەنە) چۆڵ بكات، تا ئاشتییەك لەناوهاوسەنگی ئەتۆمی مەترسیداردا دەسەبەر بكەین. (داڕمانی بێچەندو چوون) چەمكێكی ستراتیژی نوێیە كە دەبێتە ئاستەنگ لەبەردەم داڕمانی گشتی لەجەنگی چوارەمی جیهانیدا. ئەو هەڕەشەیەی سەرەوە لەڕاستیدا لەڕووی فروانیو ئەگەری ڕوودانەوە زۆر مەترسیدارە. هەڕەشەی لەوجۆرە پێویستی بەسیستمێكی گشتی ستراتیژی نوێیە كە هاوشانی بێت- سیستمێكی خۆپڕچەك كردنی ڕێسادارو تاكتیكە ڕێسانەدارەكان كە لەتوانایدا بێت هاوسەنگی ئەتۆمیو ئاشتی دابین بكات، كە هەمان ئەو هاوسەنگییە بووە لەنیوەی دەی ڕابردوودا ئاشتی دەسەبەر كردبوو- جیهانی ئەمڕۆ لەبنەڕەتدا شوێنگەیەكی جودای لەگەڵ پەنجا ساڵ پێش ئێستا هەیە. یەكێتیو پەیوەندیە سیاسیو سوپاییەكان هاوسەنگی هێزو توێژینەوەكانیش دەگۆڕن. هەموو دامەزراوەكانمان بەسیاسی، سەربازیو بەتایبەتی سیخوڕیشەوە دەبێت هەمیشە دەستیان بەسەرئەو ئاڵوگۆڕانەدا بشكێت، گەروا نەبێت دوچاری شكست دەبن. لەگەڵ ئەوەشدا هەڕشەی جەنگی چوارەمی جیهانی لەخۆیدا بەڵگەی ئەم بانگەشەیەیە كە پێویستمان بەیانەیەك هەیە. لەوانەیە بتوانرێت ئەو جۆرە یانەیە بە (یانەی كەسانی شایستە) ناوببرێتو، ئەندامەكانی ئەو وڵاتانە لەخۆبگرێت كە بڕوایان

بەڕێزی تاك، مافی هەمووان بۆ ژیان، ئەو ژیانەی کە خۆمان هەڵی دەبژێرین هەیەو، باوەڕیان بەسەرکەوتن یان شکست لەسەربنەمای ئامادەکاریو ئارەزووەکانمان هەبێتو، هەروەها کەسانێکیش کە دڵنیایی بدەن یەخەگیری دراوسێکانیان نەبن لەدیاریکردنی چارەنووسیاندا. ئەم یانەیە دەبێت ببێتە پاسەوانی جیهان. لێرەوە کە ژمارەی دانیشتوانی جیهانەکەمان لەپێنج ملیاردەوە بەرەو زیاتر لەهەشت ملیارد کەس، لەسەربنەمای خەمڵاندنی ئەم ژمارەیە تا ساڵی (٢٠٢٥) هەڵکشاوە، هەموو تاکێك پێویستی بەگرنتییەکە تا لەناوئەو توندوتیژیو هەراوهوریایەی مایەی پێشبینیکردن نییەو بەرهەمی دیکتاتۆرو تیرۆریستانو گروپەکانی مادە سڕکەرەکانە، لانی کەمی ئازادی بۆ دابین بکرێت. یانەکەمان دەبێت خاوەنی ئازادی سەرەکی بێت بۆ پاراستنی ژیانی مرۆڤایەتی. لەوحاڵەتەدا هەمان سەقامگیری شارستانی، کە ئێمە بڕوامان پێیەتی لەئارادا دەبێت. ئەندامانی یانەکەمان دەبێت لەهێزە واقیعیەکانی جیهانی (باکور)- واتە ویلایەتە یەکگرتووەکان، ئەوروپاو ژاپۆن- هەروەها ئەو دۆستانەشمان کە وەك ئەندامانی یانەکە لە (باشور) دان، پێك بێت. هەریەك لەوئەندامانەی بەڵێنی سوپایەکی سەدهەزار چەکداری لەدەستبژێران لەهەموو بەشەکانی زەمینیو دەریاییو ئاسمانیو پشتیوانی لۆجستیکیو دابینکردنی دارایی بۆ ڕاپەڕاندنی ئۆپەراسیۆنەکان دەدەن. سەنتەرێکی فەرماندەیی دیاری دەکرێت، کە سەنتەری هەمیشەیی فەرماندەیی گشتیو بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری دادەمەزرێنێت. لەم پەیوەندییەدا یانەکە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ (ناتۆ)- ڕێکخراوی پەیمانی ئەتلانتیکی باکور- نابێت، بەڵام ڕێکخراوێکی جوودا لە (پەیمانی ناتۆ) دەبێت. لەبەرئەوەی بۆ ڕێککەوتن لەسەریەکێتیەك لەقاڵبی پەیمانێکی ئیجباری لەجۆری (ناتۆ) لەلایەن دەستەبەر پرسەکانەوە لەهەموو وڵاتێکدا دەبێت پشتیوانی لێ بکرێتو، هەموو ئەندامەکانی یانەکە پەیمان دەدەن کە هەرکارێکی کە فەرماندەیی بڕیاری پێداویستیو گونجاویی بوونیدا دەبێت ئەنجامی بدەن. سەرانی باشگاکە دەبێت زۆرتر پابەندی کاری خێراو

دیاریکراو لەژێر هەلومەرجێکی تەواو نەهێنیدابن. لەبارودۆخێکی لەوجۆرەدا هەلی ڕاوێژکردن لەگەڵ کۆمیتەکانی پەرلەمانو، کات کوشتن لەسەرئاستی لۆژیکی سیاسی یان ڕای گشتی لەئارادا نییە. لەڕاستیدا دەرئەنجامی سەرکەوتووترین ئۆپەراسیۆنەکان هەرگیز ئاشکرا نەکراون، بەڵام بچوکترین دوودڵی دەتوانێت دەرئەنجامی ترسناکی بەرامبەر بەئایندەی شارستانیەت لەهەگبەدا بێت. لەڕاستیدا (ناتۆ)و بەتایبەتی حکومەتی ئەمریکا کە ئەرکی ڕێنمایی کردنی لەئەستۆگرتوەو هەنگاوی بەرەو وڵامدانەوەی خێراناوە، کە ئەوە بنەمایەکی تاکتیکیانەی (یانەی شایستە) پێك دەهێنێت.

دواین دارشتنەوەی (ناتۆ) بەجۆرێك نەخشەی بۆ کێشراوە کە دەتوانێت یەکەیەکی بەئەندازەی فەوجێك بەتوانای وەڵامدانەوەی خێراو بەبزاوتێکی دەمودەستانەی پێنج هەزار سەربازی پێك بهێنێتو، دەتوانێت لەمەیدانێکی چاوەڕوان نەکراوو بەکتوپڕی بەپێداویستی تەواوەوە لەماوەی حەفتاو دووسەعاتدا بەپشتیوانی لەشکرێکی پەنجا هەزار چەکداری، کە لەماوەی پێنج تا حەوت ڕۆژدا دەگاتە حەفتا هەزارکەس، لەژێر فەرماندەییەکی ئینگلیزیدا دەسبەکار بێت. ئەم یەکەیە بەشێکە لەزرێپۆشی قورسی پازدە هەزار کەسی ئینگلیزی نیشتەجێی ئەڵمانیا. بەشی دووەمی لقێکی زرێپۆشی شێواز ئینگلیزییە بەهاوەڵی کۆماندۆ ژێر دەریاییەکانو، دوولقی چەند نەتەوەییو هەروەها لقێکی ئەمریکی، کە هەموو فرۆکەو هەلیکۆپتەرو هێزە ئاسمانیەکان بۆ هەموو لەشکرەکان دابین دەکات.

بەڵام جموجۆڵی (ناتۆ) لەڕاستیدا تەنها قۆناغی یەکەمی ئەزموونی دوودڵییە بەرامبەر بەجۆرێك لەیەکێتی سەربازیو سیاسی، کە دەتوانێت ئاشتیەکی جێگا بڕواو پایەدار دەسەبەر بکات. فەڕەنسا هێشتا خۆی لە(ناتۆ) بەدوورگرتووە، چونکە ئەندامی ڕێکخراوێکی سەربازی نییە.

حکومەتی فەڕەنسا درێژە بەفشارەکانی خۆی دەدات لەپێناوی پێکهێنانی هێزێکی تەواو ئەوروپیو لەژێر فەرماندەیی ئەورووپادا، کە بەپێی ئەوە زۆربەی پێداویستیەکانی جەنگی (باکور- باشور)، کە ئێستا لەحاڵەتی

ململانێ داین لەگەڵیدا، نادیدە دەگرێت. لەواقیعدا ئەمە ڕێگایەکی پراکتیکانە نییە. (ناتۆ) دەبێت نەك لەسەربنەڕەتی پەیمانەکەی، بەڵکو لەسەرزەمینەی چالاکیەکانیشی کە لەودەست نوسەدا تەنها پەیوەستە بەئەوروپاو ئەتلانتیکی باکورەوە فراوان بکرێت. هەروەها پێویستە لەپشکە سیاسیەکانیشیدا بۆ بەشداریکردن لەوقەیرانانەی کە ئەگەری خستنەبەر مەترسی بەرژەوەندیەکانی باکوری لێ دەکرێت فراوان ببێت. بڕیاری تاکلایەنەی حکومەتی (بوش) لەتشرینی دووەمی (١٩٩١) سەبارەت بەلەناودانی جبەخانەی ئەتۆمی ماوە کورتی ئەمریکاو، براوتن بەرەو داماڵینی ڕیشەیی چەکی ئەتۆمی بەئاشکرا هەنگاوێکی ستراتیژیانەی گرنگ بوو بۆ ڕێگاگرتن لەهێزە ئەتۆمیەکان. ئەمە ئاماژەیەکی ڕوون بوو کەوڵاتە باکوریەکان توانستی تەواوی هێزە ئەتۆمیەکانی ئایندەیان تەنها وەك هێزێکی داکۆکیکارانە لەبەرامبەر هێرشە چاوەڕوان نەکراوەکانی دوژمنە نالۆژیکیەکانیان دانابوو. لەجیاتی ئەوە سەرچاوەکان دووبارە بەرەو جۆرەها هێزی کە تواناى ئەنجامدانی تیۆری (دارمانی بێچەندوچوونی)هەیە دەڕۆن، کە بەلێدانێکی خێراو قووڵ لەجەستە سەرەتانیەکە پێش ئەوەی فریای ڕیشەداکوتان بکەوێت ڕیشەکێش دەکرێت.

بەهەمان شێوە کە بۆ چەندەمین جارە بەدرێژایی ساڵەکانی یەکەمی جەنگی چوارەمی جیهانی ئەم واتایە فێربووین ، کە ئەگەر ڕێگای دوودڵی بەخۆمان بدەین دوچاری شکست دەبین. قۆناغی ئەزموونکاری‌و هەنگاوی نیوەناچڵانە لەم دەورو بەرە نوێ‌و فراوانەدا کاریگەری نابێت. هێزی سەربازی ڕێکخراو دەبێت ئامرازی فشار هێنانی لەبەردەستدابێت. دەبێت خەنجەری ترسوبیم بەناودڵی چەوسێنەرانێکدا بکەن کە لەوەپێش هەرگیز شکستیان ئەزمون نەکردووە. ئەو هێزانە نەك تەنها بەڕووکەش لەشکان نەهاتوو دەرکەون، بەڵکو دەبێت بەکرداریش لەشکان نەیەن. یانەی (کەسانی شایستە) هۆکاری وشککردنی هێزی تایبەتی نییە، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵێکی هەڵخەڵەتێنەرانە بۆ ڕیشەکێشکردنی نەیاران لەو وڵاتانەی کە ئەندامن تیایدا

نییە. کۆنترۆڵو هاوسەنگی هەنگاوە سیاسییەکان لەوڵاتە جۆربەجۆرەکانی جیهاندا ئەوە دەسەلمێنێت کە پێکهاتەیەکی لەوبابەتە هەرگیز ڕۆچوون نییە بۆ ئاستی یانەیەکی ڕەگەز پەرستانەو، نابێت زۆربەی کاتەکانو وزەو تواناکان بۆ لێکۆڵینەوە لەحوکمڕانی وڵاتێك یان یەکێکی دی بەهەردەر بدرێت. بەدرێژایی جەنگی کەنداوی فارس هیچ کام لەوڵاتە هاوپەیمانەکان بۆ ناردنی سوپا بۆ ساتێکیش بووبێت مەبەستی کۆنترۆڵکردنی فەرماندەیی جەنەڕاڵ (نۆرمان شورتسکۆف) لەهزریاندا نەجولا. هەروەها یانە هیچ کاتێك نابێتە کۆمەڵگایەکی داخراو. لەوانەیە زۆر لەوڵاتانی شایستەی دی بۆ کۆمەککردنی تایبەتی لەسەرئاستی توانا جاسوسی یان سەربازییەکانیان بانگهێشت بکرێن، کە بۆ ئەوان بەهەڵێکی ڕەخساوی ناوقەیرانە پێشبینی کراوەکان دادەنرێت. یانەی سەروە بەوردیو زۆر سادەیی ئامرازێکی دڵنیا کەرەوەیە، کە دیکتاتۆرێکی شێت یان وڵاتێکی لەمەسیحیەت هەڵگەڕاوە نەتوانێت هەموو ئەم ئەستێرەیە لەناو ببات. بەم پێیە ئامانجی یانەکەمان تاکەیەك کەس نابێت. بۆنمونە بەتەنها (سەدام حوسەین)یان (کیم ئیل سۆنگ)یان (معەمەرقەزافی)و (حافزئەسەد). ئامانجی ئەم یانەیە زۆر سادەو ڕۆشنە؛ واتە دەستەبەر کردنی ئارامیەك کە هیچ کەس یان وڵاتێك نەتوانێت ببێتە هەڕەشە بۆ سەرجەمی جیهان، بەتایبەتی گەر لەجۆری هەڕەشەی ئەتۆمی بێت. ئەگەر بەڕاستی هەڕەشەیەکی لەوجۆرە بکرێت یانەکە بەهێزی سوپاییو بۆ مەبەستی نەهێشتنی ئەو هەڕەشەیە بەشداری دەکات. بەلێدانێکی سادەو گورجك بڕانە وەك (ماموتێك- گیانەوەرێکی زەبەلاحی کۆنینەی لەناوچووە) بەشداری دەکاتو، بەبێ خۆدەرخستنو بوومە لێلانە دەسبەکار دەبێت. هەڵبەتە لەهەموو ڕووەکانەوە دەرئەنجامەکانی بەشداریکردنە کە هەڵدەسەنگێنرێنو، بڕیارەکان بەپێی باشترین زانیاری مومکین دەدرێن. پێش هەنگاونان بەرەو ئۆپەراسیۆنی (گەردەلولی بیابان) ئەمریکا بەتەواوی دوچاری زانیاری هەڵە ببوو. چ لەلای هاوپەیمانەکانیەوە لەخۆرئاواو وڵاتانی عەرەبی چ لەلایەن پسپۆڕانی زانیاری خودی خۆیەوە.

هەموویان پێشبینی هەڵگەڕانەوەیەکی خێرا لە (سەدام حوسەین)و هەموو دامەزراوە سوپایی- سیاسیەکانیان کردبوو، بەڵام ڕووداونی پێشبینیەکە بەوفراوانیەی کەوێنای بۆ کێشرابوو لەناوخودی عێراقدا ڕووینەدا. (سەدام حوسەین) وەك غودەیەکی سەرتانی لەوڵاتەکەیداو هەموو ناوچەکەشدا مایەوە؛ شێرپەنجەیەك کە دووبارە، تەنانەت پێش تەوابوونی نەشتەرگەرییەکەی ئەمریکا لە (گەردەلولی بیابان) دەستی بەگەشەکردن کردەوە. ئەوەی لێرەدا لێکۆڵینەوەی لەسەردەکەین ئەو هەڕەشانەیە کە فرە ئاڕاستەیە لەسنورەکانی تاکێکدا. ئامۆژگاری ئەوە ناکەین کە دووبارە بیناکردنەوەی جیهان دەبێت بەپێی بنەماکانی وێنا هزریەکانی ئێمەی خۆرئاوایی بکرێت. یانەی باسکراو بەهیچ کلۆجێك هەوڵدان نییە بۆ بنیاتنانی سیستمێکی نوێی جیهانی، بەڵام بەکەماڵی هیواوە دەبێت بووترێت کە کەمکردنەوەی ئەو هەڕەشانە بەشێکە لەسیستمی جیهانی ئەم دامەزراوە، کە هەنگاوە سەربازییەکان کەمترو کەمتر پێویست دەبن. هەمووشتێکی کە دەمانەوێت ئەمەیە کە مافی چارەی خۆنووسین بدەینە هەموو وڵاتێكو، ئەوەش کۆمترۆڵ بکەین کە ئەو وڵاتەداوای سەپاندنی هەمان چارەنووس بەسەر وڵاتانی هاوسێیدا نەکات.

سەرانی هەموو وڵاتەکان دەبێت ئەوە بزانن کە ئەگەر خۆپڕچەککردنی ئەتۆمی، ڤایرۆسی یان کیمیایی خۆیان تەواو کردووەو، هەڕەشەی بەکارهێنانی دژی وڵاتانی ئەودیو سنورەکانی خۆیان بەمەبەستی بەرپاکردنی نەزمێکی تایبەت دەکەن، ئەو چەكو توانایەی بەدەستیان هێناوە بێچەندوچوون و لێبڕاوانە لەناودەبرێن. یانەی (کەسانی شایستە) بەوردی دواین ئاستەنگ دەبێت. ئەگەربەدروستی بینابکرێت و فەرمانەکانی ڕابپەڕێنێت دەتوانێت بەهۆی سیاسەتی (بێچەندوچوون)ەوە هاوسەنگی ستراتیژیانە دەسبەر بکاتو، ببێتە ڕێگر لەبەردەم دۆزەخێك کە لەناودڵی جەنگی چوارەمی جیهانیدا سەرهەڵدەدات. هاوسەنگی وەحشەت دروست وەك سیاسەتی (دارمانی بێچەندوچوونی دوولایەنە) بووە بەربەرست لەبەردەم

سەرهەڵدانی دۆزەخێك كە لەئەنجامی فراوانبوونی جەنگی سێیەمی جیهانییەوە پەیدادەبوو. ڕێگابدە وێنای ئەوە بكەین كەساڵی ئاینده سەرنجی ئەوە دەدەین كە دیكتاتۆرێكی نائاسایی دوور لەچاودێریكردن شەش مانگی لەدروستكردنی بۆمبێكی ئەتۆمیدا گوزەراندووە، ئێمە چی بكەین؟ ئایا ڕێگای پێ بدەین پەیمانی سنووردارکردنی بڵاوبوونەوەی چەكی ئەتۆمی ئیمزا بكات؟ لەوحاڵەتانەدا هەموو توانستو نەخشەكانی دروستكردنی چەكی ئەتۆمی ڕاستەوخۆو بێوەستان لەلایەن یانەی (كەسانی شایستەوە) لەناودەبرێن. كاتێك فڕۆكە ئەمریكیەكان لەساڵی (١٩٨٦)دا (تریپۆلی) یان بۆمبباران كرد، كاریگەرییەكی كەمیان لەسەرهێرشە تیرۆریستیەكانی (قەزافی) دانا. لەڕاستیدا كارەكە ڕووبەڕووی شكست بۆوە. تەنانەت سەبارەت بەدۆزینەوەو لەناوبردنی خودی (قەزافی)ش سەركەوتوو نەبوو. بەپێچەوانەوە بۆمبەكان كەوتنەچەند ناوچەیەكی سیڤیلەوەو ژمارەیەك منداڵو پیرەژنیان كوشت. ئەمەش بووە هەنجەتێكی باش تا (قەزافی) بەجۆرێكی كاریگەرانە بۆ ئامانجەكانی خۆی لەڕاگەیاندنە سیاسیەكانیدا بەكاری بهێنێت. بەڵام تەنانەت ئەم ڕێنماییە هەڵەیەو هەنگاوە پڕ كەموكوڕیەكەش دەرئەنجامێكی گرنگیان هەبوو، كەوای لە (قەزافی) كرد برێك ڕابمێنێت. لەماوەی ساڵانی دوای ئەم بۆمبباران كردنەدا (قەزافی) لەبەگەڕخستنی تیرۆریزمدا كەمێك سڵەمییەوەو، هاریكاری كردندنیشی بەجۆرێكی ڕێژەیی بۆ لەناوبردنی گروپە تیرۆریستیەكان زیادی كردو، هەموو هاوكارییەكانی كە لەگەڵ گروپە تیرۆریستەنێو دەوڵەتیەكانیشدا هەیبوو سنووردارکرد. بەكورتی، تەنانەت ئەم چالاكیە نیوەناچڵەش، گەر نەڵێین كاریگەری لەسەرهەموو توانای، بەلایەنی كەمەوە لەسەرئامانج ەفراوانخوازییەكانی بەهۆی چەكی تیرۆریزمەوە، دانا. لێدانی ناوچە نەوتیەكان سەرچاوەی داراییەكانی بۆ ئەنجامدانی چالاكی تیرۆریستانە لەناوبردو، ئەمەش خۆیلەخۆیدا تواناكانیشی لەبەكارهێنانی تیرۆریزم ئاشكرا دەكات.

ئـــەو هەنگاوانـــە بەتـــەواوی هـــەمان ئەوشـــتەیە کەویلایەتـــە یەکگرتووەکان‌و هاوپەیمانەکانی هەوڵ دەدەن دژ بە (سەدام حوسـەین) لەکـەنداودا پیـادەی بکـەن. لەگـەڵ ئەوەشـدا بـەهۆی ئـەوەی کـە هاوپەیمانەکان سەرکردەیەکی کە لەلایەن خۆرئاواوە کەسێکی بـێزراوەو بـەڵام لـەلای زۆربـەی وڵاتـانی جیـهانی سـێ قارەمانێکـە ڕووبـەڕووی ڕەخنـەگرتن بوونەتـەوە. هەڵبەتـە ڕاسـتیەکی تێدایـە کـە (سـەدام حوسـەین) لەوڵاتەکـەی خۆیـداو لـەدەرەوەش لـەلای هـەندێ لایـەن کەسایەتیەکی تاڕادەیەك خۆشەویست بووە.

ئێمەی ئەندامانی یانە لەوڕووەوە هیچ گرفتێکمـان نـابێت. دەتوانێت لەناوسنورەکانی خۆیدا تا ئەو ماوەیەی خەڵکی تەحـەمولی دەکـەن چـی بوێـت بیکـات. دەتوانێـت وەك ئیمـپراتۆر لەسـەرتەختی شـایانەی دانیشێت. بەڵام نـاتوانێت دامـەزراوەی چەکـازی ئـەتۆمی، ڤایرۆسـی‌و کیمیایی دروست بکات‌و، هەروەها نابێت بـەهۆی زەبروزەنگـەوە خـاکی وڵاتـانی هاوسێی داگیر بکـات. نـاتوانێت بـۆ سـاتێکیش بێـت لـەودیو سنورەکانیەوە ببێتە سەرچاوەی هەڕەشە لەسـەرجیهان.

لەڕاستیدا ئـەوەی لەکـەنداودا بەسـەرمان بـرد. وەك جۆرێکی کاریگەرانـە بەهەنگاوی یەکەمی یانەی (کەسانی شایستە) دادەنرێنت. ئۆپەراسیۆنەکە هـەم خـاڵی لاوازو هـەم بەهێزیشـی بەئاشـکرا خسـتەڕوو. یەکـەم ئەمەیـە کـە یانەکە پێویستی بەجموجۆڵی خێرایە، هۆیە سەرەکیەکەی سنورداری ژمارەی ئەندامـەکانی‌و دەمودەسـتی کـار ڕاپەڕاندنەکـەیـەتی بەبێگەڕانـەوەی بـۆ ڕاوێژکردنی یانە.

خۆنواندنـی پڕشـکۆی هێزەکـان‌و ئامادەکاریـەکـانی وڵاتـانی بەشـداربوو، پشتیوانی مەعنەویانە لەئۆپەراسیۆنی (گەردەلولی بیابـان) ئـەوەندە زۆربـوو، کـە بەتـەواوی هـەموو مـانۆڕێکی زیرەکانـەی دیپلۆماسـی یـان سـەربازیانەی سنورداردەکرد. لـەکۆتاییدا، هێرشـێکی ڕووبـەڕوو وەك تاکـە چارەسـەرێك مابۆوە. گەرچی زۆر کـورت بـوو، بـەڵام شوێنەوارێکی وێرانـی لـەپاش خـۆی

بەجێهێشت. هێشتا بەرنامەی چەکسازی ئەتۆمی عێراق لەپێشەوەیەو دەبێت ڕیشەکێش بکرێت. دووەم: هێزەکانی یانە پێویستیان بەبزاوتن هەیە لەهەرشوێنێك کەشیاو بێت، تا بتوانن بەهێزی لێدەری بچوك و کارامە هەرەشە تایبەتیەکان لەناوببات. ئەو ڕاستییەی کە (سەدام حوسەین) بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ (باکور)و بەشێکی جیهانی (باشور) هەموو توانا سەربازییەکانی خستبووە ژێر فشارەوە، وایلێ کرد بەتەنها شوێن پێگەکانی خۆی زیاتر توندوتۆڵ بکات، کە ئەمکارەشی شەڕێکی بەرفراوانتری دەویست. ڕزگاربوون خولیایەکی بەهێزی هەردیکتاتۆرێك یان حاکمێکی ناوچەییە. مەبەست لەسەرو هەموو شتێکەوە ئەمەیە کە یانەکە پێویستی بەزانیاری ڕاستەوخۆیە، کە دەمودەست بگاتە دەستی فەرماندەی سوپایی یان ناسوپاییەکانەوە. بەدرێژایی جەنگی کەنداوی فارس زانیاری جەنگی کە لەلایەن (CIA)، دەزگای هەواڵگری بەرگریو یەکە هەواڵگرییە مەیدانیەکانەوە ئامادە دەکران، بەتایبەتی دەربارەی بڕی زیانی بۆمبەکان، کە تەنها دەبووە هۆی لێڵی لەسەرئاستی چالاکیو ئەوەش لەڕەخنە سەرەکیەکانی جەنەڕاڵ (شوارتسکۆف) بووە. یەکەمین قۆناغی پێکەوەنانی یانەی (کەسانی شایستە) دەبێت هەوڵێکی جیهانی بێت بەهاوکاری بەخشینی زانیاری لایەنە بەشداربووەکان. بیهێنە بەرچاوی خۆت لێدانێکی سەرسوڕهێنەرانەو کاریگەر بەهۆی یەکەیەکی وەك هێزی تایبەتی ئاسمانی بەریتانیاوە لەدەوڵەمەندترین ناوچە نەوتیەکانی لیبیاو سوریا، دەتوانێت کۆنترۆڵی کامپە پەروەردەییەکانی دۆڵی بیقاع لەلوبنان بکات. یانەکە دەتوانێت زۆرکار، تەنانەت بەبێتە قاندنی یەك گوللەش ئەنجام بدات. کارێکی گرنگی کە پێویستە ئەنجام بدرێت دامەزراندنی دادگایەکی نێودەوڵەتی لەئەندامانی یانەکە بۆ بەدواداچوونی تیرۆریستانو ئەوانەی پشتگیریان دەکەن. هەوڵ دەدرێت هەموو تیرۆریستێك لەبەردەم ئەم دادگا تایبەتەدا بەمەبەستی لێکۆڵینەوەو سەلماندن ئامادە بکرێت. بەهەمان شێوەی کە لە (نۆرینبێرگ)ی ئەڵمانیا پەیڕەوانی هتلەر بەهۆی تۆمەتە جەنگیەکانەوە بۆ بەردەم ئەو

دادگایە کێشکران. سەبارەت بەو کەسانەی کە دەستگیر دەکرێن، یان لەگەڵ ئامادە نەبوونیشیاندا لەتاوانەکانیان دەکۆڵرێتەوە، دەرئەنجامەکان لەڕادیۆی جیهانی (BBC) دەنگی ئەمریکا، دەنگی ئەڵمانیاو ڕادیۆی نیودەوڵەتی فەرەنساوە پەخش دەکرێت. بۆنمونە (بەڕێز ئایکس تۆ خراویتە بەردەم دادگاو بەئەنجامدانی کاری تیرۆریستانە تاوانبار کراویت، ئێستا ناوت لەناولیستدایە، لەهەلومەرجی ژیانتان دەکۆڵینەوەو، ڕۆژێك دێت دەستگیرت دەکەین)

حوکمێکی لەوجۆرە ڕەنگدانەوەی جۆراوجۆری دەبێت؛ بەتایبەتی پاش ئەوەی یەکەمین تاوانبار ناسێنرا، دەستگیرو لەسێدارەدرا، یان حوکمی هەتاهەتایی زیندانی بەسەردا درا. هاوکارەکانی دەست دەکەن بەبیرکردنەوە: (من چل ساڵ یان پەنجا ساڵە دەژیم، ئەم دەزگا بەهێزە دەیەوێت تا دوایین ساتەکانی ژیانم بەدوومەوە بێت. دەبێت ڕێگا چارەیەك بۆ بەسەربردنی ئەو ماوەیەی لەژیاندا ماوە هەبێت)

دەبێت بەوتاوانبارە نێودەوڵەتیانە بسەلمێنین کە لەپەیوەندیمان لەگەڵیاندا ڕاستین‌و مەبەستمانە هەموو ئەوانە زۆر تربژین. هەڕەشەکردن لەمەزهەبیەکان کاریگەری نابێت، بەڵام لەسەرکەسانێکی کە لەلایەن دەوڵەتەکانەوە دارایيان بۆ دابین دەکرێت‌و ئاراستە دەکرێن کاریگەر دەبێت. کەسانی وەك لیبیەکان‌و پارێزەرە سوریەکان، لەوێنەی ئەوانەی فڕۆکەی پان ئەمریکای ژمارە گەشتی (١٠٣)یان لەسەرئاسمانی لۆکەربی لەئۆسکتلەندا تەقاندەوە، کە دەرکەوت دەستی ئەو پرۆفیشنالانە بووە کاریان بۆ (قەزافی) دەکردو، (قەزافی) سەرپەرشتی کارمەندە سیخوڕەکانی خۆی‌و ئەندامانی بەرەی ڕزگاریخوازی فەلەستینی (سەرکردایەتی گشتی)یشی دەکرد. هەمووئەوانە دەبێت یەك بەدوای یەکدا لەناولیستی یانەی (کەسانی شایستە)دا تۆمار بکرێن. جۆری ئەو شەڕانەی کە هێزەکانی یانەی (کەسانی شایستە) دەیکەن لەگەڵ هەموو ئەو جەنگانەی پێشتر کردومانن بەتەواوی

جیاواز دەبێت. بۆ ئەمەش چەند بەڵگە هەیە؛ ماهیەتی تەواو جیاوازی دوژمن، زۆری ستراتیژو تاکتیکە نەناسراوەکانیشی.

هێزە تیرۆریستەکانی کە دژ بەئێمە ئامادە کراون لەم دیدەوە زۆر بەگران دەکرێن بناسرێن، چونکە خۆیان دادەپۆشن. لەبەرامبەردا کاتێك دەچیتە پایتەختەکانیانەوە ڕاستەوخۆ هەموو سیماکان مۆن دەبن.

ناتوانین لەنێو ئەوانەدا خۆمان حەشار بدەین، چونکە ئەم کارە تۆڵە سەندنەوەو ئەنجامی (دارمانی بێچەندوچوون) زۆر دژوارتر دەکات. لەودواییانەدا لێکۆڵیارێکی فەرەنسی هەبوو کە چەندین ساڵ بوو لەنێو خەڵکی ئەفریقای سەروودا بەنهێنی دەژیا. هەرگیز ناسنامەکەی ئاشکرانەبوو، تا ڕۆژێکیان لەبیاباندا کەوایدەزانی بەتەنهایە بەپێوە میزی کردبوو. چونکە موسڵمانەکان هەرگیز کاری لەوجۆرە ناکەن بۆیە ناسنامەکەی ئاشکرببوو. بەهۆی هەڵەیەکی بچوکی لەوجۆرەوە یان شتێکی لەوبابەتە سەرتان لەدەس دەدەن. لەشێوەی هەمان ئەو هێزانەی کە لەزۆربەی وڵاتانی ئەوروپادا هەن لەبەشی خوارووی ویلایەتە یەککگرتووەکانیش بۆ بەرپاکردنی نائارامی نائاسایی هەن.

لەبەشی خوارەوەی سنورەکانی ئەمریکادا گروپگەلی ئیسپانیۆلی داکۆکیکار لەیەکێتی هزری ئیسپانیو ئیسلامی هەیە، کە دەتوانن ئەو هێزانە پوچەڵ بکەنەوە کە حاڵەتی تەقینەوەیان تێدایە. هەندێ لەدەوڵەتەکانی ئەمریکا تەنانەت لەناساندنی گرفتەکەشدا بێتوانا بوون. ئەوە نەفرەتو فەرامۆشکاری ئێمەیە کە لەکۆتایی ئەو پەیوەندییەدا یەکەمین گوللەی جەنگی چوارەمی جیهانی لەڕووی کینەو ڕقەوە بەرەو ڕووی ئەمریکاو ئەوروپا دەتەقێنرێت؛ کە خۆمان دەبینە هۆی لەناوچوونی خۆمان. بەهۆی نوشستی هێنان لەدزەکردنە ناو ئەو کۆمەڵگا نوێو تازە دەرکەوتوانەوە سەخترینو قورسترین دەرئەنجام چاوەڕێمان دەکات. هەڵبەتە هەموو دەزگا جاسوسیەکان گرنگی بەهاو گرفتی سمینی پلەبەپلەی بەرەو ناوەڕۆکی دوژمن دەزانن.

لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا هاوپەیمانەکان لەسەرانسەری ئەوروپادا ئەم شێوازەیان پیادە کرد. هەر ئەم کارەش بەردی بناغەی کاری بەرگریکردنی بزوتنەوەی فەرەنسابوو. لەکۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیدا کاتێك جەنگی سێیەمی جیهانی بەخێرایی بەدوایدا دەهات، (ستالین) دەستی کرد بەدزەکردنە ناو ناوچە بەرزەکان‌و، دزەکردنی بۆناو خۆرئاوا بەکارمەندانێك بەڕێوە دەچوو کە بەبەرگی هەلگەڕاوەیان یان کۆچبەرە نایاساییەکانەوە خۆیان دەنواند. بەلام سیخوڕان‌و دەسەلاتدارانی ئەمڕۆ لەجیاتی ئەوەی بەتەواوی کارمەندی کۆدنەوەی زانیاری بن بۆ ئامێری تێکدان‌و شەڕ گۆڕاون. بۆ جەنگی چوارەمی جیهانی جەنگێکی تیرۆریستانە دەبێت.

لەکارکردندا هەندێك لەوبیانیانەی لەنێو ئێمەدا جێگیربوون، واتە ئەوانەی کە چالاکی دەنوێنن یان پشتیوانی تیرۆریستان دەکەن، دەتوانن ببنە جۆرە موشەکێك کە لەجەنگی سێیەمی جیهانیدا دەیتوانی ولاتێك وێران بکات، بەلام بەهۆی سیناریۆی ستراتیژیانەی (دارمانی بێچەندوچوونی دوولایەنە) لەکۆتاییدا بەناچاری بۆ هاوسەنگی وەحشەت گۆڕا. جیاوازی موشەکەکانی ئەمڕۆ لەگەل ئەوانەدا لەوەدایە کە پێنج دەقیقە دواکەوتن لەکاتی هاویشتن بۆ تەقینەوە لەئارادا نییە. ئەم مرۆ موشەکیانەی جەنگی چوارەمی جیهانی لەکۆنەوە لێرەدا هەن. ئێمە هیچ جۆرە دژە موشەکێکی دژ بەوانمان نییە. نەجەنگی (ئەستێرەکان)و نەموشەکەکانی (پاتریۆت) ناتوانرێت لەدژیان ئاراستە بکرێت. لەوەش زیاتر، ئێمە توانای تۆلەسەندنەوەیەکمان نیە کە بتوانێت (دارمانی بێچەندوچوون)ی جەنگی چوارەمی جیهانی‌و واقیعە ستراتیژە نوێیەکەی زامن بکات. ئەگەر ئەم مرۆ موشەکیانە لەگەل لێدان‌و وێرانکردنی بنکەکانیان هاویژران، دەبێت ئێمەش توانای گۆڕان لەخۆماندا دروست بکەین‌و، بە بەرزکردنەوەی ئاستی سیخوڕی‌و زانیاری دەبێت جۆرەها سیستمی هەوال ناردن لەدوورەوە گەشە پێ بدەین، تا لەهاویشتنیان ئاگادارمان بکەنەوە. هەندێك لەدەولەتە تایبەتەکان بەجۆرێکی کارگەرانە تر

لەدژی وڵاتانی دی سوود لەتیرۆریزم وەردەگرن؛ دروست وەك هۆكارێكی جەنگی، سوپایی یان ئامرازێكی سیاسیانەی دەوڵەت.

ئەمڕۆ ئاشكرایە كە هەندێ لەوڵاتان لەنێو وڵاتە رەسەنەكانی تیرۆریزمدان. لەگەڵ ئەوەش دەستەی تایبەت لەناو هەریەك لەوانەدا هەن، كە لەڕاستیدا هێزی مێژوویی قوڵن. ئەم هێزانە دەبنە هۆی ئەوەی لەم وڵاتانەدا بە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی دی ئەگەری بەكارهێنانی تیرۆریزم وەك چەكێك دژ بە (بكور) زیاتر بێت.

چەكەكانی تیرۆریزمی ئەمڕۆ تەنها جۆری ئاڵۆزتری هەمان خەنجەرە دێرینەكانە. تیرۆریزمی ئەمڕۆ تەنها هەڵدانی نارنجۆكێك بۆ ناوسینەمایەكی جەنجاڵی ناوشارێكی گەورە، یان تیرۆركردنی سناتۆرێكی ئەمریكی نییە، بەڵكو دەكرێت زەهركردنە ناو سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی پاریس یان نیۆرك، یان تەنانەت نانەوەی بۆمبێكی ئەتۆمی لەناوجەرگەی شارێكی گەورەی ئەروپا یان ئەمریكا بێت، كە تائێستا چانسمان هەبووە لەوڕووەوە. تیرۆریستەكانی تا ئەم دەمە لەهەرجۆرێك بووبن پرۆفیشناڵ بوون، ئەمەش بەو واتایە دێت كە زۆرباش رێكخراون، هەلی كەم لەئارادایە بۆ دەسگیركردنیان، یان هەر ناتوانرێت دەسگیربكرێن. بەڵام بەهۆی هۆكارە سیاسیەكانەوە هیچ ئامانجێكی روون لەلایەن پشتیوانەكانیانەوە دیاری نەكراوە. تەنها برێك دراو بۆ هەرهۆیەك بێت پێیان دراوەو پێیان وتوون: (هەرچیت دەوێت بیكە، تەنها زیان لەدوژمنەكانتان تاڵ بكەن، ئیتر چ شێوازێك هەڵدەبژێریت گرنگ نییە) ئێستا تا ئەودەمەی جەنگی چوارەمی جیهانی بەڕاستی بەرپا دەبێت چانس دەمانپارێزێت. قۆناغی دواتر ئەمەیە كە ئێمە لەحاڵەتی چوونەناوەوەدا دەبین. ئەمە قۆناغێكە كە تیایدا تیرۆریستەكان بەتەواوی بەهۆی چەكە جیهانیەكانەوە دەبنە ئامانج، لەڕاستیدا بۆ ئامرازە بەهێزەكانی دەسەلاتی دەوڵەتی‌و هێزی سوپایی دەگۆڕین. دەچینە خولێكەوە كە تیایدا تیرۆریستەكان لەلایەن دەوڵەت‌و لەژێر فەرمان‌و دەستوری ئەواندا دەبن‌و، تادوا ڕادەچەك‌و دراوو ئامۆژگارییان

پێ دەدریت: (ئیستا ئیوە ریکخراون، سوپایەکن. ئیوە بەم ریگایەو لەم کاتوساتە تایبەتەدا مەیدان لەدوژمنەکانتان تەسک دەکەنەوە. ئەوانە ئامانجیکن کە ئیمە هەلمان بژاردوون، ئیوە ئەوان لەناو دەبەن) بەمجۆرە، ئەمە جەنگیکی خۆش بەلام زۆر بێ بەزەیانەو سامناك دەبیت. ئەمرۆ خواستی ئیمە بانگهیشت کردنیکی خیرایە بۆ دەسبەکاربوون. ئەمرۆ ئەو شتەی کە لەرووی گرنگیەوە پلەیەکە ئەمەیە کە نەزمی جیهانی بەوجۆرەیە کە (ئیمە) دەیناسین.

((کۆتایی))

## زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەمساڵی ٢٠٠٤

| زنجیرە | ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێڕانی |
|---|---|---|---|
| ٢٤٨ | مانگی نیوە مۆر | دڵشاد عەبدوڵلا | |
| ٢٤٩ | گەڕانەوە لە خەیاڵەوە بۆ واقیع | عەتا قەرەداخی | |
| ٢٥٠ | پەیڤەکانی ڕەنگ | وەهبی ڕەسوڵ | |
| ٢٥١ | گۆڕستانی چراکان | شێرکۆ بێکەس | |
| ٢٥٢ | چوار شانۆنامە | | هەورامان وریا ق |
| ٢٥٣ | دەربارەی ئەقڵی مۆدێرن | | ئازاد بەرزنجی<br>ئاوات ئەحمەد |
| ٢٥٤ | دوا گفتوگۆکانی بورخیس | ئا: ئوسفالدو فراری | ڕەووف بێگەرد |
| ٢٥٥ | چاخی زانیاری | ئازاد حەمە | |
| ٢٥٦ | فەرهەنگی هەندەران | ئا: حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ | |
| ٢٥٧ | خەیاڵی زمان | عەبدولموتەلیب عەبدوڵلا | |
| ٢٥٨ | بینای کات لە سێ نمونەی ڕۆمانی کوردیدا | نەجم خالید نەجمەددین | |
| ٢٥٩ | بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری کوردیدا | سەردار ئەحمەد حەسەن گەردی | |
| ٢٦٠ | ڕشتەی مرواری | عەلائەدین سەجادی | |
| ٢٦١ | باخچەیەك لە شیعری فەرەنسی | | د.فەرهاد پ |
| ٢٦٢ | کێوی پێنجەم | پاولۆ کۆیلۆ | یاسین عوم |